دوکتور مارف خەزنەدار

# مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردی‌یە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

بەرگی سێیەم
نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم
١٨٠١ - ١٨٥٠



# مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پڕۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

بەرگی سێیەم
نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم
١٨٠١-١٨٥٠

**دوکتۆر مارف خەزنەدار**



کتێب: مێژووی ئەدەبی کوردی - بەرگی سێیەم
دانانی: د. مارف خەزنەدار
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٢١٤
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
نووسینی بەرگ: خۆشنووس محەمەد زادە
پیت لێدان: تریسکە ئەحمەد - نسار عەبدوڵڵا
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل - لوتفی عەبدولفەتاح
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمان مەحموود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٣
تیرێژ: ١٠٠٠ دانە

لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٢٨٢)ی ساڵی ٢٠٠٣ی دراوەتێ

# پێشەکی

پێشەکیی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە گشتی بوو بۆ هەموو بەرگەکان لە سەرەتای پەیدابوونی ئەدەبی کوردییەوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم. ئەو پێشەکییانەی بۆ بەرگەکانی دیکە نووسراونەتەوە لە بەرگی دووەمەوە تایبەتین بەو بەرگانەی بۆیان تۆمار کراون. لە پاشانا بێ گومان هەموو پێشەکییەکان لە بەرگی یەکەمەوە تا کۆتایی دەدرێنە پاڵ یەک و، دەبن بەپێشەکییەکی گشتی بۆ هەموو بەرگەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی.

بەرگی سێیەمی ئەم کتێبەی لە بەردەستی خوێنەر و خوێندەواری کورددایە باس لە مێژووی ئەدەبی کوردی دەکا لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا. بەهەموو حسێبێک ئەو ماوەیە نیو سەدە دەگەیەنێ، واتە پەنجا ساڵی نێوان (١٨٠١ - ١٨٥٠). ئەم دەستنیشانکردنە ئەوە ناگەیەنێ باس لە بەرهەم و خاوەنی بەرهەمە ئەدەبییەکان دەکرێ ئەوانەی لە ماوەی ئەم پەنجا ساڵەدا لەدایکبوون و، هەر لەو ماوەیەشدا کۆچی دواییان کردووە، بەڵکو نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم ماوەیێکی زۆر لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەم و نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم وەردەگرێ، ئەمە جگە لەوەی کە باس لە خاوەنی بەرهەمی ئەدەبی دەکرێ ماوەی ٢٠ تا ٢٥ ساڵ دەخرێتە سەر تەمەنی لە دوای لەدایکبوونی، چونکە لەو تەمەنەدا کەسایەتی ئەدەبی و هونەری دروست دەبێ، بەم پێیە هەندێ لەو کەسانەی لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەم لەدایک دەبن و لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم کۆتایی بەژیانیان دێ لە کەسانی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم دەژمێررێن. ئەوەی لێرەدا گرنگ بێ ئەوەیە خاوەنی بەرهەمی ئەدەبی و بەرهەمەکەی زۆرترین سەردەمی ژیانی لەو پەنجا ساڵەدا وەرگرتبێ کە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمی پێ دەڵێین (١٨٠١-١٨٥٠).

لە مێژووی ڕۆشنبیری کوردیدا کە ناوی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم دەبرێ بیری هەموو خوێندەوارێکی هوشیار ڕوو دەکاتە ناوچەی سلێمانی لە باشووری کوردستان و دروستکردنی شاری سلێمانی وەکو پایتەختێک و یادگارێکی میرنشینی مۆدێرنی بابان. لەم کۆمەڵی شارستانییە تازەیەدا، هەموو هۆیێکی دامەزراندنی دەسەڵات لە ناوەوە بوو، گرنگترینی ئەم هۆیانە لایەنی خوێندەواری بوو، بەتایبەتی بزووتنەوەی ئەدەبی. لە میرنشینی بابان بلیمەتێکی وەکو نالی تێیدا پەیدا بوو، کابرایێکی شارەزووری کەلاش خوار بەفریای ئەو کردارە گەورەیە کەوت، لەسەر بنیادی مەشقی هەزار ساڵەی ئەدەبی ئیسلامەوی (عەرەبی، فارسی، تورکی عوسمانی، قوتابخانەی مەلای جزیری لە کوردستانی باکوور) بابەتێکی نوێی ئەدەب بێنێتە ناو ئەدەبی کوردستانی باشوورەوە، لە دواییدا بەچەند ناوێک پێناسە کرا، وەکو: قوتابخانەی غەزەل و قەسیدە، شیعری عەرووزی و یەکێتیی قافیە، شیعری قوتابخانەی کلاسیکی ئیسلامەوی و هی دیکە.

نالی و سالم و کوردی بناغەی بتەوی ئەم قوتابخانەیان لە ناوچەی سلێمانیدا چەسپ کرد. لە ڕۆژانی داهاتوودا واتە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم ئەم بزووتنەوە ئەدەبییە نوێیە لە هەموو ناوچەکانی



باشووری کوردستان بڵاو بووەوە، لە موکریان و ئەردەڵان و سۆران و گەرمیان، بەدرێژایی ڕۆژگار پەلی هاوێشت تا گەیشتە ڕادەیێک بزووتنەوە ئەدەبییەکە گەلێ لە ناوچە و هەرێمەکانی گۆرانزەمینی گرتەوە، بەتایبەتی لەو ناوچانەی دیالێکتەکانی کرمانجیی باشوور و گۆرانی لە یەکتری نزیک دەبنەوە. بەم ڕەنگە بەهێزبوونی قوتابخانەی نالی لەسەر حسێبی لاوازبوون و نەمانی دیالێکتی گۆرانی بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەدەبی کلاسیکی گۆرانزەمین وەرگەڕاوەتە سەر دیالێکتی کرمانجیی خواروو، ئەدەبی میللیی سەر زار وەکو خۆی ماوەتەوە.

پەرەسەندن و گۆڕان و پێشکەوتنی ئەدەبی کوردی لە کوردستانی باشووردا لە پاشانا لەسەر ئەو بنیادە بوو کە نالی و هاوڕێکانی دایان مەزراندبوو بەدیالێکتی کرمانجی باشوور لە سەرەتای سەدەی بیستەم و بۆ دووەمین جار دابەشکردنی خاکی کوردستان لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی. لەو ڕۆژگارەدا کوردستانی عیراق دەوری گرنگی هەبوو لە پێشکەوتنی ئەدەبی کوردی و پەیدابوونی زۆربەی بابەت و مەبەس و هونەرە ئەدەبییەکانی هەموو گێتی لە شیعر و پەخشان لە ئەدەبی کوردیدا و بوونی بەئەدەبێکی عالەمی.

لەبەر گرنگی ئەو ڕینیسانسەی لە کوردستانی باشووردا سەری هەڵدا، دەبوو بایەخ بەجوگرافیا و مێژوو و ئەتنۆگرافیا و ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی ناوچەی سلێمانی بدرێ. ئەگەرچی ئەوەی لەم بەرگەدا کراوە دەبوو زیاتر بێ، بەڵام لە ترسی ئەوەی مێژووی ئەدەب نەبێ بەمێژووی گشتی بەکورتی باس لە مەسەلەکە کراوە.

وەک ئاشکرایە قوتابخانەی نالی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم لە سلێمانی پەیدا بوو، ئەدەبێکی بەرزی گۆرانزەمین لە ناوەوە بوو، ئەم بزووتنەوە تازەیە دەستی بەوە کردبوو جێگە بەئەدەبی تەمەن هەزار ساڵەی گۆرانزەمینی کوردستان لەق بکا، بەڵام هەر چۆنێ بێ لەو ڕۆژگارەوە بەرەو کزی دەڕۆیشت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ماوەیە ناوێکی پرشنگداری شاعیرانی گۆرانزەمینمان بۆ دەور دەکاتەوە لە سەرووی ئەمانە هەموویانەوە شاعیرێکی گەورەی وەکو مەولەوی، لەبەر ئەوە لەم بەرگەدا هەوڵ دراوە وێنەی ڕاستەقینەی بەرهەمی شیعری گۆرانزەمینی کوردستان بخرێتە پێش چاو.

ئەوەی پێوەندی بەئەدەبی کوردستانی باکوورەوە هەیە ئەوەیە لە سەدەکانی شازدەم - هەژدەم قوتابخانەی هەریری - جزیری - خانی گەیشتە لووتکە، لە سەدەی نۆزدەمدا لەبەر گەلێ هۆی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو گوڕەی کۆنی هەندێ نیشتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بزووتنەوەکە بەکزی بەردەوام بوو، هەروەها لە ناوچەی جزیری بۆتان و هەکاری چووە دەرەوە و گەلێ لە ناوچەکانی دیکەی کوردستانی باکووری گرتەوە، وەک ناوچەی بادینان، بەڵام بزووتنەوەکە لە پلەی دەستپێکردنەکەی سەدەی شازدەم نەبوو. لە پاشانا بەهۆی دابەشکردنی کوردستان بۆ جاری دووەم لە دوای جەنگی دووەمی گێتی ئەدەبی کوردستانی سەروو لە زۆربەی ناوچەکانیدا کوژابووەوە، نموونەی پاراستنی ئەو ئەدەبە دەتوانرێ لەناو کوردانی قەفقاسی ڕووسیا و کوردانی سووریا و ناوچەی بادینانی کوردستانی عیراق ببینرێ.

ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم بەلای ئێمەوە سنووری دانان و چەسپبوونی ئەدەبی کوردییە، لە دوای ئەوە پەرەسەندن و گۆڕان و تازەکردنەوە دەست پێ دەکا، ئەمەیان هەوڵ دەدرێ لە بەرگەکانی داهاتووی

(مێژووی ئەدەبی کوردی) تیشکی زانستی بخرێتە سەر.

پێش ئەوەی کۆتایی بەم پێشەکییە بهێنم بەئەرکی سەر شانمی دەزانم لە ڕووی دڵسۆزی و وەفاوە سوپاسی بێ پایانی برای بەڕێزم بەدران ئەحمەد حەبیب بکەم، چونکە بەڕاستی هاندەرێکی کاریگەر بوو بۆ بەردەوامبوون و هێنانە دی ئەم پرۆژە فراوانە. هەروەها بەپێویستی دەزانم سوپاسی بێ سنوورم پێشکێش بە هاوڕێی بەڕێزم قەرەنی جەمیل بکەم بۆ ئەو وێنە هونەرییە بەنرخانەی، بەتایبەتی بۆ شاعیرانی ئەم بەرگە کێشای و کتێبەکەی پێ ڕەنگین کرد.

هەولێر: مەڵبەندی ڕووناکی　　　　مارف خەزنەدار



## بەشی یەکەم

## نەخشەی جوگرافی کوردستانی باشوور و میرنشینی بابان

### نەخشەی جوگرافی کوردستانی باشوور

خاکی کوردستان لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا بەشێوەیێکی گشتی کەوتبووە ناو دەوڵەتی عوسمانی و فارسەوە. لە ئەنجامی جەنگی چاڵدێران (١٥١٤) لەنێوان عوسمانی و فارس و سەرکەوتنی عوسمانییان کوردستان بوو بەدوو پارچە و بەدرێژایی ڕۆژگار لە پاش جەنگی چالدیرانەوە میرنشینی سەربەخۆ و نیوە سەربەخۆی کورد لە ناوەوە بوو لە هەردوو کوردستانی ژێر دەستی عوسمانی و ئێران.

بەهۆی سیاسەتی داگیرکردن کە هەردوو دەوڵەتە دەرەبەگەکە پێڕەوییان دەکرد ئاژاوە لەناو میرنشینەکانی کورددا لە ناوەوە بوو، بەتایبەتی لەناو ئەو میرنشینانەی لەسەر یا نزیکی سنووری سیاسی هەردوو دەوڵەتەکەدا بوون.

لە سەرەتای دروستبوونی کورد وەک نەتەوەیێک کولتووری نەتەوەیی لەسەر بنچینەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی لە پەرەسەندن و گۆڕاندا بووە. ئەگەر سەرنجێکی قووڵ بدەینە نەخشەی نەتەوایەتی کورد لە ڕووی زمان و دیالێکتەکانیەوە دەبینین دابەشبوونی دیالێکتەکان بەپێی دروستبوونی ناوچە جوگرافییەکان هەڵکەوتووە، واتە کە دەوترێ کوردستانی باشوور، ئەمە زۆربەی زۆری ئەو ناوچەیە دەگرێتەوە کە دیالێکتی کرمانجی خوارووی زمانی کوردی بەکار دێنن، وە ژمارەیێکی کەم بەدیالێکتەکانی دیکە قسە دەکەن وەک دیالێکتی گۆرانی.

بەم پێیە دەبینین کوردستانی باکوور کە ئێستاکە بەشی هەرە زۆری کەوتۆتە ناو دەوڵەتی تورکیاوە و هەندێ پارچەی کەوتۆتە عیراق و سووریا و ئێران و قەفقاسی ڕووسیا ناوچەی دیالێکتی کرمانجیی خوارووی زمانی کوردییە. وە کوردستانی باشوور کە ئێستاکە کەوتۆتە وڵاتی ئێران (باکووری ڕۆژئاوای ئێران تا دەوروبەری کرماشان) و عێراق (هەولێر، سلێمانی، بەشی زۆری کەرکووک) ناوچەی دیالێکتی کرمانجیی خوارووی زمانی کوردییە. ئەوەی شایانی باس بێ لەم ناوچەیەدا لە هەندێ شوێنا دیالێکتی گۆرانی لە ناوەوەیە. وە کوردستانی ڕۆژهەڵات کە ئێستاکە کەوتۆتە ڕۆژئاوای ئێران، ناوچەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی ڕۆژهەڵاتە، وەکو لوڕی و بەختیاری و دیالێکتە بچووکەکانیان، لە هەندێ شوێنا دیالێکتی گۆرانیش بەرچاو دەکەوێ.

کوردستانی باشوور ڕووداوێکی جوگرافییە لەسەر نەخشەی نەتەوەیی میللەتی کورد، لەم هەرێمەدا خەڵکی بەدیالێکتی کرمانجی خوارووی زمانی کوردی دەدوێن. ئەم زەمینەیە پارچە خاکێکی یەک سنوورییە ئێستاکە کەوتۆتە وڵاتی ئێران و عێراقەوە. لە سەدەی نۆزدەمدا ئەم خاکە دەورێکی باڵای بووە لە پێشخستن و گۆڕانی کولتووری نەتەوەی کورد، وەکو چۆن هەر لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ناوچەکانی

کوردستانی باکوور بەدیالێکتی کرمانجیی سەرووی زمانی کوردی ناوچەی پێشکەوتن و پەرەسەندنی کولتووری کورد بوون. پێش ئەمەش هەورامان و ناوچە گۆران نیشینەکان دەوری باڵایان هەبوو لە دروستبوونی ئەدەبی کوردی و پەرەسەندن و پێشکەوتنیدا. لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم، لە کوردستانی باشووردا، چوار میرنشینی کورد لە ناوەوە بوون:

١- میرنشینی ئەردەڵان (پایتەختی سنە) لە ساڵی ١٨٦٧ لە ئەنجامی هێرشی بەهێزی ناسرەدین شای قاجار ڕووخێنرا بەلابردنی دوا والی (میر) ئەمانوڵڵا خان و دانانی فەرهاد میرزای مامی وەکو فەرمانبەری ناوچەکە بەناوی ئەردەڵان یا کوردستانەوە.

٢- میرنشینی موکریان (پایتەختی سابڵاغ «مەهاباد»)، ئەویش هەر لە دەوروبەری فەرمانڕەوایی ناسرەدین شا ڕووخێنرا.

٣- میرنشینی سۆران (پایتەختی ڕواندز و هەریر) لە ساڵی ١٨٥٨ لە لایەن عوسمانییەکانەوە ڕووخێنرا بەلابردنی دوا میری ڕەسووڵ پاشا و ئەم ناوچەیە کەوتە ژێر فەرمانڕەوایی ڕاستەوخۆی دەسەڵاتی عوسمانی.

٤- میرنشینی بابان (پایتەختی سلێمانی) لە ساڵی ١٨٥٠ لە لایەن عوسمانییەکانەوە ڕووخێنرا.

ئەم میرنشینانە و گەلێ لە میرنشینەکانی تری کوردستانی باکوور و ڕۆژهەڵات سەرەتای دامەزراندنیان دەگەڕێتەوە سەدەکانی ناوەڕاست. ئەمانە لەسەر بنکەیێکی دەرەبەگی قەومی دامەزرا بوون، بەناوی کوردەوە فەرمانڕەواییان دەکرد، سیاسەتی ناوەوەیان بەگشتی چەوساندنەوەی جووتیار و ڕەنجبەری کورد بوو، وە بۆ پاراستنی چاکە و بەرژەوەندی چینایەتییان میرانی کورد ملیان بۆ یەکتری شۆڕ نەدەکرد، هەندێ جار لە ڕووی دەسەڵاتی تورک و عەجەمیش دەوەستان، بۆیە خاکی ئەم میرنشینانە بووبوونە گۆڕەپانی زۆرانبازی لە نێوان تورک و عەجەمدا، ئەمانە هەمیشە خەریکی دانانی پیلان بوون بەمەبەسی نانەوەی تەنگوچەڵەمە لە نێوان گەورە پیاوانی بنەماڵەی بەڕێوەبەر، لە پێناوی بێ هێزکردن و سووککردنیان بۆ ئەوەی بەسەریانا زاڵ بن، لەبەر ئەوە هەرگیز هێمنی لەسەر سنووری ئەم میرنشینانە نەبوو، ئەمانە هەموویان بووبوونە هۆی ئەوەی ئەم میرنشینە کوردانە یەک نەگرن، بۆیە لە ئەنجاما لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم ئێران توانی میرنشینەکانی ئەردەڵان و موکریان لەناو ببا و عوسمانیش هەردوو میرنشینەکانی سۆران و بابان بڕووخێنێ.

## میرنشینی بابان

زۆربەی خاکی بابان دەکەوێتە لیوای (پارێزگای) سلێمانی و کەرکووک لە کوردستانی عیراقی ئێستادا. جێگەی ئەم ناوچەیە بەم دەوروبەرە جوگرافییانە دیاری دەکرێ؛ لە ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵاتدا شارستانی سنە و سەقز لە ئوستانی پێنجەم (کوردستانی ئێران، ئەردەڵان). لە ڕۆژئاوادا دەشتی حەویجە لە کەرکووک. لە باکوور و باکووری ڕۆژئاوا لیوای هەولێر (سۆران)، لە باشووردا شاخی حمرین.



لەناو قەوارەی کوردستانی باشووردا، خاکی بابان دەکەوێتە لای باشووری ڕۆژئاوایەوە، میرنشینی بابانی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم لە شار و شارۆچکەکان، ئەمانە دەگرێتەوە: لە قەزاکانی لیوای سلێمانی، هەڵەبجە، پێنجوین، شارباژێڕ، پشدەر، چوارتا، بەرزنجە. قەزاکانی کەرکووک: چەمچەماڵ، کفری، تووزخورماتوو، حەویجە.

ناوچەی سلێمانی یەکێکە لە لانکەکانی شارستانی مرۆڤایەتی، لە ڕۆژگارێکی گەلێ کۆنەوە مەڵبەندی ژیانی ئادەمزاد بووە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، مێژوونووسی کورد محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ: (شاخی پیرەمەگروون ئەگەر بهاتایە زمان و ئەوی دیویە بۆی بگێڕاینایەوە، لە سەرگوزەشتی حەقیقیی ئەم وڵاتە زۆر باش حاڵی ئەبووین، بەڵام ئەمە تەمەننیی مەحاڵە...). لە کۆتایی ڕۆژانی سەدەی هەژدەمەوە ئەم ناوچەیە بوو بەنیشتمانی فەرمانڕەوایی بابانەکان و وشەی (بابان) بوو بەزاراوەیێکی نوێ بۆ ناوی ئەو شوێنە، لە پاشانا ناونرا سلێمانی. ئەوەی ڕاستی بێ بۆ یەکەمین جار وشەی (بابان)، لەم کاتە و لەم ناوچەیەدا سەری هەڵنەداوەتەوە، بەڵکو ناوی بنەماڵەی (بابان) دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست و لە ناوچەی سلێمانیش دەچێتە دەرەوە، وەکو شەرەفخانی بدلیسی لە شەرەفنامەدا باسی لێوە کردووە.

لە دوا ساڵانی سەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەم، ناوی بابان وەکو بنەماڵەیێک لە ناوچەی سلێمانی کەوتە ناوەوە. مێژووی پەیدابوونی ئەم بنەماڵەیە ئاسایی نییە و لەناو لاپەڕەکانی مێژووی کورددا هەندێ گیروگرفتی تێدایە. ئەو باس و خواسانەی لەم بابەتەوە دەگێڕڕێنەوە زیاتر لە ئەفسانە دەکەن لەوەی لە ڕاستیی مێژوو نزیک ببنەوە.

هەر چۆنێ بێ ناوی بابانەکانی ناوچەی سلێمانی بەفەقێ ئەحمەدی دارەشمانەوە بەستراوە، گۆیا لە دەوروبەری پشدەردا پەیدا بووە، بەڵام لەقەبی (بابان) و دامەزراندنی میرنشین لەم ناوچەیەدا بەڕاستی لە سلێمان بەبەی کوڕی فەقێ ئەحمەدەوە دەست پێ دەکا. یەکەمین هێرشی سلێمان بەبە ئەوە بوو کە بۆ سەر موتەسەریفی کەرکووک دلاوەر پاشای برد، لەم شەڕەدا موتەسەریف کوژرا، ڕێگە بۆ سلێمان بەبە خۆش بوو دەست بکا بەڕێکخستنی وڵات. لە لای ڕۆژهەڵاتیشەوە بەچاوێکی دووربین و ورد تەماشای ئەردەڵانییەکانی دەکرد و هەرگیز فەرامۆشی نەدەکردن تا لە ساڵی ١٦٩٤م هێرشی بردە سەریان و هەندێ جێگەی لێ داگیرکردن، بەڵام سلێمان خانی ئەردەڵان بەهۆی یارمەتی ئێرانەوە ئەو ناوچانەی وەرگرتەوە. لە لایێکی دیکەوە بابانەکان دەسەڵاتی عوسمانییان خستبووە گومان و مەترسییەوە، لەبەر ئەوە سوپایێکی گەورەیان ناردە سەر سلێمان بەبە و لە ساڵی ١٦٩٩م بەسەریدا زاڵ بوون.

دەسەڵاتی عوسمانییان لەم ناوچەیەدا زۆری نەخایاند، لە دەوروبەری فەرمانڕەوایی بەکر بەگی بابان دەسەڵاتی عوسمانییان لەم ناوچەیەدا لەناوچوو. بەکر بەگ هەوڵی فراوانکردنی سنووری وڵاتی دا، تا گەیشتە ئەوەی سەرەتای لە لای خواروو لە زێی سیروان (دیالە) دەست پێ بکا و دوایی لە لای سەروو بگاتە زێی بچووک (کۆیە)، لەم ماوەیەدا فەرمانڕەوایی بەهێز بوو و دەیتوانی بەسەربەرزی بەرامبەر بەئەردەڵانییەکان بوەستێ، ئەگەر دەستدرێژییان بکردایە، بەڵام چاوەنۆڕی ئەوە نەدەکرا، چونکە پێوەندییان لەگەڵ یەکتریدا خراپ نەبوو.

بەکر بەگ دەستی لە چاکسازی و ئاوەدانکردنەوەی وڵاتدا هەبوو، لەوانە کێڵگەی بەکرەجۆ لە سەرچنار و ئاوەدانکردنەوەی گوندی بەکراوە لە نزیک هەڵەبجە لە کردەوەکانی ئەو بوون. لە دوای مردنی بەکر بەگ (١٧٠٣م) خانە پاشا لە جێگەی دانیشت. ئەمە یەکێک بوو لە پاشا گەورەکانی بابان. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا میرنشینی ئەردەڵان داگیر کرا، ڕاستەوخۆ فەرمانڕەوایی خانە پاشا بەڕێوەی دەبرد، خالید پاشای براشی سەرداری میرنشینی بابان بوو، بەڵام لە ساڵی ١٧٣٠م کە نادر شا تەختی ئێرانی داگیر کرد، فەرمانڕەوایی بابان لە ئەردەڵانا کۆتایی هات.

لەو کاتەی نادر شا جەنگی بەرپا کرد لە دژی دەوڵەتی عوسمانی ئامانجی گەورەی ئەوە بوو وڵاتی بابان داگیر بکا کە هاوسێی نزیکی عوسمانییان بوو، بەڵام خالید پاشای بابان کە لە پاش خانە پاشا دەسەڵاتی گرتە دەستی خۆی لە ناوچەی سەردەشت ڕێگەی لە نادر شا گرت، بەڵام بێ سوود بوو نەیتوانی خۆی لە بەریدا بگرێ.

نادر شا سوودێکی گەورەی لە ناخۆشی و دوژمنایەتی نێوان ئەندامانی بنەماڵەی بابان وەرگرت. سەلیم پاشای بابانی ڕاکێشایە لای خۆی و بەهۆی ئەوەوە نێوەندەی میرنشینی لە قەڵاچوڵان داگیر کرد، هەر بەهۆی ئەویشەوە هەندێ لە میرەکانی بابان بەچاوێکی دڵسۆزییەوە تەماشای ئێرانیان دەکرد. هەرچی عوسمانییەکانیش بوون بەفەرمانداریی والی بەغدا ئەحمەد پاشا کەوتنە خۆ و بیروباوەڕی دەمارگیریی ئایینزایی (مەزهەبی)یان کردە بەڵگە و هەندێ لە مەلا و شێخەکانیان ڕاکێشایە لای خۆیان و لە ئەنجامدا لە ساڵی ١٧٤٧م بەسەر بابانیان دادا و لەم هێرشەدا سەرکەوتن و سلێمان پاشایان کردە میری بابان.

لەم ماوەیەدا ناکۆکی بنەماڵەیی زۆر توند و کاریگەر بوو لە نێوان میرەکانی باباندا، برا و ئامۆزا و خزمانی گرتبووەوە، لە ڕاستیشدا لەو ڕۆژگارەدا پاشایێکی بەدەسەڵاتی ئەوتۆ لە ناوەوە نەبوو شایانی ئەوە بێ هەموو پاشاکانی تر ڕێزی بگرن و سەری بۆ دانوێنن، تا بۆ یەکەمین جار ئەحمەد پاشا توانی دەسەڵات بگرێتە دەستی خۆی، بەڵام فەرمانڕەوایی ئەم پاشایە زۆری نەخایاند و ئیبراهیم پاشا لە شوێنی دانیشت.

ئیبراهیم پاشای بابان لە ساڵی ١٧٨٤م لە نزیک گوندی مڵکەندی بینای شاری سلێمانی تەواو کرد. لە گوندی قەڵاچوڵانەوە پایتەختی میرنشینی گواستەوە بۆ شاری تازە. ئەم شارە یادگارێکی گەلێ بەنرخی بابانەکان بوو بۆ نەتەوەی کورد.

عەبدولڕەحمان پاشای بابان جێگەیێکی دیاری هەبوو نەک تەنیا لە مێژووی سەردەمی دوایی فەرمانڕەوایی بابانەکان و ناوچەی سلێمانی، بەڵکو لە سەرانسەری مێژووی نەتەوەی کورددا. ئەم پاشا بەهێز و ژیرە لە ساڵی ١٧٨٩ تا کۆچی دوایی لە ساڵی ١٨١٣ شەش جار دەسەڵاتی میرنشینی لە دەست خزم و کەسوکاری خۆی دەرهێنا.

پاشاکانی بابان بەپیلانی عوسمانی و عەجەم هەڵدەخەڵەتان و بگرە و بەردە و ئاژاوە لەم ناوچەیەدا دەکەوتە ناوەوە و هەمیشە دەبوو بەهۆی بێ هێزی دەسەڵاتی میرنشین.



لەم بەینەدا عوسمانی و عەجەم بەهەموو هێزێکیانەوە هەوڵیان دەدا هەموو میرنشینەکانی کورد لەناو ببەن، سەرۆکە دڵسۆزەکانی کوردیش بێ وچان لە لایێک بەرهەڵستی دوژمنی ناوەوەیان دەکرد، ئەوانەی چاویان بڕیبووە تەختی پاشایەتی و لە لایێکی تریشەوە بەرامبەر هێرشی عوسمانی و عەجەم دەوەستان بۆ پارێزگاری سەربەخۆیی وڵات.

عەبدولڕەحمان پاشا لە ساڵانی ١٨٠٦-١٨٠٨ بەهەموو توانایەوە بەرهەڵستی هێرشی سوپای عوسمانی کردبوو، بەڵام لە وزەیدا نەبوو بەسەر دوژمنانیدا زاڵ بێ، ئەمانە پشتگیری دەوڵەتی عوسمانییان دەکرد، بەم جۆرە زیانی زۆریان بەمیرنشین دەگەیاند، بەڵام لە دەرەوەی میرنشین لە جێیێکی وەکو ڕواندز ڕاپەڕینێک دەستی پێ کرد بەفەرمانداریی مەحموود پاشای کوڕی عەبدولڕەحمان پاشا. سوپای ڕاپەڕینەکە لە توانایدا بوو شوێنە هەرە گرنگەکانی باکووری میزۆپۆتامیا داگیر بکا و شارانی گەورەی وەکو هەولێر و کەرکووک بگرێ.

سەرچاوە مێژووییەکان و گێڕانەوەی ناو خەڵکی کورد لە حیکایەت و بەیتی ئەدەبی میللی نەنووسراو (فۆلکلۆر) ئەوە دەگەیەنن عەبدولڕەحمان پاشا میرێکی بەهێز و لە ڕوو بووە، دەسەڵاتی بەسەر هەموو لایێکی وڵاتدا شکاوە، سەلیم ئاغا بۆ ڕۆژهەڵاتناس فرایزەری گێڕاوەتەوە: لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عەبدولڕەحمان پاشا، ئەگەر هەموو شت لە زێڕ بووایە کەس دەستی بۆ نەدەبرد. لەم سەری وڵاتەوە سەفەرت بکردایە بۆ ئەو سەری تووشی هیچ جۆرە گیروگرفتێک نەدەبووی، بەڵام ئێستاکە وەزع شێواوە بەهۆی ناکۆکی ئەم دوو برایە بۆ قۆزتنەوەی دەسەڵات. عەجەم ئەمەی بەهەل زانیوە بۆ داگیرکردنی وڵات. نەخۆشی و برسیەتی بڵاوبوونەتەوە خەڵکەکە لەناو دەبەن و دوژمن دەهێڵنەوە. ئێستا پاشای بابان ناتوانێ هیچ شتێک بکا، چونکە سەربازی نییە بۆ ئەوەی ئەم دز و جەردە و ڕێگرانە لەناو بەرێ.

لەدوای مردنی عەبدولڕەحمان پاشا، شەڕی بنەماڵەیی لەنێوان مەحموود پاشای کوڕی عەبدولڕەحمان پاشا و عەبدوڵڵا پاشای برای عەبدولڕەحمان پاشا دەست پێ دەکا. وەکو محەممەد ئەمین زەکی دەڵێ: لە ساڵی ١٨٢٣ جەنگی بنەماڵەیی بەشێوەیێکی وەختی کۆتایی پێ هات بەوەی مەحموود پاشا بوو بەمیری سلێمانی بۆ جاری سێیەم و عەبدوڵڵا پاشا کرا بەکارگێڕی کۆیە.

پاشای کورد لەگەڵ ئەوەی هەوڵیان دەدا سەربەخۆیی میرنشینەکەیان بپارێزن و سەر بۆ عوسمانی و عەجەم دانەنوێنن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆپەرستی و بەرژەوەندی کەسێتی بەسەریاندا زاڵ بوو، هەر کەسە هەوڵی دەدا ببێ بەخاوەن دەسەڵات. میرەکان خۆشیان هەستیان بەمە دەکرد، یەکێ لە میرەکانی بابان لە بابەت دواکەوتن و پەژمردەیی وڵاتەوە بەڕیچ دەڵێ: بەرچاو تەنگی لەنێوان میرەکانمان هۆی سەرەکی دواکەوتنی وڵاتی بابانە کە بێ گومان بەرەو نەمان دەیبا، ئەگەر ئەمە نەبووایە هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و عەجەم نەیان دەتوانی داگیرمان بکەن.

بەبێ پسانەوە شەڕوشۆڕ لەنێوان میرنشینی بابان و هاوسێکانیان لە ناوەوە بوو، لە ڕۆژهەڵاتدا ئەردەڵان، لە باکووری ڕۆژئاوادا سۆران، دەوڵەتی عوسمانی و عەجەم بۆ چاکەی خۆیان میرنشینە کوردەکانیان هان دەدا لە دژی یەکتری، هەروەها میرەکانیشیان هەڵدەخەڵەتاند بۆ ئەوەی ڕێز لە یەکتری

نەنێن و لە ڕووی یەکتریدا بوەستن لە پێناوی بێ هێزکردنی دەسەڵاتیان. نموونەی ئەم ئاژاوەیە لە فەرمانڕەوایی بابان دەتوانرێ لەم شانۆیەدا ببینرێ.

لەساڵی ١٨٢٧دا مەحموود پاشای بابان هێرشی بردە سەر هەریر، جەنگ گەیشتە پۆپە لەگەڵ محەمەد پاشا (میری کۆرە)ی میرنشینی سۆران، لەدوای کوشتارێکی زۆر مەحموود پاشا گەڕایەوە، تا ئەو خەریکی جەنگ بوو لەگەڵ سۆرانەکاندا، سلێمان پاشای برای بەسەر سلێمانی دادا و داگیری کرد و دەسەڵاتی لە دەست برا گەورەکەی دەرهێنا بۆ خۆی. مەحموود پاشا هانای بۆ میرەکانی (والییەکانی) ئەردەڵان برد، لە پاش شەڕ و کوشتارێکی زۆر سلێمان پاشا سەرکەوت.

سلێمان پاشا پیاوێکی هوشیار و زۆرزان بوو، فرایزەر دەڵێ: پاشا وەک پیاوێکی چاک و ڕۆشنبیرێکی شارەزا کەوتە بەرچاوم، بۆ کورد سەردارێکی خراپ نەبوو. گەلێ پرسیاری لێ کردم لە بابەت وەزعی ئەوروپا و پێوەندی دەوڵەتە گەورەکان بەیەکترییەوە، بەتایبەتی پێوەندی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئیمپراتۆریەتی ڕووس و فەرمانڕەوایی محەمەد عەلی پاشای میسر. دیار بوو شارەزاییێکی تەواوی لە هەڵسوکەوتی ئەمەریکا هەبوو لە ڕووی سیاسەتی نێو دەوڵەتییەوە.

لەپاش مردنی سلێمان پاشا (١٨٣٨) ئەحمەد پاشای کوڕە گەورەی لە جێگەی دانیشت. ئەم میرە یەکێک بوو لە میرە هەرە ژیر و زیرەکەکانی میرانی بابان. هەوڵێکی بێ وچانی دا بۆ دامەزراندنی سوپاییێکی بەهێز و ڕێک و ئۆردووگاییێکی تایبەتی لە قەراغ شاردا دروست کرد بۆ مەشقی عەسکەری، هەروەها بایەخێکی زۆری بەتیپی تۆپ و تۆپخانە دا، ئەمە بووە هۆی ئەوەی عوسمانی و عەجەم لێی بکەونە گومانەوە. ترسێکی زۆریان لە پرۆگرامەکانی ئەحمەد پاشا هەبوو. لە ڕاستیشدا ئەم پاشایە ئامادە بوو بچێتە جەنگەوە لەگەڵ عوسمانی و عەجەمدا، لەو ماوەیەدا هەست بەوە دەکرا ئەحمەد پاشا سەربەخۆیییێکی تەواوی ڕەخساندووە لەناو کۆمەڵی میرنشینی باباندا.

شێخ ڕەزا لە قەسیدە بەناوبانگەکەیدا دەڵێ:

لە بیرم دێ سلێمانی کە دارولمولکی بابان بوو
نە مەحکوومی عەجەم نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو

ئەم ئاژاوە و تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵایەتییە لە ناوچەی سلێمانی بەڕاستی دەسەڵاتی عوسمانی خستبووە مەترسییەوە، لەبەر ئەوە والی بەغدا نەجیب پاشا بەکوڵ هەوڵی دەدا میرنشینی بابان لەناو ببا، بۆ ئەم مەبەسە بەسوپاییێکی گەورەوە هێرشی بردە سەر سلێمانی، هێزی کورد نەیتوانی بەرامبەر بەهێزی عوسمانی خۆی بگرێ و لە ئەنجامدا سلێمانی داگیر کرا، ئەگەرچی جەنگاوەری کوردی بابانیش بەهەموو توانایان بەرگرییان لە شارە خۆشەویستەکەیان کرد گەلێ قوربانییان دا، وەکو لە شیعری شاعیرانی ئەو قۆناغەی سلێمانی دەردەکەوێ. لەدوای داگیرکردنی شاری سلێمانی ئەحمەد پاشا ناچار بوو ڕوو بکاتە ئێران، لە پاشانا بەدیلی ناردیانە ئەستەموڵ. کە سلێمانی داگیر کرا و کەوتە دەست سوڵتانی عوسمانی، ئەم دەسەڵاتە قازانجێکی زۆری کرد و سوودێکی فرەی لە بێ هێزی کورد بینی. دواکەوتن و نزمبوونی پلەی ئابووری و دارایی لەناو کۆمەڵ و برسیەتی و نەبوونی چەک و ناکۆکی لە نێوان میرەکانی



بنەماڵەی بابان و نەبوونی میرێکی بەتوانا هەموو ئەم دیاردانە بووبوونە هۆی ئەوەی عوسمانییەکان ناوی (بابان) بسڕنەوە. بەم جۆرە شاری سلێمانییان کرد بەقایمەقامییەت و عەبدوڵڵا پاشای برا بچووکی ئەحمەد پاشایان کرد بەقایمەقامی قەزای سلێمانی بەناوی دەسەڵاتی عوسمانییەوە. لە پاشانا حامیەییێکی سەربازی عوسمانییان لە ئۆردوگای سلێمان پاشا دانا. ئەم قایمقامە کوردە بۆ ماوەییێکی کەم فەرمانڕەوایی کرد.

لە ساڵی ١٨٥١ نامیق پاشای والی بەغدا عەبدوڵڵا پاشای قایمەقامی بانگ کردە بەغدا، لەوێ دەست بەکەلەپچە ناردیە ئەستەموڵ، لە شوێنی ئەودا میر میرانی عوسمانی ئیسماعیل پاشا لەسەر تەختی دوا میری بابان دانیشت. لەم لایەنەوە لۆنگریک ڕاست دەکا کە دەڵێ: بەم جۆرە ڕۆژی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی کوردی بابان لە کوردستاندا ئاوا بوو. ئەم بنەماڵەیە نزیکەی دوو سەد ساڵێک لەم ناوچە فراوانەدا دەسەڵاتێکی بەهێز و بەناو بوو، ئیتر ماوە خۆش بوو کار بکەوێتە دەست مووچەخۆری ترسنۆکی بەرتیلخۆر ئەوانەی دەکڕێن و دەفرۆشرێن، هەروەها قانوون لەسەر کاغەز بمێنێتەوە بەبێ ئەوەی بچێتە ناو پراکتیکەوە، سەرباری ئەم هەموو نالەبارییە چەوساندنەوەی خەڵکی ڕەشوڕووت و بێ دەسەڵات و باوبوونی زمانی تورکی نامۆ و نەبیستراو. سلێمانی لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە تا پاش جەنگی یەکەمی گێتی لە بن دەستی دەسەڵاتی عوسمانی مایەوە، لە پاشانا لە لایەن کۆلۆنیالیزمی بەریتانییەوە داگیر کرا، ئەوجا ڕاپەڕین و هەڵسانەکانی شێخ مەحموود و لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا وەکو بەشێک لە ویلایەتی مووسڵی کۆن بوو بەلیواییێک (موحافەزەییێک) لە عیراق.

یەکێ لە ڕووداوە گرنگەکانی مێژووی کورد لەم دەوروبەرەدا، ڕووداوی (دوازدە سوارەی مەریوان) بوو، ئەم دوازدە سوارەی بابانە لە قەڵای مەریوان سوپاییێکی گەورەی ئێرانیان شکاند. قارەمانیەتی ئەم دوازدە سوارەیە ڕەنگی لە ئەدەبی میللی (فۆلکلۆری) کوردی داوەتەوە، بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانی. وا بوو شاعیری نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم پیرەمێرد ئیلهامی لەم حیکایەتە میللییە وەرگرت و چیرۆکێکی لێ دروست کرد بەناوی (دوازدە سوارەی مەریوان).

## بەشی دووەم

## ژیانی ئابووری – کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری – خوێندەواری میرنشین لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا

### ژیانی ئابووری – کۆمەڵایەتی

ناوچەی سلێمانی وەکو ناوچەکانی تری کوردستانی ئێران و عوسمانی بەدرێژایی رۆژگار لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە بووبووە گۆڕەپانی شەڕوشۆڕ، لەنێوان سەرکردەکانی کورد خۆیانەوە ئینجا چاوچنۆکی دوو دەوڵەتە گەورەکە. ئەم ئاژاوە و شەڕوشۆڕە بێ دوایی بوو، وڵاتی خستبووە دواکەوتوویی و تەنگوچەڵەمەوە. یاسای دەرەبەگی گەورەی عوسمانی و عەجەم بەسەر یاسای دەرەبەگی بچووکی کوردا زاڵ بوو، ئەگەرچی میرنشینە کوردییەکان هەوڵیان دەدا بەرگری لە سەربەخۆیی و ئازادی وڵاتیان بکەن، بەڵام ئاژاوە و برسیەتی و هەژاری رێگەی لە هەمبوو جۆرە پێشکەوتن و گۆڕانێکی تەبیعی گرتبوو، لەم لایەنەوە گەڕۆکی ئینگلیز بیلی فرایزەر لە ساڵی ١٨٣٤ لە سلێمانی بووە، چاوی بەکەلاوەی خانووە قوڕینە رووخاوەکانی شار کەوتووە، سەری سوڕماوە لەوەی چاوی پێ کەوتووە، بەڵام توانای ئەوەی هەبووە وێنەی ئەدگاری پێشووی شاری سلێمانی بێنێتە سەر پەردەی خەیاڵی.

ئەمە لە ساڵی ١٨٣٤م، بەڵام لە ساڵی ١٨٢٠م کە کلۆدیۆس ریچ لە سلێمانی دەبێ هەمووی ٣٦ ساڵ بەسەر دروستکردنی شار تێپەڕی بوو، کەچی ریچ دەڵێ: کە قسەم لەگەڵ مەحمود پاشای بابان کرد لە بابەت خانووە رووخاوەکانی شاری سلێمانییەوە دەستبەجێ ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا و وتی: بێ گومان تۆ باوەڕ بەقسەکانی من دەکەی، ئێمە ئەگەر بزانین ماوەمان بۆ دەڕەخسێ بەئاسوودەیی لە نیشتمانی خۆماندا بژین دەتوانین خانووبەرەی یەکجار جوان دروست بکەین و ئەوەی رووخاوە جوانتر بینای بکەینەوە. لای ئێمە ئەگەر میرێک بگۆڕێ و میرێکی دیکە لە جێی دابنیشێ لە ئەندامانی بنەماڵەی بابان، میری تازە دەستە و دایەرە و پیاوانی خۆی دێنێ، ئێمە دەربەدەر دەکەن و ئەوان دەبنە خاوەن ماڵ، ئەم گۆڕانکارییە دەبێتە هۆی کارەسات و پەژمردەیی و هەژاری بۆ خەڵکی ئەم وڵاتە.

لە کۆمەڵی سلێمانی دوو چینی سەرەکی بەدی دەکرا لە رووی دەسەڵات و داراییەوە. یەکەمیان چینی سەرەوە لە دەرەبەگ و میر و پاشا و بەگ و کاربەدەستان و بازرگانان و دەست رۆیشتووە دەوڵەمەندەکانی ناو شار؛ دووەمیان چینی ژێرەوە بریتی بوو لە جووتیار و پاڵە و هەژار و بێ کارانی شار، ئەمانە جگە لە کار و کاسبی خۆیان هێزی چەکداری میرنشینی بوون. خەباتی چینایەتی لەنێوان ئەم دوو چینەدا دەتوانین بڵێین نەبوو، چونکە دەرەبەگێکی بەهێزتر لە دەرەبەگی کورد کە دەسەڵاتی عوسمانی و عەجەم بوون، بێ وچان هەمیشە داویان دەنایەوە کۆمەڵی کورد بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە و سوود لە خاکی ئەو وڵاتە



ببینن، لەبەر ئەوە دەبینین جووتیاری کورد بۆ دەرەبەگی کورد دەجەنگا، بەناوی سەربەخۆیی دەسەڵاتی میری کورد بۆ ئەوەی سەرانە نەدا بەدەرەبەگی عوسمانی و عەجەم، چونکە ئەوان ئەگەر وڵاتیان داگیر بکردایە بێ گومان دەرەبەگی کورد سەرانەی خۆی هەر وەردەگرت.

شەڕوشۆڕی ناوەوە گەلێ زیانی بەجووتیار و چینی خوارەوە دەگەیاند، زۆرجار وا رێک دەکەوت بۆ ماوەیێکی درێژ عوسمانی یا عەجەم وڵاتیان داگیر دەکرد، ئیتر جووتیاری کورد ناچار دەبوو سەرانە بەداگیرکەر و میرەکانی خۆی بدا، ئەگەر سەرانەکە لە رێگەی میری کوردەوە بدرایە دوو داگیرکەرەکە، ئەو کاتە دەبوو سەرانەکە زۆر بێ بۆ ئەوەی لە بەشی ئاغای کورد کەم نەبێتەوە.

جووتیاری کورد لە گوندەکاندا خەریکی کشتوکاڵ بوو، ناوچەکانی رۆژئاوای سلێمانی دانەوێڵەی زۆری هەبوو لە گەنم و جۆ و برنج. لەو کاتەی کە کلۆدیۆس ریچ لە کەرکووکەوە بەرەو سلێمانی دەکەوێتە رێ، لە بابەت کشتوکاڵەوە دەڵێ: لەدوای ئەوەی دەربەندی بازیانمان بەجێ هێشت، تاسلووجەش کەوتە پشتمانەوە، کە لە سەرچنار نزیک بووینەوە لە رێگە تووشی پەرێزی گەنم و جۆ و کێڵگەی مەرەزە بووین، هەروەها شیوی تانجەرۆ تا سیروان (دیالە) سەوز بوو، لۆکە و تووتنیش لەو ناوەدا شین دەبوو.

کەلوپەلی هێنانەدی بەرهەمی کشتوکاڵی جووتیاری کورد بریتی بوو لە گاسن و هەوجار و داس و هەندێ وردە ئامێری دیکە لەگەڵ ئاژەڵی جووتکردن. هەندێ لە جووتیاران بەشێ لەم ئامێرانەیان نەبوو، ناچار دەبوون بەکرێ لە جووتیارانی تر وەریان دەگرت. بەدرێژایی بەهار و هاوین خەریکی ئیش دەبوون و بۆ ئەوەی زەخیرەی زستان دابین بکەن، لەدوای دەرکردنی سەرانە و باج و سەلەم شتێکی ئەوتۆیان بۆ نەدەمایەوە کە بەتەواوی بتوانن زیندەگانی پێ بکەن.

لەم ناوچەیەدا جگە لە دانەوێڵە، بەرهەمی میوە و سەوزە و شینایی لەو شوێنانەی ئاوی هەبوو گەلێ زۆر بوو و بازارێکی بەهەرمێنی هەبوو، بۆ بەڵگە سلێمانی هەموو جۆرە میوەجاتێکی بۆ کەرکووک رەوانە دەکرد، ئەم شارە بازارێکی گرنگ بوو میوەجاتی ناوچە کشتوکاڵییەکانی سلێمانی، ئاشکرایە کە گوێزی هەورامانی سلێمانی بەزۆری و چاکی ناوی دەرکردبوو، جگە لە کەرکووک بەرهەمی کشتوکاڵ و باغ و باغاتی سلێمانی دەگەیشتە مووسڵ، هەروەها هەنگوینی چاکی کوردستانیش بازارێکی گرنگی لە دەرەوە هەبوو.

باغ و باغاتی میوە لە ناوچەی سلێمانی، بەزۆری موڵکی میرەکانی بابان بوون، جووتیار و کرێکاری کشتوکاڵی تایبەتییان هەبوو لەو باغانەدا کاریان دەکرد. باغی میوە لە هەموو ئاقاری ناوچەکانی سلێمانی هەبوو، تا لە دەوروبەری شاریش دەبینرا. لە لای باشووری شاری ئەو باغەی بەناوی (چوارباغ)ەوە بوو، یەکێک بوو لە باغە گەورەکانی میرانی بابان. ئەم چوارباغە لە دوای رووخانی میرنشینی بابان هێشتا هەر مابوو، بەڵام لەپاشانا لەناوچوو، لەو کاتەی کە شاری سلێمانی فراوانتر بوو، ئیتر جێگەی چوارباغ بوو بەخانووبەرە، گەڕەکەکە تا ئێستا بەناوی گەڕەکی چوارباغەوەیە.

کێڵگە گەورەکانی دیکەی لۆکە و تووتن و مەرەزەی برنج بەهەموو لایێکی وڵاتدا بڵاو بووبوونەوە، وەکو کێڵگەی بەناوبانگی سەرچنار لە موڵکەکانی یونس بەگ بوو و مەحموود پاشای بابان پێی بەخشی

بوو. جووتیاریش تا ڕادەیێک زەوی خۆی هەبوو، بەڵام زۆر کەم بوو، ئەمەش دیارە تەنیا لە دێهاتەکاندا.

زستانان بازرگانەکانی ناو شاری سلێمانی هەتا هی دەرەوەی ئەویش وەکو کەرکووک بەناو جووتیارە هەژارەکانا دەگەڕان، بەسەلەم پارە یا شتومەکی پێویستیان دەدانێ، بەرامبەر بەمە لە بەرهەمی داهاتوو شتێکی زۆریان لێ دەسەندن، لەپاش قەرز دانەوە و سەرانە شتێکی وایان بۆ نەدەمایەوە.

لە لایەن پیشەسازییەوە، دیاردەی هەرە گرنگ لە شاری سلێمانی هێنانە بەرهەمی سابوون بوو، تا ئێستاش لە شاردا گەڕەکی سابوونکەران ماوە. سابوونکەران ئەو گەڕەکەیە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا لە هەر ماڵێکا کارخانەیێکی سابوون هەبوو، ئەم کارخانانە تایبەتی بوون بەماڵەکان. بەتێکڕایی شاری سلێمانی ساڵی (٥٠٠) تەن سابوونی دەهێنایە بەرهەم، وە بازرگانییێکی فراوان و بەهەرمێنی هەبوو، بۆ بەغدا و کەرکووک و مووسڵ و سنە و سەقز و شوێنی دیکە لە وڵاتانی عوسمانی و عەجەم دەنێررا، ساڵی نزیکەی ١٥ تا ٢٠ کاروان سابوون لە سلێمانییەوە دەردەچوو، هەر کاروانەی ٩٠ تا ١٠٠ وڵاغی هەبوو.

بەرهەمی ماڵەکان لە سابوون لە لایەن بازرگانەکانەوە دەکڕا و هەمووی کۆ دەکرایەوە، ئینجا بەکاروان بۆ دەرەوە دەنێررا، لە دوای فرۆشتنی بەپارەکەی شەکر و چاو و قاوە و پێڵاو و مس و ئاوریشمیان دەکڕی و هەر بەو کاروانانە دەیانهێنایەوە بۆ شار. لە شارا پێنج کاروانسەرا هەبوو ئەمانە خان و ئوتێل بوون بۆ کاروانچییە بێگانەکان ئەوانەی لە دەرەوەی شارەوە کوتاڵ و ماڵی بازرگانیان دەهێنا بۆ دانیشتووانی شار و ناوچەکە. بێ گومان بوونی پێنج کاروانسەرا لە شارا فراوانی و گەورەیی ناوچەکەی پیشان دەدا. بەزۆری کاروانچییانی بێگانە کاروانیان بەباری برنج و هەنگوین و مازوو و کەتیرە و گەزۆ و بنێشتە تاڵ و شتی دیکە بار دەکرد لەو کاتەی کە دەگەڕانەوە وڵاتی خۆیان.

لە ناوچەی سلێمانی وەکو ناوچەکانی تری کوردستان بۆ بەکارهێنانی ڕۆژانە هەندێ بەرهەمی پیشەسازی دروست دەکرا، وەکو قاپوقاجاغی ناوماڵ و کەلوپەلی نان دروستکردن، قوماش بۆ جلوبەرگ و نوێن، فەرش و بەڕە و لباد بۆ ڕاخستن. ئەم کارگانە بچووک بوون، بەتەنیا یەکێک بەڕێوەی دەبرد، بەزۆری کارگەکەی لە ماڵەوە یا لە دوکانێکی تایبەتیدا دەبوو، شاگردێکی منداڵ یا کوڕێکی وەستا خۆی یارمەتی دەدا.

پیشەسازی هونەری سووک و ورد تا ڕادەیێک پێشکەوتوو بوو، وەکو چەقۆ و جۆرەکانی و ئامێری تری برین، تا ئێستاش دێی تەوێڵە لەم لایەنەوە ناوبانگی دەرکردووە. هەروەها دروستکردنی خەنجەری کوردی. چەخماغسازانی سلێمانی تفەنگ و دەمانچە و شیریشیان دروست دەکرد، بەڵام بەڕادەیێکی وا نەبوو بەشی میرنشین بکا، ئەوەی بەبێ پشوودان لە ناوەوە خەریکی خۆکوژی و لە دەرەوە لە دژی عوسمانی و عەجەم لە جەنگدا بوو.

بەرهەمی پیشەسازییە بەرتەسکەکە تا ڕادەیێک بەشی دەکرد و پێویستییەکانی ناوەوەی دابین دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە دەرەوە ماڵی عەتاری و قوماش و کەلوپەلی چایی، سەماوەر و قۆری و ئیستیکانی بۆ دەهات. جگە لەمە ناوچەی سلێمانی دەیتوانی گۆشت و مەڕوماڵات بدا بەهەموو



هاوسێکانی کورد. مەڕوماڵاتی کوردستان دەگەیشتە بەغدا و ئەستەمووڵ و وڵاتی شام. لەو وڵاتانەوە ئاوریشم و قوماش و بەردی بەنرخ و بۆیاغ و شەکر و گەلێ ماڵی بازرگانی دیکەی بۆ دەهات.

بەم جۆرە لەم زانیارییانەوە ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ تا پلەیێک پێوەندی ئابووری لە نێوان کورد و هاوسێکانیدا لەناوەوە بووە. دەوڵەمەندی خاکی کوردستان هانی دوو دەوڵەتە چلێسەکانی عوسمانی و عەجەمی داوە هەمیشە چاو ببڕنە ئەو خاکە پیرۆزەی بەرەکەتێ لێ دەچۆڕێتەوە. ئەگەر ئەم وەزعە ناهەموارە نەبووایە زرووفێکی کۆمەڵایەتی – ئابووری و هوشیاری سیاسی و کوردایەتی یاریدەی ئەوەی دەدا ئەم ناوچەیە سەربەخۆ بێ.

## ژیانی ڕۆشنبیری – خوێندەواری

یەکەمین مەڵبەندی خوێندەواری لەناو نەتەوە موسوڵمانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا مزگەوت بوو، خوێندن لەو دەسگایەدا بەشێوەیێکی گشتی بەزمانی عەرەبی و لە بابەت زانستییە عەرەبی و ئایینییەکانی ئیسلامییەوە بوو. لە کوردستان و وڵاتە ئیسلامییەکانی دیکەدا مزگەوت وەک جێگە و نێوەندێک بۆ مەبەسی پەرستن و عیبادەت بینا دەکرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر مزگەوت بوو ئەو خوێندەوارانەی پێ دەگەیاند کە بایەخیان بەکولتووری نەتەوەیی خۆیان دەدا، ئەوە مەرج نەبوو هەر کەسێکی لە حوجرە بیخوێندایە دەبوو ببێ بەمەلا، بۆیە دەبینین هەر مەبەسی عیبادەت و خوێندنی زمانی عەرەبی و زانستییە ئیسلامییەکان بوو دەیبرد بۆ ئامانجێکی دیکە ئەویش پێگەیاندنی کەسی خوێندەوار بوو.

بەڕاستی دەتوانین پایەی خوێندەواری لە هەر وڵاتێک لە دەورانی پێش سەدەی بیستەم بەپێی زۆری و کەمی مزگەوت بەراوورد بکەین، هەر وەکو لە سەردەمی ئێستاماندا قوتابخانە نیشانەی خوێندەوارییە و پێشکەوتنی هەر کۆمەڵێکی ئادەمزاد بەژمارەی قوتابخانە بەراوورد دەکرێ.

لە شاری سلێمانیدا گەلێ لە یادگاری بەنرخی پاشاکانی بابان تا ئێستا ماونەتەوە، ئەو یادگارانە لەو مزگەوتانە دەبینرێن کە دروستیان کردوون. هەر لەو مزگەوتانەدا گەلێ شاعیری کورد پێگەیشتوون، ئەمەش وەنەبێ تەنیا لە شار بوو بێ، بەڵکو لە هەموو ناوچەکانی وڵاتی سلێمانی. مزگەوتەکانی شار و ناوچە لە لایەن پاشاکانی بابانەوە سەرپەرشتی دەکران و لە خەزێنەی میرنشین هەرچی پێویست بووایە پێیان دەبەخشرا. ئێمە لەم ماوەیەدا باس لە شیعر و ئەدەب ناکەین، چونکە ئەم کتێبە تەنیا بۆ ئەم مەبەسە تەرخان کراوە.

شاری سلێمانی یەکێکە لەو ئاوەدانییانەی کوردستان، خەڵکەکەی بەهەوەس و چاو بەبزە و پێکەنینن، حەز بەبەزم و ڕەزم و ئاهەنگ و گۆرانی و مۆسیقا و ڕابواردن دەکەن. گەلێ ئاوازی شیرین و گۆرانیی میللی سەر زاری کوردەواری لەوێ سەری هەڵداوە. قسەی نەستەقێک لەناو کۆمەڵی کورددا هەیە، دەڵێ: (گۆرانی لە سابلاغ (مەهاباد) لە دایک دەبێ و لە سلێمانی پێ دەگا). پاشاکانی بابان بایەخێکی زۆریان بەگۆرانی و مۆسیقا دەدا و بەچاوێکی گرنگ تەماشایان دەکرد، لە دیوەخانی خۆیاندا



لاپەڕەییەک لە دەسنووسی (الشرح الشمسیة فی علم المنطق) بەدەست و قەڵەمی کەسێکی کورد مستەفا کوڕی ئەحمەد لەناوچەی ئالان لە رۆژی پێنج شەممەی ٦ی شەوالی ١٢٨٣ی هیجری (بەرامبەر بە ٦ی شوباتی ١٨٦٧ مەسیحی) لە نووسینی دەسنووسەکە بۆتەوە.



کۆڕی مۆسیقا و گۆرانییان دەبەست و پیاو ماقووڵیان بانگ دەکرد بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگی گۆرانی و مۆسیقا، ئامێری مۆسیقا لەو سەردەمەدا بریتی بوو لە شمشاڵ، بلوێر، نای، دەهۆڵ، زوڕنا، دەف، تەپڵ و دووزەلە. لە ئاهەنگێکدا کلۆدیۆس ڕیچ ئامادە بووبوو، لەم لایەنەوە دەڵێ، ئەو گۆرانییانەی لەو ئاهەنگەدا بیستبوونی وشە و ئاوازی هەموویان وێنەی غەم و نالەباری و جیگەر سووتان بوون. هەروەها شاعیری نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم مستەفا بەگی کوردی لە قەسیدەیێکیدا ناوی هەندێ ئاوازی مۆسیقا و گۆرانیبێژەکان دەبا. هونەری گۆرانی و مۆسیقای میللی لەبەر ئەوەی خزمەت نەکراوە هەر بەشێوە فۆلکلۆری و خۆڕسکییەکەی خۆی ماوەتەوە.

هونەری شانۆگەری لە سلێمانی بەشێوەیێکی سەرەتایی لە ناوەوە بوو، بێ گومان ئەمەش پێشکەوتنێک بوو بەرامبەر ئەوەی لەناو کۆمەڵی نەتەوە موسوڵمانەکاندا هەندێ لە هونەرە جوانەکان ڕێیان لێ دەگیرا و قەدەغە دەکران.

لە بەهاراندا لە سلێمانی هەر هەفتەی سنفێک لە سنفەکانی بازاڕی شار بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک سەیرانی دەرەوەی شاریان دەکرد، وەکو سنفی بازرگانان و ئاسنگەران و سابوونکەران... هتد. ئەم تاقمانە یاساییێکی وەختییان بۆ ئەم چەند ڕۆژە دادەنا. یەکێک دەبوو بەشا و جلی شایان لەبەر دەکرد، وەزیر و کاربەدەستانیان بۆ دادەنا، ئەوانیش بەجلوبەرگی تایبەتی وەزیرییەوە. بۆ هەر ڕۆژێکی سەیران پرۆگرامێکیان دادەنا. تاوانکردن لە کۆمەڵەدا ڕووی دەدا، دادگایان بۆ دەبەست. شانۆی شایی و زەماوەند و ژنهێنان پیشان دەدرا، جگە لەوە ڕمبازی و تەراتێن و سوارچاکی و وەرزین و یارییە فۆلکلۆرییەکان جێگەی دیاری خۆیان هەبوو.

وەرزینە جۆراوجۆرەکان، بەتایبەتی زۆرخانە پێشکەوتوو بوو، بۆ ئەم مەبەسە عومەر ئاغا ساڵۆنێکی بۆ مەبەسی زۆرخانە دروست کردبوو. کلۆدیۆس ڕیچ دەڵێ: ئەو مەشقە نایابانەی لەوێ دەکرا، لەو مەشقانە کەمتر نەبوون کە لە شیراز دەکران.

جگە لە زۆرخانە شیربازی و خەنجەر وەشاندن و تاقیکردنەوەی هێز و توانای لەش و ماسوولکەکان و زۆرانبازی لە هونەرەکانی وەرزین بوون.

هونەری دەرهێنانی دەسنووس لە ناوچەی سلێمانی لەکن فەقێ و مەلاکان پێشکەوتوو بوو، لێرەدا مەبەس لە دەسنووس تۆمارکردنی زانستییەکانی زمانی عەرەبی و ئایینی ئیسلامی نییە کە زاناکانی کورد لەم لایەنەوە کاری زانستی بەنرخیان هەیە، بەڵکو دەرهێنانی هونەری دەسنووسەکەیە، بەتایبەتی لەو کتێبانەی ناوەڕۆکەکانیان چەند پەراوێزێکیان هەیە، هەر پەراوێزەی بریتییە لە کتێبێکی سەربەخۆ، لە ئەنجامدا هەموو لاپەڕەییێکی دەسنووسەکە بەجۆرێک دابەش دەکرێ جێی هەرسێ یا چوار کتێبەکەی لێ ببێتەوە. ئیتر داهێنانی هونەری بەرزی نووسەری دەسنووسەکە لە ئەندازیاریی بیناسازییەوە مۆزاییکێکی جوانی هونەراوی دەخاتە ڕوو، ئەوەی زیاتریش ڕەونەق بەدەسنووسەکە دەدا خەتخۆشی خاوەنەکەیەتی. لەم ماوەیەدا نموونەییێک لەم هونەرە جوانە بڵاو دەکەینەوە.

## بەشی سێیەم

# بزووتنەوەی سۆفیزم لە میرنشینی باباندا

### سۆفیزم چییە؟

زانستی فەلسەفە لە سەرەتادا بۆ ئەوە پەیدا بووە بەشوێن کردگارا بگەڕێ تا دەیدۆزێتەوە، ئەمە کارێکی عەقڵی و لۆجیکییە، بەڵام بێ گومان ئەگەر سۆفیزم لەگەڵ زانستی فەلسەفە سەری هەڵنەدا بێ لە دوای ئەو پەیدا بووە و بەهیچ جۆرێ پێش ئەو نەکەوتووە.

ئەگەر فەلسەفە لەگەڵ عەقڵ و لۆجیک قسە بکا لەو کاتەی لە کردگار دەگەڕێ، سۆفیزم بەدوای خەیاڵ دەکەوێ بەدڵ و بەگیان لە کردگار نزیک دەبێتەوە لەدوای بڕینی چەند قۆناغێک بەخەون، لەدوا قۆناغدا دەگاتە کردگار و تێکەڵی دەبێ و دەبن بەیەک.

مەسەلەی دۆزینەوەی گیانی کردگار لە قاڵبێکی مەتریالیدا کۆنە، لە هەندێ لە ئایینە ئاسمانییەکانی وەکو مەسیحی بەدی دەکرێ، هەروەها لە هەندێ لە ئایینەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتدا وەکو ئایینی هیندۆس و زەردەشتی و مانەوەی و هەندێکی لای خۆمان وەکو ئێزدی و ئەهلی هەقی یارسان.

سۆفیزم لەدوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بەئاشکرا لای یارسانانی کورد ئاشکرا بوو، لای ئەوان یەکێتی کردگار و ئادەمزاد بوو. لێرەدا ئەم جۆرە سۆفیزمە بوو بەئایین، بەناوی ئایینی ئەهلی هەقی یارسان.

لەناو کۆمەڵی عەرەب لەدوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، هەر لە دەوروبەری سەردەمی پێغەمبەرەوە دیاردەی (زوهد) لە کۆمەڵی ئیسلامیدا پەیدا بوو، ئەم بزووتنەوەیە ڕێی خۆش کرد بۆ سۆفیزم وەک ئیدیۆلۆجییەتێکی تیۆری، لەو کاتەی لە تیۆرییەوە بوو بەپراکتیک لەگەڵ پراکتیککردنی شەریعەتی ئیسلام لە لایەن دەستە و دایەرەی خەلیفەکانەوە لەدوای ڕاشیدین و ئومەوی تا سەردەمی فەرمانڕەوایی عەباسییەکان لە بەغدا وەک بزووتنەوەیێکی فیکری و ئیدیۆلۆجی لەناو کۆمەڵدا بڵاو بووەوە.

ئەوەی ئاشکرا و زانراوبێ ئەوەیە دۆزینەوەی کردگار مەبەسی سۆفییەکان بوو، بەڵام ئەوەی نهێنی و نەزانراو ئەوە بوو سۆفیزم شۆرشێک بوو لە دژی فەرمانڕەوایی بیرۆکراتی و تۆتالیتاری خەلیفەی بەغدا لەسەر بنچینەی ئەوەی شەریعەت بڕیاری کردگاری دەستنیشان کردووە لە ئەزەلەوە تا ئەبەد، بەڵام سۆفیزم باوەڕی بەتازەکردنەوە و داهێنان هەبوو، لەبەر ئەوە وەک ڕێبازێکی فەلسەفی کەوتە ناوەوە.

خەلیفە و لایەنگرانی شەریعەت واتە مەلا و زانایانی ئایین کە دەمڕاستی خەلیفە بوون دەستیان بەبەربەرەکانییێکی ئەوتۆی سۆفیزمی ئیسلامی کرد تا گەیشتە ئەوەی سۆفییەکان بکوژن و پێستیان بگروون و سەریان لە دەروازەی شاردا هەڵواسن، ئەمە بووە هۆی ئەوەی سۆفییە گەورەکان ڕێکخراویان



(تەریقەتیان) بکەن بەنهێنی.

سۆفیزم وەک بزووتنەوەیێکی ئیدیۆلۆجی پراکتیکی دوای ئەوەی بەرهەمێکی ئەدەبی بەرزی عالەمی هێنایە کایەوە لە جموجۆڵی کەوت و وەک تیۆرییێک لەناو لاپەڕەکانی کتێب مایەوە. ئەمە ماوەیێکی لەبار بوو بۆ خەلیفە و کاربەدەست و مەلاکانی پارێزەری شەریعەت بزووتنەوەکە بکەن بەداردەست و لەگەڵ شەریعەت بیگونجێنن، کەچی سۆفیزم (تەریقەت) لەگەڵ (شەریعەت) لە حەقیقەتدا دوو شتی جیاوازن. بەم جۆرە ئەم دوو شتەی پێچەوانەی یەکتری بوون، تێکەڵ بەیەکتری کران. زۆر ئاسایی بوو پارێزەری ئایینی ئیسلام (مەلا) ببێ بە(شێخ)یش، واتە مەلایەتی وەک ڕێبەری شەریعەت و شێخیەتی وەک ڕێبەری تەریقەت لە یەک کەس کۆبووەوە کە مەلایە.

ئێمە ئەم جۆرە سۆفیزمەمان ناو ناوە (دەروێشیزم)، ئەمە لایەنی ڕەشبینی (سەلبی) سۆفیزم دەخاتە پراکتیکەوە، لە ڕێکخراوی جیاوازدا خۆی پیشان دەدا، بەناوی ئەو شێخانەی بەرنامەیان داناوە بۆ ڕێکخراوەکانیان، وەکو تەریقەتەکانی ریفاعی، خەلوەتی، شازلی، قادری، نەقشبەندی... هتد.

ئەم دەروێشیزمە بوو بەداردەست لە لای دەسەڵاتی هەموو ئەو دەوڵەتانەی بەناوی ئیسلامەوە فەرمانڕەواییان کردووە لە ڕۆژگارانی خەلافەتی عەباسییەوە تا عوسمانی و سەفەوییەکان و تا ئێستاش باوی ماوە. دەسەڵاتدارانی وڵاتە موسوڵمانەکان بۆ بەرژەوەندی کاربەدەستان و چینەکانی سەرەوە بەکاری دێنن. ئەم بەکارهێنانە موتلەق نییە، بەکەسێتی شێخی تەریقەتەکە (سەرۆکی ڕێکخراوەکە) دەگۆڕێ. لای ئێمە لە کوردستان پێویستە هەڵسوکەوتی هەر تەریقەتێک لە سەردەمێکی دیاریکراودا لێی بکۆڵرێتەوە و بڕیاری لەسەر بدرێ.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم ڕێکخراوی سۆفیزم بەشێوەی دەروێشیزم لە سلێمانی پەیدا بوو. بێ گومان پێش ئەو ڕۆژگارە سۆفی لە کوردستاندا بووە، وەکو لە بەرهەمی شاعیرانی کوردی پێش سەدەی نۆزدەم دەردەکەوێ، بەڵام ڕێکخراویان نەبووە، لەوانەیە شێخێک باوەڕی بەتەریقەتێکی سۆفیزمی بووبێ و چەند مرید و دەروێشێک لە دەوری کۆبووبنەوە، یا مەلایێکی کورد دوور بەدووری خۆی بەدەروێشی یەکێ لە شێخەکانی دەرەوەی کوردستان زانیبێ، بەڵام وەک لە سەرەوە ڕوونمان کردەوە بزووتنەوەی دەروێشیزم وەک ڕێکخراوێک لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا بەناوی تەریقەتی قادری و تەریقەتی نەقشبەندی لە سلێمانی دروست بوو.

### تەریقەتی قادری

کە دەبیەین تەریقەتی قادری هەموو ڕۆژهەڵاتی گۆی زەوی گرتۆتەوە، پێویستە شێخ عەبدولقادری گەیلانی بناسین چونکە ئەو تەریقەتەکەی داهێناوە، بۆ بڵاوبوونەوەشی لە ناوچەی سلێمانی و لە پاشانا لە هەموو کوردستاندا پێویستە ئاگاداری بەسەرهاتی شێخ مارفی نۆدێ بین.

دامەزرێنەری تەریقەتی قادری ناوی عەبدولقادری کوڕی ساڵحی کوڕی محیەدینە، لە ساڵی ۱۰۷۷م لە گوندی نایف لە ناوچەی گەیلان لە باشووری زەریای قەزوین لەدایک بووە و بەنەژاد بنەماڵەی سەر

بەیەکێ لە میللەتانی ئێران بووە، لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا لە ساڵی ١٠٩٥م بۆ خوێندن ڕووی کردۆتە بەغدا، هەموو قۆناغەکانی خوێندنی حوجرەی تەواو کردووە، لە دواییدا ژنی هێناوە و ئینجا چووە بۆ حەج.

لە ساڵی ١١٣٠م تەریقەتی سۆفیزمی لە ئەبولخەیر محەمەد وەرگرتووە و شێخەکەی نازناوی (بازی ڕەش) (الباز الأشهب)ی پێ بەخشیوە. لەدوای ئەوە دەستی کردووە بەوەعز و ئیرشاد. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گوێگرانی بەژمارە زۆرتر دەبوون، ڕەمزی دیاری تەریقەتەکەی لەبەرکردنی جلی شڕی کۆنە بوو، لەبەر ئەوە دەروێشەکانی بە(خەرقەپۆش) ناسرابوون. نێوەندی ئیرشاد و وەعزی سۆفیزم و شەریعەتی شێخ عەبدولقادر لە تەکیەیێک بوو لە دەرەوەی شار، تا لە ساڵی ١١٣٣م تەکیەیێکی بۆ بینا کرا خۆی بەڕێوەی دەبرد و لە ڕۆژانی هەینی و ئێوارانی دووشەموو خوتبە و وەعزی بۆ خەڵکی دەدا و لە ڕۆژانی یەکشەمووانیش لە مزگەوت خەریکی ئیرشاد دەبوو.

هەندێ لە قوتابی و مریدانی شێخ عەبدولقادر گەیشتنە پلەی وەزیری دەوڵەت و والیی ویلایەت، لەناو خەڵکی ڕێزی لێ دەنرا و هەندێ جار خەلیفە و وەزیر و والییەکان پرسیان پێ دەکرد و گوێیان شل دەکرد بۆ ئامۆژگارییەکانی.

شێخ عەبدولقادر نووسینی زۆرە، کتێبەکانی لە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی تیۆرییەکانی سۆفیزم دەدوێن، بەتایبەتی تەریقەتەکەی خۆی. دەم لە سەختترین مەسەلەکانی شەریعەت دەدا بۆ ئەوەی لەگەڵ تەریقەتی سۆفیزم بیانگونجێنێ.

لە سەرچاوەکاندا ئەوە هاتووە کە شێخ عەبدولقادر چل و نۆ منداڵی بووە، بەڵام ئەو زانیارییەش لە ناوەوەیە گۆیا ئەوانەی دیارن و ناویان لە ناوەوەیە پازدە کوڕن.

شێخ عەبدولقادر هەموو ژیانی لە بەغدا بردۆتە سەر و لە ساڵی ١١٦٥م هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە و لە مزگەوتەکەی خۆیدا نێژراوە. ئەو گەڕەکەی مزگەوت و ئارامگای شێخی لێیە لە بەغدا ناوی (بابولشێخ)ە. مزگەوتەکە ئێستا نێوەندێکی ئایینی و سۆفیزمی گەلێک گرنگە، حوجرەی خوێندنی زانستییەکانی زمانی عەرەبی و ئایینی موسوڵمانی تێدایە لەگەڵ نامەخانەیێکی گەورە، خوتبەی شەریعەتی ئیسلام و زیکر و تەهلیلەی تێدا دەکرێ، لە هەموو لایێکی گێتیی ئیسلامی سەر ڕووی زەوی دەروێش و مریدی تەریقەتی قادری بۆ پیرۆزی ڕووی تێ دەکەن.

شێخ مارفی نۆدێ تەریقەتی قادری بۆ یەکەمین جار وەکو ڕێکخراوێک لە کوردستانا دامەزراند، ئەم زانا گەورەیە ناوی محەمەد مەعرووف لە نەوەی شێخ محەمەدی نۆدێیە. باپیری سێزدەمی سەید عیسا بەرزنجی کوڕی سەید بابا عەلی هەمەدانییە، لەوێوە هاتووە بۆ شارباژێڕ و تێیدا ژیاوە. شێخ مارف لە ساڵی ١٧٦٦م لە گوندی نۆدێی شارباژێڕ لەدایکبووە. سەرەتای خوێندنی لە قەلاچۆلان و لەدواییدا لە هەزارمێرد بووە، زانستییەکانی ئایینی ئیسلامی لەسەر دەستی مەلا محەمەدی ئیبنولحاج وەرگرتووە، پێوەندی لەگەڵ زانای گەورە و ناودار مەلا عەبدولڵای بێتووشی بووە.



جگە لە کتێبێکی یەکجار زۆر لە زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی لە شیعر و ئەدەبی عەرەبیشدا باڵادەست بووە. بەشێکی زۆر لە دانراوەکانی بەهۆنراوەن، لەوانە فەرهەنگۆکی (ئەحمەدی) هەیە بریتییە لە هەندێ وشەی کوردی لەگەڵ وەرگێڕانی عەرەبی، لە بنجدا ئەم کتێبەی بۆ کاکەحمەدی کوڕی داناوە بۆ ئەوەی فێری زمانی عەرەبی ببێ.

شێخ مارفی نۆدێ لە ساڵی ١٨٣٦م لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لەسەر گردێک نێژراوە لە دواییدا بەناوی گردی شێخ مارف ناسراوە.

بێ گومان دەتوانین شێخ مارفی نۆدێ لە سلێمانی بەدامەزرێنەری یەکەمی تەریقەتی قادری دابنێین لە ڕووی تیۆرییەوە، هەروەها دەستێکی باڵای بووە لە پەرەسەندنی تەریقەتەکە لە ڕووی پراکتیکەوە، لە دواییدا ڕێکخراوی قادری بوو بەدەسگاییێکی لێکۆڵینەوە لە شەریعەت و تەریقەت و خەڵکێکی زۆر لە دەوری کۆبوونەوە. شێخ مارف ئەم هەموو سامانە گیانی و ڕۆشنبیرییەی بۆ کاکەحمەدی شێخی کوڕی بەجێ هێشت، ئەمە و هاودەم لەگەڵ زیرەکی خۆی کاکەحمەد بوو بەگەورەترین ڕێبەری تەریقەتەکە لە کوردستاندا و پلەی ڕێزلێنانی گەیشتە پلەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی دامەزرێنەری ڕێکخراوەکە.

کاکەحمەدی شێخ کە بەحاجی کاکەحمەدیش ناسراوە، ناوی ئەحمەد و کوڕی شێخ مارفی نۆدێیە، لە ساڵی ١٧٩٢م لە سلێمانی لەدایکبووە، لای شێخ مارفی باوکی خوێندنی تەواو کردووە، وەک زانایێکی پێشکەوتوو ناوبانگی لە گێتیی ئیسلامیدا دەنگی داوەتەوە. کە سوڵتان عەبدولحەمید بەمەی زانیوە ئارەزووی ئەوەی کردووە چاوی پێی بکەوێ، بەڵام بۆی نەکراوە ڕوو بکاتە ئەستەمووڵ، لەباتی خۆی سەید محەمەدی مفتی ناردووە وەک نوێنەرێکی.

لە جەنگی عوسمانی و ڕووس لە ساڵانی ١٨٧٥-١٨٧٦م کاکەحمەد هێزێکی لە مرید و دەروێش و پیاوانی خۆی بەسەرۆکایەتی شێخ سەعیدی کوڕەزای نارد بۆ جیهاد، واتە شەڕی نێوان گاوور و موسوڵمانان، ئەنجامی ئەمە ئەوە بوو سوڵتان پێنج گوندی دەستنیشان کرد بۆ خەرجی پێشکێشی بکرێ.

کاکەحمەد لە زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی بێ هاوتا بوو، نووسینی بەزمانی فارسی و عەرەبی بوون، بەڵام زیاتر وەک ڕێبەرێکی تەریقەتی قادری ڕێزی لێ دەنرا و تەماشا دەکرا، لایەنی سۆفیزمییەکەی بەسەر لایەنی مەلایەتییەکەیدا زاڵ بوو.

کاکەحمەد لە ساڵی ١٨٨٧م لە تەمەنی سەرووی نەوەد ساڵی لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد و لە مزگەوتی گەورە بەخاک سپێررا، لەو ڕۆژەوە تا ئێستا ئارامگای کاکەحمەد زیارەتگای خەڵکی سلێمانی و دەرەوەی شار و هەندەرانە و کاکەحمەد بووە بەجەوهەرێک لە جەوهەرەکانی بوونی نەتەوایەتی کورد.

## تەریقەتی نەقشبەندی

دامەزرێنەری تەریقەتی نەقشبەندی کە هەموو گێتیی ئیسلامی گرتۆتەوە شێخ محەمەدی نەقشبەندییە. بۆ یەکەمین جاریش دامەزراندنی تەریقەتەکە یا تازەکردنەوەی؛ وەکو خۆیان دەڵێن لە کوردستاندا لەسەر دەستی شێخ خالیدی شارەزووری نەقشبەندییە.

جاری بەسەرهاتی دامەزرێنەر.

شێخ محەممەد کوڕی محەممەد بەهائەدینی بوخارییە، لەبەر ئەوە نازناوی (نەقشبەند)ی دراوەتێ چونکە لە ڕووی هێزی ڕووحییەوە توانای ئەوەی بووە وێنەی بەڵگەی زانستی ئیلاهییات بکێشی، واتە ئەو بەڵگانە لەناو دڵدا بنەقشێنێ.

شێخ محەمەدی نەقشبەندی کە بەشای نەقشبەندیش ناسراوە لە ساڵی ۱۳۱۷م لە گوندی (کۆشکی هیندوان) لە نزیک شاری بوخارا لەدایکبووە. لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا سەرەتا و دەستووڕەکانی سۆفیزمی لە محەممەد بابا ساماسی وەرگرتووە، لە گوندی ساماس کە لە نزیک بوخاراوە بووە.

لەپێش ئەو سەردەمە بەپێی دەستوور و نەریتی محەمەد بابا ساماسی زیکر و تەهلیلە بەئاشکرا و دەنگی بەرز دەکرا، لەو کاتەدا شێخ محەمەدی نەقشبەندی مریدی شێخی خۆی ساماسی بوو، بەپێی ئەمە لەدوای مردنی خۆی بوو بەخەلیفە و جێگری.

شێخ محەمەدی شای نەقشبەند لە پاش مردنی شێخی ڕێبەری ڕووی کردە سەمەرقەند، لەدوای ماوەیێک چوو بۆ بوخارا، لەوێ زۆر نەمایەوە و گەڕایەوە گوندەکەی خۆی، ئینجا ماوەی چەند ساڵێک خەریکی وەرگرتنی سلووک و دابونەریتی تەریقەت بوو، لەدوای ئەمە لە سوڵتان خەلیل نزیک بووەوە، ئەم سوڵتانە داوای سەڵتەنەتی دەکرد و لە سەمەرقەند دادەنیشت.

لەپاش سەرنەکەوتنی سوڵتان خەلیل و بێ بەش بوونی لە فەرمانڕەوایی سەڵتەنەت، شای نەقشبەند لە ساڵی ۱۳٤٦م ڕووی کردە گوندی زوارتون لە نزیک شاری بوخارا، خەریکی کاری کۆمەڵایەتی و گوزەرانی خۆی و خەڵکی بووە، تا گەیشتۆتە ئەوەی ماوەیێکیش خەریکی کردنەوە و چاککردنی ڕێگەوبان بێ. شای نەقشبەند پێش مردنی گەڕاوەتەوە دێی خۆی و لەوێ لە ساڵی ۱۳۸۸م کۆچی دوایی کردووە و لە گوندی باوەدین نێژراوە، ئەم گوندە لە نزیک شاری بوخاراوەیە.

شێخ خالیدی شارەزووری نەقشبەندی یەکەمین کەس بوو تەریقەتی نەقشبەندی وەکو ڕێکخراوێک هێنایە کوردستانەوە. شێخ خالید دامەزرێنەری ئەم تەریقەتەیە لە ناوچەی سلێمانی و هەموو کوردستان، کوڕی کەسێکە لە تیرەی مکاییلی عەشرەتی جاف، نازناوی زیائەدینە، لە ساڵی ۱۷۷۹م لە قەرەداغ لەدایکبووە، زانستی ئایینی لە زانا گەورەکانی ئەو سەردەمە لە قەرەداغ و سلێمانی و شاری سنەی ئەردەڵان وەرگرتووە، لە ساڵی ۱۸۰٥م چووە بۆ حەج بەڕێگەی مووسڵ و شام، لە دوای حەج گەڕاوەتەوە سلێمانی.

لە کاتێکدا میرزا ڕەحموڵڵا کە بەدەروێش محەممەد خۆی بەخەڵکی ناساندبوو لە سلێمانی پەیدا بوو، ڕێگەی بۆ شێخ خالیدی شارەزووری خۆش کرد و شێخ بەڕێبەری ئەو و لەگەڵیدا لە ساڵی ۱۸۰۷م ڕووی کردە هیندستان بۆ لای شا عەبدوڵڵای دهلەوی، ئەمە یەکێک بوو لە شێخە گەورەکانی تەریقەتی نەقشبەندی لە هیندستان.

شێخ خالید ساڵێک لای شا عەبدوڵلا مایەوە، لەو ماوەیەدا هەموو پێویستییەکانی وەرگرتنی



تەریقەتی بەجێ هێنا و لەسەر دەستی شا عەبدوڵلا تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت و ڕێی بۆ خۆش بوو ببێ بەمورشید و شێخی تەریقەتەکە و ڕێکخراوی تەریقەتی نەقشبەندی لە کوردستاندا دابمەزرێنێ. لە ڕێی گەڕانەوەیدا بۆ سلێمانی شێخ خالید لای دایە شاری سنە و ماوەیێک خەریکی بڵاوکردنەوەی تەریقەتەکە بوو، توانی مامۆستای خۆی شێخ محەممەد قەسیم بێنێتە سەر تەریقەت و بیکا بەمورشید لەو ناوچەیەدا، ئەوجا هاتەوە سلێمانی، بەڵام زۆر نەمایەوە و ڕووی کردە بەغدا، ماوەیێکیش لەوێ ژیانی بردە سەر، ئینجا هاتەوە سلێمانی و دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی تەریقەت، خەڵکی لە دەوریدا کۆبوونەوە، چونکە باوەڕیان بەبیر و بۆچوونەکانی هەبوو.

کە کەسایەتی شێخ خالید زیاتر بڵند بووەوە بەهۆی ئەوەی هەندێ مرید و سۆفی کردیان بەشێخی خۆیان، دەروێشی قادری لێی کەوتنە تەقە، ناخۆشی کەوتە ناوەوە. لەو ماوەیەدا شێخ مارفی نۆدێ بەهێزتر بوو، ئیتر شێخ خالید بەناچاری سلێمانی بەجێهێشت و بەرەو بەغدا کەوتە ڕێ. لەو سەردەمەدا مەحموود پاشای کوڕی عەبدولڕەحمان پاشای بابان لە بەغدا بوو، تکای لە شێخ خالید کرد بگەڕێتەوە سلێمانی، بەقسەی ئەو گەڕایەوە و خانەقایێکی بۆ دروست کرد و کەوتە ئیرشاد. تەریقەتەکە پەرەی سەند، مرید و سۆفی زۆر بوون، ئەمە بووە هۆی ئاژاوە و دوژمنکاری لەنێوان زانایانی ئایینی و خوێندەواران. میرەکانی بابان و دەوڵەمەند و کاربەدەستان و خەڵکی ناوشار بوون بەدوو بەرە بەپێی بەرژەوەندی و چاکەی کەسایەتی، تا وای لێ هات هەوڵی کوشتنی شێخ خالید بدرێ. لەو سەردەمەدا مەحموود پاشا نێوانی لەگەڵ والی بەغدا خۆش نەبوو، هەروەها حەزی بەوە نەدەکرد شێخ خالید بەدەسەڵات و دەستڕۆیشتوو بێ، سەرەڕای ئەمانە دووبەرەکی نانەوە لەناو کۆمەڵی میرنشینی بابان جێی ڕەزامەندی خەڵکی شار و میرەکانی بابانیش نەبوو. ئیتر شێخ خالید هەستی بەوە کرد ناتوانێ بەرهەڵستی ئەم دژایەتییە بکا و لەو هێرش و هەڵمەتە خۆی بپارێزێ. ناچار بوو بەیەکجاری سلێمانی بەجێ بێڵێ و ڕوو بکاتە بەغدا، لەوێ لە خانەقای خالیدی دادەنیشێ و شێخ ئەحمەدی ئەربیلی دەنێرێتە شام بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی تەریقەتی نەقشبەندی.

وا دەردەکەوێ قادرییەکان بەغداشیان بەنزیک دەزانی پێیان خۆش نەبوو لەوێ بژی، لەبەر ئەوە لەوێش سەغڵەتیان کردبوو و بۆی نەدەکرا بەئاسوودەیی بژی، بۆیە بەغدای بەجێ هێشت و بەرەو شام کەوتە ڕێ و لە شاری دیمەشق نیشتەجێ بوو. لە پاش ماوەیێکی کەم بەنەخۆشی ڕشانەوە لە ساڵی ۱۸۱۳م کۆچی دوایی کرد.

شێخ خالید دەستی شیعری هەبوو، نازناوی شیعریی (نووری) بوو، شیعری فارسی زۆر بوو، لە پلەیێکی بەرزدا بوو، بەڵام شیعری کوردی (دیالێکتی گۆرانی) زۆر کەم بوو و لە پلەی شیعرە فارسییەکانیدا نەبوو. ئەو بناغەیەی شێخ خالید بۆ تەریقەتی نەقشبەندی لە کوردستاندا دروستی کرد زوو پەرەی سەند لە هەموو ناوچەکاندا مورشید و مرید و سۆفی پەیدابوون، ئەگەرچی خۆشی ماوەیێکی کەم لە کوردستان مایەوە.

لەدوای شێخ خالید نێوەندی ئیرشادی نەقشبەندی لە هەموو کوردستاندا بڵاو بووەوە، بەڵام نێوەندی

هەرە گرنگی تەریقەتەکە لە بیارە و تەوێڵە بوو. مریدە هەرە دیارەکانی ئەمانە بوون: شێخ عوسمانی تەوێڵە (سەراجەدین) (١٧٧٥م–١٨٦٧م)، شێخ محەمەدی تەوێڵە (بەهائەدین) (١٨١٩م–١٨٨٠م)، شێخ عومەری تەوێڵە (زیائەدین) (١٨٣٩م–١٩٠٠م).

## کاریگەری دەروێشی لە ژیانی کۆمەڵایەتی - سیاسیدا

لە شاری تازەی سلێمانی کۆمەڵێکی مۆدێرن پەیدا بوو، خۆی لە شێوەی دەوڵەت پیشان دەدا، دەسەڵاتی سیاسی بەدەست پاشاکانی بابانەوە بوو، دەسەڵاتی ئایینی بەدەست شێخ مارفی نۆدێیەوە بوو، شێخ مارف زانایێکی ئایینی ئەوەندە پڕ زانستی بوو، کەس نەیدەتوانی خۆی لە قەرەی بدا، یا بەربەرەکانی بکا، ئەویش ڕێگەی ئەوەی نەدەدا کەس خۆی وەک ئاوزەی ئەو یا لەو گەورەتر حسێب بکا.

لەنێوەندی مەلایانی ئایینی ئیسلامی لەو سەردەمەدا لە سلێمانی بیروڕا و بۆچوونی پێچەوانە لە ناوەوە نەبوو لە بابەت پراکتیککردنی تیۆرییەکانی ئایینی ئیسلام (شەریعەت)، چونکە ئەو مەلایانە بەئایینزا هەموویان سوننی بوون؛ زیاد لەسەر ئەمە پێڕەوی مەزهەبی شافعییان دەکرد، لەبەر ئەوە چەندوچوون لەم مەیدانەدا نەبوو، ئەوە ناڵێم یەک دوو مەلا لەوانە بوو بکەوتنایە زۆرانبازی لەسەر ئەوەی کامەیان لە ئەوی دیکە مەلاترە.

لەو ڕۆژگارەدا تەنیا لە بیروڕا و بۆچوونی سۆفیزمدا دەتوانرا دووبەرەکی بکەوێتەوە، بۆیە شێخ مارفی نۆدێ بەناوی تەریقەتی قادرییەوە ڕێگەی نەدەدا لە دەسەڵاتی ئایینیدا یەکێکی تر ئاوکوفی بێ یا مونافەسەی بکا، لەبەر ئەوە کارێکی ئاسایی بوو کە شێخ خالید لە سلێمانی ویستی بەرامبەر بەشێخ مارف بچێتە مەیدانەوە شێخ ڕێگەی پێ نەدا. وە ئەوەی بووە هۆی سەرکەوتنی ئەوەبوو شێخ مارف بناغە و بنکەیێکی بتەوی لە سلێمانی هەبوو وەک مەلایێکی گەورە و شێخێکی تەریقەتی قادری و سەییدێکی ئەولادی پێغەمبەر بەئاسانی جێی لەق نەدەکرا، ئیتر شێخ خالید ناچار بوو سلێمانی بەجێ بێڵێ بەرەو بەغدا بەڕێ بکەوێ لەوێشەوە بۆ شام.

لە پاش دەرچوونی شێخ خالید لە سلێمانی و نیشتەجێبوونی لە شام و لەدوای ماوەیێکی کەم کۆتایی هاتنی ژیانی بەمەرگێکی لەپڕ تەریقەتی نەقشبەندی لەناو نەچوو، بەپێچەوانەوە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی بابانەکان لە سلێمانی خانەقای شێخ خالید (لە دواییدا بەخانەقای مەولانا ناوبانگی دەرکرد) بوو بەنێوەندی ئیرشادی تەریقەتەکە، مەسەلە تەنیا سلێمانی نەبوو هەموو کوردستانی گرتەوە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانییان لە سلێمانی دەسەڵاتی سوڵتان ڕێزی لە هەردوو تەریقەتەکە دەنا و یارمەتی دەدان لە پێناوی بەرژەوەندی خۆی، بەڵام هەر چۆنێ بێ دەسەڵاتی عوسمانی لە مورشیدانی کاکەحمەدی شێخەوە نزیکتر بوو، ئەم حاڵەتە لە ئەنجامی بیروباوەڕێکی ئایینییەوە ڕەنگی لە سیاسەتی هەڵسان و ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحموود دابووەوە لە دژی ئەمپریالیستی بەریتانی.

تەریقەتی قادری و نەقشبەندی لە سەردەم و جێگە و ناو میللەتانی جیاواز پەیدابوون، بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنیان ماوەیێکی زۆری خایاند، لە حەوسەد ساڵەوە تا هەزار ساڵێک.



تەریقەتی نەقشبەندی لە ئاسیای ناوەڕاست لە وڵاتی ئەودیو ڕووبار (ما وراء النهر) یا خاکی تووران‌یان لەناو تورک و مەغۆل پەیدا بوو لە پاشانا هەموو ئێرانی گرتەوە، لە دواییدا گەیشتە وڵاتی گەورە و فراوانی هیندستان کە لە پێشانا سەدان ساڵ هۆڵەندە و ئینجا فرەنسە و ئەوجا ئینگلیز فەرمانڕەوایییان تێدا کردووە، بەمەش نەوەستا لە هەموو گێتیی ئیسلامدا بڵاو بووەوە. تەریقەتی قادری کەسێکی ئێرانی لە ناوچەی گەیلانی نزیک زەریای قەزوین دروستی کرد و لەوێوە سەری هەڵدا، بەڵام شێخ عەبدولقادر لە بەغدا گەورە بووە و هەموو ژیانی لەوێ بووە و هەر لەو شارەشدا کۆچی دوایی کردووە. ماوەی زیاتر لە چوارسەد ساڵ مزگەوت و تەکیەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لەژێر سەرپەرشتی سوڵتانەکانی عوسمانی بووە. گەلێ سەراودەراوی دیوە بەناوی دووبەرەکی سوننە و شیعەوە. لە جەنگەکانی نێوان ئێرانییانی سەفەوی و قاجار لە لایێک و عوسمانی لە لایێکی دیکەوە بەناوی ئایینزاوە مزگەوت و تەکیە ڕووخێنراوە، ئازاری ئارامگە دراوە.

بەسەرهاتی ئەو دوو تەریقەتە گەلێ نەریتی تایبەتی دروست کردووە، هەریەکەیان قاڵبێکی وای گرتووە، ئەدگارێک دەخاتە ڕوو تایبەتییە بەخۆی، لەبەر ئەوە بەدرێژایی مێژوو لە کاتی دیاریکراودا بگرەوبەردە و گیروگرفت کەوتۆتە نێوانیانەوە، گەلێ جاریش لە لایەن زلهێزەوە بەکارهێنراون بۆ بەرژەوەندی خۆیان، ئەمانە هەموو دەوڵەتە موسوڵمانەکان دەگرنەوە، لە عەباسییەکانەوە دەست پێ دەکا تا دەگاتە شای عەجەم و سوڵتانی عوسمانی و لە دواییدا زلهێزە ئەوروپاییەکان لەم دووسەد ساڵەی دواییەدا، واتە سەدەی نۆزدەم و بیستەم.

لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ڕێکخراوەکانی تەریقەتی قادری لە کوردستاندا بەزۆری لەناو شارەکاندا بەرچاو دەکەون، بەپێچەوانەوە نەقشبەندی زیاتر لە گوند و دێهات و ئاوەدانییە کشتوکاڵییەکاندا لەناوەوەن. هەریەکە لەو دوو تەریقەتە زاراوەی خۆیانیان هەیە بۆ ناوی پەرستگا و ناوی ئەندامی ڕێکخراوەکانیان، بۆ بەڵگە لای قادرییان بەجێی کۆبوونەوەیان دەڵێن (تەکیە)، بەئەندامی ڕێکخراوی تەریقەت دەڵێن (دەروێش)؛ نەقشبەندی بەجێی کۆبوونەوەیان دەڵێن (خانەقا)، بەئەندامی ڕێکخراوی تەریقەتیان دەڵێن (سۆفی). ئەم وردە دیاردانە ئەگەرچی زۆر گرنگ نین بەڵام دەوریان هەیە لە دوورخستنەوەیان لە یەکتری.

لە کۆمەڵی کوردەواریدا مەرج نییە هەموو کەسێک دەروێش یا سۆفی بێ، تەریقەتی لەسەر دەستی شێخێک وەرگرتبێ. دەروێش و سۆفی خاوەن ئیجازە ئەوانەی مارگریان پێ دەڵێن ژمارەیان کەمە و بەزۆری نەخوێندەوار و بێ سەوادن، بەڵام ئەو کەسانەی هەر بەناو سەر بەتەریقەتن لە کۆمەڵی کوردەواریدا ژمارەیان زۆرە. ئەمانە پێڕەوی نەریت و شەعائیری تەریقەت ناکەن، بەڵام لەبەر هەر هۆیێک بێ: خزمایەتی، برادەرایەتی، هاوسێیێتی، خۆشویستنی شێخێک خۆیان لە تەریقەتێکی دەروێشیزم نزیک دەکەنەوە و لارییان لەوە نییە خەڵکی بەدەروێش یا سۆفی بیانژمێرن.

لەگەڵ ئەوەشدا کەسی وا هەیە بەئارەزوو لە پێناوی سوود و چاکە و بەرژەوەندی خۆی لە هەردوو تەریقەتەکە نزیک دەبێتەوە، ئیجازەی هەردووکیان لەسەر دەستی شێخێکیان وەردەگرێ.

تەریقەتی قادری هەندێ لایەنی کۆمەڵایەتی تایبەتی خۆی هەیە لە شاعائیری کۆبوونەوە و زیکر و تەهلیلە و یاهوو، ئەمانە بەپێچەوانەی نەقشبەندییان زیکر و تەهلیلەیان ئاشکرایە، وەکو حاڵگرتن و ئاگرخواردن و زەرگ وەشاندن، جگە لەمە ئەندامی ڕێکخراوی قادرییان ڕدێن و سمێڵ و پرچ بەردەدەنەوە، بایەخ بەجلوبەرگ نادەن، ژیانیان درشتە، خواردنیان ساکار و کەمە.

دەتوانین بڵێین لە کوردستانا لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە هەردوو تەریقەتی قادری و نەقشبەندی دەوری باڵایان بوو لە ژیانی سیاسی – کۆمەڵایەتی. کردەوەیان لایەنی چاکە و خراپەی بووە، تا ئێستاش ئەم تەریقەتانە دەوری کۆمەڵایەتی و سیاسییان ماوە، بەڵام لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە کەم بۆتەوە.

## ڕەنگدانەوەی سۆفیزم لە ئەدەبدا

کارکردنی سۆفیزمی کوزمۆسی بەگشتی و سۆفیزمی ئیسلامی بەتایبەتی لە ئەدەبی کوردیدا لە سێ شێوەدا دەبینرێ، ئەمانە ئەگەرچی لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی سۆفیزمدا هاتوون، بەڵام جیاوازییێکی تەواو لە ڕووی هونەری و ئیستیێتیکییەوە لە نێوانیاندا هەیە.

١– شیعری سۆفیزم (عیرفانی)

ئەم جۆرە شیعرە لووتکەی داهێنانە، ئیلهام لە (یەکێتیی بوون) وەردەگرێ بەرێگەی ڕەمز و هەناسەی ڕۆمانتیکییەوە. ئەم جۆرە شیعرە لە سەرووی ئایین و قەومیەتەوەیە، کێشەی چینایەتی و چەوساندنەوەی ئادەمزادی تێدا نییە، شاعیر تەنیا ئیلهام لە سێ شت وەردەگرێ: کردگار و ئادەمزادی بێ کەموکووڕی (کامڵ، سووپەرمان) و سروشت. هەریەکە لەمانە ئازاد و سەربەخۆیە، بەڵام هەرسێکیشیان یەکێکن. شاعیری ئەم بابەتە شیعرە هیچ ئیلتیزامێکیان نییە، شەریعەت و تەریقەتیان لەگەڵ یەکتری نەگونجاندووە کە دوو شتی جیاوازن، بەڵام شیعرێکی ئەوتۆیان هێناوەتەوە بەهیچ جۆرێ تەعبیر لە ئایین ناکا کە هەمووی دەستوور و قانوونە، کەچی لەگەڵ داهێنانی ئازادی و سەربەستی و داهێنانی نەمری و هەمیشەیی و بێ کۆتاییە.

٢– شیعری وەسفی سۆفیزم

شیعری وەسفی سۆفیزم وەسفێکی ڕووکەشی خوو و ڕەوشت و کردەوە پراکتیکییەکانی دەستووری سۆفیزمە، هەندێ جار خەریکی لێکدانەوە و شیکردنەوەی ڕاستی و زانیاری و زانستییەکانی سۆفیزمە و تیۆری و دەستوورەکانی دەخاتە ڕوو، هەندێ جاریش دەم لە مێژووی سۆفیزم دەدا. بۆ ئەم ئامانجە پەنا دەباتە بەر زاراوە و تەعبیر و لێکسیکۆنی سۆفیزم، وە بەشێوەی شیعری تەعلیمی (دیداکتی) بیروڕاکانی دەگەیەنێتە خوێندەواران.

٣– شیعری دژی دەروێشیزم

دەروێشیزم لایەنی پراکتیکی ڕەشبینی سەلبی سۆفیزمە، خەریکی لاپەڕە تاریکەکانیەتی. دەروێشیزم بوو بەدیاردەیێکی کۆمەڵایەتی، دەسەڵاتی دەوڵەت بەتایبەتی عوسمانی کردبووی بەداردەست، بۆ ڕاووڕووت و بەنجکردنی خەڵکی ناو کۆمەڵ. شیعری دژی دەروێشیزم دوو شێوازی وەرگرتووە.



یەکەمیان دیاریکردنی هەندێ کار و کردەوەی خراپی دەروێشیزم و بەراووردکردنی لەگەڵ کەموکووڕی و ناگزووری کۆمەڵایەتی بەشێوەیێکی هونەری؛ دووەمیان هێرش بردنە بۆ سەر خوووڕەوشت و دیاردە پراکتیکییەکانی دەروێشیزم وەکو ڕووداوێکی دواکەوتوو و کۆنەپەرست لەناو کۆمەڵی کوردەواریدا.

## بەشی چوارەم

# رینیسانسی شیعری کوردی لە باشووری کوردستاندا

لە ناوچەی سلێمانی (بابان) و کەرکووک (گەرمیان) و هەموو ناوچەکانی دیکەی باشووری کوردستان، سنە (ئەردەڵان) ، ساباڵاغ = مەهاباد (موکریان) و هەولێر و ڕواندز (سۆران) لە سەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەم ئەدەبێکی میللی سەر زاری دەوڵەمەند بەشیعر و پەخشانەوە لە ناوەوە بوو. ناوچەی سلێمانی لەو ڕۆژگارەدا لە هەموو لایێکەوە دیالێکتی گۆرانی دەورەی دابوو و ئەدەبێکی کلاسیکی نووسراو و میللی تۆمار نەکراو لە ناوەوە بوو، مەشق و تاقیکردنەوەی سەدان ساڵی بەخۆوە دی بوو.

لای باکووری سلێمانی سەر بەدیالێکتی گۆرانی نەبوو، ئەودیو شاخی ئەزمر و گۆیژە ناوچەی شارباژێر لە سەرووتر لەگەڵ ناوچەی موکریان یەکتری دەگرنەوە، لەم جێیانەدا دیالێکتی کرمانجیی زمانی ڕەسمی خەڵکەکە بوو. ئەم دوو دیالێکتە گۆرانی و کرمانجیی خواروو کاریان لە یەکتری دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پارێزگاری و مانەوەی بوونی خۆیانیان کردبوو، ئەگەرچی ڕۆژگاریش لە چاکەی دیالێکتی کرمانجیی خواروو بوو، چونکە میرنشینی بابان زەمینەیێکی خۆش کرد ئەو دیالێکتە پێش بکەوێ و شاعیری گەورەی لێ پەیدا ببێ، ئەمە هەمووی لەسەر حسێبی دیالێکتی گۆرانی بوو. ئەوی ڕاستی بێ لەگەڵ دامەزراندنی میرنشینی مۆدێرن لە پایتەختی تازە شاری سلێمانی و پەیدابوونی شیعری کلاسیکی تازە لەسەر دەستی نالی دیالێکتی گۆرانی کەوتە لێژییەوە ئەم دیاردەیە بەردەوامە تا ئێستاش و دیالێکتی کرمانجیی خواروو هەموو ناوچەکانی دیالێکتی گۆرانی داگیر نەکردووە.

### ئەدەبی کوردی پێش رینیسانس

ئەدەبی کوردی لەپێش سەدەی نۆزدەم و سەرەتای ئەو سەدەیە و پێش پەیدابوونی نالی لە دوو شێوەدا دەبینرێ، یەکەمیان شیعری میللی سەرزار و دووەمیان ئەو شیعرە کەمانەی کە خاوەنیان خوێندەوارییان بووە.

### شیعری میللی سەرزار

ئەدەبێکی میللی سەرزاری بەنرخ بەدیالێکتی کرمانجیی خواروو لە ناوەوەیە مێژووی دەگەڕێتەوە سەدەکانی پێش سەدەی نۆزدەم. ئەگەرچی زۆربەی بەرهەمی ئەدەبی میللی خاوەنیان دیار نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مێژووی ئەدەب ناوی شاعیرێکی میللی دەور دەکاتەوە کە عەلیبی بەرداشانی بووە، ئەم شاعیرە لە ڕۆژگارانی فەرمانڕەوایی عەبدولڕەحمان پاشای بابان ژیاوە و گەلێ شیعری بەسەر ئەو پاشایە و میرنشینەکەی هەڵداوە، جگە لەوە شیعری میللی نەنووسراوی ناوچەیی بەقەوارە زۆر بوو، ناوی



هەندێ لە خاوەنەکانیان پارێزراون، بەڵام بەزۆری خاوەنی شیعرەکان گوم ناون. هەندێ لە ڕەخنەگرانی ئەدەبی میللی لەسەر ئەو باوەڕەن بەرهەمی ئەم جۆرە ئەدەبە نابێ خاوەنەکانیان ناسراو بن.

### شیعری میللی خۆماڵی تۆمارکراو

بەڵگەیێکی کەم و هەندێ جار گومان لێ کراو بەدەستەوەیە، لە سەدەی هەژدەمدا هەندێ بەرهەمی ئەدەبی وا بدۆزینەوە فۆلکلۆر ئامێز بێ و خاوەنیان هەبێ. ماوەی دۆزینەوە و لەپاشانا لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردیدا گەلێک فراوانە، کاری بەکەڵک و ڕووناکی دیوە، بەڵام نە بەقەلەمی درشت و نە بەقەلەمی ورد هەوڵێکی وا نەدراوە تیشک بخرێتە سەر کون و قوژبنەکانی ئەدەبی کوردی، ئەم کەلێنانە گەلێ زۆرن، لە بەرهەمی شاعیران و ناو و نازناویان، بەسەدان ناوی نووسەر و زانایانی کورد لە دەسنووس و کتێب هاتووە، لە سەدەکانی هەژدەم و نۆزدەم ژیاون کەچی بەرهەمیان لە گێتیی ڕۆشنبیری کوردیدا ئاشکرا نییە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو بەرهەمە کەمەی کە ژێر دەستمان دایە و ئەوانەی شارەزاییمان لێیان هەیە، دەتوانین بڵێین تیشکێکی کز لە ئەدەبی کوردیدا بەدیالێکتی کرمانجیی خوارووی سەدەی هەژدەم لە ناوەوەیە.

لە ناوچەی سلێمانی لە سەدەی هەژدەمدا لە گوندی هەزارمێرد مەلا محەمەدی ئیبنولحاج مامۆستای شێخ مارفی نۆدێ و مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی بووە خاوەنی حەوت هەشت کتێب بەزمانی عەرەبی لە بارەی ئایینی ئیسلامەوە.

تەنیا یەکێک لە دانراوەکانی بەزمانی کوردییە و بەشیعر هۆنراوەتەوە، ئەم بەرهەمە چیرۆکێکی شیعرییە بەناوی (مەهدی نامە)وە، لە ١٥٧ چوارین پێکهاتووە کە دەکاتە ٦٢٨ نیوە دێڕ شیعر. وەکو دانەر خۆی لە چوارینێکیدا دەڵێ لە ساڵی ١٧٦٢م چیرۆکەکەی تەواو کردووە. دانەری چیرۆک بەشیعر ئەو حیکایەتە دەگێڕێتەوە کە لە گێتیی ئیسلامدا یەکێکە لەو حیکایەتانەی دەچنە ناو میتۆلۆجیای ئایینەوە.

نویشکی حیکایەتەکە لەوە دەدوێ، ڕۆژی قیامەت نزیک دەبێتەوە، بەڵگەکانی ئاخر زەمان دەردەکەون، خەڵکی لە نزیکبوونی سەردەمی پەیدابوونی دەججال دەدوێن، لە پاشانا محەمەدی مەهدی دەردەکەوێ و گێتی دەکەوێتە خۆشی و بەختیارییەوە. زۆری پێ ناچێ دەججال هەڵدەستێ، ئاژاوە دەکەوێتەوە، خەڵکێکی زۆر بەدوای دەکەون، ئینجا عیسای مەسیح لە ئاسمان دێتە خوارەوە و دەججال دەکوژێ، لەدوای ئەو یاجووج و ماجووج پەیدا دەبن، فیتنە و فەساد لەگەڵ خۆیانا دێنن. ئەوجا ڕۆژ لە ڕۆژئاوا هەڵدێ و قورئان بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان و دوکەڵ گێتی دادەگرێ، لەدوای ئەوە گەردەلوێکی تیژ و بەتین لە شامەوە هەڵدەکا و دوایی بەژیانی هەموو ئادەمزادێک و گیانلەبەرێک دێنی و کۆتایی بەژیانی سەر ڕووی زەوی دێ، لە دواییدا خەڵکی زیندوو دەبنەوە بۆ دادگای ڕۆژی قیامەت.

هەندێ لە چوارینەکانی چیرۆکەکە ئەمانەن:

یا ڕەب تۆبی ساحیب هودای
وەقتێ دەبێن فیتنە بەدای
حیفزن بکەی (یا ذا الندا)ی
بەئیسمی تۆ بیدایەتێ

***

بیدایەتم بەئیسمی تۆ
لە زیکری فیتنەی خەلقی تۆ
ویفقی حەدیس نەبییی تۆ
زانیومە بەئیرسییەتێ

***

ئەهلی مەککە دەبن سووروور
دەکەن شوکری ڕەببی غەفوور
خەسف کران ئەهلی شووروور
دەزانین ئەو عەلامەتێ

***

مەهدی لە مەککەیێ دەردێ
ئالای نەبییی لە بۆ دێ
دوازدە هەزاری لەگەڵ دێ
(أو عشر مع خمستێ)

***

لە وەقتی خەلقی ئادەمێ
نەبووە فیتنە بەو ئەعزەمێ
یا ڕەب هەر تۆی مونتەقیمێ
حیفزن بکەی لەو فیتنەتێ

***

هەر لە نووحێ بەپاشەوە
چی پێغەمبەرێ کە بووە
ئومەتی ئاگاه کردووە
دا بزانن ئەو عەلامەتێ

***



نەفخی دووەم گەرا دەبێ
هەموو ئینسان قایم دەبێ
لەسەر قەبرێ هایم دەبێ
لەبەر حیرەت و دەهشەتێ

***

دەیان ئاژۆن بۆ مەحشەرێ
بۆ جەزایی خێر و شەڕێ
هەر کەس غەمی دێتە بەرێ
دەکێشێ ئاه و حەسرەتێ

***

خەتمی عەلامەتان تەمام
ئەوجا کۆتا بکەین کەلام
ئەرجو لە (رب ذی الانعام)
خەلاسن کا لە قیامەتێ

***

نەزم کرا بەناخۆشی
دڵ پڕ لە غەم و بێهۆشی
لە تەئریخی حەفتا و شەشی
(بعد ألف و مأتێ)

***

نەزمم کرد بەقەولی سەحیح
بەلەفزی کوردی نافەسیح
بۆ مونسیفان (لا للشحیح)
بۆ ئینتیفاعی عامەتێ

***

ئەزم محەمەدی دڵڕێش
حاڵم وەکی حاڵی دەروێش
پەردەی غەمان دایم لەپێش
لەبەر خۆفی عاقیبەتێ

***

وەقـــتی دەچینە ژێر گڵێ
غـــەمم زۆرن لەســـەر دڵێ
وەک مـــەنجـــەڵی پڕ دەکـــوڵێ
لە خـــوای دەخـــوازین ڕاحـــەتێ

***

ئەوەی لە خوێندنەوەی هەموو چیرۆکە شیعرییەکە و ئەم برە شیعرەدا دەبینرێ و هەستی پێ دەکرێ لە ڕووی ڕووخسارەوە ئەوەیە ئەم شاعیرەی ناوچەی سلێمانی کاریگەری شیعری میللیی نەنووسراوی دیالێکتی کرمانجیی سەرووی پێوە دیارە. ئەم بەرهەمە لەم ڕووەوە لە هەندێ لە چیرۆکە شیعرییەکانی فەقێ تەیران دەکا بەتایبەتی لە ڕووی کێشی سیلابی خۆماڵی و قافیەوە، دێری چوارەمی هەموو چوارینەکان لە سەرەتاوە تا دوایی لەسەر یەک قافیە دەبن، جگە لەوە زمانەکەشی تێکەڵاوە، سوودی لە دیالێکتە بچووک و ناوچەییەکانی وڵاتی سلێمانی و موکریان و سۆران و ئەردەڵان وەرگرتووە.

لە چوارینێکی پێش دوو چوارینی دوایی شاعیر دەڵێ شیعرەکەی (بەقەولی سەحیح...) هۆنیوەتەوە، (بەلەفزی کوردی نافەسیح...) (بۆ ئینتیفاعی عامەتێ...) مەبەستی ئەوەیە کوردییەکەی لە ڕووی دەستووری زمانەوە ڕاستە و هەڵەی تێدا نییە. بەڵام لەفزە کوردییەکە نافەسیحە، مەبەستی ئەمە ئەوەیە بەدیالێکتی میللی شەعبی یا کوردی جلفە و زمانی ناو بازاڕ نووسیویەتییەوە و زمانی بەرزی شیعر و نایابی پەخشان و گفتوگۆی بێ خەوشی ڕۆشنبیر و زانایانی بەکار نەهێناوە، واتە (زمانی ئەدەبی)، ئەم چیرۆکە شیعرییەی بۆ خەڵکی بێ سەواد و نەخوێندەوار نووسیوەتەوە، بۆ ئەوەی بەئاسانی تێی بگەن. ئەمە تێبینییێکی ژیرانەیە لە نرخی هونەری و جوانکاری چیرۆکەکە کەم ناکاتەوە.

لە ناوچەی کۆیە لە سەدەی هەژدەمدا پێش پەیدابوونی نالی و سەرهەڵدانی تەریقەتەکانی قادری و نەقشبەندی لەسەر دەستی شێخ مارفی نۆدێ و شێخ خالیدی شارەزووری لە وڵاتی کۆیە مەلایێک هەبوو مستەفا بوو و لەدواییدا کە شامی کردووە بەمەڵبەندی ژیانی بە(قوتبی شام) ناسراوە. دەڵێن شێخی تەریقەت بووە، دەکرێ دەروێش یا سۆفییی تەریقەتێک بوو بێ بەڵام قادری و نەقشبەندی وەکو ڕێکخراو لە کوردستانا دروست نەبووبوون. وا باوە پەرستگای لە جێی مزگەوتی (کۆنە جومعە)ی ئێستای کۆیە بووە. ناکۆکی و تێکچوونی شیرازەی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە کۆیە بووە هۆی ئەوەی شار بەجێ بێڵێ و ڕوو بکاتە وڵاتی شام.

سالی مردن و ژیانی قوتبی شام نەزانراوە، لەناو خەڵکی وا باوە لە شام نەگەڕاوەتەوە و هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

شێخ مستەفا چیرۆکێکی شیعری هەزار بەیتی نووسیوەتەوە، لە مەسەلەکانی ئایین و کردەوەکانی کردگار و ڕوونکردنەوەی هەندێ لایەنەکانی سۆفیزم بەگشتی دەدوێ.

سەرەتای چیرۆکە شیعرییەکە بەم جۆرەیە:



ئەڵڵا هەبوو قـــەت کـــەس نەبوو
بوونی بوو نەبوونی نەبوو
ئەزەلی بوو ئەبەدی بوو
فـــەرد و ئەحـــەد ســـەرمـــەدی بوو
زاتی لە غـــەیران غـــەنی بوو
(ألآن کـــان کـــما کـــان)

ئەوەی شایانی باس بێ ئەوەیە ئەم چیرۆکە شیعرییە تا ئێستاکە بڵاو نەکراوەتەوە. بینای ئەندازیاری لەسەر بنچینەی کوپلێت ڕێکخراوە و کێشی سیلابی خۆماڵییە، وەکو لە ناوەرۆک و شێوەی داڕشتنی دەردەکەوێ دەبێ فەقێیانی مزگەوت بەگۆرانی بەیتەکەیان چڕی بێ. بێ گومان ئەم یادگارە ئەدەبییە لە ئەدەبی میللی (فۆلکلۆر)ەوە نزیکترە لەوەی لە ئەدەبی کلاسیکیی نووسراو.

## شیعری عەرووزی

لە بارەی شیعری کێشی عەرووزییەوە لەپێش ڕینیسانسی نالی غەزەل و پارچە و تاکە دێری شیعر لە ناوەوە هەیە، هەندێ جار پەنجە بۆ ناوی شاعیرەکانیشیان درێژ کراوە، بەڵام نە ڕاستی بە لە ڕووی ڕەخنەی ناوەوە و نە لە ڕووی ڕەخنەی دەرەوە متمانە بەو شیعرانە ناکرێ لە سەردەمی پێش نالی بەدیالێکتی کرمانجیی خواروو وترا بن.

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە دێڕە شیعرێکی نازدارمان لە بەردەستدایە، سەرچاوەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی ئەوە دەردەبڕن کە ئەم شیعرە لە بەرهەمی نووسەری کوردی ناودار مەلا عەبدوڵڵای بێتووشییە (١٧٤٧-١٨٠٦):

لە دیباجەی کیتابی حوسنی عالەم هەر وەرەق لادەم
دەبینم مەبحەسی وەسفت لە هەر فەسڵێ و لە هەر بابێ

ئەم دێڕە شیعرەی بێتووشی لە لایەن کێش و قافیەوە نموونەی ئەو شیعرانەیە کە قوتابخانەی شیعری کوردستانی باشووریان پێک هێناوە.

## پەیدابوونی شیعری عەرووزی

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا میرنشینەکانی بابان و سۆران و ئەردەڵان لە باشووری کوردستاندا لە ژیانا بوون، خەباتیان لە دژی دەوڵەتەکانی عوسمانی و عەجەم گەیشتبووە لووتکە. تاقیکردنەوەییێکی باش بەسەر کۆمەڵی کورددا تێپەڕی بوو، ئەمە بووە هۆی ئەوەی بەشێوەییێکی تر هەستی نیشتمانپەروەری لە مێشک و دڵ و دەروونیدا بجووڵێ، لە ئەنجامی ستەم و زۆرداری عوسمانی و عەجەم بۆ ماوەییێکی دوورودرێژ ئادەمزادی کوردیان چەوساندبووەوە و خاکی کوردستانیان داگیر کردبوو. ئەو دەسەڵاتە

تۆتالیتاریانە بەهیچ جۆرێ ماوەی ئەوەیان نەدەدا کۆمەڵی کورد بەئاسوودەیی و بەختیاری بژی، ئەم دیاردە کۆمەڵایەتی و ئابوورییە کە بێزاریی دروست کردبوو لای خەڵکی لەگەڵ ئەوەی کورد سامانێکی نەتەوەیی هەبوو لە وێنەی ئەدەبێکی میللی سەرزاری دەوڵەمەند خۆی دەنواند، لەولاشەوە شیعرێکی کلاسیکی باڵا بەدیالێکتی کرمانجیی سەروو و گۆرانی لە ناوەوە بوو، ئەم دیاردانە بوونە هۆی ئەوەی بزووتنەوەییێکی نوێ لە ئەدەبی کوردیدا بەرپا ببێ.

ئەم بزووتنەوە نوێیە لەسەر بنچینەی هەوڵ و تەقەلای پێشووتر سەری هەڵدایەوە و پەرەی سەند. شاعیرانی ئەم ڕۆژگارە لەبەر ئەوەی خوێندەواری باشیان هەبوو لە زانستییەکانی ئەو سەردەمە و زۆر چاک لە شیعری کلاسیکی ئیسلامەوی (عەرەبی - فارسی - تورکی عوسمانی) گەیشتبوون، وا بوو هەر لەسەر ڕێگە و شوێن تاقیکردنەوەکانی ئەو دەسگایە شیعری کوردی نوێیان دامەزراند، بەشێوەییێکی وا کە وێنەی کۆمەڵی کورد بگرێ و چاکە و خراپە و جوانی و ناشیرینی ئەو کۆمەڵە تێیدا ڕەنگ بداتەوە. بەڕاستی ئەو ئەدەبە وەرنەگیراوە و بەواسیتە دروست نەکراوە، بەڵکو دیاردەییێکی ڕەسەنە و لەدواییدا بەشداری لە دروستبوونی شیعری کلاسیکی ئیسلامەوی کردووە و بەرهەمەکەی خۆشی چۆتە ناو ئەوەوە.

ئەدەبی کوردی ئەو سەردەمە ناوی چەند شاعیرێکی کوردمان بۆ دەور دەکاتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو شیعرانەی لەبەر دەستمانن زۆر کەمن و نەگەیشتوونەتە پلەی شاعیریەتی سێ شاعیرە بەناوبانگەکە نالی و سالم و کوردی، بۆیە تەنیا بەرهەمی ئەم سێ شاعیرە دەبێتە بناغە بۆ نووسینەوەی مێژووی شیعری کوردی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا لە ناوچەی سلێمانی. لە ڕاستیشدا ئەم سێ مامۆستایە دامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیەن و بەشێوەییێکی گشتی بزووتنەوەکە بەهۆی بەرهەمی شیعری سێ شاعیرەکە دروست بووە.

بێ گومان بەرهەمی هەر شاعیرێک لەم سێ شاعیرە سوودی لە ئەوانی تر وەرگرتووە، چونکە لە یەک مەڵبەندا ژیاون و یەکتریشیان ناسیووە، بەڵام بەرهەمی هەریەکێکیانیش سیما و ئەدگاری تایبەتی خۆی هەیە، بەزۆری لە ڕووی ناوەرۆکی شیعرییەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین هەر لەو سەردەمەدا نالی بەمامۆستای شیعر لە قەڵەم دراوە و دەنگوباسی گەیشتۆتە ئەوروپا، بەڕێزەوە سالم ناوی بردووە و بەمامۆستای خۆی زانیوە، هەروەها شاعیرانی نەوەی دووەم نالییان بەمامۆستای خۆیان داناوە، لەم لایەنەوە حاجی قادری کۆیی دەڵێ:

نالی ئوستـــــــادێکی چا بوو

خدری ئاوی حەیاتی مەعنا بوو

بەلای ئێمەوە تەنیا بەرهەمی شیعری بێ وێنەی نالی نەبۆتە هۆی ئەوەی بەمامۆستای شیعر دابنرێ، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا تەمەن کارێکی گەورەی هەیە، بەتایبەتی لەناو کوردەواریدا، جا ئەو تەمەنە با نالی سێ چوار ساڵ لە سالم گەورەتر بێ، لەبەر ئەوە ئەم وەستایەتی و تەمەنە بوونەتە هۆی ئەوەی نالی بەمامۆستا و دامەزرێنەری شیعری کوردستانی باشوور دابنرێ، ئەگینا ئەگەر بێتو تەماشای ناوەرۆکی شیعری نالی و سالم و کوردی بکەین لەوانەیە شیعری سالم پێوەندی لەگەڵ نیشتمانپەروەری و وەزعی



کورد و ڕەنگدانەوەی کۆمەڵی سلێمانی و ڕووخانی میرنشین زیاتر بێ لە ناوەرۆکی شیعری نالی، هەروەها کوڵانی سۆزی دەروونی لە هەندێ شیعری مستەفا بەگی کوردی کەمتر بێ لە ناوەرۆکی شیعری نالی.

بەم جۆرە دەبینین لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا لەبەر ڕۆشنایی تاقیکردنەوەی ئەدەبی کۆنی کوردی و ئەدەبی ئیسلامەوی (عەرەبی - فارسی - تورکی عوسمانی) لە ناوچەی سلێمانیدا ئەم بزووتنەوە نوێیە سەری هەڵدا. شاعیرانی ئەم دەورە نالی و سالم و کوردی بوون بەدامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە. ئەم ڕینیسانسە مەزن و گرنگە لە دواییدا بوو بەسەرچاوەییێک بۆ گۆڕان و پێشکەوتنی ئەدەبی کوردی لە هەموو کوردستانی باشووردا.

## ڕوخساری شیعری کوردستانی باشوور

بەرهەمی شیعری نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم لە ناوچەی سلێمانی بریتییە لە پارچە شیعرێکی لیریکی، ژمارەی دێڕە شیعرەکانی لە پێنج دێڕە شیعرەوە دەگاتە سەد و زیاتریش. لە ئەدەبی کوردیدا هەموو پارچە شیعرێک تا شازدە دێڕ لە ڕووی ڕوخسارەوە (غەزەل)ی پێ دەڵێین. جیاوازییێکی ئەوتۆ لەنێوان غەزەل و قەسیدەدا نییە لە ڕووی ناوەرۆکەوە، تەنیا ئەوە نەبێ قەسیدە زیاتر بۆ مەبەسەکانی موناجات و نەعت و سوارچاکی، یا وەسفی جەنگ، یا بۆ نووسینی نامەی شیعری بەکار دەهێنرێ.

لە ڕووی کێشەوە شیعری کوردی بەغەزەل و قەسیدەوە هەریەکەی لەسەر کێشێک دەهۆنرێتەوە، واتە دێڕی یەکەمی شیعرەکە بەچی کێشێک دەست پێ بکا هەر بەو کێشەش کۆتایی پێ دێ، ئەم قسەیە بۆ قافیەش دەست دەدا، کەوابێ هەموو دێڕە شیعرەکان بەوشەییێک کۆتاییان دێ لەسەر یەک کێش و یەک دوو تیپی دواییان لەسەر یەک دەنگ دەبن. ئەمە و نیوە دێڕی یەکەمی هەموو شیعرێک پێویستە لەسەر قافیەی نیوە دێڕی دووەم و هەموو شیعرەکە بێ.

بێ گومان ڕەوانبێژی عەرەبی (بەلاغە) بەتایبەتی وشەییەکان کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر شیعری کوردی ئەو ڕۆژگارە، ئەم جوانکارییە لە شیعردا هەندێ جار بەوشەی کوردی دەخرێنە ڕوو، هەندێ جاری دیکەش بەوشەی عەرەبی، بەڵام ئەو وشانەی کورد بەکاریان دێنێ شتێک نین دوور بن لە چێژی کوردی، وەکو ئەوەی وشەییێک کە یەک دوو جار دووبارە دەکرێتەوە و هەر جارەی مانایێک دەدا و ڕستەکەی پێ جوان دەکرێ.

شاعیری ئەو ماوەیە دەبوو فەرهەنگی زمانی کوردی ئەو سەردەمە بەکار بێنێ، فەرهەنگەکە هەمووی ئەو وشانە بوون کە لە بنجدا کوردی بوون یا وەرگیرا بوون، واتە وشەکان بێگانە بوون.

لە شیعری کوردیدا بەکارهێنانی وشەی بێگانە بەتایبەتی لەو سەردەمەدا کارێکی گەلێک ئاسایی و باو بوو، بەڵکو پێویست بوو. ئەگەر شاعیرێک وشەی عەرەبی یا فارسی بەکار نەهێنایە، بەتایبەتی ئەو وشانەی لە شیعردا بەکار دەهێنران، یاخود ئەو وشە و زاراوانەی پێوەندییان بەئایین یا سۆفیزمەوە هەبوو، دەڵێین ئەگەر ئەو وشانەی بەکار نەهێنایە بەشاعیرێکی گەورە لە قەڵەم نەدەدرا، هەروەها ئەم خاسیەتە لە

شیعری فارسی و تورکی عوسمانیشدا هەیە، ئەگینا خۆ لە ڕاستیدا ئەو وشە عەرەبی و فارسییانەی شاعیرانی کورد بەکاریان دەهێنا وەنەبێ لە زمانی کوردیدا نەبوو بن، بەڵکو هەندێ جار زۆر بەئاسانی دەتوانرێ هەندێ وشەی عەرەبی و فارسی لە شیعرەکانا دەربهێنرێن و لە شوێنی ئەوانا وشەی کوردی دابنرێن بەبێ ئەوەی شیعرەکە لەنگ ببێ. ئەو وشانەی بەکاریان دەهێنا ئەو وشانە بوون کە خوێندەواری کورد خۆی شارەزایان بوو. ئەوەی شایانی باس بێ مامۆستامان ڕەفیق حیلمی لە (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی)دا تەقەلایێکی زۆری داوە لە پێناوی ڕەخنەگرتن لەو شاعیرانەی وشەی بێگانەیان لە شیعرەکانیانا بەکارهێناوە و، گەلێ جار ئەو وشانە بەدەستەوە دەگرێ و دەڵێ: دەبوو شاعیر لە باتی ئەو وشە بێگانانە ئەم وشە کوردییانە بەکار بێنێ!.

هەر چۆنێ بێ ئەو وشە بێگانانەی شاعیری کورد لە شیعردا بەکاری هێناون (عەرەبی، فارسی، تورکی عوسمانی) ئەگەر بخرێنە ناو فەرهەنگۆکێکەوە، دەتوانین ناوی بنێین فەرهەنگۆکی وشەی بێگانە لە شیعری ئیسلامەوی نەتەوە موسوڵمانەکاندا.

## ناوەرۆکی شیعری کوردستانی باشوور

لە بنجدا شیعر بۆ مەبەسی گۆرانی دادەنرێ، کاری شیعری ئەم سەردەمە دەربڕینی هەستی دڵدارییە، بیری فەلسەفی قووڵ و خەیاڵی ناسک و ئاوازی ڕەوان شیعرەکە جوان دەکەن.

نالەباری ژیانی ئادەمزاد لە کۆمەڵی دەرەبەگیی کۆندا هەمیشە شاعیری خستۆتە گێتییێکی سایکۆلۆجی ئەوتۆ ڕەشبینی دڵ و دەروونی داگیر بکا، نرخ بەدواڕۆژ نەدا، هەروەها سۆزی ئایینی لە لای بەهێز دەبێ. وەزعی ئابووری کۆمەڵ کارێکی وا دەکاتە سەر شاعیر بەچاویلکەی ڕەشبینییەوە تەماشای ژیان بکا، ئەم دیاردەیە لە دڵداریدا ڕوون و ئاشکرایە تا ئەگەر شاعیر لە پێوەندی خۆشەویستیشدا سەرکەوتوو بێ، شیعرەکانی بەپێچەوانە نائومێدی و ڕەشبینییان لێ دەتکێ.

شاعیران وا خۆیان پیشان دەدەن لە یارەکەیان دوورن و هەرگیز دەستیان ناگاتە گەردنیان. ئەم جۆرە شیعرە گەلێ زۆرترن لەو جۆرە شیعرانەی گەشبینی دەپژێنن، یاخود هیچ نەبێ ڕاستی دەردەبڕن لە بابەت ئەوەی لە دڵداریدا سەرکەوتوون.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ڕاستییە لە شیعرەکانیاندا بەرچاو دەکەوێ کە بەشێوەییێکی جوان و سەرکەوتوو شاعیران باس لە ناگزووری ناو کۆمەڵ دەکەن، بیر لە نیشتمان دەکەنەوە، خاکی مەڵبەندی ژیانیان لە هەموو شتێک خۆشتر و جوانترە. لە هەموو جێییێک دڵگیرترە، بەهەشتی سەر ڕووی زەمینە، ڕق و کینیان بەرامبەر دوژمنانی کورد، تورکی عوسمانی و عەجەم، برینێکە بەئاسانی سارێژ نابێ.

قوتابخانەی شیعری کوردستانی باشوور بەڕاستی لە دەوروبەری ژیانی سێ شاعیرەکە نالی و سالم و کوردی گەلێک پێشکەوت، بەتایبەتی لە لایەن ڕوخساری هونەری شیعرەوە، لێرەدا ئەو شیعرە بۆی هەیە وەک داهێنانێکی پێگەیشتوو و کامل بکەوێتە بەرچاو. بەڵام لە ناوەرۆکیدا لە بابەت هونەرییەوە لە پلەییێکی زۆر بەرزدایە کەچی لە ڕووی مەبەس و بابەت و هونەرەکانی شیعرەوە هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو



ڕادەیە. بۆ بەڵگە ئەو مەبەسە بنچینەییانەی کە دەبوو لە شیعری کوردیدا ببینرێن، وەکو لە ئەدەبی نەتەوەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (عەرەب و عەجەم و تورکی عوسمانی) جێگەی شیاویان هەیە، داشۆرین و پێدا هەڵدان و شانازیکردن لە ئەدەبی کوردی ئەو ڕۆژگارەدا کەمە.

ڕاستە نالی گەلێ شانازی بەخۆیەوە کردووە، بەڵام بەبنەماڵەی خۆی و خەڵکی تری نەکردووە، بەڵکو شانازی بەوەوە کردووە کە شاعیرێکی گەورە و بێ هاوتایە. یا سالم کە مەدح دەکا، مەدحی خۆی ناکا، بەڵکو بەسەر پاڵەوانانی جەنگ و گەورە پیاوانی کورد هەڵدەڵێ، ئەوانەی نەبەردانە دژی دوژمن دەجەنگان بۆ ئەوەی سەربەستی و ئازادی نیشتمان بپارێزن.

# بەشی پێنجەم

## نالی ١٨٠٠-١٨٥٦

### وشەی (نالی) مانای چییە؟

خدر کوڕی کەلاش خوارێکی هەژاری نەناسراوی شارەزووری، کە بووە بەشاعیر ناوی (نالی) لە کوێ دۆزیوەتەوە و کردوویەتی بەنازناوی شیعری خۆی؟

١- وشەی (نالی) لە دیالێکتی زەردەشتیانی ناوچەی کرمانی ئێران وەک لە (فرهنگ بهدینان) هاتووە، ئەم مانایانەی گرتۆتە خۆ: دۆشەک، نوێن، ڕایەخی نوستن، ئەو چەرچەفەی لەسەر دۆشەک ڕادەخرێ، ئەو تەختەی بۆ نوستن بەکار دەهێنرێ.

٢- وشەی (نالی) نیسبەتە بۆ وشەی (نال)، ئەمە لە کۆمەڵێک فەرهەنگی جیاوازدا، بەتایبەتی لە (برهان قاطع) و (مکمل عثمانلی لغتی) بەم مانایانە هاتووە: قامیشێک ناوی بۆش بێ، قەڵەمی نووسین، ئەو تاڵە باریکانەی لەناو قەڵەمی قامیشدایە، هەروەها بەو قامیشە ناو بتەوەش دەڵێن کە تیری لێ دروست دەکرێ، قامیشی شەکر، جۆگەلە، زێی بچووک و گەورە، ناوی باڵندەیێکی بچووکە دەنگ و ئاوازی خۆشە، ئەو قامیشەی قەڵەمی لێ دروست دەکرێ، نووکی قەڵەم، شمشاڵ، نای، دووزەلە.

٣- ئەگەر وشەی (نالی) لە (نالە)وە دروست کرا بێ وەک نیسبەت ئەمەیان بەپێی دەستووری زمان ڕاست نییە، چونکە نیسبەتی (نالە) (نالەیی) دەبێ. شاعیری ئێمە ناوی خۆی نەناوە (نالەیی) بەڵکو (نالی). لەگەڵ ئەمەشدا (نالە) لە زمانەکانی بنەماڵەی ئێرانی لە مەسدەری (نالین)ەوەیە، هەروەها لە زمانی پەشتووی ئەفغانستان بەمانای شیوی تەسک، بەست هاتووە. لە (فرهنگ کاتوزیان)دا بەمانای قامیشی شەکر، نووکی قەڵەم، زێی گەورە و بچووک، وەک ناوی باڵندەیێکی خۆش ئاواز هاتووە.

ئەمە لە بارەی وشەکانی (نال) و (نالە) و (نالی)یەوە، بەڵام وشەی (نالی) و (نالە) وەک ناو و نازناوێک جگە لە خدری خەڵکی شارەزووری ئێمە؛ چەند کەسێکی دیکەش هەن ئەم وشانەیان وەک ناو یا نازناو هەڵگرتووە، لەمانە:

١- پیر نالی مۆردینی بەپێی کتێبی سەرەنجام یەکێکە لە حەفتاودوو یارانی سوڵتان سەهاک، لە گوندی مۆردین لە دایک بووە، لە گوندی شێخان ماوەیێک لە لای سوڵتان سەهاک لەنێوان سەدەی سێزدەم و چواردەمدا ژیاوە. هەندێ لە شیعری ئایینی یارسان دەدرێتە پاڵ پیر نالی مۆردینییەوە.

٢- نالی قۆنەوی، ناوی محەمەدی کوڕی عوسمانی قۆنەوی ڕۆمی حەنەفییە، نازناوی (نالی) بووە. لە ساڵی ١٧٧٢م کۆچی دوایی کردووە، دەسنووسێکی هەیە بەناوی (تحفه‌ء امثال نالی).



٣- نالە، نازناوی مەلا محەمەد ئەفەندییە، ئەم زاتە خەڵکی بەغدا بووە، لە ئەستەموولّ ژیاوە، هەندێ وەزیفەی لە دەوڵەتی عوسمانیدا دیوە، لە ساڵی ١٨٢١ ڕووی کردۆتە هیندستان و لە شاری لکهنۆ زیندەگانی کردووە، لە شاعیرە چاکەکانە، شیعری لە (صبح گلشن)دا هەیە.

٤- نوێنەری شاری موناستیری بەشی ئەورووپی دەوڵەتی عوسمانی لە ئەنجوومەنی مەبعووسان (پەرلەمان)ی عوسمانی لە ئەستەموولّ ناوی تریان نالی ئەفەندی بووە، وێنەی لە کۆواری (رسملی کتاب)ی عوسمانی لە ١٠ی تەمووزی ١٣٢٥ بڵاو کراوەتەوە.

شاعیری ئێمە ڕەنگە ئەم هەموو زانیارییانەی لە بابەت وشەی (نالی)یەوە نەزانی بێ، بەڵام بێ گومان ئاگاداری ئەوە بووە کە وشەی (نال) پێوەندی بەزانیاری و خەیاڵ و چێژ و مۆسیقاوە بووە، لەبەر ئەوە (نالی) بۆ نازناوی هەڵبژاردووە.

### نالی کێیە؟

ئەو زانیارییانەی لە بارەی ژیانی نالییەوە تۆمار کراون، ئێستا هەمووی کە بەسەریەکەوە تەماشا دەکرێ، وەک کۆمەڵێک ئاگا و ڕووداوی بێ سەروبەر و پێچەوانەی یەکتری دەکەونە بەرچاو. ژیانی شاعیر لەناو تەمومژی نەبوونی سەرچاوەی ڕەسەن و تاریکایی کەمی زانیاریی باوەڕ پێ نەکراو ون بووە. شیعری نالی سەرچاوەی یەکەم و هەرە گرنگی دۆزینەوەی کەسایەتی خاوەنەکەیەتی، ئەم شیعرەش وەکو ژیانی شاعیر ئەوەندە لە گێتیی نهێنی و ڕەمز و داخراوی وشە و گەمەی ڕەوانبێژیدا نوقوم بووە تەنیا مەگەر تروسکاییێک بەردەمان ڕووناک بکاتەوە و بتوانین چۆرێک لە ژیان و فەلسەفەی ئەم شاعیرە بگەین.

ئەو بڕە ئاگا و هەواڵانەی لە بابەت ژیانی نالییەوە لە ناوەوەن بێ گومان شتێکی زۆر کەمن. لە ئامۆژگا و خوێندنخانەکانی ڕۆژهەڵاتناسی ئەورووپا هێشتا ناوبانگی تەواوی دەرنەکردووە. ئەوەی بەکوردیش لەسەری نووسراوە هێشتا هەر وەکو سەرەتاییێک دەکەوێتە ڕوو بۆ ناسینی نالی. ناوبانگی شاعیر لە کوردستانا وەنەبێ هۆی لەو نووسینانەوە هاتبێ کە لەسەری نووسراون، بەڵکو شیعری نالی پلە و پایەیان بڵند کردووە و بووە بەیەکێک لە هەرە خۆشەویستەکانی میللەتی کورد.

ئێمە لەم ماوەیەدا هەوڵ دەدەین لە ئێستگە گرنگەکانی ژیانی نالی بوەستین، دوور لە موبالەغە و بۆچوونی نالۆجیکی، بەپێی ئەو سەرچاوانەی لە بەردەستدان، بەزۆریش قسەکانی خۆی کە لە هەندێ لە شیعرەکانی خۆیدا دەری بڕیوون.

نالی ناوی خدر کوڕی ئەحمەد شاوەیسە، لە تیرەی ئالی بەگی مکاییلی عەشرەتی جافە، لە گوندی خاک و خۆڵ، لەناو جەرگەی شارەزوور، لە نزیک ڕووباری تانجەڕۆ لە ساڵی ١٨٠٠م لەدایکبووە. باوکی ڕەنجبەرێکی عەشرەتی جاف بووە، لە بنەماڵەیێکی بەدیمەن و ناودار نەبووە. هیچ زانیارییێک لە بابەت دایکییەوە لەناوەوە نییە، وا دەردەکەوێ تاقانەی باوک و دایکی بوو بێ. باوکی زوو مردووە و دایکی بەبێوەژنی تاقانەکەی پێگەیاندووە. لەناو کوردەواریدا ئەوە باو بووە دایکی بێوەژن نێرینەی تاقانە بخاتە

بەر خوێندن. بەم پێیە سەرەتای خوێندنی حوجرەی لە خاک و خۆڵ بووە، دەبێ ماوەی منداڵیی لەوێ بردبێتە سەر، چونکە یاد و بیرەوەری هەیە لەگەڵ مەڵبەندی لە دایکبوونی، بەخۆشەویستی و سۆز و شەوقەوە ناوی دەبا.

لە سەردەمی لاویەتیدا شاعیر چووە بۆ قەرەداغ، لەو ڕۆژگارەدا ئەو ناوچەیە نێوەندێکی گرنگی زانستییەکانی ئایینی ئیسلامی و زمانی عەرەبی بوو. مەلای کوردی چاکی لێ بووە، لەناو کوردەواریدا بەناوبانگ بوون. وا دەگێڕنەوە گۆیا شاعیر لە قەرەداغ حەزی لەکەنیشکێک کردووە ناوی (حەبیبە) بووە، ئەو کیژە ناوی لە شیعری نالیدا هاتووە، بەڵام بەجۆرێک ناوی هێناوە، دەکرێ کیژێک بێ ناوی (حەبیبە) بێ، هەروەها دەکرێ وشەکە وەک وشەیێکی عەرەبی (حەبیبە) وەرگێڕانە کوردییەکەی (خۆشەویست) یا (دولبەر) بێ و شاعیر بەخەیاڵ وەک بووکی شیعر دروستی کردبێ. هیچ بەڵگەیێک بەدەستەوە نییە حەبیبەی هێنا بێ، یا هەر ژنیشی هێنا بێ، بەڵام ئەوە هەیە شاعیر شارەزاییێکی تەواوی لە ئەندامە نهێنی و شارراوەکانی ژن هەیە، بەهیچ جۆرێ ناکرێ ئەگەر لە نزیکەوە تێکەڵی ژن نەبووبێ ئەو شتانە بزانێ. ئەمە و لە گەشتە دوورودرێژەکانی کە لەدواجار لە ئەستەموولّ نیشتۆتەوە ژنی لەگەڵدا نەبووە.

نالی بۆ تەواوکردنی خوێندن ڕوو دەکاتە سلێمانی، لە مزگەوتی سەید حەسەن لە لای زانای بەناوبانگ مەلا عەبدوڵڵای ڕەش خوێندنی تەواو دەکا و ئیجازەی دوازدە عیلمی وەردەگرێ، وە ئاموشۆی خانەقا دەکا، کە بەخانەقای مەولانا ناسرا بوو وەک خۆی لە شیعرەکانیدا دەری دەبڕێ. لەوانەیە وەکو نەریتی ئەو سەردەمە نالیش هەندێ شوێنی کوردستان گەڕابێ بۆ خوێندن، بەڵام هیچ بەڵگەیێک بەدەستەوە نییە و ناوی هیچ جێگەیێکیش نەهاتووە سەری دابێ یا ماوەیێک بەشێک لە خوێندنەکانی تێدا بردبێتە سەر. وەکو لە سەرچاوەکاندا دەردەکەوێ، نالی لەدوای ئیجازە وەرگرتن لە مزگەوتی سەید حەسەن بەمەلایی ماوەتەوە، هەتا دواڕۆژی ژیانی لە سلێمانی لە حوجرەی ئەو مزگەوتە بووە. مەلا محەمەدی قزلجی ئەو شایەتییە دەدا و ئەوە دەگەیەنێ کە شاعیری بەناوبانگی کورد مەلا خدری نالی لە مزگەوتی سەید حەسەندا ژوورێکی تایبەتیی خۆی هەبووە، پاش ئەو نەگبەتییەی بەسەر بابانەکاندا هات لە سلێمانی دەرچوو و نەگەڕایەوە.

دیارکردنی کاتی ئەم نەگبەتییە کارێکی ئاسان نییە، ئەگەر مەبەس لەم نەگبەتییە تێکچوونی میرنشینی بابان و ئاوارەکردنی ئەحمەد پاشای بابان بێ لە میریەتی، ئەمە لە ساڵی (١٢٦٠ھ/١٨٤٤م) ڕوویداوە، خۆ ئەگەر مەبەس لە ڕووخانی میرنشینی بابان بێ بەلەناوچوونی بەتەواوی و دانیشتنی فەرمانبەری عوسمانی لە سلێمانی لەباتی کورد وەکو قەزایێک لە ویلایەتی مووسڵ یا شارەزوور ئەو مێژووەش دەکاتە (١٢٦٧ھ/ ١٨٥٠-١٨٥١م). بەلای ئێمەوە نالی دوای ساڵی ١٨٤٤م لە پاش لابردنی ئەحمەد پاشا و دامەزراندنی عەبدوڵڵا پاشا لە جێگەی ئەو لە لایەن دەسەڵاتی عوسمانییەوە هێشتا لە سلێمانی بووە و بۆ هیچ لایێک باری نەکردووە، بەڵکو لەو کاتەی دەسەڵاتی عوسمانی عەبدوڵڵا پاشای لابردووە و پیاوی خۆی لە جێی داناوە، واتە لە ساڵی ١٨٥٠-



١٨٥١ نالی لە سلێمانی دەرچووە. لەپێشانا ڕێگەی حەجی گرتووە و لەپاشانا گەڕاوەتەوە شام و ماوەیێک لەوێ ماوەتەوە. شیعرە بەناوبانگەکەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم...)ی بۆ هاوڕێیان و خەڵکی سلێمانی نووسیوە، لەو کاتەی کە سوپای عوسمانی داگیری کردبوو.

کە وەرامی شیعرەکەی لە خەڵکی سلێمانی بەناوی شیعرێکی سالم (جانم فیدای سروەکەت...) وەردەگرێتەوە و بۆی دەردەکەوێ سلێمانی پەرێشان و شپرزەیە، یەکسەر پشت دەکاتە شام و ڕێی ئەستەموولّ دەگرێ و تێیدا بزر دەبێ.

لە بابەت ژیانی نالییەوە لە شام ڕۆژهەڵاتناسی ڕووس مامۆستای ئەدەبیاتی سلاڤی لە ئامۆژگای فرەنسا ئەلێکساندر خۆدزکۆ لەو سەردەمەدا لە پاریس دەژی، لەم لایەنەوە زانیاری بەنرخ بەدەستەوە دەدا. خۆدزکۆ لە پاریس خەریکی نووسینەوەی باسێک دەبێ لە بابەت دیالێکتی کرمانجیی خوارووی ناوچەی سلێمانی لە ڕووی زمانەوانییەوە. ئەحمەد پاشای بابان لەو ماوەیەدا بەنەخۆشی لە پاریس لەسەر پزیشک دەبێ. خۆدزکۆ بۆ مەبەسی لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکەی خۆی ناسیاوی لەگەڵ ئەحمەد پاشادا پەیدا دەکا. لە ساڵی ١٨٥٣وە تا دوایی ساڵی ١٨٥٤ ئەحمەد پاشا یارمەتی خۆدزکۆ دەدا. ئیتر خۆدزکۆ لە دەمی ئەحمەد پاشاوە دەگێڕێتەوە، گۆیا لە سووریا یا بەتەواوی لە شاری دیمەشق (شام) زانایێکی کورد دەژی ناوی مەلا خدر ناسراو بەنالی ئەفەندییە، هەروەها ئەحمەد پاشا بەڵێن بەخۆدزکۆ دەدا لەدواڕۆژدا نالی ئەفەندی برادەری خۆی بەخۆدزکۆ بناسێنێ.

بەم جۆرە ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە لە ساڵانی ١٨٥٣-١٨٥٤ نالی لە شام بووە. بەم پێیە دەکرێ بڵێین نالی لەدوای ڕووخانی میرنشینی بابان بەتەواوی لە ساڵانی ١٨٥٠-١٨٥١ بەڕێگەی مووسڵ و شام و قودسەوە چووە بۆ حەج لەدوای یەک دوو ساڵ لە شامەوە ڕووی کردۆتە ئەستەموولّ. وەک خۆدزکۆ دەڵێ یارمەتی زانستی و زمانەوانی لە ئەحمەد پاشا وەرگرتووە تا دوایی ساڵی ١٨٥٤م. ئیتر ئەحمەد پاشا کە لە پاریس گەڕاوەتەوە ئەستەموولّ لە ساڵی ١٨٥٥م کراوە بەمیرمیرانی یەمەن تا ساڵی ١٨٦٣.

ژیانی نالی لە ئەستەموولّ زۆری نەخایاندووە، هەروەها شیعری وای نالیمان نەکەوتۆتە بەردەست باس لە کۆمەڵی ئەستەموولّ بکا، یا بۆنی دەسەڵاتی عوسمانی لێ بێ، وا دەردەکەوێ لەوێ خۆی لاتەرێک گرتبێ و لەناوەوەی خۆی لە حەژمەت دووری لە شارەزوور و سلێمانی تلابێتەوە و توابێتەوە. تا لە ساڵی ١٨٥٦ لە ئەستەموولّ کۆچی دوایی کردووە. شوێنی گۆڕی دیار نییە.

### کێ نالی ناسیوە؟

ئەوانەی نالییان لەم سەدەونیوەی دواییەدا ناسیوە ژمارەیان زۆرە، هەندێکیان لە شاعیر نەگەیشتوون، هی دیکەیان تا ڕادەیێک لە شاعیر گەیشتوون، بەڵام کەمیان لەسەر نووسیوە. ئەمانە بڕێکیان بەرهەمی شاعیریان بڵاو کردۆتەوە، هی دیکەیان لەسەریان نووسیوە، تێیاندا هەیە هەردووکی کردووە. بەرهەمی بڵاو کردۆتەوە و بیروڕای خۆشی بەرامبەر دەربڕیوە.

لەو دواییـیـەدا، واتە لەدوا سـالآنی سەدەی بیـسـتـەم و سـەرەتای سەدەی بیـست و یەکەم نووسـینی وا پەیدا بووە لە لایێکی دیکەوە تەمـاشـای نالی دەکـا، لە بەرتیـشـکی برێک بۆچوونی سـایکۆلۆجی و سۆسیـۆلۆجی زاراوەی تیـۆرییـەکانی فـەلسـەفە و ئەدەب کە لە ئەنجامی هەڵسـەنگاندنی بەرهەمی ئەدەبی ئەوروپا هاتوونەتە ناوەوە. لە گەلێ کاتدا ئەو بۆچوونانە لەگەڵ هەڵسوکەوت و جەوهەری دروسـتبوونی بەرهەمی ئەدەبی کوردی یا ئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ناگونجێن. بەهەمـوو شێـوەییێک ئەو جۆرە نووسینانەی لەم بابەتەوە وەک لێکۆڵینەوە لە شیـعری نالی پێوەندییان بەم کارەی ئێمەوە نییە کە نووسینەوەی مێژووی ئەدەبە، لەوانەیە بۆ ڕەخنەی ئەدەبی و ئەدەبی بەراووردکاری دەست بدەن.

لەم مـاوەیەدا یادی هەندێ لەو کـەسـانە دەکـەینەوە کـە دڵسـۆزانە هۆگـری نالی بوون، قـسـەییێکیـان بۆ کردووە، یا شیعرێکیان بڵاو کردۆتەوە.

نالی هێشتا لە ژیاندا بووە کە لە کۆمەڵی سلێمانی ناسراو بووە. یەکەمین کەس کە زۆر بەڕێزەوە ناوی هێناوە عەبدولڕەحمان بەگی سالمی هاوڕێی بووە، بەشیعرێکی جوان (جانم فیدای سروەکەت...) وەرامی قەسیدەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم...)ی نالی داوەتەوە.

لە سەردەمی ژیانی شاعیرەوە تا ئێستا کەم شاعیر لەناو کوردەواریدا بووە ناوی نالی نەهێنابێ، لەناو ئەمـانەدا جێگەی حاجی قـادری کـۆیی دیارە. زیاتر لە دە جێگە لە شـیـعـری ناو دیوانیـدا یـادی نالی کردۆتەوە و بەچاوێکی بەرز تەماشای کردووە و بەگەورەی شاعیران ناوی بردووە.

عـەبدولکەریمی سلێـمـانی لە سـاڵی **١٩١٣** لە ئەسـتـەمـووڵ لە کـۆواری (ڕۆژی کـورد)دا یادی نالی کــردۆتەوە و چەند پارچە غــەزەلێکی بڵاو کــردۆتەوە. عــەبدولکەریم سلێـــمـــانی بەم جــۆرە نالی هەڵدەسەنگێنێ: لە مەسلەکی ئەشعاردا نالی و ڕەفیقانی ئیمرۆ قەومی کوردیان ئیحیا کردەوە، فەقەت مەعەلئەسەف لە دیوان و تەئلیفات و ئەشعاری ئەم زاتانە بێ خەبەرین.

ئەمین فـەیزی لە ئەسـتـەمـووڵ لە سـاڵی **١٩٢٠** کـتـێـبی ئەنجـوومـەنی ئەدیبـانی کـوردی لە چاپ داوە، هەندێ بیروڕای بەرامبەر بەشاعیرەوە دەربڕیوە و کۆمەڵێک شیعری بڵاو کردۆتەوە. لەدوای دروسـتبوونی دەوڵەتی عـیـراق (**١٩٢١**) ڕۆژنامەگەری کوردی (ڕۆژنامە و کۆوار) لە بەغـدا و شـارەکـانی کـوردسـتـانی عـیراق بایەخێکی زۆریان بەنالی داوە لە سەرەتاوە تا ئێسـتـا. دیوانی نالی تا ڕۆژی ئەمـڕۆ ئەم چاپانەی بەخۆیەوە دیوە:

١- دیوانی نالی، چاپی (کوردی و مـەریوانی) لە بەغـدا لە سالّی **١٩٣١**؛ لە بابەت ئەم دیوانەوە لە د. محەمەد محەمەد سالّحم بیست، ئەویش لە ئەمـەریکا لە تاهیر بەهجەت مەریوانی بیستبوو، وتبووی لە کاتی خۆیدا دەسنووسێکی دیوانی نالییان بۆ ناردین بۆ چاپکردن، لەگەڵ دەسنووسەکە بەجیاوازی مێژووی ژیانی شاعیریان بۆ ناردین، وابوو لەگەڵ دیوانەکەدا چاپمان کرد.

٢- دیوان نالی شاعـر شهـیر کرد، چاپی (عـەلی موقبـیل سـەنەندەجی) لە سالّی **١٩٤٨/١٣٢٧** چاپ کراوە.

٣- دیوانی نالی یادگاری مەلا خضری شارەزوورییە، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، **١٩٦٢**.



٤- دیوانی نالی یادگاری مەلا خضری شارەزوورییە، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، **١٩٧٤**.

٥- دیوان نالی شاعـر شهـیر کرد، چاپی کیـتـابفرۆشی و چاپخانـەی مووەفـەقی لە مەهاباد، **١٩٦٧** (ئەم چاپەی مەهاباد ئۆفسێتی چاپی سالّی **١٩٦٢**ی هەولێرە).

٦- دیوانی نالی هۆنراوەی مـەلا خدری شارەزوورییە، چاپی کـتـێـبفرۆشی سـەیدیان لە مەهاباد (ئەم چاپە ئۆفسێتی چاپی سالّی **١٩٧٤**ی هەولێرە).

٧- دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مـەلا عبدالکریمی مدرس و فـاتح عبدالکریم، پێداچوونەوەی مـحـمـدی مـەلا کـریم، بەغـدا، **١٩٧٦**، ئەم چاپەی دیوانی نـالی تەنیـا بڵاوکـردنەوە نیـیـە، بەڵکو لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەیە وەکو خاوەنەکانی دەڵێن؛ لەم لایەنەوە بڵاوکەرەوەکانی دیوانی نالی دوو لایەنی شـیـعـری نالیـیـان ڕوون کـردۆتەوە، یەکـەمـیـان وێنە ڕەوانبـێـژییـەکانی شـیـعـری شاعـیـریان دەستنیشـان کردووە، دووەم ئیشارەتە شارراوەکـانیان پیشـان داوە کە شاعـیر پەنا دەباتە بەر ئایەتی قورئـان. ئەم دوو جۆرە لێکۆڵینەوەیە لە ئەدەبدا دەچێتە ناو زانستییەوە، ڕەوانبێژی دەستووری خۆی هەیە وەکو زانستییەکانی تری ئەدەب: عـەرووز و کێشی سیلابی و قافیە و هەندێ لایەنەکانی تری زانسـتیی ڕەخنە. لایەنە زانسـتییەکان لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا چەندە گرنگە؛ لەو گرنگتر لایەنی چێژ و خەیاڵ و زانیاریی ئەنسیکلۆپیدییە بەتایبەتی بۆ نالی.

٨- دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی مارف خەزنەدار، بەغدا، **١٩٧٧**.

پیرەمێرد لە سالّی **١٩٣١** بەهۆی بڵاوکردنەوەی چاپی یەکەمی دیوانی نالییەوە وتارێکی لە ڕۆژنامەی (ژیان) بڵاو کـردەوە بەناوی (خدمـەتێکی بێ هەمـتـا بەمـوناسـەبەتی تەبعی دیوانی نالییـەوە)، وتارەکە بریتییە لە سۆزێکی ڕۆمانتیکییانە خراوەتە ناو قالّبی وەسفێکی خەیاڵاوی لە بابەت دەرچوونی نالی لە سلێمانییەوە بۆ وڵاتی ئاوارەیی.

شاعیری کەرکووک هیجری دەدەی کاکەیی لە سالّی **١٩٣٥** لە شیعرێکیدا یادی نالی و مستەفا بەگی کوردی دەکاتەوە، بەچاوێکی بەرز تەماشایان دەکا و بەشاعیری بەرز ناویان دەبا.

مـحـەمەد ئەمین زەکیی مێـژوونووس لە سالّی **١٩٣٩** لە کـتـێـبی (تاریخ سلێـمـانی و وڵاتی)دا، لە فەسڵی زانا و شاعیر و گەورە پیاوانی سلێمانی کە ناوی نالی دەهێنێ، دەڵێ: لەدوای وەفـاتی سلێمان پاشـا و بوونی ئەحـمـەد پاشـا بەئەمـیـر، تەعـزیە و تەبریکێکی مـەنزوومی بۆ نووسـیـوە کـە حـەقـیـقـەت وێنەییێکی مومـتـازی شـیـعـر و ئەدەبە. مـەبەسی ئەمین زەکی شـیـعـرە بەنـاوبانگەکەی نالـییـە (تا فـەلەک دەورەی نەدا...).

جـەلادەت بەدرخـان بەناوی (هەرکـۆل ئازیزان)ەوە لە کـۆواری (هاوار)دا لە سـالّی **١٩٤١** یادی نـالی دەکاتەوە لە شاعیرە کلاسیکییە گەورەکانی ئەدەبی کوردی کۆنی دەژمێرێ.

عـەبدوڵڵا گۆران بەهۆی یادی کـۆچی دوایی پیـرەمـێـردەوە وتارێکی نووسـیـوە، تێـیـدا نالی بەگـەورەی شـاعـیران حسێب دەکا، ئەمە لـە کتێبی (یادی پیـرەمێرد) لە بەغدا لە سالّی **١٩٥١** چاپ کراوە و بڵاو

کراوەتەوە.

عەلائەدین سەجادی دەوری دیاری هەیە لە نووسینەکانیدا لە بابەت ڕوونکردنەوەی هەندێ لایەنی ژیانی نالی و لێکدانەوەی بڕێک لە شیعرەکانی، بەتایبەتی لە کتێبەکانی (مێژووی ئەدەبی کوردی) و (ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی) و (دوو چامەکەی نالی و سالم).

نووسەری ئەم کتێبە مارف خەزنەدار لە شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە لە ژیانی وڵاتی ڕووسیا و باکووری ئەفەریقا و ئەوروپا و ژیانی ناوەوەی نیشتمان کاتێکی زۆری ژیانی ڕۆشنبیری بۆ نالی تەرخان کردبوو. کۆمەڵێک وتار و باسی لە ڕۆژنامە و کۆوارەکاندا بەزمانانی کوردی و عەرەبی و ڕووسی بڵاو کردۆتەوە. هەروەها بەساڵ بەرنامەی تایبەتی هەبووە لە بابەت نالییەوە لە ئێستگەی ڕادیۆی بەغدا و تەلەڤیزیۆنی کەرکووک. ئەمە جگە لە کتێبی (نالی لە دەفتەری نەمریدا) لە بەغدا لە ساڵی ١٩٨١دا بڵاو کراوەتەوە.

مەسعوود محەمەد لە حەفتاکانی سەدەی بیستەمەوە خۆی لەگەڵ نالی خەریک کردبوو، زیاتر لە بارەی لێکدانەوە و شیکردنەوەی هەندێ لە شیعرە داخراوەکانیدا. لەم کارەیدا جاری وا هەیە شیعرێکی داخراو هەڵدەبژێرێ، لە کاتی لێکۆڵینەوەکەیدا بۆچوونەکانی لەباتی ئەوەی داخراوەکە بکەنەوە، بۆچوونەکانی خۆی لە شیعرەکەی نالی داخراوتر دەکەونە بەرچاو، بەم جۆرە هیچ بەدەستەوە نادەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ بۆچوونی ماقووڵی هەیە، دەکارێ خۆی وەک ئەندامێک لەناو کۆڕی نالی ناس و نالی زانەکان لە قەڵەم بدا، کاری دیاری لەم لایەنەوە لە کتێبی (چەپکێک لە گوڵزاری نالی)دا دەبینرێ.

ساڵی ١٩٨٤ ساڵێکی هات بوو لە بەهاری ڕۆشنبیری کوردیدا، لەو ساڵەدا سێ کتێب لە بارەی نالییەوە بڵاو کراوەتەوە. یەکەمیان لە دانانی عەبدولخالیق مەعرووف بوو، (دیوانی نالی و کێ ڕاستە؟). کتێبەکە ناوبژییێکە لە بابەت ئەو دیوانەی نالی کە نووسەری ئەم کتێبە بڵاوی کردبووەوە و ئەو ڕەخنانەی لێی گیرابوون. لەبەر ئەوەی کتێبەکەی عەبدولخالیق مەعرووف وەک بەرگرییێک دەکەوێتە بەرچاو لە دانەری ئەم کتێبەی بەردەستت، ئێمە بیروڕای خۆمان بەرامبەری ناخەینە ڕوو و باشتر وایە خوێندەوار و ئەوانەی بایەخ بەئەدەبی کوردی و بەتایبەتی نالی دەدەن ئەو کتێبە بەوردی بخوێننەوە.

دوور لەو مەسەلەیە، عەبدولخالیق مەعرووف بلیمەتێک بوو، کەم پیاوی وا هەڵدەکەوێ، نالی زانێک بوو لە نالی زانە هەرە دیار و گەورەکانی کورد.

کتێبی دووەم و سێیەمی ئەو ساڵە بەپیت و بەرەکەتە (١٩٨٤)، یەکەمیان بەناوی (نالی لە دادگای ڕەخنەدا) بوو لە لایەن ڕەئووف عوسمانەوە نووسرا بووەوە. دووەمیان بەناوی (نالی و زمانی یەکگرتووی کوردی) بوو لە لایەن کەریم شارەزاوە بڵاو کرابووەوە. ئەم دوو کتێبە کەلێنێکیان لە لێکۆڵینەوە و ڕوونکردنەوەی هەندێ لە لایەنە نهێنی و داخراوەکانی گێتیی نالی پڕ کردۆتەوە. ناوبانگی نالی کەم و زۆر لە قوتابخانە و دەسگا زانستییەکانی ڕۆژهەڵاتناسی ئەوروپادا لە ناوەوە بووە. هێشتا لە ژیاندا بووە لە شام کە بەهۆی ئەحمەد پاشای بابانەوە ڕۆژهەڵاتناس ئەلێکساندر خۆدزکۆ ناوبانگی بیستووە (١٨٥٣)، ئیلیا سۆن لە ساڵی ١٩١٣ باسی نالی کردووە و نموونەی شیعری بڵاو کردۆتەوە. ڤلادیمیر



مینۆرسکی لە ساڵی ١٩١٥دا نالی بەشاعیرێکی گەورەی کورد لە قەڵەم دەدا و هەندێ لە غەزەلەکانی بڵاو دەکاتەوە.

باسیلی نیکیتین لە ساڵی ١٩٥٦ لە کتێبە نایابەکەی (کورد لێکۆڵینەوەیێکی سۆسیۆلۆجی – مێژوویی) بەزمانی فرەنسی باس لە ئەدەبی کوردی دەکا، لەناو شاعیری کورددا جێگەی دیاری بۆ نالی تەرخان کردووە. سیسیل ئەدمۆندس لە ساڵی ١٩٥٧ لە کتێبی (کورد و تورک و عەرەب)دا کە باس لە ئەدەبی کوردی دەکا، لەناو گەورە شاعیرانی کورد ئاماژە بەنالی دەکا.

نووسەری ئەم کتێبە دەوری هەیە لە ناساندنی نالی بەکۆمەڵی ڕووس و ڕۆژهەڵاتناسی لە وڵاتی ڕووسیا. لە کارەکانی بەزمانی ڕووسی (دامەزرێنەری قوتابخانەی کلاسیکی نوێ لە کوردستانی باشووردا) لە کتێبی کۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناسی لە ساڵی ١٩٦٦ لە لینینگراد (سانت پیتر سبورگ) چاپ کراوە، هەروەها لە کتێبی (بەکورتی مێژووی ئەدەبی کوردی نوێ) لە ساڵی ١٩٦٧ لە مۆسکۆ چاپ کراوە، لەم لێکۆڵینەوانەدا بەزمانی ڕووسی دانەر بایەخێکی زۆری بەژیان و بەرهەمی شیعری نالی داوە. جگە لەو کوردناس و ڕۆژهەڵاتناسانەی باسیان لێوەکرا، کەسانی تریش هەن، وەکو تۆما بوا و جۆیس بلوو باسی ئەدەبی کوردییان کردووە، بەتایبەتی ناوی نالییان هێناوە، بەڵام زانیارییەکانیان سادە و سەرپێیین، ڕەسەنایەتییان تێدا نییە، لەبەر ئەوە نابن بەسەرچاوەی ڕاستەقینە، ڕەنگە لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە کەڵکیان هەبێ. لە سەردەمی ژیانی نالی و لەدوای ئەویش قوتابییان و نالی دۆستان شیعری ئەو شاعیرەیان نووسیوەتەوە. دەفتەری شیعری واتە دەسنووس ئەم دەست و ئەو دەستی کردووە، شیعری نالییان لەبەر دەفتەری ڕەشنووس و پاکنووس تۆمار کردووە، بەم جۆرە کۆمەڵێک دەسنووسی بەنرخ لە ناوەوەی نیشتمان و لە نامەخانە گەورە و گرنگەکانی ئەوروپادا پارێزراون.

لە کوردستانی باشووردا بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانی و سنە و موکریان بەزۆری تەواوی دیوانی نالی بەرچاو دەکەوێ کە لە دەسنووسێکدا تۆمار کرا بێ، بەدەگمەن شیعری شاعیرانی دیکە لە دەسنووسێکی تایبەتیدا دەبینرێن، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ دەسنووسێکی شیعری کوردی بەگشتی (بەیاز) و کەشکۆڵێکی شیعر نابینرێ شیعرێک یا زیاتر لە شیعرێکی نالی نەگرتبێتە خۆی. بەپێویستی دەزانین بەکورتی باس لە هەندێ لەو دەسنووسانە بکەین کە بەچاوی خۆمان دیومانن، ئەگینا ئەوەی ناوبانگیانمان بیستووە گەلێ زۆرن:

١– دەسنووسی Ms. or. oct. 1909 SB Marburg - Berlin لە ئەڵمانیا، شیعری تێدایە لە دیوانە چاپکراوەکانی نالی بڵاو نەکراونەتەوە، بەپێی قسەی ئۆسکارمان ئەم دەسنووسە لە ساڵی ١٨٨٠دا نووسراوەتەوە.

٢– دەسنووسی دیوانی نالی لە لایەن مەلا عەبدوڵڵا لە ساڵی ١٣١٦ھ/ ١٨٩٨م دا ڕوونووس کراوە.

٣– دەسنووسێکی دیوانی نالی لە ساڵی ١٣١٧ھ/ ١٨٩٩ نووسراوەتەوە، مینۆرسکی لە گەشتەکانی کوردستانیدا دەستی کەوتووە.

٤- دەسنووسی دیوانی نالی لە (٥٩) لاپەڕەدایە، لەدوا ساڵانی سەدەی نۆزدەم یا سەرەتای سەدەی بیستەم نووسراوەتەوە.

٥- دەسنووسی دیوانی نالی لە دەفتەرێکی بچووکی گیرفاندایە لە ساڵی ١٣٢١ھ/ ١٩٠٣م لە لایەن محەممەد ئەمین زەکی مێژوونووسی کورد ڕوونووس کراوە.

٦- دەسنووسی دیوانی نالی لە (٩٣) لاپەڕەدایە لە ساڵی ١٣٢١ھ/ ١٩٠٣م نووسراوەتەوە، تێکستەکان سەروژێریان بۆ کراوە. ئەم دەسنووسە لە نامەخانەی تایبەتی شێخ محەممەدی خاڵ لە سلێمانی پارێزراوە.

٧- دەسنووسی دیوانی نالی لە لایەن محەممەد حوسێنی قەرەداغی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ڕوونووس کراوە.

٨- لەم دواییەدا قوتابی بەڕێزم خوا لێخۆشبوو جەمال محەممەد محەممەدئەمین پێش کۆچی دوایی دەسنووسێکی دیوانی نالی پێشکێش کردم، سەرەتا و دوالاپەڕەکانی نەماون، زۆربەی شیعری نالی تێدا تۆمار کراوە، لە ڕووی زانستی و مۆزەییەوە نرخی خۆی هەیە.

٩- دەسنووسی دیوانی نالی لە لایەن جەمالی مەلا ئەحمەد لە ئاغستۆسی ساڵی ١٩١٣ نووسراوەتەوە.

١٠- دەسنووسێکی تری دیوانی نالی لە کۆکراوەکانی مینۆرسکییە لە ساڵی ١٣٣١ھ/١٩١٣م نووسراوەتەوە. ئەم دەسنووسە ئێستا لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمییەی زانستی لە سانت پیتر سبورگ پارێزراوە.

١١- کەشکۆڵ یا بەیازێکی گەورەی (٥٠٠) لاپەڕەیی لە ساڵی ١٣٣٨ھ/١٩١٩م نووسراوەتەوە، بەشێکی زۆری شیعری نالی تێدایە.

١٢- دەسنووسی (سۆزی نیشتمان) (٥٧٤) لاپەڕەیە، لە لایەن نەجمەدین مەلاوە، لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٤٥دا نووسراوەتەوە، هەندێ هەڵبژاردەی شیعری نالی تێیدا تۆمار کراوە.

ئەوەی شایانی باس بێ لە بارەی شارەزایی لە گێتیی ناوەوەی شیعری نالییەوە ئەوەیە بەپێی تاقیکردنەوە دووروودرێژەکانم لەم مەیدانەدا گەیشتمە ئەو ڕاستییەی سێ جۆرە کەسانێک لە نالییەوە نزیک بوون، جا ئەمانە بەڕاستیان بووبێ یا بەڕاستیان نەبووبێ شانازییان بەوەوە کردووە کە نالییان خۆش دەوێ:

١- تاقمێک فریان بەسەر شیعری نالییەوە نەبووە و هەر تێی نەگەیشتوون، بەخەیاڵی خۆیان وایان زانیوە تێی دەگەن. بەشێک لەمانە لە مامۆستایانی هەموو قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی و زانستگا بوون.

٢- تاقمێکی دیکە تا پلەیێک لە نالی گەیشتوون و بەشوێن ئەو کەسانە گەڕاون ئەوەی تێی نەگەیشتوون تێیان بگەیەنن.

٣- ئەو کەسانەن تا پلەیێکی باش لە نالی گەیشتوون، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنی لە هەموو بەرهەمی



شیعری نالی گەیشتبن. باوەڕ ناکەم یەکێک هەبێ بەتاقی تەنیا لە هەموو شیعری نالی بگا!

هەندێ لەوانەی دەچنە ناو ئەم تاقمەی دواییەوە و من دەیانناسم ئەمانەن: مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی، کاکە حوسێنی خانەقا، هێمنی شاعیر، فاتیح عەبدولکەریم، مەسعوود محەمەد، عەبدولخالیق مەعرووف.

### نالی چۆن شاعیرێکە؟

نالی وەک (کەسایەتی) و (شیعرایەتی) لە هەردوو باردا نهێنی و شارراوەیە. سەرچاوە بۆ ناسینی شیعرەکانیەتی، لە شیعریشدا پیاو هەرچەندە زیاتر ورد بێتەوە و بیری لێ بکاتەوە و بچێتە ناوییەوە تەنگوچەڵەمە زیاتر دەبێ بۆ ناسینی نالی، چونکە شیعری بەگشتی لەناو گێتییێکی قانگدراو بەتەمومژ و پڕ لە جادوو و ئەفسووندا دەژی. ئەگەر لە دێرە شیعری غەزەلێکدا تروسکاییێک بەدی بکرێ پیاو هەست بکا لە مەبەسێکی گەیشتووە لە دێرە شیعرێکی دیکەدا ئەو تروسکاییەش نامێنێ و دەبێ بەشەوەزەنگ.

نالی باوەڕی بەدڵداریی زەمینی بووە، ژن هەوێن و سەرچاوەی ئەو دڵدارییەیە لە وێنەیێکی مەتریالی خۆی دەنوێنێ، بۆیە نالی گرفتاری ژنە وەکو پەیکەرێک لە قاڵبی گیان و سۆزدا، ئینجا ئەم پەیکەرە بەهەموو ئەندامەکانی لەشی ورد دەکاتەوە، بێ گومان دیار و نادیار، بینراو و شارراوە. هەموو ئەندامەکان بەلایەوە جوان و پیرۆزن و وێنەی گشتی پەیکەرەکە دەخەنە ڕوو. بۆ ئەم جۆرە دڵدارییە زاراوەی (عیشقی مەجازی)ی سۆفیزم بەکار دێنێ کە بەرامبەر بەدڵداری زەمینییە، ئەمەش بۆ ئەوەی زاراوەی (عیشقی حەقیقی) بهێڵێتەوە بۆ ئەو دڵدارییەی دوورە لە شەهوەتی مەتریالی و خۆی لە (جوانی هەمیشەیی)دا دەبینێ.

نالی دانایانە و فەیلەسووفانە بوون و گەردوون وەک دیاردەیێک بەچاویلکەی فەلسەفەی ئەفلاتوون و مەنتیقی ئەرستۆ لێک دەداتەوە، هەرچەندە بۆچوونەکانی میتافیزیکییانەیە، بەڵام خەیاڵی شاعیری وێنەیێکی جوان و داهێنراوی پێ دەبەخشێ.

نالی لەو کەسانە بووە کە لە خۆی گەیشتووە، بەرامبەر بەو ئیدیۆلۆجییەتەی باوەڕی پێی بووە خۆی بەبچووک حسێب کردووە، لەوانە بەرامبەر بە(خۆشەویست) و (خودا) و (پێغەمبەر) خۆی بەکەم زانیوە، ئەگینا دانی بەکەسی دیکە نەهێناوە لەناو کۆمەڵدا ئەگەر لە شاعیر بەگەورەتر ناسرا بێ.

ئەم کابرا شارەزوورییە دڵسۆزە شیعری تەنیا بۆ هەستی خۆی وتووە، کەس بۆی نەکراوە لە لای نالی شیعر بەڕادان بدا. مەدح و ستایش و پێداهەڵدانی بۆ کەس نەبووە، تەنیا ئەحمەد پاشا و سلێمان پاشا نەبن، ئەمانەش وەکو دروشمی کورد نەک وەک پاشایانی میرنشین و گەورە پیاوان.

ئامانجی شاعیر لە ژیانی هونەری شیعریدا ئەوە بووە هەرچی دەیزانی و هەستی پێ دەکرد و پەری شیعری بۆی دەهێنا بەزمانی کوردی تۆماری دەکرد، بەم جۆرە یەکەم شاعیر بوو لە کوردستانی باشوور توانی ئەم زمانی کوردییە بکا بەزمانی شیعرێکی یەکجار جوان و بەرز و باڵا.

نالی سوودی لە بەرهەمی شاعیرانی کۆن و هاوچەرخی خۆی، بەتایبەتی شاعیرانی نەتەوە هاوسێکانی کورد وەرگرتووە، یەکەمین کەسە لە کوردستانی باشووردا شیعری کردووە بەپیشە و بووە بەپسپۆڕی شیعری کوردی. ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە نالی خوێندنی حوجرەی تەواو کردووە و بووە بەمەلا و مەلای باشیش بووە، بەڵام لە مەیدانی مەلایەتی و زانستییە ئایینییەکانی ئیسلام و زمانی عەرەبی هیچ جۆرە کردەوە و نووسینێکی نییە، ئەمە هەموو ئەو شاعیرانەی دەوری نالی و پاش ئەویش تا دەگاتە سەردەمی جەنگی یەکەمی گێتی دەگرێتەوە.

شاعیر زمانانی هاوسێکانی کوردی زانیوە، بەکارهێنانی وشەی ئەو زمانە بێگانانە لە شیعریدا ناگەڕێتەوە سەر ئەوەی ئەو وشانەی نالی بەکاری هێناون لە فەرهەنگی زمانی کوردیدا دەست ناکەون، بەپێچەوانەوە ئەم وشانە لە زمانی کوردیدا هەن، بەڵکو دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی ئەم وشانە وشەی (فەرهەنگی شیعر) بوون، لە زمانانی فارسی و کوردی و تورکی عوسمانی بەکار دەهێنران و ئەم وشە و ڕستانە بۆ خوێندەواری کورد شتێکی بێگانە نەبوون.

نالی لە حوجرەی فەقێیان بیر و مێشکی بەشیعری کلاسیکی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئاودرا. لەوانەیە غەزەلەکانی مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی بە(مەم و زین)ەوە کاریان لە نالی کرد بێ، چونکە شیعری نالی سەر بەو قوتابخانەیەن کە پێشتر شاعیرانی کوردستانی باکوور بەردی بناغەیان دانا. دەکرێ ئەم بیروڕایە بۆ شیعری (گۆرانی) لەمەڕ نالییەوە بخەینە ڕوو. بەڵام ئەمەیان گومانی تێدا نییە کە نالی هیچ نەبێ ئاگاداری ئەو شیعرانە بووە کە لە کۆنەوە بەدیالێکتی (گۆرانی) وتراون، تا دەگاتە سەردەمی خۆی و مەولەویش لەو ئاقارانەدا ژیاوە کە نالی لێ بووە، بەڵام ڕەنگە مەیلی لەگەڵ شیعری (گۆرانی)دا نەبووبێ، لەبەر ئەوە گوێی نەداوەتە گەلێ هونەر و بابەتی بەرزی ئەو سەردەمە، وەکو چیرۆکی شیعری کە لە ئەدەبی کوردستانی باکوور و ئەدەبی دیالێکتی گۆرانی باو بووە و گەلێ چیرۆکی شیعری بەرزی سەرکەوتوو هاتۆتە بەرهەم.

لە ژیانی شیعرایەتی نالی ئەوە دەردەکەوێ چێژێکی ئەوتۆی لە زمانی عەرەبی وەرنەگرتبێ، ئەگەرچی خۆشی هەندێ دێڕە شیعر و ڕستەی عەرەبی هەیە تێکهەڵکێشی شیعرە کوردییەکانی کردووە، بەڵام ئەو عیبارەتانە بێ هێزن. هەروەها شیعرە فارسییەکانیشی ئەوەندە کەمن هەر ئەوە دەتوانین بڵێین فارسی زانیوە نەک شاعیری فارسی زمان بووە. لە بابەت شیعری تورکی عوسمانییەوە نالی شیعری بەم زمانە نییە، ئەوەندە هەیە لە یەک دوو شوێن وشەیێکی تورکی بەکار هێناوە.

نالی هەموو هۆش و بیر و هێزی شاعیریەتی خۆی بۆ بەرزکردنەوەی پلەی شیعری کوردی بەکار هێناوە، لەبەر ئەوە دەبێ تەنیا بەشاعیرێکی کوردی گەورە بناسرێ.



## بەشی شەشەم

## ڕوخساری شیعری نالی

### ڕوخساری شیعری نالی لە ڕووی بابەتەوە

شیعری نالی بەقەوارە و ژمارە کورت و کەمە، ئەو بەرهەمەی لە بەردەستماندایە دەتوانرێ هەمووی لە دەورووبەری ١٢٠ پارچە شیعری لیریکی بژمێررێ. هەروەها شیعری نالی لە ڕووی بابەتی هونەرە شیعرایەتییەکانی ئەدەبی ئیسلامەوییەوە (نەتەوە ئیسلامەکانەوە) کە زۆرن، شاعیر ئەو قاڵبانەی لەم لایەنەوە هەڵیبژاردوون بۆ بەرهەمی شیعری لە چوار جۆر تێپەڕ ناکەن: غەزەل، قەسیدە، موستەزاد، تاک (فەرد).

١- غەزەل: ئەم بابەتە شیعرە لە لای نالی و لە ئەدەبی ئیسلامەوی ڕۆژهەڵات بەو پارچە شیعرە دەووترێ کە ژمارەی دێڕە شیعرەکانی، نیوە دێڕی یەکەم و نیوە دێڕی دووەم (سەدر و عەجز) لە پێنج دێڕ کەمتر نەبێ، ئیتر بەزۆری ئەم جۆرە شیعرە لە حەوت دێڕ، یا نۆ دێڕ، یا دە دێڕ، یا دوازدە دێڕ پێک دێ، هەندێ کەس دەیگەیەننە هەژدە و تا بیست دێڕیش. ئەگەر ژمارەی دێڕە شیعری غەزەل لەمە تێپەڕ بکا قەسیدەی پێ دەڵێن. لە ڕووی کێشەوە پێڕەوی دەستوورەکانی کێشی عەرووز دەکا، هەرچی قافیەشە لەسەر سیستێمی یەکیەتی قافیە بەڕێوە دەچێ.

بەرهەمی شیعری نالی ئەوەی ئێستا لە بەردەستماندایە و ئاگادارمان لێی هەیە لە زیاتر لە سەد پارچە غەزەل پێک هاتووە، هەندێ لەم غەزەلانە ئەوانەی ژمارەی دێڕەکانیان سێ یا شەش یا هەشت دێڕ بێ، بێ گومان ئەم شیعرانە ناتەواون، لەوانەشە هەندێ لەم غەزەلانە لە بنچدا قەسیدە بن و ژمارەی دێڕەکانیان لە دوازدە زیاتر بوو بێ و بەدرێژایی ڕۆژگار هەندێ لە دێڕەکانی کەوتبن.

٢- قەسیدە: لە هەموو ڕوویێکی ڕوخسارەوە وەکو غەزەل وایە، دەتوانین غەزەلی درێژی پێ بڵێین، بەڕاستی ئەم بابەتە شیعرە غەزەلە، بەڵام کە ژمارەی دێڕەکانی زۆر بن قەسیدەی پێ دەوترێ.

بەرهەمی نالی لەم جۆرە شیعرەدا کەمە، ژمارەی هەموو قەسیدەکانی لە ژمارەی پەنجەی هەردوو دەست تێناپەڕێ. لەمانە درێژترین قەسیدەی ئەو دوو (نەعت)ەیە کە بۆ پێغەمبەری وتووە، یەکەمیان (ئەی ساکینی...) لە ٦٨ دێڕە شیعر و، دووەمیان (ئەلا ئەی نەفسی...) لە ٧٤ دێڕە شیعر پێک هاتوون. هەروەها دەتوانین لە قەسیدە بەناوبانگەکانی نالی ناوی قەسیدەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم...) (٤٣ دێڕ) و (مەستوورە کە حەسناو و ئەدیبە...) (٤٩ دێڕ) ببەین.

٣- موستەزاد: جۆرە هونەرێکە لە غەزەل، شاعیر نیوە دێڕە شیعرێکی کورت دەخاتە سەر هەموو نیوە دێڕە شیعرە درێژەکان، لەبەر ئەوەیە موستەزادی پێ دەڵێن، واتە غەزەلێک شتی زیادی دەخرێتە سەر. نالی لەم جۆرە هونەرە تەنیا موستەزادێک لە دیوانیدا هەیە. بینای ئەندازیاری موستەزادەکە

بەم جۆرەیە:

غەزەلەکە لە نۆ دێڕە شیعر پێک هاتووە، یەکێتیی کێش و قافیەی تێدایە. لە ڕووی کێشەوە لەسەر بەحری هەزەجی عەرووز ڕێک خراوە، قافیەی دەنگی (میم)ە (کەوتووم، چووم، مردووم... هتد) هەرچی غەزەلەکەی دیکەیە ئەویش شیعرێکی نۆ دێڕە شیعرییە، بەڵام دێڕەکانی کورتن (مفعولُ فعولن)، ئەمەش لەسەر یەک کێش و یەک قافیەیە، قافیەی دەنگی (میم)ە (حەیاتم، وەفاتم، بەتەماتم... هتد) ئیتر دێڕە شیعرە درێژ و کورتەکان بەیەکترییەوە لکێندراون و بەسەر یەکەوە دەخوێنرێنەوە. بەم چەشنە موستەزادەکە دەتوانرێ بەسێ جۆر بخوێنرێتەوە. یەکەمیان هەمووی بەسەریەکەوە، دووەمیان دێڕە درێژەکان بەتەنیا، سێیەمیان دێڕە کورتەکان بەتەنیا. ئەم کارە دیارە وەستاییییێکی پێویستە، شاعیری بەدەسەڵات نەبێ ناتوانێ ئەم بابەتە هونەرە کلاسیکییە بەبەرهەمی شیعری خۆی ببەخشێ.

موستەزادەکە بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

ئەی تازە جەوان پیرم و ئوفتادەوو کەوتووم

تا ماوە حەیاتم

دەستێ بدەرە دەستی شکستەم کە لە دەس چووم

قوربانی وەفاتم

تۆ یووسفی نەو حوسنی لەسەر میسری جینانی

من پیرم و فانی

لەم کولبەیی ئەحزانە نە زیندووم و نە مردووم

هەر وا بەتەماتم

٤- تاک (فەرد): بریتییە لە دێڕە شیعرێک (لە نیوە دێڕی یەکەم و نیوە دێڕی دووەم) پێک هاتووە. ئەم بابەتە شیعرە بۆ قسەیێکی نەستەق یا پەندێکی پێشینان یا بیرێکی فەلسەفی یا وێنەیێکی جوان بۆ ژن و دڵداری و وەسفی سروشت دادەنرێ.

نالی لەم جۆرە شیعرە تەنیا (تاک)ێکی هەیە:

سەوتی نەغمەی بلبلە یا چەهچەهەی خرخاڵییە

دەنگی سۆلە یا لە ژێر پێی ناڵەناڵی (نالی)یە

## تەرکیبی ناوەوەی شیعری نالی

شیعری نالی و هەموو شیعری کلاسیکی ئیسلامەوی لە ڕووی ڕوخساری ناوەوەی ئەم ئەدگارانەی خوارەوەی هەیە:

١- دێڕە شیعری غەزەل یا قەسیدە دەکرێ بەدوو پارچە: یەکەمیان نیوە دێڕی یەکەم (سەدر) و دووەمیان نیوە دێڕی دووەم (عەجز)ی پێ دەووترێ.



٢- غەزەل یا قەسیدە یا هەر بابەتێکی تری شیعر لە ڕووی کێشەوە لە یەکەمین دێڕە شیعرەوە تا دوایی هەمووی لەسەر یەک کێش دەبێ، کێشەکان پێڕەوی عەرووز دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ بەپێوانەی سیلاب (کەرت) بکێشرێن بەتایبەتی ئەو شیعرانەی لەسەر کێشە سووکەکانی عەرووز دانراوون، وەکو ئاشکرایە لە شیعری کلاسیکی کوردی ئیسلامەویدا بەزۆری ئەو کێشە سووکانە بەکار دەهێنرێن، چونکە لەگەڵ زمانی کوردی دەگونجێن.

٣- هەندێ جار نالی دێڕی شیعر دەکا بەچوار کەرت، واتە هەر نیوە دێڕی دەکا بەدوو کەرت، دوایی هەموو کەرتەکان وەستانیان تێدا دەبێ و لەسەر یەک قافیە دەبن. واتە نیوە دێڕی یەکەم دوو قافیەی دەبێ، وە نیوە دێڕی دووەمیش دوو قافیەی دەبێ؛ دوو قافیەکەی نیوە دێڕی یەکەم و قافیەی یەکەمی نیوە دێڕی دووەم لەسەر یەک کێش و یەک دەنگ (تیپ، حەرف) دەبن، وە قافیەی دووەمی نیوە دێڕی دووەم دەبێتە قافیەی بنچینەیی شیعرەکە، وەکو لەم غەزەلەی لای خوارەوە دەبینرێ:

سۆفی چییە ئیشی تۆ هەر کایە حەشیشی تۆ

عاشق وەکو ڕیشی تۆ هەوساری لەکن پەشمە

چەند واسیعە ئەم زیهنە ئەفلاکی تێدا ڕەهنە

ئەجیالی لە لا عیهنە ئەدواری لەکن پەشمە

(نالی) کە قەدەح نۆشە مەستانە و سەرخۆشە

خامۆش نەمەد پۆشە ئەسعاری لەکن پەشمە

بۆ دیارکردنی نرخی هونەری ئەم غەزەلە لە ڕووی ئاواز و ڕیتمەوە و کاریگەری بەسەر گوێی مۆسیقییەوە لە بابەت وێنەی بیناسازی دەرەوەی شیعرەکە دەتوانرێ بەم جۆرەش تۆمار بکرێ:

سۆفی چییە ئیشی تۆ

هەر کایە حەشیشی تۆ

عاشق وەکو ڕیشی تۆ

هەوساری لەکن پەشمە

چەند واسیعە ئەم زیهنە

ئەفلاکی تێدا ڕەهنە

ئەجیالی لە لا عیهنە

ئەدواری لەکن پەشمە

(نالی) کە قەدەح نۆشە

مەستانەوو سەرخۆشە

خامۆش نەمەد پۆشە

ئەسعاری لەکن پەشمە

٤- یەکێ لە ئەدگار و خاسیەتە هەرە گرنگەکانی شیعری نالی بەگشتی ئەوەیە هەر دێڕێکی لە مانادا سەربەخۆیە، واتە گیانی چیرۆکی و زنجیرەی بیری بەستراو بەیەکەوە کەمە، هەر ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی شیعرەکانی پاش و پێش بکرێن. ئەگەر هەندێ دێڕە شیعر لە غەزەلێک یا قەسیدەیێکدا بکەون هەست بەبۆشایی جێگەی ناکرێ، بۆیە هەر دێڕە شیعرێک لە شیعری نالی دەشێ ببێ بە وتەیێکی جوان، یا قسەیێکی نەستەق، یا وێنەیێکی ڕەنگین. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ لە غەزەلەکانی نالی و بەتایبەتی لە قەسیدەکانیدا هەست بەزنجیرەی بیر واتە بەسەرهات و گێڕانەوەی ڕووداو دەکرێ. ڕووداوەکان زۆرن بەیەکتری دەبەسترێنەوە و حیکایەتێکیان لێ دروست دەبێ. واتە ئەم چیرۆکانە گیانی شیعریان تێدا هەیە.

٥- لە زۆربەی غەزەل و قەسیدەکانی نالی بەپێی دەستووری شیعری کلاسیکی لە دێڕی دواییدا نازناوی شاعیر تۆمار دەکرێ، بەزۆری ناو هێنانەکە لە دێڕی دوایی شیعرەکە دەبێ. ئەوەی لێرەدا پێویستە بوترێ لە هەموو دیوانی نالیدا تەنیا چەند غەزەل و قەسیدەیێک شاعیر نازناوی خۆی نەهێناوە. ئێمە وا بۆی دەچین ڕەنگە شاعیر لەم شیعرانەشدا نازناوی خۆی هێنا بێ، بەڵام ئەو دێڕە شیعرانە کەوتبن.

## کێشی شیعری نالی

نالی پێڕەوی شیعری کلاسیکی ئیسلامەوی کردووە لە ڕووی کێشەوە، هەموو شیعرەکانی بەبەحری عەرووزی کێشاوە، لەوانە بەشی هەرە زۆری غەزەلەکانی لەسەر کێشی هەزەج و هەندێ لەو کەمتر لەسەر کێشی ڕەمەلن. لە کێشی موزاریع هەشت غەزەلی هەیە، لە کێشەکانی ڕەجەز و بەسیت و تەویل لە هەریەکەیان غەزەلێکی هەیە.

لەناو قەسیدەکانی شاعیردا پێنجیان لەسەر کێشی هەزەجن، لە کێشی موزاریع و ڕەمەلدا لە هەریەکەیان دوو غەزەلی هەیە، تاکە قەسیدەیێکیش لە کێشی موجتەسە (مجتث)، موستەزادە تاقانەکەش لەسەر کێشی هەزەجە، هەرچی تاکە دێڕە شیعرییەکەی شاعیریشە لەسەر کێشی ڕەمەلە.

## قافیەی شیعری نالی

غەزەل یا قەسیدە لە ڕووی قافیەوە، نیوە دێڕی یەکەم و نیوە دێڕی دووەمی دێڕی یەکەم لەگەڵ نیوە دێڕی دووەمی هەموو دێڕەکانی شیعر تا دوایی لەسەریەک قافیە دەبن.

قافیە لە لای نالی و شاعیرانی دوای ئەو دەکرێ بەدوو بەشەوە:

١- قافیەی سادە: ئەو ڕێزە وشانەیە کە تیپی (دەنگی) هەرە دوایی، واتە یەک تیپ یا دوو، یا سێ، یا چوار، یا پێنج وەک یەک دەبن، بەمەرجێ ئەم تیپانە لە بزوێن و بێ دەنگ پێک دێن، ئەگەر لە شیعری نالی ورد ببینەوە دەبینین قافیەی وای هەیە تەنیا لەسەر یەک تیپ دامەزراوە، وەکو (ا)، (ۆ)، هی واشی هەیە لەسەر دوو تیپ، وەکو (شا)، (ار)، لەسەر سێ تیپ، وەکو (ادا)، (ارم)؛ لەسەر چوار تیپ، وەکو (ینتە)، (ـەندی)؛ لەسەر پێنج تیپ، وەکو (اییکە)، (ایەوە).



٢- قافیەی قورس: هەندێ شیعری نالی قافیەیان بریتییە لە وشەیێک یا ڕستەیێک، یا نیوە ڕستەیێک لە هەموو دێڕە شیعرەکاندا وەکو خۆی دووبارە دەبێتەوە، پێش ئەو قافیەیە قافیەیێکی دیکەی ئاسایی هەیە وەکو بڵێی ئەمە قافیەی یەکەمە، ئەوەی تر قافیەی دووەمە، یا دەتوانین (پاش قافیە)شی پێ بڵێین. بەم جۆرە قافیەی یەکەمی ئەم بابەتە شیعرانە وەکو قافیەی سادە وایە و لە هەموو شیعرێکی کلاسیکیدا هەیە وەکو لە پێشەوە باسمان لێوە کرد.

ئیتر دەکارێن زاراوەی قافیەی قورس بۆ ئەم جۆرە شیعرە بەکار بێنین. لای نالی ئەم جۆرە قافیەیە زۆرە، وەکو لای خوارەوە دەکەونە ڕوو:

(أ) قافیەی یەک وشەیی، وەک بەکارهێنانی ناو، وەکو (باز)، (کچ)؛ یا پاشکۆکانی ناو، وەکو (ئەز)، (من)، (قوربان)؛ یا فرمان، وەکو (دەکا)، (بوو)، (هەیە).

(ب) قافیەی ڕستە و ڕستەی ناتەواو، وەکو (ئەمشەو)، (نەبوو)، (لەکن)، (پەشمە)، (موجەرڕەد بێ)، (زولفەینی)، (دەوێ)، (نەما باس)، (نییە باس)، (دەخۆم)، (نادەم)، (بێ تۆ)، (بەعەبەس).

لەوانەیە بەرهەمی نالی لەمە زیاتر بوو بێ و ئەو بەرهەمەی لە دیوانی نالیدا چاپ کراوە ڕەنگە هەمووی نەبێ. بەڵگە بەدەستەوە هەیە بۆ ئەم کەموکورییە:

١- شاعیرە کلاسیکەکانی قوتابخانەی ئیسلامەوی هەوڵیانداوە بەشی هەرە زۆری تیپەکانی (دەنگەکانی) ئەلف و بێی کوردی و عەرەبی بکەن بەقافیە، لەم ڕووەوە مەلای جزیری (١٥٦٧-١٦٤٠) لەپێش نالی و ئەحمەد حەمدی ساحێبقران (١٨٧٨-١٩٣٦) لەدوای نالیدا بەشی زۆری ئەو دەنگانەیان کردووە بەقافیەی شیعرەکانیان لەم لایەنەوە دەوڵەمەند بوون، بەڵام لە دیوانی نالیدا قافیەی هەندێ تیپی ئەلفبای کوردی و عەرەبی وەکو (پ، ج، خ، ذ، ش، ص، ض، ظ، ع، غ، ف، گ، ل) نابینرێن، ڕەنگە قافیەی ئەم هەموو دەنگانە یا هەندێکیانی هەبووبێ بەڵام ون بووبن.

٢- بەپێی دەستووری شیعری کلاسیکی کۆن زۆربەی شاعیران لە بابەت ناوەڕۆکەوە شیعری موناجات (ئیلاهییاتیان) هەیە، تەنانەت دیوانەکانیان بەم جۆرە شیعرە دەکەنەوە، کەچی لای نالی دوو قەسیدەی نەعت (مەدح و ستایشی پێغەمبەر)ی هەیە، کەچی موناجاتی نییە. ڕەنگە بیرمان بۆ ئەوە بچێ لە نەعتەکانیدا هەست بەوە دەکرێ موناجاتی تێدا بێ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ شاعیر شیعری موناجاتی وتبێ.

لە بابەت ڕوخساری شیعر و هونەرەکانی دیکەی شیعری کلاسیکییەوە نالی هەندێ لایەنی پشتگوێ خستووە و لە دیوانی شیعریدا تەرجیع بەند و تەرکیب بەند و چوارین و هی دیکەش بەرچاو ناکەون. ئینجا ئەگەر لە دیوانی نالیدا تەنیا چوارینێکی فارسی هەبێ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ چوارینی بەزمانی کوردی هەیە. ئێمە باس لە نالی دەکەین وەکو شاعیرێکی کورد.

٣- دیوانی نالی سەرچاوەیێکی دەوڵەمەند و لەبارە بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێ لایەنی ژیانی تایبەتیی

خۆی له نیشتماندا، کەچی ئەو دیوانە ناتوانێ تروسکایییێک بخاتە سەر ژیانی ئەم شاعیرە لە شام و ئەستەموول کە زۆر گرنگە بۆ ناسینی شاعیر. ئەو ماوە کەمەی لەو دوو جێیە ژیاوە لەوانەیە شیعری وتبێ بەڵام لەناوچوو بن، وەکو گەلێ لە شیعرەکانی حاجی و شاعیرانی کوردستانی باکوور، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شیعرێکی کەمی حاجیمان پێ گەیشتووە لە ئەستەموول یادی کوردستانی کردۆتەوە.



## بەشی حەوتەم

# ناوەرۆکی شیعری نالی

ناوەرۆکی شیعری نالی بەگشتی ئەو مەبەسانەیە کە لە ئەدەبی کلاسیکی ئیسلامەوی (غەزەل و قەسیدە)ی نەتەوە موسوڵمانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبینرێن. ئەوەی داهێنان و نوێ بێ لای شاعیر ئەوەیە بەزمانی کوردی لە کوردستانی باشووردا شیعری بەرزی دروست کردووە، یا ڕاستتر زمانی کوردی لەو ناوچەیەدا کردووە بەزمانی شیعرێکی بەرز. سروشتی کوردستان کارێکی گەورەی کردۆتە سەر شاعیر، بلیمەتی شاعیر لەوەدا دەبینرێ ڕوخسار و فۆرمی نوێی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە و بەشداری لە پەرەسەندن و پێشکەوتنی شیعری ئیسلامەوی کردووە، هەرچی ناوەرۆکیشە جەوهەری تایبەتیی خۆی هەیە و سیمای نەتەوەیی لە شیعریدا ئاشکرا و دیارە.

لەم ماوەیەدا جێی خۆیەتی نویشکی ناوەرۆکی شیعری نالی ڕوون بکرێتەوە. بەپێی مەبەسەکانی بەرهەمی ئەدەبی، وەکو لە لای خوارەوە دەکەونە بەرچاو.

### یادی نیشتمان

نیشتمانپەروەری شاعیرێکی وەکو نالی لە ناوچەی کوردستانی باشووردا لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا ژیابێ لە چوارچێوەی (زمانی کوردی) و (یادی نیشتمان) ناچێتە دەرەوە، ئەوەی جێی باوەڕ و متمانەبێ ئەوەیە نالی هەستی بەوە کردووە نەتەوەکەی ماف خوراوە، لەبەر ئەوە دواکەوتووە، بەڵام ڕەنگدانەوەی ئەم هەستە ئاشکرا و ڕوون و دیار نییە، وەک لە لای دوو شاعیری دیکەدا دەبینرێ خانی (١٦٥٠-١٧٠٧) کە لە پێش ئەودا ژیاوە، یا حاجی (١٨١٥ -١٨٩٧) کە لەدوای نالی لە ژیاندا بووە.

ئەوپەڕی نیشتمانپەروەری نالی لەوەدا دەردەکەوێ کە ڕێچکەی شیعری کوردی لە ڕووی زمانەوە شکاندووە، بەوەی دیالێکتی کرمانجی خوارووی زمانی کوردی کردووە بەزمانی شیعرێکی بەرزی بێ کەموکووڕی کە لە غەزەل و قەسیدەدا بەرچاو دەکەوێ. شکاندنی ئەم ڕێچکەیە لەبەر ئەوە نەبووە نەیتوانیوە شیعر بەزمانەکانی دیکە بڵێ، بەڵکو وای بەباش زانیوە زمانی نەتەوەی خۆی بکا بەزمانی شیعرێکی ڕەسەن و پڕ لە هونەر، لەم لایەنەوە دەڵێ:

تەبعی شەککەر باری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا
ئیمتیحانی خۆیە مەقسوودی لە عەمدا وا دەکا

جگە لەوەی مەبەسی شانازیکردن (فەخر) یەکێکە لە مەبەسە دیارەکانی شاعیرانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە بەرهەمەکانیاندا بەڕوونی ڕاستگۆییان دەکەوێتە بەرچاو، کەچی نالی شاعیرییەت و خەیاڵی شیعری لە زمانی قەومی خۆیدا دەکا بەمەبەس و دەڵێ ئەو شاعیرییەتە توانای ئەوەی هەیە

بەهەر زمـانێک لەو زمـانانەی دەیزانێ هونەری خـۆی دەربـڕێ، لێـرەدا زمـانی کـوردی لەپێش ئەودا بەشێوەییێکی وا نەکەوتبووە ناوەوە ببێ بەزمانی شیعر و دیوان و بەرهەمێکی زۆر بەم زمانە بێتە ناوەوە.

نالی تەنیـا بەوە ناوەستێ هەسـتی هونەری خۆی بەزمـانی کوردی دەرببڕێ، بەڵکو نیشـتمـانپەروەری دەگاتە ڕادەییێک دان بەوەدا بنێ خەیاڵیشی کوردییە، وەکو لە شیعرێکیدا دەڵێ:

موحەققەق مەشرەبی (نالی) لە شیعرا هەر وەکو خاکی
خـەیاڵی کـوردییـە بەیتی سـەراپا زولفی دوو تایە

بەمە نالی خۆی دەکا بەشاعیری ڕاستەقینەی نەتەوەی کورد، نەوەکو تەنیا بەزمانی کوردی دەنووسێ، بەڵکو خەیاڵیشی ڕەنگدانەوەی (بوونی کورد)ە کە بیری کوردایەتی و ڕەوشتی کوردەواری دەگرێتەوە.

شاعـیر وەک هەمـوو ئادەمزادێک سـۆزی نیشـتـمـانپـەروەری زیاتر لە دەرەوەی نیشـتـمـان و سـەردەمی ئاوارەییدا هەڵچووە، وەکو ئاشکرایە لە دەوروبەری ڕووخانی میرنشینی بابان لە وڵات دوور دەکەوێتەوە و لە ئەسـتەمـووڵ کۆچی دوایی دەکا. بەم هۆیەوە دەتوانرێ هەندێ دێڕە شیـعـری وا لە دیوانی شـاعـیردا بدۆزرێتـەوە لە دەرەوەی نیـشـتـمـان داینایـن و یادی ئەوی کردبێتـەوە. لێـرەدا مەبەس ئەوەیە شـاعـیـر لە دەرەوەی نیشـتـمـان یادی کردبێتـەوە، ئەگینا شیـعـری وای نالیـمـان لە بەردەسـتدا نییە وێنەی کۆمـەڵی دەرەوەی کێشابێ وەک شام و ئەستەمووڵ.

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

ڕەوشـەنی دیدە بەئینسـانە کـە مـوژدەی قـەدمت
ڕەوشـەنی دیدەیی غـەمـدیدیی بەیتـولحـەزەنە
دڵی (نالی) کـە ئەنیـسی قـەرەداغـە ئێسـتـەش
داغـی ســــەرچـاوە و دێوانـەیی دار و دەوەنـە

ئەو غـەزەلەی ئەم دوو دێڕەی لێ وەرگیـراوە، شیـعـرێکی داخراوە. شـاعـیـر دەڵێ ڕووناکی لە گلێنەی چاوەوە هەڵدەقـوڵێ. کـە خـۆشەویست دێتە نـاویەوە، یا هەر لە بنجدا نیـشـتـەجێی ئەوێیـە، غـەمبـاری بەیتولحەزەن (کونجی غـەم، ژووری یەعـقـووب) چاوی دەکرێتەوە. نالی دەیەوێ بڵێ چۆن دڵی یەعـقـووب لای یووسفە، دڵی ئەویش لە قـەرەداغە و ئاخ و داخ بۆ ئاوایی سەرچاوە و دۆڵی دێوانەی شاخی سەگرمە و دار و دەوەنەکانی دەکێشێ. ڕەنگە ئەم بیرەوەرییە پێوەندی بەخورپەییێکی دڵی نالییەوە هەبێ، چونکە بەرامـبـەر بەژن خـورپەی زۆرە، ئەو بڕە دڵدارییـە لەسـەر شـانۆی ئەو خـاکـە ڕوویداوە، واتە یادی خۆشەویسـتـەکەی دەکاتەوە، بەم جۆرە یادی دڵداری و یادی نیـشـتـمـان تێکەڵ بەیەکتـری دەبن، ئەمـە ئەوپەڕی گیـان و هەستی مرۆڤایەتی دەنوێنێ. ئەگەر (دڵداری) و (یادی نیـشـتـمـان) تێکەڵ بەیەکـتریش نەکرێن هەریەکەیان بەتەنیا سەرچاوەییێکی لە بن نەهاتووی داهێنانی ئەدەبی و هونەرییە.

پۆپەی بیـر و هەسـتی نیـشـتـمـانپـەروەری لە لای نـالی شیـعـرە بەناوبانگەکـەیەتی (قـوربـانی تۆزی ڕێگەتم...) وەک پەیامێکی دڵسۆزانە لە شامەوە بۆ دۆسـتانی خۆی و شار و ناوچەی سلێمـانی ناردووە. لە بەشێکی دیکەی ئەم کتێبەدا بەدرێژی باسی لێوە دەکرێ.



## شیعری کۆمەڵایەتی

بەشێوەییێکی گشـتی ناوەرۆکی شیـعری نالی خەریکی بابـەتەکانی جوانی و دڵداری و سروشـتە، وەکو هەمـوو شـاعیرە کلاسیکییەکانی دیکە. شـاعیر ئەم مەبەسـە بنچینەییـیانە جاروبار بەشێوازێکی فـەلسـەفی و داناییـیانە دەردەبڕێ، هەر لەبەر ئەوەشە ئەو جۆرە شیـعرە وەک داخراو دەکـەونە ناوەوە و هەندێکیـان تا ئێـسـتـاش بەتەواوی لە ڕووی مـاناوە ساغ نەبوونەتەوە. جاری وا هەیە شـاعـیـر ئاوڕ لە ناگـزووری و کەمـوکووڕی کۆمـەڵ دەداتەوە، وە ئەوەی زیاتریش خـۆی پێوە خەریـک کردووە مەسـەلەی دەروێشـیـیـە لە کوردستاندا.

١- دژی دەروێشیزم:

نالی شارەزای تیـۆرییەکـانی سۆفـیزم بوو، هەروەها ئاگاداری دەروێشـیزم بوو وەک پراکـتیـکی سۆفـیزمی ئیـسلامی، جا ئەگـەر دژی دەروێشـیـزم بووبێ وەک تیـۆری، کـەڵکی لە سۆفـیزم وەرگـرتـووە و ئاماژەی بۆ هەندێ لایەنی گیانی ئەو بیروباوەڕە کردووە.

کـوردسـتـان کێـڵگەییێکی ئاودار و بەپیت و بەرەکـەت بوو بۆ بیـروباوەڕی دەروێشی، چونکە وڵاتێک بوو بەنەخـوێندەواری قـانـگ درابوو، کـۆمـەڵێکی هەژاری دواکـەوتـوو. لە سـەرەتادا ئەگـەرچی سـۆفـیـزم بزووتنەوەییێک بوو لە دژی ئۆتـوکراتیـزم و تۆتالیـتـاریزمی خەلیـفـەکـانی دوای ڕاشـیدین، بەتایبـەتی لە ئاییـنزای سوننیدا، بەڵام هەر ئەم بزووتنەوەیە لە پاشانا بۆ چاکەی چینەکانی سەرەوە خرایە کارەوە.

لە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی نۆزدەم، لە سـەردەمی ژیانی نالیـدا، ئەم دەروێشـیـیـە هەندێ لە ناوچەکـانی کوردسـتانی تەنی بووەوە. لە وڵاتی سلێمـانی هەردوو تەریقەتەکەی قادری و نەقشبەندی کە بەڕواڵەت و ڕوخسار وەکو بڵێیی لە دژی یەکـتری بووبن، بەڵام لە مەبەس و نـاوەرۆکدا هەردووکـیان هەوڵ و تەقـەلایان بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی خۆیان بوو، جا ئەگـەر ڕۆژێ لە ڕۆژان دژی یەکـتر بووبن مـەبەسیـان ئەوە بووە قازانجیان زیاتر بێ، سەرکەوتنی هەر لاییێکیان وەک یەک بوو بۆ خەڵکی کورد.

نالی لە گێـتیی دەروێشی نزیک نەکەوتۆتەوە، بێ گومـان گەلێ هۆ لە ناوەوە بووە شاعیر سەر بەلاییێک بێ، بەڵام بەهوشـیـاری خـۆی لە دەروێشی دوور خسـتـۆتەوە، لەدوای ئەوەی لە بنج و بناوانـی دەروێشی گـەیشـتـووە و بەتەواوی بۆی دەرکـەوتـووە لەگـەڵ بەرژەوەندی چاکـەی خـەڵکی نـاگـونجێ، ئیـتـر کـەوتۆتە بەربەرەکانی دەروێشیزم.

یەکێ لە ڕەوشتە ئاڵۆز و پڕ لە تەنگوچەڵەمەکانی دەروێشی ئەوەیە دیوی دەرەوەی لەگەڵ دیوی ناوەوەی ڕێک ناکەوێ، هەرچەندە وا پیشان دەدا کە سۆزی بەرامبەر بەئادەمزاد هەیە کەچی لە ڕاستیدا وا نییە:

(نالی) کـە ویقـاری نییـە بێ باکـە لە خـەڵقی
سـۆفی کە سـولووکـێکی هەیە عـوجب و ڕیایە

جـارێکی تریش نالی ئەم (ڕیا)یە دەخـاتە ڕوو و ئەوە پیـشـان دەدا خـەڵکی لەم ڕەوشـتـە خـراپەی دەروێشی گەیشـتوون. ئەو ڕدێنەی بۆ دەست بڕین دەروێشەکان بەخێوی دەکەن خەڵکی بەچاوێکی وا نزم

تەماشای دەکەن تا دەگاتە ئەوەی تێی دەڕین:

ڕیشەکەی پان و درێژە بۆ ڕیا خزمەت دەکا
زاهیرە هەر کەس لە تووڵ و عەرزی ڕیشیدا ڕیا

یەکێ لە خاسیەتە پراکتیکییەکانی دەروێشی ئەوەیە ڕەوڕەوەی مێژوو بووەستێنێ، یا بزووتنەوەی کردگار و ڕۆژگار ڕابگرێ، ناخۆشی لەباتی خۆشی، وشکی لەباتی تەڕی، مردن لەباتی ژیان، هەر لەبەر ئەوەشە تەعبیری (وشکەسۆفی) لەناو کوردەواریدا هەیە، بۆ بەڵگە نالی لە غەزەلێکیدا دەڵێ:

فەسلێ کە هەر لەفەرقی بەشەر تا ڕەگی شەجەر
وشکی بەغەیری سۆفی و عاسای نەمایەوە

هەر بۆ ئەم مانایە لە شیعرێکی دیکەیدا دەڵێ:

سۆفییان هاتنە مەجلیس وەرەقی دیدە بشۆن
لەکن ئەو دێمییە وشکانە لە دەریا نییە باس

لە شیعرێکی تریشیدا نالی دەڵێ:

ئاوی کەوسەر نۆشی سۆفی بێ کە من
ئاوی ئینسان یەعنی ماچی دەم دەخۆم

لەم بڕە شیعرانەدا وا هەست دەکرێ شاعیر هیچ مەبەسێکی هێرشبردنی نەبێ بۆ سەر بیروباوەڕی دەروێشی تەنیا ئەوە نەبێ بە(وشک)یان دادەنێ. دەروێش کە بەتەمای ئاوی کەوسەر بێ، ئەوە دەگەیەنێ ئەم دنیایەی ناوێ، بۆ ئەوەی لە دنیای تردا هەتا هەتایە بژی، ئەمە بیروباوەڕە، بێ گومان نالی خۆی نانێتە ڕێزی دەروێشان و بەتەمای ئەوە نییە واز لە دنیا بێنێ بۆ ئاوی کەوسەر، چونکە ئاوی دەمی خۆشەویست دەخواتەوە، واتە ماچی دەم دەکا و جارێ بیری لە ئەوەی دیکە نەکردۆتەوە.

نالی لە شیعرێکی تریدا چاوەنۆڕی ئاوی کەوسەریش ڕەت دەکاتەوە، ئەوەی بەلای شاعیرەوە گرنگە ئەوەیە دەروێش لەو کاتەی وا دەردەخا چاوەنۆڕی ئاوی کەوسەرە ئەگەر ماچی دەست بکەوێ خۆی لەسەر بەکوشت دەدا، یا ئەگەر خواردنی بەتام و خۆشی بۆ ئامادە بکرێ دەیقۆزێتەوە. وەکو شاعیر بۆی دەچێ خەڵوەت گرتنی دەروێش بەڕاستی نییە، هەر بۆنی بەهار بکا لە خەڵوەت دێتە دەرێ:

سۆفی ڕیایە خەڵوەتی بۆنی بەهاری کرد
هاتە دەرێ لە سایەی چایەر حەسایەوە

نالی شیعرێکی حەوت دێڕی داناوە تایبەتە بەبزووتنەوەی دەروێشی و، وا دەردەکەوێ بۆ شێخێکی سنەیی هۆنیبێتەوە. لەوێدا بیروباوەڕی خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر دیوی ناوەوە و دەرەوەی ئەم بزووتنەوەیە. دەروێش بەگشتی کاریگەری بووە بۆ سڕکردن و وەستاندنی کۆمەڵ کە لە ئەنجامدا بووە بەهۆی دواکەوتنی لە ڕووی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسییەوە:



بنوارە وشکەسۆفی و ڕەقسی بەهەڵهەلە
دیسان لە بەحری وشکی هەوا کەوتە پێ مەلە

یەکێ لە خاسیەتەکانی دەروێشی بۆ کوشتنی کات ئەو دەمانەیە کە بەزیکر و تەهلیلە و های هووی و حاڵگرتن دەیبەنە سەر. لێرەدا نالی وێنەی ئەو بزووتنەوە فیزیکییانە لە هەڵپەڕین و سەما دەکێشی کە دەروێش لە حەلقەی زیکر و حاڵدا دەیانکا و لەگەڵ پێ مەلە بەراووردیان دەکا نەک لە زەریای تەڕدا، شاعیر لە هەوای وشکدا ئەم کارە دەبینێ، دیارە وشکی لە لای نالی یەکێکە لە خاسیەتەکانی دەروێشی. ئەم کارە وێنەی ڕاستەقینەی تەمەڵییە، شاعیر دەیەوێ هەموو مرۆڤێک کار بکا، زەوی پێویستە بکێڵرێ، بەڵام لە سایەی دەروێشییەوە کە بیروباوەڕی تەمەڵی و ئیش نەکردن بڵاو دەکاتەوە هەمووی بووە بەمزگەوت یا کاولگە:

ئەم ئەرزە مەزرەعی عەمەلە و گوڵخەنی ئەمەل
هەندێ بووە بەمەسجید و بەعزێ بەمەزبەلە

نالی لەو کاتەی زەوی کردووە بەمەڵبەندی کارکردن و هیوا و ئامانجی ئادەمزاد لە پێناوی ژیاندا، مزگەوتی کردووە بەبەڵگەی بێ کاری بەهۆی کۆلکە مەلایانەوە، دیارە گووفەکیش بەڵگەی وێرانی و پیسی و دواکەوتووییە. بێ گومان لێرەدا نابێ مەبەسی نالی بەتەواوی ڕەتکردنەوەی مزگەوت بێ، چونکە ئەمە لەگەڵ ڕاستیی ناوەوەی شاعیر ناگونجێ، بەڵکو مەبەسی ئەوەیە نابێ عیبادەتی ناو مزگەوت درێژە بکێشێ و هەموو کاتی ئادەمزاد قووت بدا و نەتوانێ کار بکا و لە ئەنجامی کاردا بژی.

ئینجا شاعیر وێنەیێکی کاریکاتۆری شێخ دەکێشێ بەخۆی و ڕیشییەوە و بەچاوێکی نزم و قەشمەری ئامێزەوە تەماشای دەکا بەوەی ئەم هەموو خەڵکە، ژن و پیاوە پیس و پۆخڵ و تەوەزەڵە بەهەڵپەڕین و خۆبادان بەدوای کەوتوون و ئەویش وەکو کەڵەگا ڕێبەرییان دەکا:

شێخم چ گەرمە حەلقەیی زیکرت بەڕەشبەڵک
حاڵی ئەمانە خۆ بەجەنابت موحەووەلە
دائیم لە دووتە مێگەلی ژن و نێرگەلی پیاو
بەم ڕیشەوە لە پێشەوە بووگی بەسەر گەلە

نالی تەنیا بەوە ناوەستێ؛ بەڵکو بەئەوپەڕی دووڕوویی و ناڕاستی دەروێش دەردەبڕێ؛ بەوەی لەگەڵ ڕۆژگاری نامەرد بەراووردی دەکا و دەیانخاتە بەرامبەر بەیەک و لەدواییدا دەیانکا بەهاوبەش. ڕۆژگار دەکا بەپیرێژنێکی ڕزیو و نزم و عەیار و دەڵ، شێخی تەریقەتیش دەکاتە پیرەمێردێک، هەردووکیان دەبن بەژن و مێرد و زیندەگانییان و مارەیی و شاهیدیش لە ناوەوە نییە.

دونیا مەحەللی کەون و فەسادێکە خێرەدوون
مەعلوومە چەند موحەبییە لە چ عەییارە چەند دەڵە
تۆ شێخ و ئەو عەجووزە عەجەب دۆستی یەکترن
بێ شاهید و نیکاحە دیارە موعامەلە

(نالی) سەرت لە گونبەدەکەی خانەقا دەچێ

لایێ پڕە لە مەشعەلە لایێ لە مەشغەلە

مەبەسی شاعیر ئەوەیە لەسەری خۆی و گومەزەکەی خانەقا کە لە یەکتری دەکەن، لایێکی ڕووناک و چراخانە، ئەمە دیوی ژیانی خۆشی شێخی تەریقەتە، دیوەکەی دیکە جێگەی حەلقەی زیکری دەروێشانە، کار و کاسبییان تەنیا ئەمەیە.

٢- لەگەڵ مرۆڤایەتیدا:

نالی باوەڕی بەوەیە ئادەمزادی دڵسۆز نابێ خۆپەرست بێ، تەنیا بیر لە خۆی و کەسوکار و نزیکەکانی بکاتەوە، بەڵکو پێویستە بیر لە هەموو کەسێک بکاتەوە و بەهانای هەموو لێ قەوماوێک بگا و دەستی یارمەتی بۆ هەموو بێ دەسەڵاتێک درێژ بکا، بەم جۆرە لای نالی مرۆڤپەروەری ئەوەیە هەموو مرۆڤایەتی بگرێتەوە:

من لە تەوری عالەم و جەوری فەلەک

زەربی لازیب زەخمی بێ مەرهەم دەخۆم

تالی بێ یار و دیاری تار و مار

عەلقەمی چی ئەرقەمی چی سەم دەخۆم

نەوعە ئینسانێ هەیە غەم قووتییە

من غەمی خۆم و غەمی عالەم دەخۆم

غەم دەڵێ (نالی) کە غەمخواری دەکا

ناعیلاجم من بەنی ئادەم دەخۆم

لەگەڵ ئەوەی ئەم شیعرە لە وێنە هونەراوییەکانیدا جۆرە داهێنانێکی ڕۆمانتیکییانەیان تێدایە، بەئاشکرا ئەدگارێکی کۆمەڵایەتیشیان پێوەیە بەوەی نالی نەوەکو تەنیا غەمی خۆی دەخوا، بەڵکو غەمی هەموو خەڵکی دەخوا و بیریان لێ دەکاتەوە، بەڵام نوکتەییێکی هونەری گەلێ بەرزی تێدایە بەوەی هەر کەسە سەودا و غەمێکی هەیە، بەتایبەتی شاعیران؛ یەکێک شێت و شەیدا و گرفتاری یارە خۆشەویستەکەیەتی، ئەوی تر دووچاری ئاوارەیی و غوربەت بووە، یەکێکی تر پاشە و پێش سواری کەر کراوە و ماستی بەسەرا کراوە، چونکە داوای مافی میللەتە ڕەش و ڕووتەکەی کردووە. دەیان و سەدان و هەزارانی لەم بابەتە، ئەمانە هەموویان عاشقن، عاشقی دلبەر لەگەڵ عاشقی نیشتمان و لەگەڵ عاشقی ڕەش و ڕووتان عاشقێکن هیچ جیاوازییێک لە نێوانیاندا نییە. هەموویان غەمبارن، لێو بەبارن، نالی یەکێکە لەمانە، یا سەرۆکیانە، غەمی خۆی و غەمی هەموویان دەخوا، لەبەر ئەوەیە هونەروەرانە دەتوانێ تەعبیر لە غەمی دڵ و دەروونی هەموویان بکا.



## دڵداری

سروشت سەرچاوەییێکی بنچینەییە بۆ هەموو ناوەرۆکە دڵدارییەکان، نالی هەمیشە هەوڵیداوە بیانخاتە چوارچێوەی شیعرەکانیەوە، لەبەر ئەوەیە هەندێ جار شاعیر هەموو سروشت دەکا بەیارەکەی، بەڵام بێ گومان یار لە سروشت جوانترە، هەرچۆنێ بێ ئاشکرا و دیارە نەوەکو تەنیا لە شیعرە دڵدارییەکانی شاعیردا، بەڵکو زۆربەی هەرە زۆری بەرهەمی شیعری داگیر کردووە، واتە ڕەشبینی نالی لە دڵداریدا لە ئەنجامی سەرنەکەوتنیەتی لە تاقیکردنەوەی خۆشەویستیدا، کەچی لای ئەورەحمان بەگی سالم لە بەئەنجام نەگەیشتنی چارەنووسی نەتەوەیی میللەتی کوردە، بەڵام لای مستەفا بەگی کوردی ڕەشبینی لەناو تەمومژی سۆفیزمدا ون بووە.

غەزەلە دڵدارییەکانی نالی زادەی خۆشەویستی حەبیبەیە، ئەو کچە هەبێ یا نەبێ، بووکی خەیاڵ بێ یا هەر شتێکی تر بێ، گرنگ نییە، ئەو کچە دەورێکی باڵای بووە بۆ دروستکردنی مانا و وێنە لە لای شاعیر. لە هەندێ لەو شیعرانەی شاعیر باس لە پێوەندی سۆز و دڵداری نێوان خۆی و حەبیبە دەکا، زنجیرەی بیر و باس و ڕووداو هارمۆنییێکیان تێدایە، واتە دێڕە شیعرەکان لە ڕووی ناوەرۆکەوە پێوەندییان بەیەکترییەوە هەیە و، وە نییە هەر دێڕە شیعرێکی لە لایەن ماناوە بەتەواوی سەربەخۆ بێ.

یەکێ لەو غەزەلانەی وێنەییێکی ڕوون و ئاشکرا بەدەستەوە دەدەن لە بارەی پێوەندی نالی بەحەبیبەوە لەم ماوەیەدا دەیخەینە بەرچاو.

دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵمەگرە ئەی حەبیبە

وە بزانە خوێنی خۆمە، یا مننەتی ڕەقیبە

شاعیر دەیەوێ بەحەبیبەی خۆشەویستی بڵێ من کوژراوی تۆم لە ڕێگەی دڵداریدا، واتە خوێنم کەوتۆتە سەرت و ئەو خوێنە لە ئەستۆی تۆیە، لەبەر ئەوە لێم مەگرە کە دەست لە ملت دەکەم، ئەمە خوێنی خۆمە و وەری دەگرمەوە، هەروەها کوشتنی من لە لایەن تۆوە مایەی بەختیارییە بۆ ڕەقیب و مننەتێکی گەورەی دەکەوێتە سەر، چونکە بەنەمانی من تۆ بۆ ئەو دەبی.

لەمەوە نالی دەکەوێتە ئەوەی خۆی گەلێک بچووک و نزم بکاتەوە لە دڵداریدا بۆ ئەوەی حەبیبە گەلێک گەورە و باڵا خۆی بنوێنێ. بێ گومان ئەم خۆ بەبچووک زانینە تەنیا لە گێتیی دڵداری نالیدا ناکەوێتە بەرچاو، بەڵکو دڵداری لە سەرانسەری ئەدەبی کلاسیکیدا سنووری بۆ نییە و گەورە و بچووک و سوڵتان و گەدای تێدا نییە، هەموو شاعیرێکی عاشق پێویستە خاکی ژێر پێی نازەنین بێ.

سەر بەردەبازی ڕێتە، تەن تەختەبەندی جێتە

دڵ مەیلی خاکی پێتە، ڕووحماڵی خۆتە بیبە

تۆ نەوشکۆفە وەردی، من مایلم بەزەردی

تۆ هەم سەرت نەسیمە، من هەم دەمم لەهیبە

نالی سەری خۆی کردووە بەبەردەباز بۆ حەبیبە لە پێناوی ئەوەی ئەگەر تووشی جۆگەلەییێک هات پێی

لەسەر سەری شاعیر دابنێ بۆ پەڕینەوە، هەروەها لەشیشی دەکاتە ئەو تەختەی شەو لەسەری دەخەوێ. ئەوەندە گیرۆدەی حەبیبەیە ئارەزوو دەکا پێ لە دڵی بنێ، گیانیشی کە مایەی ژیانیەتی ئەگەر هی ئەوە، هەموو کاتێک دەتوانێ بیباتەوە.

لە دڵداریدا ئەنجامی دڵدار و دلبەر یەک دەبێ، نالی و حەبیبە یەکتری تەواو دەکەن جا با گەورەیی و بڵندییەکە هەمووی بدرێ بەحەبیبە و بچووکی و نزمییەکەش هەمووی بدرێ بەشاعیر، یاخود بەشێوەییێکی دیکە گەورەیی و بڵندییەکە هەمووی بۆ حەبیبە بێ بەرامبەرەکەشی کە (هیچ)ە بۆ شاعیر بمێنێتەوە. ئەمە بەلای شاعیرەوە (بوون) و (نەبوون)ە. لە دێڕی داهاتوودا نالی ئەم بوون و نەبوونە بەشێوەییێکی هونەری زیاتر ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ: تۆ، واتە حەبیبە گوڵی سووری غونچەییێکی تازە پشکووتووی، هاوسەرت بای شەماڵە و لە بەهار یا لە ژیانی بەهاریدای، بەڵام من زەرد هەڵگەڕاوم و لە پاییز یا لە ژیانی پاییزیدام، گڕ و گڵپەی ئاگر هاوڕێ و هاودەمی منە. نالی حەبیبەی کردووە بەگوڵی سووری تازە پشکووتوو، بەڵام خۆی کردووە بەشتێکی دیاری نەکراوی کەساسی زەرد. لێرەدا مەبەسی شاعیر ئەوەیە خۆی بکا بە(مۆم) یا (پەپوولە) وەکو لە مانای شیعرەکەدا دەردەکەوێ بەبێ ئەوەی ناویان ببا. نالی دەڵێ حەبیبە گوڵی سووری غونچەی تازە پشکووتووە و هاوسەری بای شەماڵە کە دەیبزوێنێ و دەیلەرێنێتەوە گەشەی زیاتر دەبێ، ئەمە (بوون) و (ژیان)ە، بەڵام شاعیر مۆمە هاوڕێی زمانی ئاگرە، یا پەپوولەیە و هاودەمی ئەو گڕەیە، لە هەردوو باردا بەرامبەر بەحەبیبە (نەبوون) و (مردن)ە، یەکەمیان دەتوێتەوە و نامێنێ، دووەمیان دەسووتێ و دەبێ بەزوخاڵ.

لەدوای ئەمە شاعیر دەیەوێ وێنەییێکی تر یا ڕەوشتێکی تر بۆ (بوون) و (نەمر)ەکە کە دلبەرەکەیەتی دروست بکا. ئەویش ئەوەیە ئەم نازەنینە لە خۆیدا زۆر ناسکە، بەڵام کردەوەکانی قورسن و ئازاری خەڵکی دەدەن:

شاهێنی دیدەبازە، مەستی شەرابی نازە
دڵدار و دڵنەوازە، دڵکێش و دڵفرییە
ئەو تیفلە خوردە ساڵە، هەرچەندە وەک غەزالە
ئەمما کە هاتە نەخچیر، شیر سەولەت و مەهیبە
دڵ پەی دەکا نیگاهی سەهمی موژدەی سیاهی
ڕەمزی هەموو بەلایە، غەمزەی هەموو موسیبە

لە وەسفی دلبەردا نالی لە چاوبازی دەگەڕێ، لە شاهێندا ئەو باڵندە چاو جوانەدا دەیدۆزێتەوە، لەگەڵ یارەکەی بەرامبەری دەکا، دڵی مەست و سەرخۆش بووە بەشەرابی ناز و عیشوە و لەخۆبایی نەوەکو شەرابی ئاسایی. ئەو یارە خاوەن دڵ و دلاوەر و عاشقە، ئارامی دڵی شاعیرە و خۆشی دەگەیەنێتە گیان، دڵ دەکاتەوە و ڕایدەکێشێ و جارجارەش هەڵی دەخەڵەتێنێ. یارم هەرچەند تەمەنی بچووک و منداڵە و ناسک و نەرم و نازدارە وەکو مامز دەبێ خۆی نێچیر بێ و ڕاو بکرێ، بەڵام کە دەچێتە ڕاووشکار وەکو



شێر بەتوانا و هێز و هەیبەتە، بەسام و ترسێنەرە، دیارە لێرەدا مەبەسی ڕاوکردنی عاشقە. دڵی ئەو عاشقە کون دەکا بەنیگاییێک کە لەم ڕوانینە تیرێک کە برژانگی ڕەشیەتی دەردەپەڕێ و دڵی عاشق دەسمێ، بزووتنەوە نهێنی و داپۆشراوەکانی کە وەکو تەلیسم وایە کارەسات و گرفتاری و ڕەنجەڕۆییە بۆ عاشق و، تیری چاوەکانیشی هەموویان بەناو دڵ کە جەرگەی مەبەسە دەکەون و دەیسمن.

نالی لەم هەموو کارەساتەی بەسەر دڵیدا هاتووە و تیرەباران کراوە بەڕووداوێکی خۆش و بەختەوەر دادەنێ، چونکە ئەم ئازارە لە ئەنجامی دڵدارییە، کە دڵداری ببێ مانای ئەوەیە ژیان هەیە، بەڵام ئەگەر دڵداری نەبێ مانای وشکی و مردنە. لەبەر ئەوەیە قسە لەگەڵ چاوی خۆی دەکا و پێی دەڵێ تۆ پڕ لە پەشیمانی و ئەفسووس و داخی گرانی، دڵیش پڕ لە غەم و غەرامەتە لەبەر دڵداری، ئەمە بەختیارییە بۆ من، لەبەر ئەوە تۆ فرمێسک بۆ وشکەسۆفی برێژە چونکە لەم ژیانە تەڕ و ئاودارەی دڵداری بێ بەشە.

ئەی چاوی پڕ نەدامەت، دڵ پڕ غەم و غەڕامەت
بگری کە وشکەسۆفی، لەم فەیزە بێ نەسیبە

لە پاش ئەمە نالی لەگەڵ تەنیایی قسە دەکا، ئەو تەنیاییە کپی و بێ دەنگی نییە، بەڵکو تەنیاییێکە ئاژاوە و تەنگوچەڵەمەی دڵداری دەنێتەوە، دوژمنایەتی دەخاتە ناوەوە، ئینجا لەگەڵ سیما قسە دەکا، ئەو سیمایەی خۆی بەڕەنگێک دەنوێنێ وەکو چۆن هەیە وا بەبێ ئەوەی ڕووتوش بکرێ و، دەڵێ پێویستە زەردی ڕەنگی تۆ ئەو زەردییە بێ کە عاشق هەیەتی، نەوەکو ئەو زەردییەی تاوانبار هەیەتی. ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە عاشق و تاوانبار هەردووکیان ڕەنگیان زەرد دەبێ. یەکەمیان لەبەر عەشق و دڵداری، دووەمیان لەبەر ترس و خەجاڵەتی، جا تۆ زەردی عاشقان بە نەوەکو زەردی ڕێگر و ئەشقیای بەدبەخت.

ئەی خەڵوەتی موڕایی، بێ ڕەنگی خود نومایی
ڕەنگ زەردی عاشقی بە، نەک زەردی ڕووشەقی بە

نالی سەر دەقی ئەم غەزەلەی بەناوی حەبیبەی بووکی شیعرییەوە شکاندووە، بەناوی ئەویشەوە کۆتایی پێ هێناوە.

(نالی) لەبی حەبیبە، هەم تیبە هەم تەبیبە
خولاسەوو لەبیبە، فەرمانبەری لەبی بە

شاعیر هەوڵی داوە جوانییەکانی کە لە حەبیبەدا هەیە لە دەم و لێوی کۆیان بکاتەوە و دەڵێ دەم و لێوی حەبیبە بەبۆن عەتر و عەبیرن، لە دڵدانەوە و ئاراستەکردنی خەڵکی بۆ کاری چاک پزیشک و حەکیمن، پاک و ساف و بێ غەشن، واتە قسەی بێ تام و بۆیان لێ دەرناچێ، هەروەها بەهۆش و پڕ بیر و هوشیار و خێرخوان، واتە قسەی قووڵ و پڕ مانا و ماقووڵ لێیان دێتە دەرەوە، لەبەر ئەوەیە دەبێ سەرت دانوێنی و خزمەتکاری هەموو فەرمانێک بێ کە لەم دەم و لێوە دێتە دەرێ و ئارەزووەکان جێبەجێ بکەی.

سروشتی دڵداری لە شیعری نالیدا وەک دیاردەییێکی زەمینیی دوور لە دڵداریی سۆفیزمی دەکەوێتە ڕوو، بەشی زۆری هەناسەییێکی ڕەشبینی پێوە دیارە، لەو کەمتر پێوەندی بەدەستبازی و ماچوموچەوە هەیە.

## وەسف

سروشت و هەستی دەروون یەکتری تەواو دەکەن، لە غەزەلی کوردیدا ئەم جۆرە شیعرە بەگشتی و لە لای نالی بەتایبەتی ڕەونەقێکی ناسکی ڕۆمانتیکی هەیە. جوانیی سروشتی کوردستان هەوێنێکی گرنگی شیعری نالییە، ئەم سروشتە دەوڵەمەند و ڕەنگینە، شاعیر هەندێ لە دیاردە تایبەتییەکانی سروشتی کوردستان لە شیعریدا بەکاریان دەهێنێ.

نالی یەکجار پابەندی سروشتە و هەرگیز بەوشکی وەری ناگرێ، بەڵکو هەندێ جار چەند دیمەنێکی ڕەنگاوڕەنگ و هەمەجۆر لە نیگارێکدا کۆ دەکاتەوە و ورد و درشتی ئەو سروشتە دەجووڵێنێ:

گوڵ تاجی لەسەر ناوە چەمەن مەخمەلی پۆشی

هات موژدە کە خیلعەت گەییە بەر بەموباهات

گوڵ پشکووتووە، زەوی فەرشی سەوزی پۆشیوە، ئەم جلوبەرگە بەخەڵات دراوەتە زەوی، ئەوەندە جوانە بەلەخۆباییبوونێکەوە خۆی دەنوێنێ. لەسەر ئەم خاکە ڕەنگینەدا بلبل و قومری دەخوێنن، درەخت حەیرانی ئەم ئاوازەن، بەشنەی بای شەماڵ سەریان دەلەقێنن:

هات زەمزەمەیی بلبل و ئاوازەیی قومری

هات بادی سەبا دێن و دەچن عەرعەر و بانات

گوڵ و گەڵای دار ئەوەندە زۆرن وەکو ئەستێرەی ئاسمان لەو دەشتەدا بڵاو بوونەتەوە، واتە وێنەی ئاسمان شەوقی زەوییە لەوی ڕەنگی داوەتەوە:

نەجم و شەجەر و نێرگس و ئەنواری شکۆفە

جیلوەی چەمەنن یەعنی زەمین بوو بەسەماوات

لە شیعرێکی تریدا نالی هەندێ ڕووداوی هەستی دەروونی خۆی و ئەندامی لەشی خۆشەویست لەگەڵ ڕووداوی سروشت بەرامبەر و بەراوورد دەکا. لەوانەیە هەست بەوە بکرێ شاعیر هەندێ قاڵبی ئامادەکراوی وەرگرتووە، ئەمە ڕاستە شاعیرانی گەورەی ڕۆژهەڵات لەم کارە بەدوور نین، بەڵام هەر لەم قاڵبە ئامادەکراوانەدا نالی وەستایەتیی نواندووە و وێنەی تازەی داهێناوە.

لەم شیعرەی خوارەوەدا شاعیر وردەکاری لەوەدا نواندووە، کە بەزۆری لە نیوەدێڕی یەکەمدا ڕووداوێکی هێناوەتەوە لە هەستێکی خۆی یا ئەندامێکی خۆشەویستەکەی پێک هاتووە، لە نیوەدێڕی دووەمدا هەندێ بزووتنەوەی سروشتی لە بەرامبەر داناوە:



عاشقی بێ دڵ دەناڵێ مەیلی گریانی هەیە

بێ شکە هەورە تریشقە تاوە بارانی هەیە

عاشقی شەیدا لە دووری خۆشەویست دەگری و دەناڵێنێ، دەنگی ناڵینی ئەوەندە بڵندە وەکو هەورە تریشقە وایە، فرمێسکی ئەوەندە زۆرە وەکو بارانی سەر بەکڵاوەیە:

چاوی من دەمدەم دەڕێژێ ئاوی ساف و خوێنی گەش

دا بڵێن دەریایی عوممان دوڕڕ و مەرجانی هەیە

چاوم فرمێسکێکی زۆری لێ دێتە خوارێ، ئەم فرمێسکە هەندێ دڵۆپی سافە وەکو ئاو، هەندێکی تری سوورە وەکو خوێنی گەش. بۆ زۆری هێندەی زەریاییێکە، ئەمە وەکو زەریای عوممانە کە دوڕڕ و مەرجانی تێدایە، دوڕڕەکە سپییە وەکو فرمێسکە سپییەکان و، مەرجانەکەش سوورە وەکو فرمێسکە خوێناوییە سوورەکانی شاعیر:

ڕوومەتی وا دادەپۆشێ ئەو بەپێچی زولفەکەی

دا بەڕۆژیش پێی بڵێن شەمعی شەبستانی هەیە

لێرەدا شاعیر دەیەوێ بەڕۆژ شەو دروست بکا بۆ ئەوەی سووچێکی کوڵمی لە بریسکە و ڕووناکی بکا بەچرا، ئەگەر ئەم وێنەیە دەربکەوێ تاریکییەکە بەڕووناکی دەگەڕێتەوە. خۆشەویست زولف و پەرچەمی لەسەر ڕوخساریدا بڵاو دەکاتەوە، ئەم ڕوخسارە سپییە ڕەونەقدارە بەهۆی قژی ڕەشەوە لە ڕووناکییەوە دەبێ بەتاریکی. ئەو بەشەی لە ڕوومەت و کوڵم کە لە کەلێنی مووەکاندا دیارن، سپی دەچنەوە، ئەمە دەکاتە ئەو مۆمەی جێگەی نوستنی شەوی ڕووناک دەکاتەوە. لێرەدا شەو و ڕۆژ لە ڕووداوەکانی سروشتن. لەمەوە نالی ڕوو دەکاتە ئاسمان بۆ ئەوەی لەوێش شتی وا بدۆزێتەوە لە هەندێ ئەندامانی خۆشەویست بکەن:

ئاسمانی حوسنی مەحبووبم بەئەبرۆ و زولف و ڕوو

دوو هیلال و دوو شەو و دوو ماهی تابانی هەیە

ئاسمانی جوانی دلبەر ڕوخساریەتی، واتە دەموچاو، لە ڕوخساریشدا ئەوەی سەرنجی شاعیری ڕاکێشاوە برۆ و زولف و کوڵمە، دیارە لەبەر ئەوەش ئاسمانی پێ وتووە چونکە هیلال و شەو و مانگ لە ئاسمانا دەبن. ئیتر شاعیر دەڵێ ئاسمانی جوانی دلبەر وەکو ئاسمانەکەی گەردوون نییە، چونکە ئەم ئاسمانە تەنیا یەک شەو و یەک هیلال و یەک مانگی چواردەی تێدا دەبێ و بەهیچ جۆرێکیش هیلال و مانگی چواردە پێکەوە دەرناکەون، بەڵام ئاسمانی جوانی دلبەر دوو هیلال کە دوو برۆیە، دوو شەو کە جووتە زولفەکانیەتی و دوو مانگی چواردە کە دوو کوڵمەکانیەتی، هەموویان بەجارێک کۆبوونەتەوە.

شاعیر لە دەموچاو و لێوەکانی بەرەو خوار دەبێتەوە بۆ لای سنگ و مەمک:

یا لەبی یا سینەشی هەردوو بەدەرخا دا بڵێم

لەعلی ڕوممانی هەیە یا لەعل و ڕوممانی هەیە

ئەگەر پیاو تەماشای لێو یا سنگی دلبەر بکا، لەعلی ڕوممان و لەعل و ڕوممان دەبینێ. لەعلی ڕوممان دەنکی هەنارە، بۆ سووری لێوە چونکە لەگەڵ ئەمە بەراووردی دەکا. لەعل بەمانای گۆی مەمک و هەناریش مەمک خۆیەتی، ئەمەش سنگ و بەرۆکی دلبەرە. بەشێوەیێکی تر شاعیر دەڵێ: با دلبەر لێو و سنگی بەدەرخا و پیشانمانیان بدا، بۆ ئەوەی چاومان بەلێوی بکەوێ کە وەکو دەنکی هەنار سوورە، سنگیشی لەعل و هەناری هەیە، واتە گۆی سووری وەک لەعل و مەمکی هەنارییە.

لە پاشانا شاعیر دلبەرەکەی دەکاتە ئاژەڵی کێوی ئەوەی لە ئادەمزاد دەڕەوێتەوە لە ترسی پلار و توانجی ڕەقیبی خوو و ڕەوشت سەگانی.

وەحشییە لێمان لەبەر تەعنەی ڕەقیبی سەگ سینەت

ڕاستە هەرزی ڕووحێ بۆ وەسواسە شەیتانی هەیە

لەناو کوردەواریدا ئەفسانەیێکی وا لە ناوەوەیە لە ئەنجامی بیروباوەڕی ئایینی زۆر کۆنەوە هەڵقولاوە، گۆیا هەموو گیانلەبەرێک، بەتایبەتی ئادەمزادێک شەیتانێکی هەیە، ئەمە ڕێگەی خراپە و دوودڵی پیشان دەدا، ئەو کارە خراپەی مرۆڤ دەیکا لە ئەنجامی هاندان و ڕێ پیشاندانی ئەو شەیتانەیە، جا شاعیر لێرەدا دان بەوە دادەنێ کە بۆ وەسواسە و چاوەزار و دوودڵی هەموو مرۆڤێک شەیتانێکی هەیە، وەکو ئەو شەیتانەی دلبەر وا لێ دەکا لێمان دوور بکەوێتەوە.

شاعیر هێشتا وازی لەو وێنەیە نەهێناوە، ئەو مێرغوزارەی ئاژەڵی کێوی تیایە و ئەم کێوییە خۆشەویستەکەیەتی، بێ گومان ئاژەڵەکەش دەبێ مامز بێ. پێش ئەوەی باس لە سرکی و جموجۆڵی بکا، دەڵێ:

دڵ موشەببەک بوو لەبەر ئێشان و نیشانی موژەت

حەیفە قوربان ئاخر ئەم نیشانە ئێشانی دەوی

چاو ئەوەندە تیر ئاراستەی دڵی عاشق دەکا هەمووی کون کون دەبێ، وەکو پەنجەرەی لێ دێ، بەڵام جێی داخە ئەم هەموو تیرە ئاراستەی دڵ بکرێ چونکە هەموو برینە، برینێکی بەئێش و ئازار و دژوار.

ئینجا شاعیر دێتەوە لای مامزە کێوییەکە و دەڵێ، مامزە کێوی بەهیچ جۆرێ ناتوانێ لە مرۆڤ نزیک بکەوێتەوە و هەمیشە لێی دوور دەکەوێتەوە، لەبەر ئەوەیە بۆ ماوەی چاو قوچانێکیش ناتوانێ چاوی پێی بکەوێ واتە لێی نزیک ببێتەوە:

لەحزەیێک و لەمحەیێک چاوم بەچاوی ناکەوێ

کێ دەڵێ وەحشی غەزالە مەیلی ئینسانی هەیە

ئینجا شاعیر دەکەوێتە وردەکاری لە وشە و مانا، بەدلبەری دەڵێ:

تۆ ئەگەر هەستی لە جێ ڕاوەستی دەهری و کافریش

دێن دەڵێن بێ شک قیامەت ڕاستە هەستانی هەیە



کورد کە دەڵێ (قیامەت هەستاوە) مانای ئەوەیە کارێکی گەلێ گەورە ڕوویداوە، واتە دلبەری شاعیر کە هەڵدەستێتە سەر پێ ئەوەندە جوان و بێ وێنەیە وەکو ڕووداوێکی گەلێک گەورە ڕوویدابێ، جا بۆ ئەمە کەسی خودا نەناس و کافریش باوەڕ بەخودا دەکەن و دەڵێن خودا هەیە، کە ئەو هەبێ دیارە ڕۆژی قیامەتیش هەیە. لێرەدا هەڵسانە سەر پێی دلبەر لەگەڵ هەڵسانی قیامەت بەراوورد کراوە. بێ گومان چۆن کەس نییە بڵێ ئەم دلبەرە جوان نییە، هەروەها کەسیش نییە بڵێ قیامەت هەستانی نییە.

لە بڕەشیعرێکی تریدا نالی هەندێ دیاردەی سروشت وەردەگرێ و بەرامبەر چەند وێنەیێکی هەست پێکراوی دادەنێ لە لەشی دلبەرە خۆشەویستەکەی. ئەمە لەوانەیە زیادەڕۆیی زۆری تێدابێ بەوەی شتێکی یەکجار بچووک بەرامبەر شتێکی یەکجار گەورە دادەنێ، بەڵام سەرکەوتنی شاعیر لەوەدایە کە جەوهەرێکی لەیەکچوو لە هەردوو شتی زۆر گەورە و زۆر بچووکدا دەدۆزێتەوە، بەمە وێنەیێکی تازە دروست دەکا:

لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان

بەیانی دا سپیدەی باغی سێوان

لە خەوفی تەلعەتی ڕۆژ هەر وەکو شێت

بەڕوو زەردی هەڵات و کەوتە کێوان

کات ئێوارە بوو، ڕۆژئاوا بووبوو، کە گرێی سوخمەی دلبەر کرایەوە، ڕووناکی بەیانی لە باغی سێوان پەیدا بوو. واتە مەمکەکانی سێون، سنگی باغی سێوانە، مەمکەکانی ئەوەندە بەبریسکە و ڕەونەق بوون، ئەگەرچی ڕۆژئاوا بوو، بەڵام سەرلەنوێ بەیانی دا بەهۆی دەرکەوتنی مەمکەکانی. ئاوابوونی ڕۆژ لەبەر ئەوەبوو لە دەرکەوتنی دلبەر ترسا؛ چونکە ئەو لەو جوانتر و بریسکەدارترە بۆیە، وەکو شێت و لەبەر خەجاڵەتی لە جوانی یار ڕووشی زەرد بووبوو هەڵات و کەوتە ناو کێوانەوە.

لێرەشدا شاعیر مەمکی خۆشەویست لە جوانی و بریسکە و ڕەونەقدا بەرامبەر بەڕۆژ دادەنێ، نەوەکو لە بەرامبەریەکەدا وەکو یەکن؛ بەڵکو لەویش بەشەوقتر و ڕووناکترە، تەنیا لەبەر ئەوەشە لە شەرمی ئەو ڕای کردووە. بێ گومان ڕوو زەردی ڕۆژیش دوو مانا دەگەیەنێ، یەکەمیان بەڕاستی ڕووی زەردە، واتە ڕەنگی زەردە، دووەمیان خەجاڵەت وای لێ کردووە ڕووی زەرد هەڵگەڕێ لەبەر جوانی مەمکەکانی.

دیسانەوە لە ڕووی زیادەڕۆییەوە (موبالەغەوە) نالی باس لە فرمێسک دەکا وەک ڕەمزی گریان، گریانیش بەڵگەی دڵگوشراوی عاشقی بێ چارەیە، شاعیر دەڵێ فرمێسکەکانی زۆر سوێرن، فرمێسک هەرچەندە سوێر بێ مانای ئەوەیە خاوەنەکەی دڵسووتاوترە. ئەم فرمێسکە بەرامبەر بەئاوی زەریا دادەنێ، ئاوی زەریا گەلێ تاڵ و سوێرە، بەڵام نەوەکو زەریای ئاسایی؛ بەڵکو زەریای خوێ، واتە شتێکی گەلێ گەلێ سوێر. جا بۆ پێوەندی دانان لەنێوان ئەم دوو شتە فرمێسک و زەریای خوێ، چاو دەکاتە پێوانە. چاوێکی یەکجار بچووک بەرامبەر زەریایێک، بەمەرجێ ئەو چاوە پێوانەی هەموو ئاوی زەریاکە بێ:

دوو چاوی من کەوا کەیلی سریشکن

دەپێوون ئاوی بەحری خوێ بەپێوان

لەم وێنەیەدا شاعیر لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە هەوڵ دەدا زیاتر بایەخ بەوشە بدا، وشەی (پەشێو) دووبارە و سێ بارە دەکاتەوە بۆ ئەوەی بڵێ نابێ سەرزەنشتی ئەوە بکەی کە دڵ ئەمشەو پەشێوە، ئەم پەشێواوییەی لەبەر پەرچەم پەشێوانە، واتە ئەو جوانانەی سەر و پەرچەمیان پەشێواوە. لە ڕووی هونەرییەوە هەندێ جار ئارایشکردنی سەروقژ کە جوانی دەکا، پێچەوانەکەی پەشێوان و نارێکی هەندێ جاری دیکە جوانتری دەکا:

مەکە لۆمەی پەشێوی دڵ کە ئەمشەو
پەشێواوە لەبەر پەرچەم پەشێوان

ئینجا شاعیر ئاوڕ لەمەی و مەیخانە دەداتەوە. خواردنەوەی مەی مەزەی گەرەکە، بەڵام مەزەی نالی ماچە، ئەگەر ئەو ماچە نەبێ شەراب ناخواتەوە چونکە مەزەی دیکەی ناوێ:

شەرابی لەعلی ڕوممانی لە (نالی)
حەرامە بێ مەزەی ماچێکی لێوان

شاعیر لەم دێڕەدا ئەوە دەخاتە ڕوو، شەرابی ڕەنگ سووری یاقووتی و دەنکە هەناری ناخواتەوە ئەگەر مەزەکەی ماچی لێوان نەبێ.

لە شیعرێکی تریدا نالی دیسانەوە هەندێ وێنەی پڕ لە سۆز دادەهێنێ لە بابەت بەشێک لە ئەندامە جوانەکانی نازەنین، یا بەشێک لە ئارەزووەکانی، کاری سروشت لەم وێنانەدا ئاشکرا و دیارە:

یار دڵی خوێنین و چاوی پڕ لە گریانی دەوێ
ئارێ ئارێ گوڵ لە باغان ئاوی بارانی دەوێ

دلبەر دڵی سووتاو و چاوی پڕ لە فرمێسکی دەوێ، واتە ئارەزووی دلبەر ئەوەیە لە دڵدار دوور بێ، یا خۆی دوور بخاتەوە، وەکو چۆن گوڵ لە باغان دەم دەم بەبێ بڕانەوە ئاوی دەوێ، وە چۆن بەبێ ئاوی باران ناژێ و وشک دەبێتەوە، هەروەها یاریش ناتوانێ هەڵبکا بەبێ ئازاری دڵدار و ئەوەی سووتاوی دڵ و فرمێسکی چاوە.

دیسانەوە جارێکی تریش لە گوڵی باغی ڕووی زەوی و بارانی نێوان ئاسمان و ئەرز، شاعیر بەرەو ئاسمانی بڵند و دوور دەنوارێ بۆ دەرهێنانی وێنەی تازە:

هەر کەسێ ڕووی تۆ دەبینێ خۆی بەقوربانی دەکا
چونکە ئەبرۆی تۆ هیلالی عیدە قوربانی دەوێ

هەر کەسێ ڕووی دلبەر ببینێ خۆی دەکاتە قوربانی بۆی، چونکە وەکو ئاسمان وایە، لەناو ئەم ئاسمانەدا مانگی تازە هەیە، ئەم مانگە برۆی خۆشەویستە، کە مانگی تازە دەربکەوێ دەکرێ بەجەژن، دیارە جەژنیش قوربانی دەوێ، قوربانییەکەش دڵدارە، ئەمە پێوەندی بەجەژنی قوربانی موسوڵمانانەوە هەیە.



نالی جارێکی تریش بەمەبەستی زیادەڕۆیی شتی یەکجار بچووک بەرامبەر بەشتی یەکجار گەورە دادەنێ (فرمێسک) و (ئاگری دڵ) بەرامبەر (ئاوی تۆفان) و (دۆزەخ)، لێرەدا مەبەستی ئەوەیە بڵێ سۆزی دڵ ئەوەندە گەرم و بەکوڵە، ئاگری ئەوەندە زۆرە بەفرمێسکی چاو با زۆریش بێ دا نامرکێتەوە، ئاگر و سۆزی ناو دڵ ئەوەندە زۆرە هێندەی دۆزەخە، بێ گومان دۆزەخیش دیاردەیێکی یەکجار گەورەیە مەگەر بەئاوی تۆفان بکوژێتەوە، ئاوی تۆفان ئەوەندە زۆرە وشکایی لەسەر ڕووی هەموو زەوی ناهێڵێ و گۆی زەوی دەکا بەئۆقیانووسێکی بێ پایان.

ئاو لە چاوانم بەخوڕ دێ ناری دڵ ناکوژێتەوە
وەک جەهەننەم ئەم تەنوورە ئاوی تۆفانی دەوێ

ئاگری ناو دڵم ئەوەندە زۆرە، هێندەی ئاگری ناو دۆزەخە، فرمێسکی چاوم بەشی ئەوە ناکا بیکوژێنێتەوە، لەبەر ئەوەیە دۆزەخ بەئاوی تۆفان نەبێ ناکوژێتەوە.

وەکو هەندێ پارچە شیعری کلاسیکی کە بەگشتی یەکێتیی دێڕەشیعری تێدایە، نالی لە شیعرێکدا بۆ گەلێ مەبەس دەڕوا، هەر لەو شیعرەدا زۆربەی دێڕەکانی لە سروشت وەرگیراون، کەچی هەندێ دێڕی تری ڕاستەوخۆ پێوەندییان بەسروشتەوە نییە:

عیشق سوڵتانێکە هەرگا ڕوو لە وێرانێ بکا
ئاهی سەرد و ئەشکی گەرم قەڵبی بریانی دەوێ
دوور لە تۆ دڵ هێندە بێ ئارام و بێ حاڵ کەوتووە
ئەی مەسیحایی زەمان لەو لێوە دەرمانی دەوێ

شاعیر دڵداری دەکا بەسوڵتان، ئەو سوڵتانە سەرداری هەر مەملەکەت و وڵاتێک بێ خەڵکی ئەو وڵاتە دەبێ پێشەیان ئاه و حەسرەت بێ کە نائومێدییە، فرمێسکی گەرم بێ کە گریانە، دڵی برژاو بێ کە دوورییە لە یار. ئینجا دەڵێ دڵم لە تۆ دوورە لەبەر ئەوە بێ ئارام و بەدحاڵ کەوتووە وەکو مردوو. تۆ، واتە دلبەر دیارە مەسیحە و موعجیزاتی هەیە، کە بتوانێ مردوو زیندوو بکاتەوە؛ بێ گومان دەتوانێ زامی بریندار سارێژ بکا، دەرمانی ئەو برینەی تووشی بووە لێوی دلبەرە، واتە ماچ.

لەو کاتەی نالی لە دلبەرەکەی ماچ داوا دەکا وا دەزانرێ ئەمە ئامانجێکە نایەتە دی! کەی عاشقێکی ڕۆژهەڵاتی بەئامانج گەیشتووە! بۆچ بەئامانج بگا! ئەگەر بەئامانج بگا لەوانەیە سەرچاوەی ئیلهام و داهێنان وشک ببێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەش مەسەلەکە وا دەکەوێتە ڕوو وەکو ئامانجەکە هاتبێتە دی. چونکە ئەگەر دڵداری داوای شتێک لە نالی بکا، ئارەزووی دەهێنێتە دی:

ڕووم ئەوا زەرد بوو وەکو پاییز لە هیجران (نالی)یا
عیشق ئێستاکەش لە من سەیری بەهارانی دەوێ

ئەمە کارێکی قورسە؛ چونکە لە دووری دلبەر ڕووی زەرد بووە، وەکو پاییز گەیشتۆتە قوناغی هەرە دوایی ژیان، لەو سەردەمەدا سەیرانی بەهار ناکرێ. لێرەدا ڕوو زەردی و پاییز و پیری بەرامبەر بەسووری

و بەهار و سەردەمی لاویەتی دادەنێ.

بەلای شاعیرەوە سروشت تەنیا بەهار و کەژەکانی دی و شاخ و گەلی و با و بەفر و باران نییە، بەڵکو گەلێ وردە شتی تریشی تێدایە، بەقەوارە لەوانەیە بچووک بن، بەڵام بەناوەرۆک لەوانەیە زۆر گەورە بن، وەکو چۆن ئەگەر بێتو بەخەیاڵ بیر لە میسک و عەنبەر بکەینەوە، ئەوپەڕی زۆری لەوانەیە بارێک بێ، بەڵام ئایا دەبێ ئەم بارە چەند بێ بەرامبەر گەورەیی زەریا یا تۆفان، بەهار یا بەهەشت.

نالی لەناو شتی گەورە شتی بچووک دەردێنێ و وێنەی هونەری لێ دروست دەکا:

گوڵ بەدەم بادی سەباوە پێکەنی بلبل فڕی
یەعنی عاشق لازمە دوور بێ لە یاری بێ وەفا

گوڵێکی خنجیلانەی جوان و بلبلێکی ژیکەڵەی ڕەنگین، لەوەتەی ئادەمزاد لەسەر ڕووی زەوی پەیدا بووە، ئەمانەی کردووە بەبەڵگەی خۆشەویستی، یەکێکیان دڵدار و ئەویتریان دلبەر. بەڵام گوڵ کە بەبای شەماڵ پێبکەنێ، واتە بپشکوێ مانا ئەوە دەگەیەنی خۆشی دەوێ، ئیتر دەبێ واز لە بلبل بهێنێ، لەبەر ئەوەیە بلبل دەتۆرێ و دوور دەفڕێ. ئەمە بێ وەفاییە لە گوڵەوە، ئەگەر هەر ڕۆژێ دڵدارییێک لەگەڵ یەکێکدا ببەستێ، ئەمە بێ وەفاییە و پیاو دەبێ لە یاری بێ وەفا دوور بکەوێتەوە. ئەوی ڕاستی بێ لێرەدا با هیچ پێوەندییێکی بەم کێشەیەوە نییە، گوڵ و بلبل ڕووداوێکی خۆڕسکن لە سروشتدا، ئەوەی پێوەندی نەبێ بایە، چونکە ئەگەر بێ و گوڵ بای خۆش بوێ، مانای ئەوەیە با بەرامبەر بلبل دەوەستێ، ئەمەش هیچ جۆرە لۆجیکێکی تێدا نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی بلبل بەڕەنگێ گوڵی خۆش دەوێ نایەوێ هەتا شنەی باش لێی نزیک بکەوێتەوە.

ئینجا شاعیر دێتە سەر شتی ورد. لە جوانی ژن و دیاردەی سروشت کۆمەڵە وێنەییێکی ڕەنگاوڕەنگ تێکەڵ بەیەکتری دەکا بەبێ ئەوەی هێندەی تاڵە دەزوویێک وێنەییێک لە وێنەییێک زیاتر بایەخی پێ بدرێ، ئەگەرچی لە ئەنجامیشدا مەبەس دەرخستنی شێوەی زولفە:

عاشقی سونعی حەقم قوربانی ڕەنگی قودرەتم
چاوی ماوی، خاڵی شین، کوڵمی سپی، زولفی سیا
سەرگرانە قافڵە سالاری ڕێی چین و خەتا
چونکە باری عەنبەر و موشکە لە زولفەینی دووتا
حەلقە حەلقە زولفی سەر قوببەی هەیاسەکەی کەوتووە
مەحرەمی سڕڕە بەڵێ گەنجووری گەنجە ئەژدەها

شاعیر بەچاوێکی بەرز تەماشای ئەو وەستایە دەکا ئەوەی ئەم پەیکەرەی دروست کردووە، ئەو وەستایە کردگارە، ئەو ڕەنگانەی بۆ دروستکردنی پەیکەرەکە بەکاری هێناون یەکجار جوان و دڵگیرن، چاوی بەشینی کاڵ و خاڵی بەشینی تۆخ و کوڵمی بەسپی و زولفی بەڕەش ڕەنگ کردووە.

دوو زولفی دلبەر بۆن خۆشن، سەردار و سەرۆکی کاروانی ڕێگەی وڵاتی چین و خەتا کە مەڵبەندی



میسک و عەنبەرە کابراییێکی لووت بەرز و مەست و تووڕەیە، چونکە هەموو تاکانی کاروان بەمیسک و عەنبەر بار کراون، ئەمە بۆنی هەردوو تای زولفی دلبەرە. ئەو دەستە زولفە میسک و عەنبەرییە بەپێچوپەنا و حەلقە حەلقە هاتۆتە خوارەوە لە دەوری قوببەی هەیاسەی ئەو پەیکەرە جوانە خۆی گرتۆتەوە. ئەو زولفانەی هاتوونەتە خوارووی ناوکەوە خەزێنەکە دەپارێزن وەکو چۆن ئەژدەها گەنجینە دەپارێزێ. خەزێنە و ئەو ئەندامە هەردووکیان نهێنی و شارراوەن.

ئەو خەزێنەیە ئەوەندە دڵگیر و جوان و ئاودارە، سۆفی لە دۆخی خۆیدا دەرهێناوە:

سۆفییی مەستووری ڕووتی موفلیسی خستە تەمەع
سەیری خاڵی بێ حیساب و ماچی لەعلی بێ بەها

سۆفی بەحسێب و لێکدانەوەییێک کابراییێکی داوێن پاک و بەنامووس و ڕووت و بێ پارەیە و نایەوێ ماڵی ببێ، بەڵام گەنجینەی ئەو دلبەرە خستییە تەماعکارییەوە. جگە لەمە خاڵێکی زۆر لە ڕوخساری دلبەردا هەیە و ماچی دەمیش نرخی تەواو نابێ، ئەمانە هەموویان نموونەن بۆ ئەو جەواهیرانەی لەناو خەزینەکەدا پارێزراون.

گەلێ جار وێنەی موجەررەدی سروشت لە شیعری نالیدا دەبینرێن، بەتایبەتی کە شتێکی سروشت سەرنجی ڕادەکێشێ و لەگەڵ شتێکی دیکەی ئەو سروشتە یا دەستکردی ئادەمزاد بەراوورد و بەرامبەری دەکا. نالی لەم مانا و وێنانەی هەیە، بۆ بەڵگە گوڵی سووری لالە دەکا بەئاگردان:

لالە کە مەجمەرێکە بەبا خۆش و گەش دەبێ
ناوی کە پڕ خەڵووزە بەشەونم کوژایەوە

گوڵی لالە بەدیمەن وەک ئاگردان وایە، چۆن ئاگری ناو ئاگردان بە با خۆش و گەش دەبێ، هەروەها گوڵی لالەش بەم بایە دەپشکوێ و دەکرێتەوە، ئەو تۆوە ڕەشەی کە لەناو گوڵی لالەدایە وەکو خەڵووز وایە، ئەمە پشکۆی ئاگر بوو و گەشابووەوە، بەڵام شەونم کوژاندییەوە و کردی بەخەڵووز.

وەکو لە هەندێ شوێنی ئەم کتێبەدا وتراوە، هەموو شیعرێکی نالی بۆ گەلێ مەبەس دەست دەدەن و بەگەلێ جۆر مانایان لێک دەدرێتەوە، لەبەر ئەوە ئێمە هەر شیعرێک وەکو بەڵگە بۆ ئەو مەبەسە دەهێنینەوە کە بەلای ئێمەوە نزیکترینە لەو مەبەسەی ئێمە باسی لێوە دەکەین.

## شانازی (فەخر)

شانازیکردن بەخۆ و خەڵکی دیکە هونەرێکە لە مەبەسە گرنگەکانی ئەدەبی کلاسیکی کوردی، شانازیکردن لای شاعیران لە خۆیانەوە دەست پێ دەکا تا دەگاتە باب و باپیر و هۆز و عەشرەت و میللەت و نەتەوەیان. ناوەرۆکی ناز و نیاز و شانازی خۆ هەڵکێشانی تێدایە، بەڵام نالی لەم مەبەسەدا لە ڕێچکەی شاعیرانی تر چۆتە دەرەوە، بەوەی تەنیا شانازی بەخۆیەوە کردووە، لە خۆشیدا شانازی بەوە کردووە شاعیرێکی چاک و مەزنە. ئەم مەبەسە وەک شێوازێکی کۆن لە ئەدەبی کوردی نوێدا لەناوچووە و باوی نەماوە، چونکە شتێکی کەسایەتییە و پێویستییەکانی کۆمەڵی تازە پەسەندی ناکا. جا ئەگەر بێتو

بەچاوی ئەمڕۆ تەماشای ئەو داهێنانە بکرێ کە لە شانازی شیعری کلاسیکی ئەدەبی کوردیدا بووە، لەوانەیە ئەو شیعرانە بخەینە ڕیزی ئەو شیعرانەی دەوریان بەسەرچووە و کۆن بوون بەوەی نرخی هونەرییان ون کردووە، بەڵام شانازیی نالی چەشنە تام و بۆیێکی تایبەتی هەیە. وەک ئاشکرایە لە بنجدا شانازی لە هونەری شیعردا ڕووداوێکی تەسکە و پێوەندییێکی ئەوتۆی بەکۆمەڵ و نیشتمانپەروەری و سروشتەوە نییە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە لای نالی مانایێکی هونەری بەرزی وەرگرتووە، خوێندەوار بەدڵ کراوەیی دەیخوێنێتەوە و هیچ جۆرە خۆپەرستی و خۆ هەڵکێشانێکی پووچ و بەتاڵ و بێ ناوکی تێدا نابینێ، نالی کە دەڵێ:

فارس و کورد و عەرەب هەرسێم بەدەفتەر گرتووە
نالی ئەمڕۆ حاکمی سێ موڵکە دیوانی هەیە

مەبەسی بنچینەیی ئەوەیە باس لە نەتەوەکەی خۆی بکا و بیهێنێتە ڕیزی فارس و عەرەب کە لەو سەردەمەدا لە ناوچەی کوردستانی باشووردا شیعرێکی وا بەزمانی کوردی لە ناوەوە نەبوو بگاتە پلەی کلاسیک و شانازی پێوە بکرێ. دیارە شاعیر لە ڕووی سیاسیشەوە کوردی هێناوەتە ڕیزی ئەو دوو نەتەوەیە بەوەی دامودەسگا و دەسەڵات و دیوانی هەیە وەکو ئەوان، جگە لە دیوانی شیعر کە ڕەمزی ڕۆشنبیرییە.

لە پێشانا نالی کوردی کردووە بەخاوەن دەفتەر، واتە خاوەنی سامانی نەتەوایەتی لە شیعر و ئەدەبدا، ئینجا کردوویەتی بەخاوەن موڵک و دامودەسگای سەربەخۆیی لە سلێمانیدا. بەمە ئەوپەڕی سۆزی نیشتمانپەروەری دەردەخا، جا با خۆی لە هەموو خوێندەوارێکی تری کورد بەخوێندەوارتر دانابێ و خۆشی هەڵبژاردبێ بۆ سەرۆکایەتی ئەم موڵکە.

نالی غەزەلێکی تایبەتی نووسیوەتەوە بۆ پێداهەڵدان بەسەر خۆی وەکو شاعیرێک. لەو شیعرەدا بۆنی هیچ جۆرە خۆ هەڵکێشانێک ناکرێ، چونکە ئەگەر نالی بەم ڕەنگە باسی لە شاعیرییەتی خۆی نەکردایە و هەر شارەزایێکی تر لە شیعری نالی ئەگەر توانای ئەوەی ببوایە لەباتی نالی ئەم وشانەی بەشیعر یا بەپەخشان لە مەدحیدا بۆ ڕیز دەکرد، لەبەر ئەوەیە خوێنەری شیعری لەوە بێزی نابێتەوە کە شاعیر مەدحی خۆی کردووە، چونکە نالی باسی ڕاستییێکی کردووە و ئەو تێبینییەی بەرامبەر بەخۆی دەربڕیوە بێ گومان ڕا و تێبینیی هەموو کەسێکە.

هەروەها نالی لەم شیعرەیدا لە چوارچێوەی گشتی شانازی شاعیرە کلاسیکەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چۆتە دەرەوە، بەوەی بەشێوەیێکی تەجریدی شانازی بەبەرهەمێک دەکا بەڕاستی بۆتە گەوهەرێکی هەرە جوان و بەنرخ لە گەنجینەی ئەدەبی کوردیدا:

بلبلی تەبعم ئەوا دیسان سەناخوانی دەکا
نوکتە سەنجی و بەزگە کۆیی و گەوهەر ئەفشانی دەکا

گیانی شاعیری بەرز کە دەکەوێتە پێدا هەڵدان و شانازیکردن بەخۆ، قسەی ناسک و بینینی جوان و



بیری تیژ وەک دانەی گەوهەر دەپرژێنێ. نالی شانازی بەخۆیەوە ناکا وەک مرۆڤ، شانازی بەبەرهەمە بەرزەکەی خۆیەوە دەکا، لەبەر ئەوە ئەگەر خۆی بەدانا و زانا دابنێ لە ڕاستی دوور نەکەوتۆتەوە، لەم لایەنەوە دەڵێ:

هەر کەسێ ئیزهاری دانایی بکات و مەقسەدی
خود پەسندی بێ یەقین ئیزهاری نادانی دەکا

ڕاستە هەر کەسێک ئەگەر داوای زانایی بکا و مەبەسی خۆ هەڵکێشان بێ، بێ گومان کەس باوەڕی پێ ناکا، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی وەکو نادان و بێ هۆش و کەم بیر لە قەڵەم بدرێ.

لە پاشانا نالی دێتە سەر (تەبع) و (فیکر) و (خامە):

زابیتەی تەبعم سوارە ئیددیعای شاهی هەیە
موحتەشەم دیوانە داوای تەختی خاقانی دەکا
شاهیدی فیکرم کە بێتە جیلوەگاهی دلبەری
شاهی خوسرەو ڕووحی شیرینی بەقوربانی دەکا
نووکی خامەی من کە بێتە مەعنی ئارایی کەمال
خەت بەخەت ئیزهاری نەقشی سوورەتی مانی دەکا

نالی کەسێکی لووت بەرز و لەخۆباییە، داوای شایەتی دەکا، بەڵام نەوەکو شایێکی بێ فەڕ وەک بت باوکی مرد بێ و بەمیرات تەختی بۆ مابێتەوە، بەڵکو ئادەمزادێکی بەتوانایە، دەکارێ خۆی بگەیەنەتە ئەوپەڕی بەرزی، دیوانی لە هەردوو باردا موحتەشەمە، دیوانی شایەتی و دیوانی شیعری، داوا دەکا ببێ بەخاقانی کۆمەڵ و دەوڵەت، هەروەها خۆی لەگەڵ شاعیری ئێرانی خاقانی شێروانی (١١٠٦م-١١٩٨م) بەراوورد دەکا.

لە ڕووی هۆش و بیرەوە شاعیر ئەوە دەردەخا ئەگەر ئەو هۆشە بێتە ناو بارەگا و جیلوەگای جوانی دلبەر وەسفێکی وای دەکا خوسرەوی پەروێز بەجۆرێک گیرۆدە و دلبەندی دەبێ گیانی شیرینی خۆی بەقوربانی ئەو وەسفەی نالی دەکا. جگە لەوە (شیرین) مانایێکی دیکەش هەڵدەگرێ واتە خوسرەو خۆشەویستترین کەس کە (شیرین)ی دلبەریەتی، ئەویش بەقوربانی ئەو مانا بەرزانەی شیعری نالی دەکا.

لە بابەت وێنەوە لەم شیعرەدا شاعیر باس لە نووکی قەڵەمی یا (ناله)ی دەکا، مەبەس لێرەدا وەسفی هەستی و موجەڕڕەدە، کە نەخشی وێنەی دلبەری کێشاوە گەیاندوویەتییە (کەمال) و لەدوای ئەو وێنەیە هیچی دیکە نییە. هەموو ئەو خەتانە، یا نووسینانە، یا دێڕەشیعرانە بەرهەمێکی هونەری بەرزن دەست و قەڵەمی مانی هونەروەری گەورە کێشاونەتی.

نالی لە شیعرێکیدا بایەخێکی ئەوتۆ بەزمان نادا، شیعر بەهەست تێدەگا و ئەمە جەوهەرە، هەرچی زمانە قاپە یا قاوغە دەیپارێزێ، بۆیە بەلای ئەوەوە گرنگ نییە شیعر بەچی زمانێک دەنووسرێ، بەڵکو بایەخ بەناوەرۆک و مانا دەدا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر زمان پێویست بێ بۆ دەربڕینی شیعر، ئەو کاتە خۆی

چەند زمانێک دەزانێ.

ئیستیتاعە و قووەتی تەبعم بەکوردی و فارسی

عارەبی، ئیزهاری چالاکیی و چەسپانی دەکا

بەلام لە لایەن خەیالّ و هەستی ناو دلّ و دەروونییەوە، ئەوە دەردەخا کە ئەو خەیالّە ناسک و ساف و بێ غەمە، خەریکی مەشقە، واتە شیعر تۆمار دەکا لەسەر جوانی زولفە پەرێشانەکەی دلبەر:

خاترێکی شۆخ و خۆش و بێ غەم و جەمعم هەبوو

ئێستە بۆ زولفی کەسێ مەشقی پەرێشانی دەکا

هود هودی دلّ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین

خۆی کە دامێنگیری شاهی ئاسەفی سانی دەکا

ئەو کەسە تەحدیسی نیعمەت بێ مراد و مەتلەبی

میسلی (نالی) ئیمتیسالی ئەمری یەزدانی دەکا

ئەو برە شیعرەی لە سەرەوە پیشان درا شاعیر هەمووی تەرخان کردووە بۆ وەسفی بەرهەمی شیعری خۆی، دەشێ بکرێتە (تەعریفێکی) دیکەی شیعر و بخرێتە سەر هەموو ئەو تەعریفە زۆرانەی بۆ شیعر کەوتوونەتە ناوەوە.

نالی لە شانازیکردنی بەخۆ دەگاتە ئەوپەڕی کە کەس بەشاعیر نازانێ خۆی نەبێ:

خەلّقی کە هەموو کوودەکن و بەستەزمانن

با بێن و لە (نالی) ببیەن شیعری سەلیقی

ئینجا نەوەکو تەنیا خۆی بەمامۆستاییێکی گەورەی شیعر لە قەلّەم دەدا، بەلّکو ئەوە دەردەخا هەرچی قسەی جوان هەیە لە لایەن ئەوەوە نووسراوەتەوە، یا کە قەلّەم دەکەوێتە قسە و شیعری جوان دەنووسێ؛ بێجگە لە نالی کەس توانای ئەوەی نییە قەلّەم بەکار بێنێ:

زاهیر و باتین لەسەر لەوحی حەقیقەت یا مەجاز

ئاشنای سرری قەلّەم بێ غەیری (نالی) کەس نەما

ئیتر نالی دەکەوێتە سەر ئەوەی شیعری ئەو وێنەیان نییە، واتە تایبەتین بەخۆی، لێرەدا لەوانەیە پیاو وا زان بکا نالی دان بەشاعیرانی دیکەدا نانێ، بەلام شیعری ئەو داهێنانێکی وای تێدایە هەر خۆی دەتوانێ کارێکی وا بهێنێتە ناوەوە:

(نالی) حەریفی کەس نییە ئولف و ئەلیفی کەس نییە

بەیتی رەدیفی کەس نییە تەفریقەنووسە گەپ دەکا

ئەگەر کەسی وا هەبووبێ شیعری نالی پەسەند نەکردبێ، یا لە شیعری نەگەیشتبێ، دیارە لەبەر نەفامی و نەزانی بووە، چونکە زێڕنگەر نرخی زێڕ دەزانێ و، مەلەوانی وەستا دەتوانێ لە زەریای قوولّی



غەزەلیدا دوڕ و گەوهەری بەنرخ دەربێنێ.

بەحری غەزەلم پڕ لە دوڕ و گەوهەرە ئەمما

غەوواسی دەوێ یەعنی بەتەعمیقی بزانە

پڕ دانەیە ئەمما نەوەکو دانەیی چەلّتووک

بەحرم وتووە نەک وەکو گۆلی مەرەزانە

حوسنی نەزەرە ئەسلی نەزەر حوسنە بەعیسمەت

سۆفی کە دەکا تەرکی بەئینسانی مەزانە

ئەو گەوهەری نوکتە کە لە (نالی) دەدزن خەلّق

ئاوی نییە وەک ئاگری بێ شەوقی دزانە

واتە ئەو کێشەی (وەزنەی) کە من شیعرم پێ وتووە و بەحریشی پێ دەلّێن پڕە لە بەردی بەنرخی هەمەڕەنگ، ئەمانە وێنەی مانا و هونەری بەرزن، جوانن وەکو جەواهیر، جگە لەوە ئەو بەحرەی من قوولّە، مانای شیعرەکانم ئەوەندە بەرزن وەکو چۆن بەحر غەوواسی دەوێ تا بتوانێ سەدەف و مەرجانی بێنێتە دەر، شیعری منیش هونەروەر و زانا و شارەزای گەلێ بەرزی گەرەکە تا لە مانا و وێنەکانی بگا.

بەحر بەدوو ماناوە هاتووە، زەریا و کێشی غەزەل (عەرووز)، هەردووکیان قوولّن، دوڕ و گەوهەر بۆ بەحر، مانای بەرز بۆ شیعر؛ غەوواس بۆ بەحر تا سەدەف و مەرجان دەربێنێ، کەسی شارەزا بۆ دەرهێنان و دۆزینەوەی مانای شیعری نالی.

ئەو مانایەی لە شیعری نالیدا دەدۆزرێتەوە بەنرخە وەکو دانەی جەواهیرە نەوەکو وەک دانەی چەلّتووک لە پاش پەلکۆکردن دەبێ بەبرنج و دەخورێ، بەم جۆرە نرخی نامێنێ و دەبڕێتەوە. بەلام بەحری من، واتە کێش و مانای شیعرم زۆر قوولّە وەکو گۆلی مەرەزە تەنک نییە، چونکە ئاوی تەنک بەرهەمی چەلّتووک دەبێ، کەچی زەریاییێکی قوولّ بەرهەمی سەدەف و مەرجان دەبێ، دیارە بەحرەکانی شاعیریش واتە شیعرەکانی قوولّن، لەبەر ئەوە مانا و وێنەی بەرزیان تێدایە.

بەلای نالییەوە خەلّکی شاعیر نین، کە شیعر دەنووسنەوە قسەی جوانی ئەو دەدزن، قسەی جوانیش ئەگەر بدزرێ دەگۆڕێ، بۆ ئەگەر قسەی دزراو لەگەلّ ئەسلەکەدا بەراوورد بکرێن، ئەوە ئاشکرا دەبێ ئەمەیان چەند ئاودار و بەتام و بۆیە، ئەویان ئەوەندە بێ ئاو و وشک و بێ تام و بۆیە. هەروەها مانای شیعری نالی ڕووناکە بەشەوقە، بەلام شیعری خەلّکی وەکو چرای بێ شەوقی دز وایە. لە کوردیدا تەعبیری (چرای دزان) کینایەتە بۆ چراییێکی کز و یەکجار کەم ڕووناکی، ئەمەش ئەگەر ئاگربێ یا چرابێ لەبەر ئەوەیە دز هەمیشە هەولّی ئەوە دەدا بەرچاو نەبێ، جا لە شەودا ئەگەر ئاگر بکاتەوە یا چرا هەلّگیرسێنێ دەبێ ڕووناکییان کەم بێ بۆ ئەوەی کەس چاوی لێیان نەبێ.

لە شیعرێکی دیکەیدا بۆچوونی نالی دیسانەوە وەکو تەعریف یا وەسفێک بۆ شیعر دەکەوێتە ڕوو، بینینێک لە ئەنجامی وردبوونەوەییێکی ئیستێتیکی لە خەیالّی شاعیردا دروست دەبێ و دەڕژێتە سەر کاغەز.

نالی دەڵێ:

یا لە مەیدانی فەساحەتدا بەمیسلی شاهسوار

بێ تەئەممول بم هەمموو نەوعە زمانێ ڕا دەکا

نالی وا دەزانێ بەسەر هەموو زمانێکدا زاڵە، دەیەوێ بڵێ شاعیرە و شاعیرێکی گەورەشە، ئەو قسە جوانانەی بەکوردی دەیاننووسێتەوە تاقیکردنەوەیە و شاعیر تێیدا سەرکەوتووە.

ئینجا دەڵێ:

بێتە حوجرە پارچە پارچەی موسوەددەم بکرێ بەڕووح

هەر کەسێ کووتاڵ و پارچەی بێ بەدەل سەودا دەکا

شیعری خەڵقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ ناسکی

کەی لە دیققەتدا پەتک دەعوا لەگەڵ هەوردادەکا

نالی لە حوجرەی تایبەتیی خۆی لە مزگەوت شیعر دەنووسێتەوە، لەوێ پارچە کاغەزی ڕەشنووسی شیعری ئەو دەست دەکەون، ئەمانە لەگەڵ پارچە قوماشی بەنرخ بەراوورد دەکا، واتە شیعری وەکو ئەو پارچە قوماشانەیە، بەڵام شیعری خەڵکی وا نییە، ئەگەر ئەمانە لەگەڵ قوماشێک بەراوورد بکەین دەبێ ئەو قوماشە لە پەتک دروست کرابێ نەک لە تاڵە دەزووی ئاوریشم.

نالی لە هەڵوێستیدا بەرامبەر بەشیعر، دوو شت لە یەکتری جیا دەکاتەوە، یەکەمیان خوێنەری شیعر وەکو کابرایێکی خوێندەوار و ڕۆشنبیری دوور لە چێژی ئەدەبی و هونەری، ئەوەی شاعیر نییە و هەستی شاعیریشی نییە، دووەمیان خوێنەری شیعر، وەک شاعیرێک یا خاوەن هەستێکی شاعیری:

نوسحی (نالی) ڕەنگە هەر کەس بیبیێ بیکاتە گوێ

چونکە نەزمی ساف و وردە هەر وەکو مرواریییە

لێرەدا نالی مەبەسی ئەوە نییە بڵێ شیعرەکانی لە ڕووی ماناوە ئاسانن، ئەگەرچی بۆنی ئەوەشی لێ دێ، بەڵکو مەبەسی ئەوەیە بڵێ شیعری ساف و ورد و جوانن وەکو مرواری. سووکن لەسەر گوێ، لەبەر ئەوەیە گوێ وەریان دەگرێ و دەبن بەمایەی زاخاوی مێشک وەک چۆن مرواری دەبنە هۆی جوانی گوێ کە دەکرێن بەگوارە و گوێی خۆشەویستی پێ دەڕازێنرێنەوە.

یا لە شیعرێکی دیکەیدا نالی بەرهەمی خۆی دەداتە پاڵ شێوازی ئیجاز کە لە زانستیی ڕەوانبێژیدا (مانای زۆر لە قاڵبی بچووک) دەگەیەنێ. لەم لایەنەوە دەڵێ:

(نالی) عەجەب بەقووەتی حیکمەت ئەدا دەکا

مەعنایی زۆر و گەورە بەلەفزی کەم و بچووک

لە شیعرێکی تریدا نالی ڕوو دەکاتە تاقمی دووەم کە شاعیرن یا خاوەن هەستی شاعیرین، پێیان دەڵێ:



(نالی) بەداوە شەعری دەقیقی خەیاڵی شیعر

بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە سەد داوی نایەوە

مەبەسی نالی لەو شیعرەدا ئەوە نییە بڵێ شیعری ئەو لە ڕووی ماناوە قورسن و شاعیر و ناشاعیر تێی ناگەن، بەڵکو مەبەسی ئەوەیە بڵێ شیعری ئەوەندە بەرزە لە ڕووی هونەرییەوە هەزار داو بۆ شاعیران دەنێتەوە، چونکە هەر تەعبیرێکی لە مانایێک زیاتر هەڵدەگرێ، لەبەر ئەوە ئەو شاعیرانە ناتوانن شیعرێک دابنێن بگاتە پلەی شیعری نالی.

نالی لە شیعرێکی دیکەیدا بەرهەمی ئەدەبی خۆی بە(جیگەرگۆشە) حسێب دەکا و دەڵێ:

شیعرەکانم کە جیگەرگۆشی منن دەربەدەرن

دڵی (نالی) چ ڕەقە قەت غەمی فرزەندی نییە

لەم شیعرەیدا شاعیر گلەیی لە خۆی دەکا بەوەی بەتەنگ شیعرەکانیەوە نییە، بەڵام لە شیعرێکی دیکەیدا ڕازی نییە شیعر وەک منداڵ (جیگەرگۆشە)ی دەروونی ئازار بدرێ، واتە مانای شیعرەکان بەڕاستی لێک نەدرێنەوە:

لە جیگەرگۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خراپ

بێ خەتا کەس نییە ڕازی کە لە ئەولادی درێ

خۆشەویستترین شتێک لای شاعیر شیعرەکانیەتی، پلەی ئەو سۆزە دەگەیەنێتە پایەی پێوەندی بەمنداڵی خۆیەوە، کە منداڵیشی نەبووە، ئینجا خۆی بەدڵڕەق پیشان دەدا بەرامبەر ئەو جیگەرگۆشانە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەوە ڕازی نییە هەر کەس بەئارەزووی خۆی مانای شیعرەکان لێک بداتەوە. شاعیر ئاگاداری ئەوەیە کەم کەس لە شیعری دەگەن.

### شیعری کراوە (مەکشووف، ئێرۆتیک، erotikos)

ئەم جۆرە شیعرە خەریکی دڵداریییە بەشێوازێکی کراوە لە ماچوموچ و دەسبازی و پێوەندی ژن و پیاو دەدوێ لە ڕووی سێکسەوە.

لە دیوانی نالیدا وردە ئاوڕدانەوەییێکی زۆر بۆ ئەندامی ژن هەیە ئەوەی خۆشی دەگەیەنێتە ژن و پیاو. ئەم بۆچوونانە وەکو لە سەرانسەری شیعری نالیدا دیارە گەلێ لێکدانەوە و مانا هەڵدەگرن. لەبەر ئەوەیە هەر بەڵگەیێک کە بۆ باسێکی دیاریکراو دەهێنینەوە بێ گومان هەر ئەو بەڵگەیە بۆ باسێکی دیکە یا چەند باسێک دەست دەدەن. بۆ بەڵگە ئێمە ئەم دێڕە شیعرەی نالی بۆ مەبەسی شیعری کراوە دێنینەوە لەوانەیە بەوردبوونەوەییێکی قووڵ ئەم مەبەسە بکەوێتە بەرچاو، یاخود ئەم لێکدانەوەی ئێمە دوا مەبەس بێ لەو مەبەسانەی شاعیر ویستوویەتی دەریان ببڕێ:

جەنانی وەک جینان کردم بەمەئوا

حەبیبەی ماڵیاوا ماڵی ئاوا

دلبەر دڵی شاعیری کرد بەماڵ و هێلانەی خۆی، بەڵام نەوەکو ماڵێکی ئاسایی، بەڵکو کە خۆشەویست لێی نیشتەجێ بوو بەبەهەشت وەرگەڕا. لە نیوەدێڕی دووەمدا نالی یارییێکی ڕەوانبێژی بەوشەکانی (ماڵیاوا) و (ماڵی ئاوا) دەکا. جارێکیان وشەکە مەڵبەند و جێی ژیانی حەبیبەیە، ناوی ئەو گوندەیە کە حەبیبەی لێ لەدایک بووە، جارێکی دیکەیان حەبیبە (ماڵی ئاوا) بێ چونکە کە هاتە ناو دڵمەوە کردی بەبەهەشت، هەروەها (ماڵی ئاوا) ئەوەش دەگەیەنێ، حەبیبە با ئەندامی مێیینەی ئاوا بی، واتە پشکوتوو و کراوە بێ بۆ بەزمی مێبازی.

جگە لەمە نالی پارچە شیعرێکی پێنج دێڕی هەیە (ئیلتیقای پۆڵا و ئاسن)، لەو شیعرەدا کۆمەڵێک مانا و وێنەی داهێنانی شیعری کۆکردۆتەوە، یەکێ لەو مانایانە باس لە ئەندامی مێیینەی ژن و نێرینەی پیاو دەکا. کۆکردنەوەی سارد و گەرم، بزوێن و وەستاو، ئاو و ئاگر لە پۆڵا و ئاسندا کە بەحسێبی لۆجیک دژی یەکترین، بەڵام کە بڕیاری بزووتنەوە دەدەن لەگەڵ یەک و پێکەوە، هەریەکەیان ئەوی دیکە تەواو دەکا. ئەم شیعرە یەکێکە لە شیعرە بەرزەکانی نالی لە ڕووی داهێنانەوە.

لوتکەی ئەم بابەتە شیعرەی نالی ئەو بەرهەمەیەتی لە قاڵبی قەسیدەدا کە خەون بینینێکە لەگەڵ مەستوورەی جوانە ژن و شاعیری ناودار پێکەوە کۆبوونەتەوە. لە بەشی داهاتووی ئەم کتێبە باس لەو قەسیدەیە دەکرێ.



# بەشی هەشتەم

## گەشتی بەهەشتی شیعرایەتی نالی

### نەعتی پێغەمبەر

ئەو بیروڕایە ڕاست نییە کە دەڵێ نالی شیعری (نەعت)ی لەبەر ئەوە وتووە بۆ ئەوەی پێی نەڵێن بۆچ لەم بابەتە کلاسیکییە شیعری نییە. ئەگەر بێتو حسێبی ئەوە لەگەڵیدا بکرێ بەو مانایەی لە هەموو بابەتەکان و مەبەسەکانی شیعری کلاسیکی وتووە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە، ئەو کاتە بەپێی ئەو شیعرانەی ئێستا لە ناوەوەن لە هەموو بابەتەکانی نەوتووە. ئەگەر وتبێتیشی نەماون و بێ ئاگاین لێیان. ئەوی ڕاستی بێ نالی لە بنجدا شیعری بۆ خۆی وتووە، گوێی نەداوەتە ئەوەی دەبێ لە هەموو هونەرەکانی شیعری هەبێ، یا قافیە و ڕەویەی هەموو دەنگەکانی تیپی ئەلف و بێی کوردی و عەرەبی لە دیوانیدا دەور کردبێتەوە.

ئەم قسەیە لەبەر ئەوە دێتە گۆڕێ بۆ ئەوەی بووترێ نەعتی نالی بەڵگەی ئەوە نییە کابرایێکی موسوڵمانی ئەوتۆ بووە تا گوێچکەی لەناو ئاییندا تواوەتەوە و لە ژیاندا بیری لە هیچ شتێک نەکردۆتەوە و تەنیا پێڕەوی ئەو ڕەوشتە میتافیزیکییانەی کردووە کە لە ئایین بوونەتەوە. ئەگەر مەسەلەکە بەم جۆرە بووایە دەبوو نالی زیاتر خۆی خەریکی بابەتی خوداناسی (ئیلاهییات و موناجات) بکردایە، چونکە وەکو دەڵێن خودا لە پێغەمبەریش گەورەترە، کەچی خۆی خەریکی بابەتی نەعت کردووە. ئەمە لەبەر ئەوەی لە ئاییندا پێغەمبەر زۆرکاری لێ کردووە و بزواندوویەتی. دوور نییە چوونی بۆ حەج، یا بیرکردنەوە لە چوون بۆ حەج ئەویش هۆیێک بوو بێ بۆ ئەو قەسیدانەی کە لە نەعتی پێغەمبەر نووسیونەتییەوە. یا دەبێ هەستی کوردایەتی دەوری لەم کارەدا نەبێ بۆ ئەوەی بیەوێ (بەچەند بەیتێکی کوردانە) نەعت و وەسفی پێغەمبەر بکا وەکو خۆی دەیلێ.

پێغەمبەر بەلای نالییەوە شتێکی یەکجار گەورە بوو، بەهەموو زمانێک ستایشی کراوە، بۆچ بەکوردیش ئەم کارە نەکرێ! وە بۆچ شاعیر خۆی گوناهبار نەکا بۆ ئەوەی بەزمانی کوردی لە پێغەمبەر بپارێتەوە!

لە دیوانی نالیدا دوو قەسیدە و غەزەلێک بەرچاو دەکەون لە مەدح و ستایشی پێغەمبەر و پێداهەڵدان بەگەورەیی و خۆشەویستی لە لایەن خوداوە.

یەکەمیان بەم دێڕەشیعرە دەست پێ دەکا:

ئەی ساکینی ڕیازی مەدینەی مونەووەرە
لوتفێ بکە بفەرموو: مەدینەی منە و وەرە

لەم قەسیدەیەدا وەسفی شاری مەدینە دەکا، وەک شاری پێغەمبەر و شوێنی ئارامگای، ئەم شارە

پیرۆزە بەناوەندی گێتی و چەرخ و فەلەک و عەرشوقورش دادەنێ، ئینجا باس لە نزمی و پەژمردەیی و گوناهکاری خۆی دەکا بەرامبەر ئەو پێغەمبەرە گەورەیەی نەوەکو تەنیا شاعیر لە ڕاستیا هیچە، بەڵکو (بوون، گەردوون) لەبەر ئەو پەیدا بووە. شاعیر ئەو سیفەت و بەڵگە و ڕەوشتانەی بۆ پێغەمبەر دانراوە هەموویان دەخاتە ڕوو. لە پاشانا باس لە ڕۆژی قیامەت دەکا. پێغەمبەر سەروەری ئەو ڕۆژە دەبێ دادپەروەری ئەزەلی کە خودایە هەموو تکاییێکی جێبەجێ دەکا.

شاعیر بەم دێڕەشیعرە دوایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

ڕۆژی جـــەزا رجـــا بکە بۆ (نالی)ی دەربەدەر
چونکە لە ڕووی جیهـان گوناهی گەلێ زۆر و ئەکسەرە

قەسیدەی دووەمی نالی لەم بابەتەوە بەم دێڕە شیعرانە دەست پێ دەکا:

ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا هەتا کەی حیرسی وێرانە
لەگـەڵ ئەم عـەشـقـبـازانە برۆ ئازانە بازانە

لێرەدا شاعیر خەڵکی هان دەدا بۆ حەجکردن، نەوەکو تەنیا بۆ مەککە و کابەکەی، بەڵکو بۆ مەدینە و زیارەتی ئارامگای پێغەمبەریش. ئەم قەسیدەیە وا دەکەوێتە بەرچاو لە ڕێگەی حەج وتبێتی یا پاش بینینی ئەو ڕێگەوبانە نووسیبێتییەوە، خۆ شاعیرێکی وەکو نالی دەتوانێ ئەو ڕێگەوبانەشی نەدیبێ و بەخەیاڵ دروستی بکا، خەیاڵێک لە ڕووداو نزیک دەبێتەوە.

لەم قەسیدەیەدا شاعیر وەسفی کاروان و دەشت و سارا و بیابان و وشتر دەکا، وەکو چۆن ئەم بیابانە زەردە کاکی بەکاکییە وێنەی بەهەشتی بەرینی هێناوەتە ناوەوە، نالی دەیەوێ ئەو بیابانە بکا بەبەهەشت و ئەو کاتە پێویستی بەبەهەشتی ڕاستەقینە نابێ. لەدوای وەسفی مەککە و کابە؛ ئینجا دێتە سەر ئارامگای پێغەمبەر لە مەدینە، لە پاش ئەمە باس لە میعراج دەکا، چوونی پێغەمبەر بۆ بارەگای خودا و بینین و قسەکردن لەگەڵیدا.

لەدوایی قەسیدەکەدا دەکەوێتە پاڕانەوە لە پێغەمبەر بۆ ئەوەی بەزەیی پێدا بێتەوە و لە گوناهی خۆش بێ. لە پاڕانەوەکەیدا نالی دەماری کوردایەتی دەجووڵێ، بۆیە بەکوردی ستایشی پێغەمبەر دەکا، ئەگەر مەبەسی زمانی کوردی نەبووایە دەیتوانی بەزمانێکی دیکە مەدح و ستایشی پێغەمبەر بکا. لە لاییێکی تریشەوە نالی ئەوەندە خۆی نزم کردووە لە ڕاست پێغەمبەر تا پلەییێک ڕێگە بەخۆی نادا بڵێ من نەعتی پێغەمبەر دەنووسم واتە مەدحی دەکەم، بەڵکو دەڵێ دەپاڕێمەوە، ئەوەندە بەچاوێکی بەرز تەماشای زمانی کوردی و بەیتی کوردی، یا شیعری کوردی کردووە و ئەو شیعرە کوردییەی هێناوەتە ئەو پلەیە کە بتوانێ لە کەسێکی گەورەی وەکو پێغەمبەر بدوێ.

لەو دێڕەشیعرانەدا دەڵێ:

بەقوربانی عـولوومی ئەووەلین و ئاخیـرینت بم
لەگەڵ ئەسراری قورئانت کەوا ئیلتافی ڕەحمانە



مـورادم زیللەت و پاڕانەوەی خۆمـە نەوەک نەعـتـە
بەچەند بەیتێکی کوردانە کە قـورئانت سەناخوانە
ئەگەرچی کوردی دەوری شـارەزووری قـەسوەتم ئەمما
وەسیلەم تیبەیی حیلمی شەفیع و فەزلی مەننانە

لە کۆتاییدا نالی وەکو هەموو شیعرێکی نەعت پێغەمبەر وا پیشان دەدا کە هێندەی گەورەیی خۆی سۆز و خۆشەویستی هەیە، بۆیە دەتوانی لە گوناهی زۆر و خەتای بێ پایانیش خۆش ببێ:

دەری ڕەحمەت کەوا بەحری موحیتی عاسییە (نالی)
تێدا جان و تەن ئوفتادەی شەپۆلی سەیلی عیسیانە

پارچەکەی دیکەی شیعری نالی لە بابەت ستایشی پێغەمبەرەوە بەم دێڕە دەست پێ دەکا:

وەی کە ڕوو زەردی مەدینە و ڕوو سیاهی مەککە خۆم
دەرکـراو و دەربەدەر یا ڕەب دەخـیلی عـەفـوی تۆم

لەم شیعرەدا نالی بایەخێکی زۆر بەو کردارانە دەدا کە حاجییان لە کابەی مەککە و دەوروبەری شار دەیگەیەننە ئەنجام. جگە لەمە شاعیر ئامۆژگاری ئادەمزاد دەکا ژیانی بەجۆرێک ڕێک بخا عیبادەت نەخاتە پشتگوێ و ڕەنجیش بدا لە پێناوی ژیاندا. بەم دێڕەشیعرە کۆتایی بەپارچە شیعرەکەی دێنێ:

لامـەدە (نالی) لە ئەنبـاری خـەزینەی سـاڵحـان
گـەرچی ببـیـە خـۆشـەچینی دانەیی خـەرمـانی ڕۆم

نەعتی نالی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە پێوەندی بەئایینی ئیسلامەوە هەیە، بۆ ئەو مانایانە چووە کە لە سەرانسەری نەعتی ئەدەبی نەتەوەکانی موسوڵمان دەبینرێن. بەم ڕەنگە ئەگەر بێتو نەعتەکانی نالی لە شیعرەوە بیکەین بەپەخشان، یاخود مانایان لێک بدەینەوە بەرامبەر ئەو مانایانە دەوەستین کە باسمان لێیانەوە کرد.

ئەوەی نالی لە گەلێ شاعیری دیکە جیای دەکاتەوە ئەوەیە لە نەعتەکانیدا جۆرە داهێنانێک دەبینرێ لە ڕووی وێنەوە، ئەو وردەکارییەی نالی لەم شیعرانەدا بەکاری هێناون کارێکی وا ناکەنە سەر ئەو کەسەی بەتەنگ ئایینەوە نەبێ لێی دوور بکەوێتەوە، یا بەکارێکی هونەری بەرز نەکەوێتە بەرچاوی. بەم پێیە وردەکاری نالی لەم نەعتانە و سەرانسەری دیوانیدا لە چوارچێوەی ئیدیۆلۆجییەتێکی دیاریکراو دەچێتە دەرەوە، پێوەندی بەئیستێتیکای گشتییەوە هەیە، واتە ئەو وێنە جوان و بەرزانە لوتکەی داهێنانن بۆ هەموو ئادەمزادێکی کە هەستی هەبێ، بۆیە پیاو دەهری بێ یا باوەڕی بەکردگار بێ، مەلیکی بیری نەوت بێ یا کرێکاری کۆمپانیای ئۆتۆمۆبیل دروستکردن بێ، ئەو داهێنانە هونەرییانەی نالی بۆ پێغەمبەر دەربیریوون دەبنە هۆی ئەوەی هەستی ببزوێنن و کاری لێ بکەن و چاوی ڕوون بکەنەوە.

## قوربانی تۆزی ڕێگەتم

لوتکەی بیر و هەستی نیشتمانپەروەری لە لای نالی لە شیعرە بەناوبانگەکەی ڕەنگی داوەتەوە کە لە شامەوە بۆ سلێمانی ناردووە، بەچاوی پڕ لە فرمێسک و دڵی زامدارەوە داوای ئەوە دەکا هەواڵی شار بزانێ، ئایا بگەڕێتەوە یا نا؟ نامە شیعرییەکەی نالی دەکەوێتە بەر دەستی سالم، سۆزی نالی دەبێتە سەرچاوە و، سالم بەشیعر وەرامی دەداتەوە و تێی دەگەیەنێ کە نەگەڕێتەوە.

نالی لەم شیعرە پڕ لە سۆزەدا بیرەوەری کۆن لە سروشتی خاکی نیشتمان دەتوێنێتەوە، هەموو سووچ و قوژبنێکی ئەم بیرەوەرییانە وێنەیان لە شاخوداخ، گوند و شار، ڕووبار و شیوی وڵاتەکە کێشراوە. شاعیر بەشێوەیێکی جوان سەرەتای نامەکەی بەم دێڕەشیعرانە دەست پێ دەکا:

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور
وەی پەیکی شارەزا بەهەموو شاری (شارەزوور)
ئەی لوتفەکەت خەفی و هەوا خواه و هەمدەمە
وەی سروەکەت بەشارەتی سەرگۆشەیی حوزوور
ئەی هەم میزاجی ئەشکی تەڕ و گەرمی عاشقان
تۆفانی دیدە و شەرەری قەلبی وەک تەنوور
گاهێ دەبی بەڕەوح و دەکەی باوەشێنی ڕووح
گاهێ دەبی بەدەم، دەدەمێنی دەمی غروور
مەحوی قەبوولی خاتیری عاتیر شەمیمتە
گەردی شەماڵ و گێژی جەنووب و کزەی دەبوور
سوتا ڕەواقی خانەیی سەبرم دڵ و دەروون
نەی ماوە غەیری گۆشەیی زیکرێکی یا سەبوور
هەم هەمعەنانی ئاهم و هەم هەمریکابی ئەشک
ڕەحمێ بەم ئاهـ و ئەشکە بکە هەستە بێ قوسوور

ئینجا شاعیر پەیامنێرەکەی تێ دەگەیەنێ کە بایە، پێویستە بەوردی سەرنج بداتە دیمەنە گەورە و بچووکەکانی سروشتی خۆشەویست و ئەو شوێنانە بەسەر بکاتەوە لەو کاتە کە دەچێتە ناو خاکی کوردستانەوە، چونکە نالی بیرەوەرییێکی زۆری تیایاندا بەجێ هێشتووە تا دەگاتە خاک و خۆڵی مەڵبەندی لە دایکبوونی و سلێمانی پایتەختی وڵاتە ڕووخاوەکەی:

وەک ئاهەکەم دەوان بە هەتا خاکی کۆیی یار
وەک ئەشکەکەم ڕەوان بە هەتا ئاوی (پردە سوور)
بەو ئاوە خۆت بشۆ لە کەدووراتی سەر زەمین
شاد بن بە وەسڵی یەکدی کە تۆی تاهیر، ئەوتەهوور



پێش ئەوەی پەیامنێری نالی بگاتە شاری سلێمانی، بێ گومان وەستانێکی پێ دەکا لە سەرچنار، ئەو جێگەیەی هەرگیز سروشت هەموو وەستایەتییێکی خۆی نواندووە بۆ نەخشکێشانی ئەم نیگارە، نالیش وەنەبێ وەستایەتییەکەی لەوەی سروشت کەمتر بێ کە دەڵێ:

ئەمجا مەوەستە تا دەگەیە عەینی (سەرچنار)
ئاوێکە پڕ لە نار و چنار و گوڵ و چنوور
چەشمەیکە میسلی خۆر کە لە سەد جێ بەڕەوشەنی
فەورانی نووری سافە لەسەر بەردی وەک بلوور
یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کەوا
ئەستێرەکانی ڕادەکشێ وەک شەهابی نوور
یا چەشمە ساری خاتیری پڕ فەیزی عاریفە
یەنبووعی نووری دادەڕژێنێ لە کێوی توور
دەمگوت دوو چاوی خۆمە ئەگەر (بەکرەجۆ)یی ئەشک
نەبووایە تیژ و بێ سەمەر و گەرم و سوێر و سوور

نالی عاشقی ئەو نیشتمانەیە، چونکە لەو مەڵبەندەدا هاتۆتە دنیاوە و لەوێش پەروەردە و گەورە بووە. نامە بۆ سلێمانی دەنێری بۆ ئەوەی هەواڵی وڵات بزانێ، ئەگەر بیر لە جێگەی لەدایکبوونی بکاتەوە کە خاک و خۆڵە و پەیامبەر پێویستە سەر لەوێش بدا، خۆ دەبێ هەر بەڕێگەی سلێمانییەوە تێپەڕ بێ:

داخیل مەبە بەعەنبەری سارای (خاک و خۆڵ)
تاکو نەکەی بەخاکی (سلێمانی)یا عوبوور

شاعیر لەو دێڕەشیعرانەی داهاتوودا نەخشەییێکی سروشتی شاری سلێمانی دەکێشی و باس لە دانیشتوانی دەکا، بەخۆشەویستی خۆی دەیانژمێرێ، شاری سلێمانی بەهی خۆی و ئەوان دەزانێ.

یەعنی ڕیازی ڕەوزە کە تێیدایە چەند دەمێ
موشکین دەبێ بەکاکۆڵی غیلمان و زولفی حوور
شارێکە پڕ کەرەم و عەدل، لە جێگەیێکی خۆش و نەرم
بۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن شاری (شارەزوور)
خاکی میزاجی عەنبەر و داری ڕەواجی عوود
بەردی خەراجی گەوهەر و جۆباری عەینی نوور
شامی هەموو نەهار و فوسوولی هەموو بەهار
تۆزی هەموو عەبیر و بوخاری هەموو بخوور

ئەهلێکی وای هەیە کە هەموو ئەهلی دانشن
هەم نازیمی عوقوودن و هەم نازیری ئوموور

لەدوای ئەمە نالی دەکەوێتە پرسیارکردن، بیرەوەرییە کۆنەکانی دێنەوە یادی، دەزانی جەندرمەی تورکی عوسمانی لە پاش داگیرکردنی شاری سلێمانی وێنەی ڕاستەقینەیان شێواندووە، داریان لەسەر بەرد نەهێشتووە:

سەیرێ بکە لە دار و لە بەردی مەحەللەکان
دەورێ بدە بەپرسش و تەفتیشی خوار و ژوور
داخۆ دەروونی شەق نەبووە پردی (سەر شەقام)
پیر وفتادەتەن نەبووە داری (پیرمە سوور)
ئێستەش بەبەرگ و بارە عەلەمدارە (شێخەباس)
یا بێ نەوا و بەرگە گەڕاوە بەشەخسی عوور
ئایا بەجەمع و دائیرەیە دەوری (کانی با)
یاخۆ بووە بەتەفرەقەیی شۆرشی نوشوور
(سەیوان) نەزیری گونبەدی کەیوانە سەوز و ساف
یاخۆ بووە بەدائیرەی ئەنجومی قوبوور
ئێستەش پڕە لە ئاهوویی بەر (کانی ئاسکان)
یاخۆ بووە بەمەلعەبەی گورگ و لوورە لوور
ئێستەش سروشکی عیشقی هەیە (شیوی ئاودار)
یاخۆ بووە بەسۆفیی وشکی لە حەق بەدوور
قەلبی مونەووەرە لە حەبیبانی نازەنین
یا وەک سەقەر پڕە لە ڕەقیبانی لەندەهوور
داخۆ دەروونی سافە گۆڕەی ماوە (تانجەڕۆ)
یاخۆ ئەسیری خاکە بەلێڵی دەکا عوبوور

لە پاش ئەم هەموو پرسیارانە کە شاعیر چاک دەزانێ وەرامەکانی چییە، دێتە سەر هەواڵی خانەقا، جێی کۆبوونەوە و خوێندن و گفتوگۆ. شاعیر دەزانێ لەدوای داگیرکردنی شار لە لایەن بێگانەی داگیرکەر ڕەونەقی جارانی نەماوە:

سەیرێکی خۆش لە چیمەنی نێو خانەقا بکە
ئایا ڕەبیعی ئاهووە یا چایەری سوتوور
سەوزە لە دەوری گوڵ، تەڕە وەک خەتتی ڕوویی یار
یا پووشی وشکی زوورە وەکو ڕیشی (کاکە سوور)



دەس بەندیانە دێن و دەچن سەروو نارەوەن
یا حەلقەیانە سۆفییی ملخوار و مەندەبوور

ئینجا نالی نامەبەر دەنێرێ بۆ مەدرەسە لە مزگەوتی سەید حەسەن لە سلێمانی، ئەو جێگەی لە هەموو شوێنێکی دیکە خۆشەویستترە لە لای شاعیر، چونکە لە حوجرەیێک لە حوجرەکانی ئەو مەدرەسەیە ژیاوە، وانەی وتۆتەوە، لە هەموو لەمانەش بێ گومان شیعرێکی زۆری خۆی لەو مەدرەسەیە نووسیوەتەوە:

مەیلێ بکە بەسەوزە درەختانی مەدرەسە
ئەوراقییان موقەددەمەیی شینە یانە سوور
حەوزی پڕی کە نائیبی دیدەیی منە لەوێ
لێلاوی دا نەهاتووە وەک سەیلی (شیوە سوور)
ئێستەش کەناری حەوزەکە جێی باز و کەوشەکە
یاری تێدایە یا بووەتە مەعرەزی نوفوور
چاوێ بخە لە سەوزەیی سیرابی دائیرە
جێی جیلوەگاهی چاوەکەمە نەرمە یا نەزوور
داخوا فەزای (دەشتی فەقێیان) ئەوێستەکەش
مەحشەر میسالە یا بووەتە چۆڵی سەلم و توور
واسیل بکە عەبیری سەلامم بەحوجرەکەم
چی ماوە چی نەماوە لە هەیوان و تاق و ژوور
ئەو غاری یارە ئێستە پڕ ئەغیارە یانەخۆ
هەر غاری یارە یا بووەتە غاری مار و موور

شاعیر لە دێڕێکی ئەم پارچە شیعرەدا ڕستەی (حەوزی پڕ)ی هێناوەتەوە، هەرچەندە مانای دێڕە شیعرەکە دروستە، وەک حەوزێکی پڕ لە ئاو لە مانادا گرێی تێدا نییە، بەڵام بیر بۆ ئەوەش دەچێ ڕستەکە (حەوزی پەری) بێ، وەک ناوێک بۆ حەوزەکە، لێرەدا مەگەر تەنیا نالی خۆی بزانێ مەبەسی کامەیانە! شاعیر شێوازی لەم بابەتەی یەکجار زۆرە.

نالی بەچاوێکی پڕ لە فرمێسک و بەدڵێکی بریانەوە، بەسەرهاتی ئاوارەیی خۆی دەگێڕێتەوە، دەزانی وڵات شپرزە بووە، لەوەدا نەماوە بگەڕێتەوە. بەم دێڕە شیعرە پڕ لە سۆز و دڵداری بەرامبەر بەمەڵبەند و خاکی نیشتمان دوایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

زارم وەکو خەیال و نەحیفم وەکو خەیاڵ
ئایا دەکەومە زار و بەدڵدا دەکەم خوتوور
لەم شەرحی دەردی غوربەتە لەم سۆزی هیجرەتە
دڵ وەختە بێ بەئاو و بەچاوما بکا عوبوور

ئایا مەقامی ڕوخسەتە لەم بەینە بێمەوە
یا مەسلەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی سوور
حاڵی بکە بەخوفیەکە ئەی یاری سەنگ دڵ
(نالی) لە شەوقی تۆیە دەنێری سەلامی دوور

بەم قەسیدەیە نالی خۆی وەکو نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز و شاعیرێکی باڵا لە ئەدەبی کوردیدا تۆمار دەکا.

لە وەرامی هەموو ئەو پرسیارانەی نالی دەیکا، سالمی هاوڕێی بەقەسیدەیێکی ڕەنگین وەرامی دەداتەوە. لە بەشێکی دیکەی ئەم کتێبە قەسیدەکەی سالم دەخرێتە ڕوو.

## پاشا دەمرێ پاشا دەژی

نالی شیعرێکی کەم وێنەی داناوە، تێیدا شین بۆ مردنی سلێمان پاشا دەکا و زەماوەند بۆ لەسەر تەخت دانیشتنی ئەحمەد پاشا دەگێڕێ. ئەوەی ڕاستی بێ ئەم شاعیرە شانازی بەکەس نەکردووە، بەسەر کەسی هەڵنەداوە، بۆ هیچ مردوویێکی بەناو گەورە نەیلاواندۆتەوە، بەڵام بەحسێبی ناوەرۆکی ئەدەبی کلاسیکی یا نووسینەوەی مێژووی ئەو داهێنانە یەکسەر شیعری (تا فەلەک دەورەی نەدا...) قوت دەبێتەوە. بەڵێ پێویستە لەم لایەنەوە بوترێ هۆی گرنگی دان بەم بەرهەمە و پلەی بڵندی و سەرکەوتوویی لەوەدایە، لاواندنەوەیە بۆ کۆچی دوایی سلێمان پاشا وەک ماتەمنامەو، پیرۆزبایی کردنە بەهۆی لەسەر تەخت دانیشتنی ئەحمەد پاشا کە مەدحە، ئەمە لە یەک شیعردا کۆ کراونەتەوە. هەر لەو کاتەشدا مەدح و شانازی کردنە بەهەردووکیان. لەم لایەنەوە شاعیر توانیویەتی ئەم هەموو مەبەسانە لەو شیعرەدا کۆ بکاتەوە.

ئەوەی گرنگە لە دیاریکردنی کەسایەتی لە بابەت خوو و ڕەوشت و هەڵسوکەوتی نالی هیچ بەڵگەیێک ناکەوێتە دەست ئەم شاعیرە دانی بەهیچ کەسێک نابێ شایانی ئەوەبێ شیعرێکی مەدحی بۆ بهۆنێتەوە. مەسەلە پێوەندی بەسۆز و دڵدارییەوە نییە، شاعیر لەسەر ئەو باوەڕە بووە کەسی دانا و بلیمەت و زانا هەموو شتێکە، ئەمە هەمووی لە خۆیدا دیوە لەبەر ئەوە لەو باوەڕەدا بووە ئەگەر مەدحی یەکێکی دیکە بکا لە نرخی خۆی کەم دەبێتەوە، ئەمە وێنەی ڕەسەنی هەموو شاعیرییەتی نالییە. بەڵام کە پیشەی شاعیر پێدا هەڵدان و ستایش نەبووبێ بۆچی ئەم شیعرەی وتووە؟! بۆ ئەوەی وردەکاری بنوێنێ، سروشت بێنێتە جموجۆڵ و وێنەی بەرز و مانای قووڵی داپۆشراو دروست بکا. لەم شیعرەدا شاعیر گەلێ خۆی خەریکی سروشت کردووە، لە ڕەمز و ڕەوانبێژی و وردەکاری هونەری و وێنەی ڕۆمانتیکییانە سەرکەوتوو بووە.

نالی پێویستی بەوە نییە لەسەری بکرێتەوە، لەم لایەنەوە با کەس بەرگری لێ نەکا، هەموو شاعیرێک دەتوانێ مەدحی پاشا بکا بۆ خۆ بردنەپێشەوە و چڵکاوخۆری، بەڵام ئەمە حاشا لە نالی. ئەو مەدحی سلێمان پاشا و ئەحمەد پاشای نەکردووە لەبەر ئەوەی پیاوی گەورەن، گەورە بەلای نالییەوە گەورەی



زانستی و ئەدەب و هونەرە، نەوەکو فەرمانڕەوایی و سیاسەت، ڕاستتر ئەوەیە ئەمانە ڕەمزی سەربەخۆیی کوردستانی باشوور بوون، لەو ڕۆژگارەدا دروشمی فەرمانڕەوایی ئەو ناوچە ڕەنگینە بوون لە سلێمانی و شارەزوور. ئەگەر سلێمان پاشا و ئەحمەد پاشا لە گەورەیی و شکۆییدا لە پلەی پاشای نەتەوەکانی تریش نەبووبن، نالی ئەوانی هێناوەتە پلەی ئەوانەوە. ئەمەی تەنیا بۆ بەرزکردنی هەردووکیان نەبووە، بەڵکو بۆ بەرزکردنی نەتەوەکەیان بووە کە کوردە، نالی مەبەسی ئەوە بووە نەتەوەی خۆی بێنێتە ڕیزی ئەو نەتەوانەی پاشای مەزن و دامودەسگای دەوڵەتی بەرزیان بووە، جگە لەوە نابێ ئەوەش لە بیر بچێتەوە ئەحمەد پاشا دۆستی نالی بووە و شانازی پێوە کردووە وەک زانا و شاعیرێک.

ئینجا با بچینە ناو شیعرەکەوە:

تا فەلەک دەورەی نەدا سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو
کەوکەبەی میهری موبارەک تەلعەتی پەیدا نەبوو

لەو کاتەی ڕۆژگار لە گەشتی سروشتی خۆیدایە، چەرخ و فەلەک و ئاسمان گەردوون دەسووڕێنەوە، لەو سەردەمەدا بەسەدان ئەستێرە دەڕژێن و ئاوا دەبن؛ کە ئەم ئەستێرانە دەکوژێنەوە، دەستە و دایەرەی خۆر کە هەمووی پیرۆزییە بەدەردەکەون و دەدرەوشێنەوە.

نیوە دێڕی یەکەم ڕژان و ئاوابوونی سەد ئەستێرە بۆ مردنی سلێمان پاشا بووە. لەناو کوردەواریدا ئەفسانەیێکمان هەیە دەڵێ: هەموو کەسێک ئەستێرەیێکی لە ئاسماندا هەیە، بەمردنی ئەو کەسە ئەستێرەکە دەڕژێ و ئاوا دەبێ، هەروەها ئەفسانەکە دەڵێ ڕژانی ئەستێرەکە خەڵکی چاویان لێی دەبێ نیشانەی مردنی گەورە پیاوێکە، بەڵام نالی دەڵێ بۆ مردنی سلێمان پاشا نەوەکو تەنیا ئەستێرەیێک دەڕژێ، بەڵکو ئەوەندە گەورەیە سەد ئەستێرە بۆی ئاوا دەبێ.

نیوەدێڕی دووەم هەڵاتنی ڕۆژ بۆ لەسەر تەخت دانیشتنی ئەحمەد پاشایە. هەردووکیان لە لای نالی گەورەن، بۆ یەکەمیان لەباتی ڕژاندنی یەک ئەستێرە سەد ئەستێرە ئاوا دەکا، بۆ دووەمیان ڕۆژێک هەڵدێنێ و لە ئاسمانی جوانیدا مانا دروست دەکا.

نالی لە سروشتدا خۆر و ئەستێرەی ئاسمان هەندێ دێنێتە خوارەوە و لە زەوی نزیکیان دەکاتەوە، ڕاستە ئەمانە لە ئاسماندا دەژین، بەڵام ئاسمانێکی نزیکتر لە ئەرز، ئەو جێیەی بارانی لێ پەیدا دەبێ و ئاسمان لەگەڵ ئەرز بەیەکتری دەگەن:

تا نەگریا ئاسمان و تەم وڵاتی دانەگرت
گوڵ چەمەن ئارا نەبوو هەم لێوی غونچە وا نەبوو

ئاسمان فرمێسک دەڕێژێ، تەمومژ هەموو سروشت داگیر دەکا، گریانی ئاسمان لە وێنەی باراندایە. مەبەسی نالی لە گریانی ئاسمان ئەو شین و شەپۆڕەیە کە بۆ مردنی سلێمان پاشا دەیکا، لەبەر ئەوە تەم هەموو لاییێکی داگرتووە و سروشت گرژ بۆتەوە و لە شیندایە بۆ ئەم کارەساتە. بەڵام کە باران بباری ئەرز دەبووژێتەوە، گوڵ لە چەمەندا خۆی دەنوێنێ و دەمی غونچە دەکرێتەوە، ئەم بەهار و خۆشی و جوانی و

ڕووناکییەی سروشت دەیخاتە ڕوو بۆ دانیشتنی ئەحمەد پاشایە لەسەر تەخت.

نالی هێشتا هەر لەگەڵ سروشتدایە، لە گریانی ئاسمان و پێکەنینی ئەرزەوە دێتە سەر ئەو چرۆیانەی لە درەختدا دەپشکوێن لەگەڵ گوڵ و غونچە:

تا چەمەن پیرانە سەر ئەسڵی درەختی لا نەدا
فەرعی تازە و خوڕڕەم و بەرز و بڵند باڵا نەبوو

لە سەرەتای بەهارا غونچە دەپشکوێ، درەخت چرۆ دەردەکا، لقی کۆن و پیر کە لە نەژاد و ڕیشەی درەختەکەیە لادەچێ. ئەم لقە بنچینەییە سلێمان پاشایە، بەمردنی لە چەمەن دەچێتە دەرەوە، بەڵام هەر لەو لقەدا چرۆی تازە و ناسک سەری دەرهێنا و گەورە بوو، ئەم چرۆیە ئەحمەد پاشایە کە لەناو دەروونی درەختەکەوە دەرچووە.

نالی لە سروشت دەبێتەوە و دەکەوێتە ڕەوانبێژی و هونەربازی:

تا سلێمانان نەبوونە سەدری تەختی ئاخیرەت
ئەحمەدی موختاری ئێمە شاهی تەخت ئارا نەبوو

سلێمان پاشا کە مرد هەروا بەئاسانی وەکو خەڵکی دیکە نەچووە گێتییەکەی دی بەپێی کردەوەی خۆی پاداشی پێ ببەخشرێ یا ئازار بدرێ، بەڵکو چۆن لەم جیهانەدا گەورە و پێشەوا بوو لە گێتیی تریش لەسەر تەختی شاهی ئەوێ دانیشت، لەو کاتەی ئەو بوو بەپێشەوای ئەو گێتییە ئەحمەد پاشا لەسەر ئەم تەختەدا جوانی بەڕۆژگار دەبەخشی، ئەو تەختەی سلێمان پاشا بەجێی هێشت.

ئەم دوو کوردە، سلێمان پاشا و ئەحمەد پاشا ئەوەندە گەورە و مەزن بوون بەلای نالییەوە تا گەیشتە ئەوەی ناوی (سلێمان) بەشێوەی کۆ بخاتە ناو شیعرەکەیەوە (سلێمانان)، ئەوەی لە دەستووری زماناندا پێڕەو نەکراوە ئەوەیە ناوی کەس (عەلەم) بەهیچ جۆرێ کۆ ناکرێتەوە، چونکە ئەو کەسە یەکێکە نابێ بەدوو، بەڵام نالی ئەمە دەشکێنێ و بۆ شانازی و بەرزی و بڵندی ناوی سلێمان پاشا بەشێوەی کۆ دەخاتە ناو شیعرەکەیەوە، هەروەها لەگەڵ ناوی ئەحمەد پاشا بەشێوەیێکی تر ئەم کارە هونەرییە دەباتە سەر بەوەی ئەحمەدی موختاری پێ دەڵێ. ئەوەی ئاشکرایە لەم لایەنەوە ئەوەیە (ئەحمەد) و (موختار) لە ناوەکانی پێغەمبەرن. ڕاستە لەناو ڕۆشنبیرانی کورد بەپێی نەریتی تورکی عوسمانی هەموو ئەحمەدێک موختاری دەخەنە پاڵ، بەڵام لێرەدا وشەی (موختار) نەخراوەتە پاڵ ناوی ئەحمەد پاشا بەپێی ئەو نەریتە، بەڵکو کە نالی بەئەحمەد پاشا دەڵێ ئەحمەدی موختار مەبەسی ئەوەیە ئەحمەد پاشا بگەیەنێتە پلەی پێغەمبەری، وە بۆ ئەوەی سەریش لە خەڵکی نەشێوێ لەنێوان هەردوو ئەحمەددا دەڵێ ئەحمەدی موختاری ئێمە.

شاعیر لەسەر شیعرەکەی دەڕوا و دەڵێ:

قیسسە بێ پەردە و کینایەت خۆشە شاهی من کەوا
عادیلێ بوو قەت عەدیلی ئەو لە دونیادا نەبوو



نالی لەم دێڕەدا خۆی دان بەوەدا دەهێنێ کە شیعرەکانی پێشووی کینایەت و نهێنی و مانا و وێنەی شاراوەیان تێدایە و پێویستە خەڵکی بەدوایانا بگەڕێ ئینجا تێیان دەگا، دەڵێ قسەکردن بەم شێوەیە شتێکی خۆشە و هونەری تێدایە، بەڵام پیاو دەبێ قسەی ساکار و ئاشکرا و ڕوونیش بکا، بۆ ئەمە دەڵێ: شاهی من کە سلێمان پاشا بوو دادپەروەرێک بوو بەچاوێک بەبێ جیاوازی تەماشای هەموو کەسێکی دەکرد، بەم پێیە هاوتا و بەرامبەری لە یەکسانیدا لەم گێتییەی ئێمەدا نەبوو کە بەجێی هێشت.

ئەوجا دەڵێ:

بۆ نشینگەی مورغی ڕووحی ئەو کە عالی فیترەتە
جێگەیێ خۆشتر لە ڕەوزەی جەننەتولمەئوا نەبوو

کە سلێمان پاشا کۆچی دوایی دەکا، مانای ئەوەیە باڵندەی گیانی کە لەشی دەردەچێ ڕوو دەکاتە گێتییەکەی دیکە، لەوێ دوو جێگە هەیە بەهەشت و دۆزەخ خەڵکی سەر زەوی ڕووی تێ دەکەن، لەبەر ئەوەی سلێمان پاشا خوو و ڕەوشتی بەرز و بڵندی هەبوو، باڵندەی گیانی لەناو چیمەن و گوڵزاری بەهەشت نیشتەوە.

وەک قیاسێکی کە موسبەت بێ نەتیجەی بێتە جێ
حەمدولیللا شا کە عالی جا بوو خالی جا نەبوو

شاعیر دەیەوێ زاراوەی فەلسەفە و لۆجیک لەم دێڕەشیعرەدا بەکار بێنێ، مەسەلەیێکی ساکار و ئاشکرا بەتەرازووی فەلسەفە بکێشێ، دەیەوێ بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خودا کە سلێمان پاشای جێگە و مەرتەبە بڵند و بەرز لە پاش خۆی جێگەی بەتاڵ نەبوو، واتە ئەحمەد پاشایێکی کە لە جێگەی ئەو دانیشتووە و چۆتە سەر تەختی پاشایەتی لە گەورەیی و مەزنیدا لە پلەی ئەودایە. لە کوردەواری لای خۆمان کە پیاوێکی باش دەمرێ و منداڵی باش لە پاشی بەجێ دەمێنێ، دەڵێن جێگەی بەتاڵ نییە. بۆ ئەم مانا ساکارە زاراوەی پێوانەی نەگۆڕاو (قیاسی ثابت) بەکار دێنێ، ئەمە ئەو شتەیە کە لەگەڵ شتێکی دیکەدا بەراوورد دەکرێ، ئەو شتە قەراری خۆی گرتووە و تێک ناچێ، ئەمە سلێمان پاشایە، زادەی ئەم مەسەلەیە شتێکە وەکو ئەو، واتە هەر شتێک کە شتێکی تری لێ دەبێتەوە بێ گومان لەو دەکا، ئەو زادەیە ئەحمەد پاشایە کە ئەنجامی سلێمان پاشایە.

شاهی جەمجا (نالی) یا (تاریخی جەم) تاریخییە
دا نەڵێن لەم عەسرەدا ئەسکەندەری جەمجا نەبوو

نالی سلێمان پاشا دەگەیەنێتە پلە و پایەی جەمشیدی جەم، کە یەکێ بووە لە شاهنشاهانی پیشدادیانی ئەفسانەیی ئێرانی کۆن و ئەحمەد پاشاش بەئەسکەندەری مەکدۆنی دەچوێنێ.

ئەم برە شیعرەی نالی نموونەی هەندێ وێنەی جوانی شیعری و مانای قووڵی داهێنراوی تێدا دەدۆزرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا نالی زانیاریێکی بەکەڵک و پێویست بەدەستەوە دەدا بەوەی بەحسێبی

ئەبجەد ڕستەی (تاریخ جم) دەکاتە ساڵی (١٢٥٤ھ) بەرامبەر بەساڵانی (١٨٣٨م/ ١٨٣٩م)یە. ئەم مێژووە ئەوە دەگەیەنێ لەو ساڵەدا سلێمان پاشا کۆچی دوایی کردووە و ئەحمەد پاشا بووە بەسەرۆکی میرنشین و نالیش هێشتا لە سلێمانی بووە.

## کچ کردگاری پەرستگای ناو دڵی نالییە

ئەگەر قەسیدەی (عیشقت کە مەجازی بێ...) لە سروودەکانی ناو دیوانی نالی نەبوایە و یەکێکی دیکە بیبوتایە لەوانە بوو وەک شیعرێکی ئاسان و ساکار و مانا دیار نەکەوتایە بەر گوێ، بەڵام بۆ نالی چار نییە دەبێ بووترێ لە شیعرە ئاسان و سفت و پڕ مۆسیقا و ماناکانیەتی.

ئەم قەسیدەیە شیعرێکی مێبازی زەمینییە، بەسێکس قانگ دراوە، بەڵام زۆر ئاشکرا نییە. شاعیر وەستایانە و هونەرمەندانە مەبەسی شارراوە و ناڕاستەوخۆی ئەوەیە بڵێ مێبازی کارێکی سروشتی و ئاسایی و بەجێیە، کەچی بەکوڵ هەتیوبازی ڕەت دەکاتەوە، وەکو لە هەندێ لە دێڕەشیعری دیکەی دیوانیدا دەردەکەوێ.

شاعیر لە ڕووی قافیەوە وشەی (کچ)ی کردووە بەپاش قافیە. قافیەی بنچینەیی لەسەر یەک دەنگی (ا)یە، واتە (ـا کچ) لە شیعرەکەدا. لەم قەسیدەیەدا وشەکانی (کچ) و (کوڕ) گەلێ جار دووبارە کراوەتەوە، ئەم دووبارەکردنەوەیە جۆرە ئاوازێکی نەرمی مۆسیقی داوەتە شیعرەکە. شاعیر زیاتر بایەخی بەوشەی (کچ) داوە، لەبەر ئەوە چەند جار وشەی (کوڕ)ی بەکار هێناوە دوو ئەوەندە وشەی (کچ)ی لە شیعرەکەدا بەکار هێناوە.

ئەوەی جێی گومان نییە لەم شیعرەدا ئەوەیە نالی پێڕەوی عیشقی مەجازی کردووە لەنێوان نێر و مێ، ئینجا دەکەوێتە ڕوونکردنەوەی ئەم جموجۆڵییانەی لەم جۆرە دڵدارییەدا بەکار دەهێنرێن. هەرچی عیشقی حەقیقیشە لەنێوان ئادەمزاد و کردگارا دەبێ، واتە لەنێوان دوو نێرینە بەو مانایەی بەلەفز وشەی کردگار یا خودا نێرینەیە. ئەمەیان وەک ئیدیۆلۆجییەتی سۆفیزم نالی ئەگەرچی لایەنگری نەبووە و لەسەریشی نەڕۆیشتووە، بەڵام باوەڕی پێی بووە، کەچی ئەم عیشقی حەقیقییە کە لەنێوان کردگار و ئادەمزادا دەبێ و نێرینە و مێیینەشی تێدا نییە گوێزراوەتەوە بۆ هەموو نێرینەیێک، نالی لە دژی ئەم جۆرە دڵدارییەیە و لەم قەسیدەیەشدا ڕەنگی داوەتەوە. نابێ ئەوەش لە بیر بکرێ، ئەم جۆرە دڵدارییە بەناوی (عیشقی حەقیقی)یەوە بەرهەمی بەرز و باڵای هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

شاعیر قەسیدەکەی بەم دێڕەشیعرە دەست پێ دەکا:

عیشقت کە مەجازی بێ خواهش مەکە ئیللا کچ
شیرین کچ و لەیلا کچ، سەلما کچ و عەزرا کچ

نالی باس لە دڵداریی مەجازی دەکا، بەلای ئەوەوە دڵداری تەنیا ئەوەیە کوڕ لەگەڵ کچدا بیکا، لەگەڵ هیچ کەسێکی تر نا، ناوی ئەو کچە جوانانە دەبا کە پەیمانی دڵدارییان لەگەڵ کوڕاندا بەستووە، وەک شیرینی خوسرەو (یا فەرهاد)، لەیلای قەیس، عەزرای وامیق، سەلمای بووکی شیعری عەرەبی. دڵداریی



ئەمانە بەلای شاعیرەوە ڕاست بووە، تەنیا لەبەر ئەوەشە لە سۆفیزمدا وەک عیشقی حەقیقی لێکدراوەتەوە.

ئینجا شاعیر دەکەوێتە دیارکردنی ئەو جیاوازییانەی لەنێوان کچ و کوڕدا هەیە:

فەرقی کچ و کوڕ ڕەوشەن وەک فەرقی مەھ و میهرە
ئەم فەرقی شەو و ڕۆژە وەک فەرقە لە کوڕ تا کچ
مەھ مەھ لە مەهی سادە، یەعنی لە قەمەر لادە
هەم شەمس و سوررەییا کچ، هەم زوهرەیی زەهرا کچ
بێ بێنە گولی ژاڵە، هەم بێ بەرە هەم تاڵە
قەد سەروو و سنەوبەر کچ چاو نێرکسی شەهلا کچ
کوڕ وەک گولی گولزارە، ئەمما سەمەری خارە
وەک هەنگی چزوودارە، هەنگوینی موسەففا کچ
کچ پەرچەمی چین چینە، دوو مەمکی لەسەر سینە
وەک شانەیی هەنگوینە، بۆ لەززەتی دونیا کچ

لەم بەراووردکردن و دیاریکردنی ئەو جیاوازییانەی لەنێوان کچ و کوڕدایە، ئەوە دەردەکەوێ کچ خۆرە، کوڕ مانگە، کچ ڕۆژە، کوڕ شەوە. دەڵێ لە مانگ لابدە، بەرەو ڕووی ڕۆژ و ئەستێرەی پەروین و ئەستێرەی ناهید و ڤینۆس ببەوە. هەروەها دەڵێ گولی ژاڵە بێ بۆن و بێ بەر و تاڵە، قەد و باڵای بەرزی کچ وەک سەروو و سنۆبەر وایە، چاوی کچ نێرگسی شەهلایە، کوڕ گولی گولزارە بەڵام بەری دڕکە، کەچی کچ هەنگە و بەری هەنگوینە، ئینجا دەکەوێتە وەسفی پەرچەمی کچ. لە بابەت سنگ و مەمکییەوە بەشانەی هەنگوینی دەچوێنێ، بەمە کچ دەبێتە مایەی چێژی خۆشی و مووچڕکی شادی لە سەردەمی دەسبازی و مێبازیدا.

لەدوای ئەوە نالی دەکەوێتە بەراووردکردن و جوانی هەریەکە لە کچ و کوڕ دەخاتە بەرچاو:

جەزلی سەمەر و سایە بۆ سەوڵەتی ئەعدا کوڕ
نەخلی سەمەری مایە بۆ دەوڵەتی دونیا کچ
کوڕ زیبی دەبستانە، کچ شەمعی شەبستانە
بۆ بەزمی تەماشا کوڕ بۆ خەڵوەتی تەنها کچ
موو سونبولی ئاشوفتە، دوڕدانەیی ناسوفتە
دەم غونچەیی نەشکوفتە، تێ فکرە کوڕە یا کچ؟
کوڕ ئایینەیی حوسنی تا وەک کچە مەنزوورە
گرتی لەغوباری موو چینی کوڕ و مینا کچ

کـــوڕ تازە و تەڕ مـــادام ســـادە وەکـــو خـــوشکی بێ
ئەمما کـــە ڕوا ســـەبزە دیبـــا کـــوڕ و زیبـــا کچ
بۆ شـــەربەت و شـــیـرینی فـــینجـانە لەســـەر ســـینی
مـەم توحفـەیی توفـفاحی شـەم عـەنبـەری بوو یا کچ

بەلای شاعیرەوە کوڕ ڕەمزی هێز و توانایییە، شیرازەی کۆمەڵ دەپارێزێ، لە ڕووی دوژمن ڕادەوەستێ و بەرگری لە وڵات دەکا، بەڵام کچ بەری هەیە و ژیانی گێتی پێ دەڕازێتەوە. لە لایێکی دیکەوە دەڵێ کوڕ جوانی قوتابخانەیە، بەرامبەر بەو کچ ڕووناکیی شەوە، کوڕ دیمەنی بەزمی کۆڕی سەرخۆشانە، بەڵام کچ مایەی ماچوموچ و چوونە ناویەکی شەوانی تەنیاییییە.

ئینجا نالی دەکەوێتە پرسیار لە خوێنەری شیعرەکەی، دەڵێ: ئەوەی پرچی ئاڵۆزە وەک سونبول، ئەوەی دورری (ئەندامی مێیینەی) نەسمراوە، واتە کون نەکراوە، ئەوەی دەمی وەک غونچەی پشکووتووە، کوڕە یا کچ؟ بێ گومان کچە. لە پاشانا نالی باس لەوە دەکا کوڕ بەمنداڵی وەکو کچ وایە تا مووی لێ دێ، ئەو کاتە لە کچ جیا دەبێتەوە. جوانی ڕوخساری کوڕ لە سەردەمی منداڵیدا کە هێشتا مووی لێ نەهاتووە وەک کچ وایە، بەڵام کە گەندەمووی لێ دەڕوێ لە میناوە (شووشەوە) دەبێ بەچینی (فەغفووری) کەچی ئەم جۆرە گۆڕانە بەسەر کچدا نایە.

شاعیر لەسەر ئەو وێنە داهێنراو و لەیەکچووانەی دەڕوا و دەڵێ: کوڕ کە هێشتا منداڵە لە خوشکی خۆی دەکا، بەڵام کە سەبزەی لێ دەڕوێ واتە تووکی لێ دەردەکەوێ دەبێتە نەخشی سەر قوماش، کەچی کچ ئەو گۆڕانەی بەسەر نایە و تێک ناچێ. ئەوجا دێتە سەر سنگ و بەرۆکی کچ، سنگی سینییە فینجانی شیرینی لەسەر ڕێزکراوە. جووتە مەمکی وێنەی سێویان گرتووە، وەک مۆم قیت وەستاون، وەک عەنبەر بۆنیان خۆشە.

نالی پێش ئەوەی کۆتایی بەم قەسیدەیە بێنێ گەلێ وێنە دروست دەکا لە جوانی کچ و کوڕ، بەڵام زیاتر دەشکێتەوە سەر کچ:

هەم گـــوڵبـــونی بێ خـــارە، هەم مـــەزرەعی ئەزهارە
هەم مـــەخـزەنی ئەســـرارە ئەســـبـــابی مـــوهەییـــا کچ
جـــەننەت پڕی ویلدانە، خـــادیم هەمـــوو غـــیلمـــانە
خـانم کـە تێـدا حـۆرین یەکـسـەر هەمـوو حەسنا کچ
گەر ئەشرەفی مـەحبـووبە، یووسف کـوڕی یەعـقـووبە
کچ بـوو بـەخـــەریداری یەعـنی کـــە زولەیخـــا کچ
سـددیقی عـەزیز هەر وەک یووسف کـە نەبی بوو کـوڕ
سـددیقـەیی مـەعـسـوومـە وەک داکی مـەسـیـحا کچ



کچ بنە گوڵێکی بێ دڕکە، کێڵگەی گوڵە، گوڵستانە، مەڵبەندی نهێنییە، واتە ئەندامی مێیینەی لە گێتیی نهێنیدایە بەتایبەتی کە هێشتا کچ بێ و نەسمرا بێ، ئینجا کە ببێ بەژن دەبێ چی لێ ڕوو بدا، ئەمانە هەموویان لە کچدا دەردەکەون و لە کوڕدا نابینرێن.

شاعیر باس لە ژیانی بەهەشت دەکا، تەنیا حوور و غیلمان لەو کۆمەڵە گیانی بەدا هەستیان هەیە، دەڵێ لە بەهەشتدا غیلمان (کوڕ) زۆرن، ئەمانە هەموویان پێش خزمەتن، کەچی حووری یا پەرییە جوانەکان هەموویان خانمن، واتە کوڕان لە خزمەت کچاندان.

شاعیر بەڵگە بۆ قسەکانی دێنێتەوە و دەڵێ ئەگەر لە ژیانی گەورە و خۆشەویستێکی وەک یووسفی کوڕی یەعقووب بپێچینەوە دەبینین کچێک کە ناوی زولەیخا بوو لە بازاڕی ئادەمزاد فرۆشتندا بەپارە یووسفی کڕییەوە، بۆ ئەوەی لە دیلییەتی ڕزگاری بکا. ئینجا شاعیر نموونە بەدوو کوڕ دێنێتەوە یووسف پێغەمبەر و عەزیزی میسر (پووتیفار)ی وەزیری فیرعەون و مێردی زولەیخا. وەک لە چیرۆکەکەدا دیارە زولەیخا حەزی لە یووسف کردووە، ئەگەر هۆگربوونی ژنێک بەپیاوێک لەناو کۆمەڵدا بەتاوان دابنرێ، بەتایبەتی پیاوەکە حەزی لێ نەبێ، کەچی مریەمی دایکی مەسیح ئەوەندە داوێن پاک بووە بەکچێنی، مەسیحی بووە.

شاعیر بەم دێڕە دوایی بەشیعرەکەی دێنێ:

بابێکی هەیە دونیا بۆ عـیشـقی مـەجـازی و بەس
(نـالی) چیـــە ئەو بابە ئادەم کـــوڕ و حـەووا کچ

شاعیر بە(عیشقی مەجازی) دەستی بەقەسیدەکە کردووە و هەر بەو عیشقەش دوایی پێ هێناوە. بنج و بناوانی دڵداری و خۆشەویستی بەلایەوە پێوەندی کچ و کوڕ بەیەکترییەوەیە. ئەم دوو دیاردەیە یەکتری تەواو دەکەن. لە سەرەتای بوونی ژیاندا کوڕێک و کچێک، ئادەم و حەووایێک هەبوون. ئاساییەکە لە ئادەم و حەووا ماوەتەوە، پێوەندیی کوڕ و کچ لەوان ماوەتەوە. ئەوەی لە جغر و کردەوەی ئەوان بچێتە دەرەوە وەک نالی خۆی دەیلێ (لە ئێمە نییە)، بەهەموو جۆرێک دڵداریی نێوان کچ و کوڕ کارێک و دیاردەیێکی ئاسایی ژیانە، لەوە بچێتە دەرەوە (کوڕ و کوڕ) یا (کچ و کچ) شەرم و بێعارییە.

## مەستوورە کە حەسنا و ئەدیبە بەحیسابێ

بەڵگەی هەرە گرنگ بۆ شیعری کراوە لە بەرهەمی نالیدا ئەو گێتییە هونەرییەیە کە بەهۆی ماه شەرەف خانمی ئەردەڵانی مەستوورەوە دروستی کردووە. لەو قەسیدەیەدا هەوڵیداوە هەموو توانا و وەستایەتی خۆی بەکار بێنێ بۆ وەسفی ئەندامی مێیینەی لەشی ژن، وەسفێک ئەوەندە وێنەی بەرزی داهێنراوی هونەری تێدا بێ تا دەگاتە ڕادەییێک پیاو بڵێ ئەم گەنجینە نهێنییە پڕ لە ژیانە لەمە زیاتر هەڵناگرێ. ئەگەر شاعیرێکی تر بێتە ناوەوە و بیەوێ لەم بابەتەوە بنووسێ دەبێ لە دەوروبەری مانا و وێنە شیعرییەکانی نالی بسووڕێتەوە.

نالی بەمەبەسی هەڵدانەوەی پەردە لەسەر ئەندامە شارراوەکەی ژن قەسیدەیێکی چل و هەشت دێڕە

شیعری، یا نەوەد و شەش نیوەدێڕ شیعری نووسیوەتەوە. لێرەدا لەبەر ئەوە دەووترێ نەوەد و شەش نیوە دێڕ شیعر، چونکە ئەم نیوە دێڕانە لە قەسیدەکەدا هەموویان لەسەر یەک قافیەن.

بۆ وەسفکردنی دیوی دەرەوە و دیمەنی دیاری ئەو ئەندامە، شاعیر ئیلهامی لە مەستوورە وەرگرتووە، جا لەبەر ئەوەی جوان بووە، یا کچی ئاغاییێکی گەورە و ژنی والیی کوردستان بووە، یا لەبەر ئەوەی خوێندەوارێکی بەرز و شاعیرێکی چاک بووە، خۆ دەبێ لەبەر ئەمانە هەموویان بوو بێ، شاعیر لەم قەسیدەیەدا گێتیییێکی هەست بزوێنی جوانی دروست کردووە. مەستوورە بەتەمەن چوار پێنج ساڵ لە نالی بچووکتر بووە، خوسرەو خانی والیی ئەردەڵانی مێردی کە لە ساڵی ١٨٣٤ کۆچی دوایی کردووە، ئەو کاتە مەستوورە تەمەنی ٢٩ ساڵ بووە، لە خوسرەو منداڵی نەبووە. نالی لە ساڵی ١٨٤٥ لە سلێمانی بۆ یەکەم جار چاوی بەمەستوورە کەوتووە.

نالی و هەر کەسێکی دیکە، بەتایبەتی شاعیرێکی دڵ ناسک بۆی هەیە حەز لە ژنێک بکا، جوان بێ، شاعیر بێ، مێژوونووس بێ، وەک نالی خۆی دەیلێ، ئەم دڵدارییە با ئاسمانی نەبێ و زەمینی بێ، دڵداریی حەقیقی نەبێ و مەجازی بێ. ئەم دڵدارییە نەگەیشتۆتە ئەوەی خوازبێنی بکا و بیکا بەژنی خۆی و بنەماڵەییێکی تازە دروست بکا، چونکە مەستوورە وەک لە شیعری دەردەکەوێ مێردی کۆچکردووی خۆشویستووە، لای شەرم بووە لەدوای خوسرەو خان شوو بکاتەوە، ئەگەر مەستوورە ئارەزووی شووی بووایە ژیانی شاری سلێمانی لە ماڵی پوورزای خۆی بردبووە سەر، ئەم کەسە لە تەمەنی خۆی بوو و بەمانگێک پێش مردنی مەستوورە ئەویش کۆچی دوایی کردووە، هیچ بەڵگەییێک بەدەستەوە نییە ئەوە بگەیەنی کە شووی بەم پوورزایەی کردووە، لەبەر ئەوە بەهیچ جۆرێ مەستوورە بۆ نالی نەدەبوو. بەڵام لە گێتیی خەیاڵ و ڕۆمانتیک و شیعر و دڵداری ڕێگە لە نالی ناگیرێ مەستوورەی خۆش بووێ، ئەگەر پێی شادیش نەبێ دەبێتە مایەی ئەو شیعرە جوانە کراوەیە بێتە ناو مێژووی ئەدەبی نەتەوەی کوردەوە.

ئەوەی پێویستە لێرەدا ڕوون بکرێتەوە بەتایبەتی ئەم بەرهەمەی نالی کە قسەی زۆر لەسەرە، هەڵسەنگاندنیەتی لە ڕووی سوود و کەڵکی خوێنەر و خوێندەواری کورد. پێش هەموو شتێک پێویستە پێوانەییێک هەبێ، بەلای ئێمەوە ئەو پێوانەیە بریتییە لەوەی مەرجی سەرەکی لە هەموو داهێنانێکی ئەدەبی و هونەریدا ئەوەیە ئەو کارە ماکی ئیستێتیکی گرتبێتە خۆی، چونکە هونەر ژیانە، دەچێتە ناو هەموو کون و کەلەبەرەکانی بوون، ئایین و بیروباوەڕ، هەژاری و دەوڵەمەندی، کرێکار و خاوەن فابریقە، مرۆڤایەتی و خیانەت، هەستی دەروون، هەموو شتێکی لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە پێوەندی بەژیانی ئادەمزادەوە هەبێ.

لەو کاتەی پیاو و ژن دەچنە ناویەکەوە، ئەندامی نێرینەی پیاو و ژن وەک بەشێک لە جموجۆڵیی ئادەمزاد، ئەگەر بوون بەسەرچاوە بۆ داهێنانی بەرهەمێکی ئەدەبی و هونەری بەمەرجێ جەوهەری جوانکاری تێدا بێ، بەبەرهەمێکی چاک دەژمێررێ. نالی کە باسی ئەندامی مێیینەی مەستوورەی کردووە، لە حەقیقەتی ژیان نەچۆتە دەرەوە، چونکە شتێکە هەیە، تایبەتی نییە بەمەستوورە، بەڵکو



هەموو ژنێک هەیەتی، ئەو ئەندامە لە گەلێک لە ئەدگاریدا وەکو ئەندامەکانی دیکەی هەموو کچ و ژنێک هەموویان وەکو یەکن، تەنیا ئەوە نەبێ جوانی دەموچاو و لەشولاری هەموو ژنێک لەوانەیە ئەوە بگەیەنێ ئەندامەکەش جوان دەکەوێتە بەرچاو، بەو هۆیەی ژنەکە ناوی بەجوان دەرکردووە.

شاعیر لە سەرەتای شیعرەکەیدا بەدە نیوەدێڕ شیعر خەون دەبینێ و مەستوورەیە هاتۆتە لای ئەوەی تێدەگەیەنێ گرێییێکی هەیە بەنالی نەبێ بەکەس ناکرێتەوە، کێشە و تەنگوچەڵەمەییێکە بەو نەبێ بەکەس جێبەجێ ناکرێ، ئەو جێگە شارراوەیەی مەستوورە کە داپۆشراوە (مەستوورە) دەبێ بەئەستووری نالی فراوان بکرێ.

لە سەرەتادا دەڵێ:

مەستوورە کە حەسنا و ئەدیبە بەحیسابێ
هاتە خەووم ئەمشەو بەچ نازێک و عیتابێ
هات و گوتی: عوقدەم هەیە قەت مومکینە وا بێ
هەر تۆ مەگەر ئەم موشکیلە حەل کەی بەجەوابێ
هەر مەسئەلە بکرێ کە بەتۆ شەرحی کرا بێ
لایق نییە کەس دەخلی بکا چین و خەتا بێ
ئاوێنە بەم ئاوێنە دەبێ ڕەنگی نەما بێ
مەستوورە بەم ئەستوورە دەبێ موهرە گوشا بێ

لەدوا دێڕی ئەم بڕە شیعرە نالی بەزمانی مەستوورەوە ڕێگە خۆش دەکا بۆ وەسفی شتە نهێنییەکە بۆ ئەوەی شاعیر یا هەر کەسێکی دیکە هەڵی بێنێ ئەو شتە چییە:

نوکتەییێکی زەریفە بەنەسیبی زورەفا بێ
تەعریفی دەکەم بەڵکو لە بۆ دەردی شیفا بێ

مەستوورە دەڵێ وەسفی ئەم ئەندامە دەکەم و پێتی دەناسێنم، بەم جۆرە بەهەشت بەندی شەش نیوەدێڕی وەسفێکی ماددی هەست پێکراوی ئەندامەکە دەکا، وەسفەکە ئەوەندە وردەکاری تێدایە لەوانەیە ئەم وێنە هونەرییانە لە ئەندامەکە خۆی بەچێژتر بکەونەوە. لە وەسفەکەدا ئەندامەکە لەگەڵ گەنجینەی جەواهیر و کۆمەڵە زیو و پەڵەبەفر و چووزەرە ڕێواس و غونچەی نەپشکوتوو و مەڕمەڕ و گردی خوێ و کاڵەک و هەنار و شەمامە و شتی تر بەرامبەر و بەراوورد دەکا.

بەم ڕەنگە مەستوورە دەکەوێتە وەسفی ئەندامەکەی بەشێوازێکی پڕ لە هەڵهێن و نهێنی، وەرامی هەر بەندێکیش بەیەک وشە ئاشکرا دەبێ:

ئەم سرره چییە وا کەسوها بێ نەسووا بێ
دوررێکی وەکو دەوری سەما بێ نەسما بێ

دوککانی توحەف کانی حەیا کانی بەقا بێ

قوببەی لە قیبابی نوقەبا بێ، نەقوپا بێ

وەک خەیمە بەپەردەییێکی دوو ئەستوونی بەپا بێ

سەر تەپڵە نەختێ بەنەزاکەت قەڵیشا بێ

***

یا کۆمەڵە زیوی بوخەلا دوور لە سەخا بێ

موغلەق بە بەخیلی بەمەسەل مشتی مەلا بێ

وەک هیممەتی سۆفی کە لە نێو خەلوە خزا بێ

مەستوور و عەزیزی شەرەف و ڕەفعەت و جا بێ

کاسەییێکی بلوورین و نوخوونی لەسەرا بێ

نەختێکی لەبەر مەوجی لەتافەت قەڵیشا بێ

***

یاخۆ پەڵە بەفرێکی کە ئەسڵا نەشکا بێ

قەندیلی مونیری گوزەری ئاب و هەوا بێ

کام ئاب و هەوا موعتەدیلی نەشئو نەما بێ

یەعنی لە وەسەت کانییێ کرمێکی تێ زا بێ

لەو کانییەدا چووزەرە ڕێواس ڕووا بێ

بەو چووزەرە ڕێواسە کەمێکی قەڵیشا بێ

***

یا قەسری موعەللا کە لە ئاوێنە کرا بێ

یا غونچەیی نەشکوفتە کە ئاوی نەدرا بێ

یا گونبەدی نەزهەتگەهی نێو باغچە سەرا بێ

ئەلوانی گوڵ ئامێزی شەکەر بێزی تێدا بێ

یا قورسی نەمەک هەر وەکو مەڕمەڕ بەزیا بێ

جێ قەترەیی ئاوێکی لە نێودا قەڵیشا بێ

***

یا هەر وەکو گردێکی کە تازە هەڵیدابێ

گردی نەمەکین یەعنی گیای لێ نەڕووا بێ



دامێنی بەئەنواعی گوڵومولّ خەملاّ بێ

گەنجێکی تێدا بێ کە تەلیسمی نەشکا بێ

حوقەیکی زەڕی سافی لەسەر بانی نرا بێ

نەختێکی بەسەد سەنعەتی مانی قەڵیشا بێ

***

یا ڕەئسی هەتیوێکی کە بێ بەرگ و نەوا بێ

حەیران و سەراسیمە نە داکێک و نە بابێ

فێسێکی سپی توندی لە کەللەی کەلی نابێ

هێشتاکو لە حەق جێکەیی خاسی نەدرا بێ

چەسپیدە و خڕ هەر وەکو بەر قالّبی دابێ

نەختێکی لەبەر سفتیی و توندی قەڵیشا بێ

***

دورجێکی موجەوهەر کە هەموو حوسن و بەها بێ

دوورێکی مونەووەر کە هەموو ئاوی سەفا بێ

بەیزێکی شوتورمورغ کەوا تازە کرا بێ

وەک بەیزەیی بەیزا بەزیا و بەسەنا بێ

خرچەیکی مودەووەر بەعەسەل ئاوی درا بێ

نەختێکی لەبەر حوسن و حەلاوەت قەڵیشا بێ

***

یاخۆ وەکو خۆی شاهیدە بۆ وەسفی وەها بێ

سیمین مەمکێکی تەڕ و تازەی هەڵیدا بێ

یا تازە هەنارێکی کە ناری گوڵی مابێ

بێ درز و قەڵیش میسلی شەمامەیکی تەڵا بێ

بۆ تەجریبە تا لەززەتی شیرینی ئەدا بێ

نەختێکی وەکو دیدەیی دەرزی قەڵیشا بێ

لێرەدا وەکو دەبینرێ هەموو موبالەغەی هونەریی شاعیر بۆ دیارکردنی بچووکی درزی ئەندامی ژنە، بۆ ئەمە گەلێ وێنەی لە سروشت و شتی کە ئادەمزاد بەکاری دێنێ لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا وەرگرتووە. دوا وێنەی لەم بابەتەوە ئەوەیە درزی ئەندامەکە لە بچووکیدا بەکونی دەرزی دەچوێنێ.

لەدوای ئەوەی لە هەڵهێنەکانی دەبێتەوە، نالی دە نیوەدێڕ شیعری دیکە دەخاتە سەر بەندەکان، ئینجا لە وەسفی ئەندامەکە دەبێتەوە بەبێ ئەوەی ناوی بێنێ:

یاخۆ مەسەلا میسلی نەوا بێت و نەوا بێ
مەشهوور و خەفی هەر وەکو عەتقا و وەفا بێ
ساحیب زەڕ و زیوی کە فریبی عوقەلا بێ
ئەکسیری تەڵای ئەحمەری چەند قەترە لە لا بێ
دەعوای ئومەرا چەندی لەسەر تەختی کرا بێ
چەند خوێنی ڕژا بێت و چ خوێنی نەڕژا بێ
کێ بێ لە جیهاندا چ گەدا بێت و چ شا بێ
سمتێکی وەها ناسک و پڕ لەززەتی گا بێ
تەعبیری خەیاڵی خەو ئەگەر بێتە حیسابێ
دەروێش و گەدا شاهە، دەبێ شاه گەدا بێ

لە سەرانسەری ئەم شیعرە نالی وەسفی ئەندامەکە بەزمانی مەستوورە خۆیەوە دەیکا. ئەوی ڕاستی بێ پیاو لە ژن باشتر نهێنییەکانی ئەو ئەندامە دەزانێ، ئەمە یەکێکە لە ئاوڕدانە هونەری و تەڕ دەستییەکانی نالی، جگە لەوەی مەسەلەکە بەخەون دەگێڕێتەوە، بێ گومان ئەمەش بەڵگەیێکی دیکەیە کە نالی بەڕاستی نییە و مەبەسی بنچینەیی دروستکردنی بەرهەمێکی داهێنراوی ئەدەبییە.

ئینجا هەر لە خەوەکە نالی وەرامی مەستوورە دەداتەوە، بەم دوو نیوەدێڕە شیعرە دەست پێ دەکا:

دێوانە کە زانی کە دەبێ عوقدە گوشا بێ
هەستا و گوتی: ئەشکی ڕەوانم بەفیدا بێ

وەسفێکی هونەری بەرزی ئەندامی پیاو دەکا، پێوەندی نێوان هەردوو ئەندام دەردەخا، بەڵام ئەوەندە هەیە لەوانەیە جوانی وەسفەکەی نالی بۆ ئەندامی خۆی شتێکی نیسبی بێ، هەندێ کەس گرژ بکا، مەبەس لە هەندێ کەس پیاوە، ئەگەر نا بۆ چ وەسفی ئەندامی ژن لە لای پیاو جوان بێ، بۆچ دەبێ وەسفی ئەندامی پیاو بەلای ژنەوە جوان نەبێ!

نالی لە وەسفی ئەندامی خۆی و بەزموڕەزمی لەگەڵ ئەوەی مەستوورە دەگاتە لووتکەی داهێنانی ئەدەبی و تابلۆیێکی پڕ لە هونەر دروست دەکا، لەسەر شانۆی چێژی بەرز چیرۆکێکی دیکەی دڵداری دەنوێنێ:

ئەم ساحێبی تەشریحە دەبێ هەیئەتی چا بێ
هەم شاریح و هەم جاریح و موزیحە گوشا بێ
بۆ توند و ڕەقی مەتنی مەتینی حوکەما بێ



تەدقیقی ئەمیش سررە دەبێ خوفیە ئەدا بێ
نەرم و خۆش و مونتیج، وەکو بەستی ئودەبا بێ
توولانیی و بەرجەستە وەکو دەستی دوعا بێ
شەو نائیم و قائیم عەلەمی بابی ڕەزا بێ
بێ دیدە هەڵستێ بەمەسەل عەینی عەسا بێ
مەجزووبی توروق مورتەعیشی لەرزە و تا بێ
ساڵێک ڕەووشی مەسلەکی ڕێگەی سولەحا بێ
چاوێکی هەبێ غەرقەیی فرمێسکی بوکا بێ
فەرقێکی هەبێ داخیلی میحرابی دوعا بێ
ڕێی حورمەت و بێ حورمەتی هەرگیز نەکوتا بێ
چەند ئاوی ڕژا بێت و چ ئاوی نەڕژا بێ
لەم ڕێگە سەریشی کە بچی یەعنی کوژا بێ
گەردەن کەچی بەر پێتە قەدەم ڕەنجە کەسا بێ
تا گەرم ڕەوی قەترەیی زوڵماتی بەقا بێ
مائولخزری قەترە لەسەر قەترە فیدا بێ
کێ بێ وەکو تۆ بەم شەوە ڕەحمی بەمنا بێ
مەجزووبە سیفەت یەعنی سیلەی ڕەحمی تێدا بێ
هەم جازیبە و قابیلەیی ئەخز و عەتا بێ
مەستوورەیی مەخفی شەبەهی بادی سەبا بێ
مەستانە هەڵستێت و بەکوێری روقەبا بێ
ئەم باب زەنە گەرم و تەڕی کا بەکەبابێ

ئەو بەرنامەیەی نالی بۆ ئەم قەسیدەیەی داناوە لێرەدا کۆتایی پێ دێ، لە سەرەتادا کە بەخەون مەسەلەکە دەگێڕێتەوە جۆرە هونەرێکی نالییانەی بەکار هێناوە کە تەنیا لەخۆی دێ، کەچی ئەوەی چاوەنۆڕ نەکراوە ئەوەیە شاعیر بەمە کۆتایی بەقەسیدەکەی ناهێنێ، بەڵکو بەم چوار نیوە دێڕ شیعرە:

(نالی) وەرە هەزلێکی کە عاری شوعەرا بێ
ڕوو ڕەش مەکە پێی سەفحەیی هیچ لەوح و کیتابێ
وا چاکە خەیاڵت لەگەڵ ئەسراری هودا بێ
نەک بەحسی سروور و عەلەمی بادی هەوا بێ

نالی لەم چەند دێڕەدا لە کردەوەکانی یا خەونەکەی کە بەمەستوورەوە دیوبەتی پەشیمان بۆتەوە، بەڵام لە بەرهەمی ئەدەبیدا پەشیمانی نییە، چونکە لە ڕووی هونەرییەوە شیعرێکی بەرزە، بێ گومان لە لای نالی ئەمە گرنگە، چونکە ئەگەر بەرز نەبووایە بڵاوی نەدەکردەوە، پەشیمانییەکەی لەوەیە لابردنی ئەو پەردەیە لە ڕووی ئایینی یا کۆمەڵایەتییەوە ڕەنگە بەجێ نەبن، لەبەر ئەوە ناچار بووە بەم دێرانە پاکانە بکا.

لەگەڵ ئەوەشدا نالی لە کۆمەڵ گەیشتووە، ئەمەی لەبەر ئەوە بووە چونکە زانیویەتی کاری وا لە کۆمەڵدا هەیە، بەزمان دەتوانرێ بوترێ، بەڵام بەقەڵەم نابێ بنووسرێ، پیاو دەتوانێ لەگەڵ ژندا بەتەنیا بن هەموو شتێکی لێ بکا، بەڵام ئەگەرهاتوو هونەروەرێک باسی ئەندامی مێیینەی بکا، ئەمەیان شەرمە، لەبەر ئەوەیە نالی وەکو شاعیر و هونەروەرێک باسی لێوە کردووە، وەکو ئادەمزادێکی ڕەوشت پاکیش پۆزشی بۆ ئەو کەسانە هێناوەتەوە بەرهەمی ئەدەبی کراوەیان پێ جوان نییە.

## پاسەوانی تایبەتیی پاشا لە سوپای میرنشیندا

ئەم پارچە شیعرە لە ئەدەبی کوردیدا بە(تاقمە مومتازەکەی نالی) ناوی دەرکردووە. ماوەیێکی زۆر لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا وا باو بوو؛ گۆیا ئەم وەسفە جوانەی نالی بۆ کۆمەڵە کەناچەیێکی نازەنینی شارەزووری لە بەهاری ڕەنگیندا لە سەیرانی ناو گوڵ و گوڵزاردا وتراوە، ئەو پەریزادە ناسک و بەدەوانە زۆربەی کاتی سەیرانیان بەشایی و هەڵپەڕکێ بردۆتە سەر، کەچی لە ساڵی ١٩٢٠دا ئەمین فەیزی لە کتێبی (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد) وتوویەتی: ئەو تاقمە مومتازە عەسکەری حوکوومەتی بابانە کە لە زەمانی ئەحمەد پاشادا تەنزیم و تەنسیق کراون.

بەئاسانی دەتوانرێ بیر لەوە بکرێتەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان نالی بەپیاسە لە گۆڕەپانی پشت مزگەوتی گەورەی سلێمانی کە ئۆردووی سوپای میرنشینی لێ بووە لە گەشتوگوزار دەبێ، لەو کاتەدا ئەو تیپەی پاسەوانی تایبەتیی پاشایە لە سوپای میرنشیندا خەریکی مەشقی عەسکەری دەبن.

ئەم تیپە سوپاییە جلوبەرگی تایبەتی خۆیانیان بووە، جیا بووە لە جلوبەرگی سەربازی ئاسایی، هەر پارچەیێکی ئەم جلە ڕەنگی تایبەتیی خۆی بووە، قۆپچە و نیشانی کڵاو و سەرشان و سنگ و بەریان تایبەتی بووە، هەروەها ئەو لاوانەی بۆ ئەم کارە هەڵدەبژێرران بەژنوباڵایان نە کورت و نە درێژ وەکو یەک بووە، بەڕوخسار جوان و بەقیافەت ڕێکوپێک بوون.

نالی لە کاتی مەشقکردندا چاوی بەم کۆمەڵە لاوە دەکەوێ، دیمەن دەبێتە سەرچاوەی ئیلهام، بۆ ئەم شیعرەی لە سەرەتاوە تا دوایی وەسفی مەشقە سوپاییەکەیە ئەو تیپە تایبەتییە کردوویانە. شاعیر گەلێ وێنەی لە بزووتنەوەی سروشت وەرگرتووە بۆ نووسینەوەی شیعرەکە:

ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاسسەیی شاهن
ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن



سەف سەف کە دەوەستن بەنەزەر خەتتی شوعاعن
خەلقەکە دەبەستن وەکو خەرمانەیی ماهن
نێرگس نیگەهـ و ساقە سەمەن کورتە وەنەوشەن
موو سونبول و ڕوومەت گوڵ و هەم لالە کولاهن
گوڵزاری دەرودەشتن و غیلمانی بەهەشتن
ئاهوو سەف و ئاتەش بەکەف و تیز نیگاهن

ئەم کۆمەڵە سەربازەی پاسەوانی تایبەتیی پاشان، گەورەترین و لە ڕووترین بەشەکانی سوپای میرنشین بوون، هەر مەترسییێک لە ستایشی دەوڵەت بووایە ئەمانە دەبوونە لابردنی ئاشووب و تەنگوچەڵەمەی ناو کۆمەڵ.

ئەم سەربازانە کە لەتەک یەکتری بەڕێز دەوەستان لە کاتی مەشقکردندا هێڵێکی ڕووناکییان دروست دەکرد، بەدەموچاوی جوان و بەشەوقیان وەکو کەسانێکی فانۆسیان بەدەستەوە بێ دەکەوتنە بەرچاو. لە کاتی مەشقی عەسکەریدا کە حەلقەیان دەبەست وەکو خەرمانە دەبینران لە دەوری مانگدا. ڕەنگە مانگەکە ئەو سەربازە یا ئەفسەرە بێ کە مەشقی پێیان دەکرد. ئینجا لە جوانیدا ئەندام و جلوبەرگی سەربازەکان وەسف دەکا، چاویان بەنێرگس و باڵایان بەسەمەن و چاکەتیان بەڕەنگی بنەوشەیی و موویان بەسونبول و ڕوومەتیان بەگوڵ و کڵاویان (فێسیان) بەسووری گوڵاڵەیی دەچوێنێ. هەروەها ئەم تیپە لاوە بەجلی ئاڵوواڵایان گوڵستانی هەموو دەرودەشتێکن و غیلمانی بەهەشتن. کە ڕیز دەگرن وەکو ڕیزی مامزن، تفەنگ و شەشاگریان بەدەستەوەیە، چاویان تیژ دەنوارێ و هەمیشە هوشیارن.

نالی لەسەر وەسفەکەی دەڕوا و دەڵێ:

سەحرا بەتەجللا دەکەنە وادیی ئەیمەن
قامەت شەجەر و مەزهەری ئەنواری ئیلاهن
لالەن بەبەدەن ئەتلەسی ئەخزەر کە لەبەرکەن
نەورەستە گوڵی بەستە لەگەڵ دەستە گیاهن
گەهـ تاووس و گەهـ کەبکن و گەهـ بووقەلەموونن
گەهـ ئاتەش و گەهـ شوعلە و گەهـ دوودی سیاهن

لەم دێڕەشیعرانەدا نالی بەچاوێکی ئەوەندە بەرز تەماشای ئەو سەربازانە دەکا و، دەڵێ دەرکەوتنی ئەوان هەموو سەحرا وەک (وادی ئەیمەن)ی لێ دێ، ئەو شیوەی لە شاخی توورسینا (حۆریب) نووری خودا کەوتە بەرچاوی مووسا لەو کاتەی لە دیالۆجیکدا هەزار و یەک وشەکەی لەگەڵ کردگاردا دەکرد. نالی کە دەڵێ باڵای سەربازەکان ڕێکە وەک درەخت، مەبەسی ئەو درەختەیە کە لە نزیک ئەوەوە مووسا قسەی لەگەڵ کردگاردا دەکرد.

شاعیر دریژە بەوەسفی دەدا و دەڵێ، پێستی لەشی سەربازەکان سوورە وەک لالە، چاکەتیان لە قوماشی ئەتلەسی سەوزە، وەکو دەستە گوڵێکن بەگیای سەوز پێچراونەتەوە، واتە لەشیان بەرەنگ سوورە، بەچاکەتی وەک گیای سەوز داپۆشراون. مەشقی سەربازەکان و بزووتنەوەی وەرزیینییان وەک ڕەوتی تاووس و کەو و بووقەلەموونن (عەلی شیشن)، هەروەها لەم بزووتنەوانەدا وەک ئاگر و بڵێسە و دوکەڵی ڕەش دەکەونە بەرچاو.

نالی بەم دێڕانە دوایی بەشیعرەکە دێنێ:

تەنهایی سەمەن بەرگی وەنەوشە کە دپۆشن

وەک نووری دڵی موئمین و زوڵماتی گوناهن

بۆ سەیری خەرامیدەنی ئەم سەروو قەدانە

سۆفی لە تەڵەب دان و هەموو سالیکی ڕاهن

بۆ زولف و روخ و پەرچەم و ئەبرۆیی سیایان

عالەم وەکوو (نالی) هەموو با ناڵەو و ئاهن

لەشی سەربازەکان وەک یاسەمینە کە جلوبەرگی وەنەوشەیی دەپۆشن، ڕەنگی کاڵ و تێر وەک ڕووناکی خوداناسی و تاریکستانی گوناهکارانن. نالی دەڵێ بۆ تەماشاکردنی مەشقی ئەم سەربازانەی ناوقەدیان وەک سەروو وایە لە هەڵبەزین و دابەزینی وەرزینییان ئەوەندە جوان و ڕێکوپێکن سۆفییان خستۆتە حاڵ و ڕێی ڕاستیان گرتۆتە بەر. لە دواییدا دەڵێ بەرامبەر بەزولف و ڕوومەت و پەرچەم و ئەبرۆی ڕەشیان هەموو گێتی وەکو نالی گەشکەبوون و کەوتوونەتە هەڵکێشانی ئاه و ناڵە.

## کەرەکەی نالی

گوێدرێژ وەک ئاژەڵێکی گیانلەبەری ماڵی کەڵکی بۆ ئادەمزاد زۆرە، لە ڕووی هەڵسوکەوت و ڕەوشتەوە خاسیەتی تایبەتیی خۆی هەیە، ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی بیرورا و بۆچوونی زۆر و جیاواز لە قالبێکی دانایی و فەلسەفیدا بەرامبەر بەکەر دروست ببێ. لە مێژووی کۆنی ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتدا ناوی کەر هاتووە، لە شیعری دانایی و سۆفیزم و فەلسەفیدا کەر بووە بەسەرچاوە بۆ وێنەی گەلێ بەرز لە شیعردا، ئێستاش لە هەموو گێتیدا باس لە کەر دەکرێ وەکو دیاردەییێکی کۆمەڵایەتی.

زۆرجار لەناو خەڵک ناوی ڕێکخراوی کەران، یا حیزبی کەران دێ و هەندێ کەس بەناوی ژیری و فیکر و دانایی لاری لەوە نییە ئەندامی ئەم ڕێکخراوە وەهمییە بێ. لایەنە بەکەڵکەکانی کەر بۆتە هۆی ئەوەی هەندێ کەسی گەورە لە کۆمەڵدا بەچاوێکی فەلسەفی تەماشای مەسەلەکە بکەن، هەروەها لەبەر ئەمەشە نالی ئەم شیعرە بەرزەی بۆ کەر نووسیوە.

شاعیر کە لە ئادەمزادی دڵسۆز و بەهۆش دەدوێ، لەسەر ئەو باوەڕەیە ئادەمزادی خراپ و بەدکرداریش هەیە، لەبەر ئەوەیە ئەوانەشی لە بیر نەکردووە، دیارە مەرجیش نییە ئەم بێ کەڵکانە تەنیا سۆفی و دەرویش بن. نالی لێرەدا کەری کردووە بەڕەمزی کار و وەفا لەگەڵ ئادەمزادی بێ کار بەراووردی دەکا.



ڕاستە کەر جانەوەری بێ فیکرە و ئادەمزاد خاوەنی هۆش و فیکرە، بەڵام ئەو بێ هۆشە کەڵکی بۆ کۆمەڵ هەیە، هەندێ لەو خاوەن هۆشانە کە ئادەمزادن نەوەکو تەنیا بێ کەڵکن، بەڵکو زیانیشیان هەیە، لەبەر ئەوەیە لەلای نالی تای تەرازووی کەرەکە لە هی ئادەمزادەکە قورسترە.

لە بۆچوونی نالی لەم لایەنەوە و تەرخانکردنی قەسیدەییێک بۆ وەسفی چاکەی کەر لەوانەیە بیر لەوە بکرێتەوە لەو کاتەدا نالی خۆی لە بیر کردووە و لە دۆخی خۆی چۆتە دەرەوە، چونکە شاعیرێکی لووت بەرزی فیز زلی وەک ئەو کەسی لە خۆی گەورەتر نەدۆزیوەتەوە چۆن کەوتۆتە هەوەسی ئەوەی بەم جۆرە بیر لە کەر بکاتەوە. لێرەدا مەبەس ئەوە نییە هەندێ کەس بۆچوونی نالی لەم لایەنەوە بەگاڵتەوگەپ بزانن، چونکە کرداری وا لە شان و شکۆی شاعیر ناوەشێتەوە.

نالی بەڕاستی مەبەسی ئەوە نییە مەدحی کەر بکا، چونکە کەر لە ڕووی بیرەوە لە پلەی ئادەمزاددا نییە، بەڵکو بەستەزمانێکە کەس ڕازی نابێ بەو بێ، بەڵام کەڵکی هەیە بۆ ئادەمزاد، نالی وەستایانە باس لەو ئادەمزادە بێ کەڵکانە دەکا، کە بەراووردیان دەکا لەگەڵ کەر، کەر لەوان بەکەڵکتر دادەنێ.

نالی نیوەی زیاتری شیعرەکەی بۆ وەسفی ڕووکەشی کەرەکە تەرخان کردووە. بەمەبەسی لێکۆڵینەوە دەکرێ بوترێ وەسفێکی فۆتۆگرافییە، ئەگەر نا وەسفەکەی نالی ڕاستی تێدایە، بەڵام ئەو ڕاستییەی خستۆتە ناو وێنەییێکی داهێنانی شیعرییەوە:

هەر کەرێکم بوو چ پەیکەر تەی کەری هەوراز و لێژ

سینە پان و مووچە کورت و شانە بەرز و گوێ درێژ

بن زگ و جەبهەت سپی کلک بژ و دامەن سیاه

یەک کەناس و سێ بڕ و دوو باد و شەش دانگ و درێژ

کەللە وەک جەررەی شەراب و پڕ نەشات و تەڕ دەماغ

شێری نەڕ، ئاهوویی بەڕ، گورگی سەفەر قەمچی نەچێژ

مل عەلەم، شیرین قەلەم، ئاهووشکەم مەیموون قەدەم

سم خڕ و کلک ئێستر و مەنزل بڕ و عارەق نەڕێژ

زەرق و زەرراقی وەکوو خاکستەر ئەمما بێ غوبار

بەرق و بەرراقی وەکوو پیرۆزە ئەمما بێ کرێژ

سم وەکوو یەشم و لە پەشمی تووکی پێ دا سەرنگوون

چاو وەکوو بیجادە یا دوو شەوچراغی شوعلە ڕێژ

لە وەسفی نالی بۆ کەرەکەی وا دەکەوێتە بەرچاو پەیکەرێکی بەکارە، ڕێگەی هەوراز و لێژ دەبڕێ، سنگی پان و دوو پێی پێشەوەی (دوو دەستی) کورت و شانی بەرز و گوێی درێژە. بن زگ و نێوچەوانی سپییە، کلکی تووکن و زبر و بەهێزە، سەروسمی هەر چوار پەلی ڕەشن. کەرێکە تەنیا خاوەنی دەناسی،

هەروەها ئەوەی ئالیکیشی دەداتێ. سێ برە، واتە تەمەنی سێ ساڵانە، تێکسمراو و قەڵەوە، شتێکی تەواو بێ کەموکوڕییە. کەللەی وەک کووپەی شەرابە، مێشکی تەڕ و بەکارە، لە چاپووکیدا وەکو شێری نێر و ئاسکی بیابانی و گورگی سەفەر وایە، ئەوەندە خۆشڕەوە پێویست بەئاژۆتن ناکا. ملی بەرزە وەک بەیداغ، ئەدگاری ڕێکوپێکە، ناوقەدی مامزییە، پێ بەخێر و بەرەکەتە، سمی خڕە، کلکی تووکن و گەورەیە وەک ئەوەی ئێستر، ڕێگەی دوور دەبڕێ و ماندوو نابێ.

شاعیر لە باسی ڕەنگی کەرەکە دەڵێ ڕەنگی شینی خۆڵەمێشی بوو، غوباری پێوە نەبوو، بۆیە وەکو پیرۆزە دەبریسکایەوە و بێ گرێژ بوو. سمی وەک ئەو بەردە بەنرخە بوو کە یەشمی پێ دەڵێن، لەناو تووکی پێیدا بزر بووبوو، چاوی وەک یاقووت یا دوو شەوچراغی ڕووناکی بژێن بوون.

ئینجا شاعیر دێتە سەر وەسفی کردەوەکانی کەرەکە:

گوێ درێژی بار و کورتان، بەرز و پالانی بەزێن
چوست و وریاتر لە گوێ کورتانی پالانیی و گێژ
قانیعی بابی ڕەزا و ڕازی بەپووش و دڕک و داڵ
ساڵێکی سەبر و تەحەممول بورد بار و هیچ نەوێژ
سائیمودەهری بەڕۆژ ئەمما بەڕۆژووی بێ نیەت
قائیمولەیلی سولووک ئەمما سولووکی بێ نوێژ
عاقڵێ بوو ناو کەر بوو قاتیعی ڕێگە و سەفەر
خۆش سولووکتر بوو لە سەد ئینسانی هەرزە و گێژوویژ

ئەو گوێدرێژەی کەری باری پێ دەووترێ، بەرزەیە، کورتان بەزێنە، گەلێ چوست و چالاکتر و وریاتره لەو گوێ کورتانەی خەڵکی ناو عەشرەتەکانی پالانی و گێژ. ئەمانە دوو عەشرەتی کوردن لە هۆزی گۆران.

کەرەکەی نالی بەبەشی خۆی ڕازییە لە پووشوپەلاش و ئەو دڕکودالەی دەیدرێتێ، ڕێگەی سەبر و تەحەمولی گرتووە، بەبێ دەنگ باری خۆی هەڵدەگرێ. کەرەکە هەمیشە بەڕۆژووە، بەڵام نیەتی نەهێناوە، بەشەو نانوێ، ئەگەر شەونخوونی ڕەوشتی سۆفیان بێ، بەڵام لای کەر سلوکێکی بێ نوێژە.

لووتکەی داهێنانی نالی لە دێڕی دوایی ئەم شیعرەدایە:

هێندە پێم خۆش بوو زمانی حاڵی دەیگوت (نالی)یا!
هەردوو حەیوانین ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ

کەرەکەی نالی لە سەرەتای شیعرەکەوە، بێ دەنگ بووە و ورتەی لێ نەهاتووە، لەپاش ئەوەی شاعیر لە وەسفەکانی دەبێتەوە، کەر وەرامی دەداتەوە و دەڵێ: هەردووکمان ئاژەڵێن، تەنیا ئەوە هەیە تۆ گوێت کورتە، منیش گوێم درێژە.



## دَرُونـي لِدارِ الشارَزُورِ

نالی بەئانقەست ئەم شیعرەی داناوە، لێکدانەوەیێکی ئەندازیاری بەکارهێناوە بۆ هۆنینەوەی، ویستوویەتی شارەزایی خۆی لە شیعر داناندا بخاتە ڕوو. شیعرەکە هەرچەندە دەسکردە، بەڵام لە ڕووی هونەرییەوە لە داهێنراوە بەرزەکانە، زمانی ئەم شیعرە زمانێکی تێکەڵاوی عەرەبی و کوردییە، ئەوەی ئاشکرایە ئەم دوو زمانە لە بنج و بناوان و بنیادی دەستووری زمان، وەک ئاسمان و ڕیسمان لە یەکتری دوورن. جگە لەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتیشدا زمانێک دروست نەبووە لە کوردی و عەرەبی پێک هاتبێ و خەڵکی قسەی پێ بکەن و پێی بنووسن.

نالی ئەم شیعرەی لەسەر دەستووری زمانی عەرەبی داناوە، تەنیا ئەوە هەیە وشەی کوردی تێیدا بەکار هێناوە بەپێی زانستی ڕێزمانی عەرەبی، لەبەر ئەوە بەهەموو جۆرێک پێویستە شیعرەکە بەئیملای عەرەبی بنووسرێتەوە و سەروژێری بۆ بکرێ، هەروەها دەکرێ بەئیملای کوردیش بنووسرێتەوە بۆ ئەو کوردانەی عەرەبی نازانن.

پارچە شیعرەکە بەئیملای عەرەبی:

دَرُونـيِ لِدارِ الشـارَزورِ وَ بَـرْدِهِ
كَـفـرمـيـسكِ گـرْمٍ إلى آوِ سَـردِهِ
تَرى وَرِدَهُ قـوتـاً وَ جُـوتـاً وَ سـايقـاً
فَـيـاقُـوتتيِ مِنْ جُـوتِـهِ ثُمَّ فَـردِهِ
تَرى عِـينةَ الأبدانِ مِنْ خـاكـوخـولِه
تَرى مَنْدَلَ الأوْراقِ مِنْ توز و گـرْدِهِ
تَرى دَشْـتَـةً بالوَرِدِ كـانَتْ بَهَشْـتَـةً
نَمُ الـوردِ بارانٌ عـلى خـاكُ و بَرْدِهِ
شَوانيِ سُلَيْمانيِ، صَبَاى پيرمَسُوركَيْ
كِـواني قَـرَداغُ، هَـواى دارِ زَرْدِهِ
كَـأنَّ كَنارُ أرْضِـهِ آسـمـانَـةٌ
لِبَـرْزيٍّ دُوريٍّ، لِسَـبْـزيٍّ عَـرْدِهِ
أَمّـا سَـرچنارُ عَـيْنٌ جـارِيةٌ لَـهُ
أمّـا تانجـرو قَـدْ صـارَ مَـجْنُونَ هَرْدِهِ
فَـبـاغـاتهُ داغـاتُ جَـرْگَ الشـقـايقِ
فَـوا دَرْدَتي مِنْ خـارِ خـارٍ لِوِرْدِهِ

وكَمْ نالَ (نالي) مَنْ شَفا ساقيانه
شِفا هَلْ شَفا مَنْ نالَ (نالي) بِدَرْدِهِ

ئەم شیعرە عەرەبی و کوردی ئامێزە بەئیملای کوردی:

دەروونی لیداریلشارەزووری وە بەردیهی
کە فرمێسکی گەرمین ئیلا ئاوی سەردیهی
تەرا وەردەهو قووتەن وە جووتەن وە سایقەن
فەیاقووتەتی مین جووتە سومە فەردیهی
تەرا عینەتەلئەبدانی مین خاکوخۆلیهی
تەرا مەندەلەلئەوراقی مین توز و گەردیهی
تەرا دەشتەتەن بیلوەردی کانەت بەهەشتەتەن
نەمولوەردی بارانون عەلا خاک و بەردیهی
شەوانی سلێمانی، سەبای پیر مەسوورەکەی
کیوانی قەرەداغ و هەوای داری زەردیهی
کەئەننە کەنار و ئەرزیهی ئاسمانەتون
لیبەرزییی دوورییی لبسەبزییی عەردیهی
ئەمما سەرچنار و عەینون جارییەتون لەهو
ئەمما تانجەرۆ قەد سارە مەجنوونە هەردیهی
فەباغاتوهو داغاتو جەرگیلشەقاییقی
فەوا دەردەتی مین خاری خارین لیوەردیهی
وەکەم ناله (نالی) مەن شەفا ساقیانیهی
شیفا هەل شەفامەن ناله (نالی) بیدەردیهی

***

نالی یەکەمین گەورە شاعیری کورد بوو لە کوردستانی باشووردا هونەری غەزەل و قەسیدەی ئەدەبی ئیسلامەوی هێنایە ناو مەیدانی ڕۆشنبیری کوردییەوە. لەسەر دەستی ئەو رینیسانسی ئەدەبی کوردی لە سەدەی نۆزدەم لە سلێمانی هەڵگیرسا و بەڕاستی بووە داهێنەر و نوێنەری قوتابخانەی ئەدەبی کوردی لە سەرانسەری کوردستانی باشوور لە ناوچەکانی بابان و ئەردەڵان و موکریان و سۆران و گەرمیان. لەو دوو سەدەی دواییەدا هەموو پەرەسەندن و پێشکەوتن و گۆڕانێکی ئەدەبی کوردی لەسەر بنج و بناوانی قوتابخانەی نالی بووە.



نالی شاعیری دروستکردن و خوڵقاندنە، شاعیری مانایە، شیعری ئەو داهێنانێکە، لە ئەنجامی بیری زانایێکەوە هاتووە و،زاڵ بووە بەسەر زانین و زانیاری شارستانیەتی ڕۆژهەڵات لە سەدەی نۆزدەمدا. شاعیر زانیاریی بەوشکی وەرنەگرتووە، لە حەقیقەتی زانستی واقیعەوە گواستوویەتییە خەیاڵی ڕەمزی شاعیرییەوە. بیری تیژی بەتوانا بووە بۆ دۆزینەوەی وێنەی مەتریالی لە سروشتدا لە پێناوی بەراوورکردن و دروستکردنی وێنەی نوێی شیعری لە ئەدەبی کوردیدا.

لە هەموو بەرهەمی شیعری نالیدا لەنگییێکی کێش و مۆسیقا و ڕیتم و قافیە بەدی ناکرێ. لە ڕووی ئەندازیارییەوە کەموکوڕی تێدا نییە. بایەخێکی زۆری بەڕەوانبێژی شیعری ئیسلامەوی داوە، لەبەر ئەوە شیعری نالی بۆ وەرگێڕان بۆ زمانێکی دیکە دەست نادەن، بەوەی مانای ڕاستی خۆیان بەدەستەوە نادەن، بەڵام مانای نوێ دروست دەکەن.

شاعیر شارەزای دیالێکتە گەورە و بچووکەکانی زمانی کوردی بووە، لە هەندێ جێ لە شیعرەکانیدا وشە و تەعبیری ئەو دیالێکتانەی بەکار هێناوە، لە دیالێکتەکەی خۆی کە کرمانجیی خوارووە ڕێبازێکی زانستی دۆزیوەتەوە بۆ هەرەوەزی لەنێوان دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی.

نالی شارەزایی تەواوی لە ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەواری بووە، بەتایبەتی مەڵبەندی منداڵی و مێردمنداڵی خۆی، ناوچەکانی شارەزوور و قەرەداغ و سلێمانی، ئەمە ڕەنگی لە بەرهەمی شیعری داوەتەوە. شاعیر هۆگری نیشتمانی بچووکی بووە، یا ماڵی بچووکی خاک و خۆڵ و هەموو شارەزوور و، ئەو جێیانەی کوردستان کە لە شیعریدا ناویان هاتووە بوون بەڕەمزی نیشتمانپەروەری شاعیر و لە قەوارەی کوردستان وێنەی ئەم نیشتمانپەروەرییە ڕەنگڕێژ بووە.

شیعری نالی تەنیا لە ڕووی جوانکارییەوە نرخی گران نییە، بەڵکو لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە دەبێتە سەرچاوەییێکی گرنگ بۆ لێکۆڵینەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ناوچەی سلێمانی.

شاعیر لە ئەدەبی کراوە (ئیرابیت، مەکشووف)دا پسپۆڕێکی گەورە بووە. خەونەکەی لەمەڕ مەستوورە دیار و ئاشکرایە، کەچی لە سەرانسەری دیوانیدا ئاوڕدانەوەی شاعیر زۆرە بۆ لای ئەم جۆرە مەبەسەی شیعر، بەڵام بەشێوازێکی سیمبۆلی پڕ لە تەمومژ و نادیاری بۆ مەسەلەکە چووە و دیارە هەموو کەسێک دەرکی پێ ناکا و ناتوانێ تەلیسمی جادووەکانی شاعیر بشکێنێ.

ئەم شاعیرە بەرزە هەندێ شیعری تا ئێستاش بەداخراوی ماونەتەوە، مشتومڕیان لەسەرە و بۆ کەس ساغ نەکراونەتەوە. ئەگەر کەسێک هەبێ بڵێ بەرهەمێکی داخراو ئەگەر کەس تێی نەگا سوودی چییە؟ وەرامی ئەم پرسیارە ئەوەیە، سوودی هەیە، چونکە یەکێکی وەکو نالی شیعرێک ناڵێ بێ مانا بێ. ئەمە لەلاییێک، لە لاییێکی دیکەوە شاعیر نەوەکانی پاش خۆی تاقی دەکاتەوە، شیعری قورس و داخراو و مانا تەماوییان بۆ دادەنێ، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە. بێ گومان بیرکردنەوە لە شتی قورسدا دەبێ، لە شتی ئاساندا نابێ، بەبیرکردنەوە مرۆڤ پێش دەکەوێ. لەبەر ئەوەیە نالی بەئانقەست شیعری قورسی وتووە. هەندێ جاریش بێ گومان هەڵەی نووسین لە شیعری نالیدا بۆتە هۆی قورسی شیعرەکان، ئەمە لە دەسنووسە زۆرەکانی دیوانی شیعریدا دەردەکەوێ کە لە هەموو شتێکدا وەک یەک نین.

شیعری نالی وەک گێتیی دڵداری و فەلسەفە و سۆفیزم وایە، ئەگەر بمانەوێ لە هەموو کون و کەلەبەرێکی ئەم دیاردە گیانی و مەتریالییانە بگەین ڕەنگە ئەو ڕەونەقەیان نەمێنێ.

هەرچۆنێ بێ، خدری کوڕی ئەحمەد شاوەیسی ئالی بەگی مکاییلی شارەزووری ناسراو بە(نالی) یەکێکە لە گەورە شاعیرانی ئەدەبی میللەتی کورد کە شانازی بەتەمەنی هەزار ساڵەیەوە دەکرێ. خاک و خۆڵ و قەرەداغ و سلێمانی و شارەزوور و هەموو کوردستان پێی خەنی دەبن.

## بەشی نۆیەم

## سالم ١٨٠٥-١٨٦٩

# ژیان و شیعری سالم

### ژیانی شاعیر

سالم نازناوی شیعری عەبدولڕەحمان بەگی کوڕی محەمەد بەگی قەرەجەهەنەمی کوڕی ئەحمەد بەگە، لە بنەماڵەی ساحێبقڕانە، لە ساڵی ١٨٠٥م لە سلێمانی لەدایکبووە، بنەماڵەی قەرەجەهەنەم بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ کوردستانی ئێران، کەچی بنەماڵەی ساحێبقڕان لە چەکمەڕەقەکانی ناوچەی سلێمانین، لەگەڵ بناغە لێدانی شاری سلێمانی بوون بەدانیشتووی ئەم شارە تازەیە.

ئەم بنەماڵەیە تەنیا ناوی بەلاوچاکی و چەکمەڕەقی دەرنەکردووە، بەڵکو لە سەدەی نۆزدەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم سێ شاعیری گەورەی پێشکێش بەمیللەتی کورد کردووە جگە لە سالم، مستەفا بەگی کوردی ئامۆزای و ئەحمەد حەمدی بەگ لە بنەماڵەی ساحێبقڕانن.

سالم وەکو هەموو خوێندەوارانی سەردەمی خۆی، لە حوجرە خوێندوویەتی، بەڵام خوێندنی تەواو نەکردووە، ئەمە لەبەر ئەوە بووە یا نەیویستووە ببێ بەمەلا، چونکە لەگەڵ پلەی کۆمەڵایەتی بنەماڵەی نەگونجاوە، یا لەبەر ئەوەی بابوباپیرانی مەلا زادە نەبوون بۆ ئەوەی جێ ئەوان بگرێتەوە.

شاعیر بەلەش لەڕولاواز بووە، بەدرێژایی ژیانی نەخۆش بووە و ساغی بەخۆیەوە نەدیوە، لەبەر ئەوە لە سەرەتای هەڵقوولانی شەپۆلی شیعر لە دڵ و دەروونیدا کە هێشتا لاو بووە نازناوی (بیمار)ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، بەڵام لە دواییدا وەک نوقلانەیێک پێچەوانەی ئەم نازناوەی هەڵبژاردووە و کردوویەتی بە(سالم) بەواتای لەش ساغ. جگە لەوە شیعری هەیە بەناوی (ڕەنجوور)یشەوە بلاو کراوەتەوە.

تەنگوچەڵەمە و کوێرەوەری و سیاسەتی ڕۆژانەی نالەبار و شێوانی شیرازەی کۆمەڵی ناوچەی سلێمانی بەڕوونی لە ژیان و شیعری سالم ڕەنگیان داوەتەوە. شاعیر ئاسوودەیی و ژیانی هێمنی بەخۆیەوە نەدیوە، لە شوێنێکدا ئۆقرەی نەگرتووە، لەبەر ئەوە هاتوچۆی وڵاتی ئێران و کوردستانی ئێرانی زۆر بووە، ئەمە لەبەر ئەوە بووە خزم و کەسوکاری ئێرانی داڵدەیان داوە، لەو کاتانەی بەر دەستدرێژی و زۆرداری تورکی عوسمانی کەوتووە.

شاعیر لە ماوەی ئاوارەبوونی لە وڵاتی ئێران و دوورکەوتنەوەی لە کوردستان تووشی ڕەشبینی و نەخۆشی سایکۆلۆجی بوو، بەتایبەتی لەدوای ڕووخانی میرنشین زیاتر ئازار و تاڵی ژیانی مەینەتی چێشتبوو، لەبەر ئەوەیە لە شیعرێکیدا دەڵێ:

خۆزگە دەمزانی لە تارانا نەجاتم کەی دەبێ

کۆیێ یارم مەشهەدە یا مەنزلم هەر ڕەی دەبێ



دیسان بۆ ئەم مەبەسە لە شیعرێکی دیکەیدا دەڵێ:

لەگەڵ دڵ شەرتە (سالم) گەر نەجاتم بێ لە تارانا

بەهەشت ئەر بێتە دەشتی ڕەی بەئێرانا گوزەر ناکەم

سالم تەنیا ژیانی ئاوارەیی لە ئێرانا بەخۆیەوە نەدیوە، بەڵکو بەر ئاوارەیی وڵاتانی عەرەبیش کەوتووە. لەدوای داگیرکردنی سلێمانی لە لایەن دەسەڵاتی عوسمانییەوە شاعیر ئازارێکی زۆری چێشتووە، بەوەی ئاوارە کراوە یا وەکو مووچەخۆرێک دوور خراوەتەوە بۆ شاری حیللە، ماوەیێک لەوێ بە نالەباری ژیانی بردۆتە سەر، مەگەر لە خەوندا دیمەنە جوانەکانی کوردستانی دیبێ. لە کۆتایی دەست بەسەرییەکەی دەگەڕێتەوە شاری سلێمانی، بەڵام لەباتی ئەوەی هیوای دوارۆژی نەتەوەکەی بەزەردەخەنەوە لێی نزیک ببێتەوە بەپێچەوانەوە ئەم هیوایە هەر هاتووە و لێی دوورکەوتۆتەوە، چونکە تورکی عوسمانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەسەڵاتیان بەهێزتر کردووە بۆ سەر ئەم ناوچەیە. زمانی تورکی بۆتە میراتگری زمانی کوردی، بیرۆکراتیەتی مووچەخۆری تورک فەرمانڕەوایی ئەم ناوچەیەی کردووە تا سەرەتای سەدەی بیستەم.

لە بەرهەمی سالمدا وەکو هەندێ لە شاعیرانی دیکەی کورد دلبەر و خۆشەویست و مەعشووقە و، بووکی شیعر وەک کەسێکی دیاریکراو بەدی ناکرێ. بێ گومان ئەمە ئەوە ناگەیەنی کە نەیبووە. لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا ئەوە باوە گۆیا بەهێ ناوێک دلبەری شاعیر بووە و بۆتە ئیلهام و شیعری دڵداری پێ بەخشیوە، بەڵام لە شیعری سالمدا هەست بەئەدگاری ئەو کچە ناکرێ. بەڕاستیبوونی ئەو بەهێیە ئاساییە، چونکە زۆربەی شیعری سالم بۆ خۆشەویستێک وتراوە مێیینەیە.

دەوروبەری ڕووخانی میرنشینی بابان سەردەمی لاویەتی بوو لە ژیانی شاعیردا. لەم ماوەیەدا بەشی زۆری شیعر بۆ کارەساتی لە دەستچوونی دەسەڵاتی سەربەخۆی میرنشینی بابان بوو. بەڕاستی دەکرێ سالم بەگەورەترین شاعیر بژمێررێ لە ڕووی ئەوەی ژیانی ناوچەی سلێمانی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمدا لە شیعری ئەودا ڕەنگی داوەتەوە.

بەشی زۆری ژیانی سالم لە سەردەمی سەربەخۆیی میرنشینی بابان بوو، تاڵی و شیرینی ئەو ژیانەی چێشتبوو، بەڵام ماوەی ژیانی شاعیر لەدوای ڕووخانی میرنشین کەمتر بوو. بەزۆری دەربەدەری و ئاوارەیی لە دەرەوەی کوردستان لەو ڕۆژگارە نالەبارەدا بوو. ئیتر هەموو مەینەتی و ناسۆری ژیانی لەگەڵ خۆیدا بردە ناو گۆڕەوە و لە ساڵی ١٨٦٩م لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژرا.

### شیعری سالم

ئەگەر نالی بەمامۆستای وشەی کوردی و دۆزەرەوەی هەستونەستی خەیاڵی کەسایەتی ئادەمزاد دابنێین، بێ گومان سالم ئەو نیشتمانپەروەرەیە هەموو توانا و ژیری و بلیمەتییەتی خۆی بۆ خۆشەویستی و سەربەستیی نەتەوەی خۆی بەکاری هێناوە. ئەو سەربەستییەی لەو سەردەمەدا لە بنەماڵەی پاشاکانی باباندا دیوە. سالم ماوەیەک لە سایەی دەسەڵاتی کورد ژیاوە و بەچاوی خۆشی ڕووخانی ئەو دەسەڵاتەی دیوە.

نموونەی ڕاست کردنەوەکانی پیرەمێرد لە دیوانی سالم



سالم وەکو زۆربەی شاعیرانی دیکەی کورد، نە لە لایەن کوردەوە هەقی خۆی دراوەتێ و جێگەی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا دیار کراوە، نە زانستی کوردناسی و ڕۆژهەڵاتناسی ئەوروپاش ئاگای لێیەتی.

سالم لەناو گەلی کورددا وەک شاعیرێک زۆر بەناوبانگە، شیعرە نیشتمانپەروەری و کۆمەڵایەتییەکانی بوونە هۆی ئەوەی لەناو خەڵکی کورددا خۆشەویست بێ.

ئەو شیعرانەی لە دیوانی شاعیردا بڵاو کراونەتەوە بەشێکی زۆر کەمن لە هەموو بەرهەمی شیعری. لەپاش بڵاوبوونەوەی دیوانی شیعری گەلێ شیعری تازەی لە ڕۆژنامە و گۆوارە کوردییەکاندا بڵاو کراونەتەوە. تا ئێستاش بەشی زۆری بەرهەمی شاعیر نەکەوتۆتە دەست خوێندەواری کورد و بەدەسنووس ماونەتەوە.

ئەگەر تا پلەیێک هەموو غەزەلە دڵدارییەکانی سالم شەقلی تایبەتیی کەسایەتی شاعیریان پێوە نەبێ کە بەناوی ئەوەوە تۆمار کراون بێ گومان قەسیدە نیشتمانییەکانی یاخود ئەو داستانانەی بۆ سوارچاکی نەتەوەی خۆی نووسیوە شتێکی تازەیە و کەسایەتی سالم لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بەڕوونی پیشان دەدا.

### غەزەل و قەسیدە

شیعری سالم لە رووی ڕوخسارەوە لە غەزەل و قەسیدە پێک هاتووە. بەقەوارە شیعری لە هەردوو شاعیرانی دیکەی کوردستانی باشوور نالی و مستەفا بەگی کوردی زۆرترە. تا ئێستا زیاتر لە دووسەد غەزەل و قەسیدەی لە بەردەستدایە، ئەمە هەموو شیعری ئەو نییە و زۆری چاپ نەکراون، خوێندەواری کورد ئاگاداریان نییە.

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا باس لە شیعری سالم کراوە، ئەمین فەیزی لە کتێبی (ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد، ئەستەموڵ، ١٩٢٠) لە شاعیر دواوە و نموونەی شیعریشی بڵاو کردۆتەوە. لە ساڵی ١٩٢٥ لە بەغدا گۆواری (دیاریی کوردستان) لە هەندێ لە ژمارەکانیدا شیعری سالمی بڵاو کردۆتەوە. ئەوانەی باسیان لە سالم و شیعری کردووە، زۆر نین لەناویاندا دەتوانرێ پەنجە بۆ ڕەفیق حیلمی و عەلائەدین سەجادی درێژ بکرێ.

تا ئێستا دیوانی شیعری سالم دووجار چاپ کراوە:


Jimare
Kurdiy-Meriwaniy
دیوانی سالم
حقوق بلاوکردن، لەوەرگرتن، وترجمەی بلاوکەرەکانە
چاپی یەکەم
چاپخانەی أیتام بغدا
1933

**بەرگی چاپی یەکەمی دیوانی سالم ١٩٣٣**

١- دیوانی سالم، بەغدا، ١٩٣٣، بڵاوکراوەکانی (کوردی - مەریوانی) ئەم چاپە بەهیچ جۆرێ دەسکاری ئەو دەسنووسانەیان نەکردووە، کە دیوانەکەیان لەبەری چاپ کردۆتەوە، واتە بەهەموو هەڵەیێکی دیوانەکەوە، چۆن نووسراوە وا بەچاپ گەیەنراوە، جگە لەمە هەڵەیێکی یەکجار زۆری تێ کەوتووە، بەکەڵک فێرکردن نایە، هەر ئەوەندەیە شیعری ئەم شاعیرەیان لە فەوتان ڕزگار کردووە. لە کاتی خۆیدا دانەیێکی ئەم چاپە دەست حاجی تۆفیقی پیرەمێرد کەوتووە، ئیتر ئەم شاعیرە هەموو زانیاریی خۆی بەکارهێناوە و هەڵەکانی چاپی ڕاست کردۆتەوە و لە هەر شیعرێکدا کەموکوڕی هەبووبێ تەواوی کردووە. ئەم دانەیەی دیوانی سالم گەلێ گرنگە بۆ ساغکردنەوەی دیوانی شیعری و ئامادەکردنی چاپێکی باوەڕ پێکراوی دیوانەکە.

٢- دیوانی سالم، هەولێر، ١٩٧٢، ئەمە لەسەر چاپی یەکەم ڕوونووس کراوە، بڵاوکەرەوە هەوڵی نەداوە هەڵەکانی چاپی یەکەمی دیوانەکە ڕاست بکاتەوە، جگە لەوە ئەم چاپە خۆشی هەڵەی زۆری تێدایە، بڵاوکەرەوە هەوڵی نەداوە ئەو جێیەی تێی نەگەیشتووە ساغی بکاتەوە، جگە لەوەی دەسکاری زۆری وشەکانی شاعیریش کراوە، لەبەر ئەوە دەتوانرێ بوترێ دیوانێکی ڕێکوپێکی ئەم شاعیرەمان لە بەردەستدا نییە، جگە لەوەی شیعری شاعیر لێک نەدراوەتەوە و ڕەخنەگرانە لێیان نەکۆڵراوەتەوە.

## دەسنووسی شیعری سالم

لە کوردستانی باشوور، بەتایبەتی لە وڵاتی سلێمانی دەسنووسی دیوانی سالم گەلێک زۆرە، بەرهەمی شاعیر تەنیا لە دەسنووسە تایبەتییەکانیدا نادۆزرێنەوە، بەڵکو لە بەیاز و کەشکۆڵی شیعریدا دەست دەکەون، هەموو ئەو سەرچاوانەی ئێمە ئاگاداریانین کەشکۆڵی وا بەرچاو نەکەوتووە شیعری سالمی تێدا نەبێ. بەشێکی زۆر لەو دەسنووسانە کەوتوونەتە وڵاتانی ئەوروپا. دەوڵەمەندترین نامەخانە لەم لایەنەوە نامەخانەی ماربورگە لە ئەڵمانیا، هەروەها لە نامەخانەی بەریتانی لە لەندەن دەسنووسی شیعری سالم دەست دەکەون. نرخی ئەم دەسنووسانە لەوەدایە شیعری وایان گرتۆتە خۆ تا ئێستا لەناو دەسنووسەکانی لای خۆمان دەست نەکەوتوون. یەکێ لە دەسنووسە بەنرخەکانی سالم لە ئەوروپا ئەوەیە لە ساڵی ١٨٦٢ ڕوونووس کراوە، واتە شاعیر هێشتا لە ژیان بووە.

## کێش و قافیە

سالم هەموو شیعری لەسەر بەحری کێشەکانی عەرووز داناوە. بەشی هەرە زۆری ئەو شیعرانە لەسەر بەحری هەزەج و ڕەمەل ڕێکخراون. بەدەگمەن بەحرەکانی دیکەی عەرووزی بەکارهێناوە. لە ڕووی قافیەوە بەکارهێنانی دەنگەکانی ئەلف و بێی کوردی و عەرەبی زۆر دەوڵەمەند نییە. مەبەس لێرەدا بەکارهێنانی ئەو دەنگانەی لە زمانی عەرەبیدا دەبینرێن و پێچەوانەشی. سالم پاش قافیەی زۆرە، ئەمانە هەندێ جار لە یەک وشە، هەندێ جاریش لە ڕستەیێک یا ڕستەیێکی ناتەواو پێک دێن. جگە لەوە شاعیر هەندێ جار نیوەدێڕی شیعر کەرت دەکا و بۆ کەرتەکان قافیەی ناوەوە دروست دەکا، ئەم هونەرە کە مورەسسەع (مرصّع)ی پێ دەڵێن ڕەوانی و مۆسیقاییێکی تایبەتی بەشیعرەکە دەدا.



## مولەممەع

سالم کۆمەڵێک مولەممەعی کوردی - فارسی هەیە، ئەمانە نیوەدێڕی یەکەمیان کوردین و نیوە دێڕی دووەمیان فارسین. لە دیوانی سالمدا کۆمەڵێک مولەممەعی لەم بابەتە بەرچاو دەکەون، ژمارەیان لە دە پارچە زیاترە. لەگەڵ ئەوەی شاعیر مولەممەعی کوردی - فارسی زۆرە، مولەممەعی نییە زمانانی عەرەبی و تورکی لەگەڵ کوردی بەکارهێنابێ وەکو ئەوەی لە لای زۆربەی شاعیرە کلاسیکییەکان دەبینرێ.

## پێنج خشتەکی

سالم بایەخی بەپێنجین و پێنج خشتەکی نەداوە، ئەوەی ڕاستی بێ ناهەقی نەبووە، چونکە لەو سەردەمەدا شیعرێکی ئەوتۆی لە بەردەستدا نەبووە نموونەی بەرهەمی شیعری کلاسیکی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم بێ لە باشووری کوردستان جگە لە شیعری نالی و مستەفا بەگی کوردی، لێرەدا شاعیر تەنیا ئەوەی بۆ کراوە شیعری نالی وەربگرێ ئەگەر بیەوێ لە هونەری پێنج خشتەکیدا شیعری هەبێ، لەبەر ئەوە دەبینین چوار دێڕە شیعری نالی وەرگرتووە و کردوویەتی بەپێنج خشتەکی.

تەواوی پێنج خشتەکییەکە ئەمەیە:

ئەی حاریس ئەگەر دەوڵەت و جاه و حەشەمت بوو
دوڕڕ و سەدەف و لوئلوئ و لەعل و گوهەرت بوو
خووبانی سیەه موو پەری ڕوو خەدەمت بوو
(هەرچەندە کە عومری خدر و جامی جەمت بوو
چونکە ئەمەلت زۆرە چ عومرێکی کەمت بوو)

گاهێ بەدوعا ڕوو دەکەیە قیبلەیی حاجات
گاهێ لە ڕەعییەت دەبییە مەرگی موفاجات
ناکەی لە دڵا قەت بەئەبەد فیکری حیکایات
(ئەی جامیعی دونیا و قیامەت بەخەیاڵات
ئەو ڕۆژە کە مردی نە ئەوت بوو نە ئەمت بوو)

هەمین گەری ئەفسوردەیی زالم دڵی بەد زات
وەی زاهیدی باتین بەد و زاهیر بەعیبادات
بێ تەربیەت و مورشید و بێ تەیی مەقامات
(دوێنێ چ بوو دەتدا بەزمان لافی کەرامات
ئەمڕۆ نەدەمت بوو نەدەمت بوو نەدەمت بوو)

ئەووەل فەرەحی دا فەلەک ئاخر غەمی هێنا

کەم بوو لە دەهەن خەندەیی دڵ ماتەمی هێنا

باقل دەمی مەرگەکە هەناسەت کەمی هێنا

(عومرت نەفەسێکە لە هەموو عالەمی بالا

بمرە لە غەمی دا کە هەموو سەرفی غەمت بوو)

جگە لەمە لە دیوانی سالمدا پێنج خشتەکی دیکەش هەیە، بەڵام لەوەدا غەزەلی شیعری فارسی کردووە بەپێنج خشتەکی.

### کاریگەری نالی بەسەر سالم

سالم شانازی بەنالی کردووە، خۆشیویستووە، کە ناوی هێناوە (حەزرەت)ی پێ وتووە، شیعری کردووە بەپێنج خشتەکی، وەرامی نامە شیعرییەکەی (شارەزوور)ی نالی داوەتەوە، ئەنجامی ئەمە ئەوە بووە شیعری نالی کارێکی زۆر بکاتە سەر شیعری سالم لە ڕووی کێش و قافیە و وشە و داڕشتن و تەعبیر و لێکسیکۆن و ڕەوانبێژییەوە.

بۆ بەڵگە دوو غەزەلی نالی کاریان لە سالم کردووە، یەکەمیان:

دەروونم پڕ کەباب و دەردە بێ تۆ

دڵم گەرم و هەناسەم سەردە بێ تۆ

دووەمیان:

نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ

نەچم شەرتە هەتا ئەو خوارە بێ تۆ

ئەم دوو غەزەلە تەنیا لە ڕووی ڕوخسارەوە مۆرکی نالییان پێوە نییە، بەڵکو لە ڕووی ناوەرۆکیشەوە وێنەیان تێدایە لە ئەوانەی نالی دەکەن یا تەواوکەری ئەوانن.

سالم دەڵێ:

لە سینەمدا سەدای ناڵینە بێ تۆ

دڵی زارم بەسێ غەمگینە بێ تۆ

ئەبەد وەک من غەمیش ساحیب وەفایە

ڕەفیق و هەمدەمی دێرینە بێ تۆ

هەناسەی سەردی من دێنێ زەمستان

گڕەی گەرمی دڵم هاوینە بێ تۆ

دەمم تاڵ و سریشکم شۆرە دائیم

ترش ڕووم و قسەم شیرینە بێ تۆ



دڵم باغ و گوڵم فرمێسکی ئاڵە

بەهار عومر و ئەجەل گوڵچینە بێ تۆ

سرشکم قرمز و دیدەم سفیدە

ڕوخم زەرد و لیباسم شینە بێ تۆ

فەرەح ڕابورد ئەبەد بێ تۆ عوبوورکا

بەڕووی دڵما خەفەت پەرژینە بێ تۆ

لە چنگ غەم سەیدە (سالم) وەک کەبووتەر

لە دڵیا میخلەبی شاهینە بێ تۆ

لە بەڵگەیێکی دیکەدا سالم لاسایی غەزەلێکی تری نالی دەکاتەوە کە لە سەرەتاکەیدا دەڵێ:

تەبعی شەککەر باری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا

ئیمتیحانی خۆیە مەقسوودی لە عەم دا وا دەکا

ئینجا سالم لە ڕەنگدانەوەی ئەم غەزەلەی نالی ئەم شیعرانە دەنووسێ:

کاتیبی فیکرم لە دڵدا دیقەتی ئینشا دەکا

جوست و جۆ بۆ سەتربەندی کاغەزی میرزا دەکا

تاکو بێتە سەر سەری سایەی هوما ئاوا نەبێ

لووتی پاپاغی لەگەڵ سەقفی فەلەک دەعوا دەکا

بۆ ڕێگا گەر ساقی عووجیان کردە پردی ئاوی نیل

ئیستوخانی دەستی میرزا پول لەسەر دەریا دەکا

گەر لە لای زەوجەی لە شەودا بێت و هەڵسێ بۆ عەمەل

قامەتی مەیلی لە دەرگانەی حەرەم بەرپا دەکا

ئەحمەقە لەقلەق ئەگەر تەرکیبی نیسبەت کا بەتۆ

حوشتر ئەر بێت و بڵێ وەک تۆ دەڕۆم بێ جادەکا

وەک لەم شیعرەدا دەردەکەوێ سالم تەنیا هەوڵی نەداوە شیعرەکەی لەسەر کێش و قافیەی نالی بێ (ڕەمەلی ٨ی مەحزووف/ فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، بەڵکو لە ناوەرۆکیشدا وەکو ئەو باس لە شیعر دانان و نووسین و کاغەز دەکا.

### هونەرەکانی شیعر

سالم بایەخی بەبابەتەکانی شیعر نەداوە لە ڕووی ڕوخسارەوە، دیوانی بەپێی بابەتەکان ڕێک نەخراوە. لە ڕووی ناوەرۆکەوە، واتە مەبەسەکانی شیعر زۆر دەوڵەمەندە، لەوەش زیاتر بایەخی بەرەوانبێژی داوە،

داهێنانی زۆر لە ڕووی جوانکارییەوە بەدەست دەدا. ئەگەر لە شیعری سالمدا هەست بەوێنەیێکی وەرگیراو یا لاسایی شاعیرێکی تر بکرێ، ئەو وێنەیە وەستایانە بەگیانی خۆی قانگ دەدا. دیارە ئەم جۆرە وێنانە کەمترن و ئەوەی داهێنانی خۆیەتی گەلێ زیاترن.

بەکارهێنانی وشەی فارسی لە شیعری سالمدا، واتە (فارسیزم) لەوانەیە هەندێ لە خوێندەوارانی کوردی نیوەی یەکەمی سەدەی بیست و یەکەم گرژ بکا. لێرەدا مەبەس لە وشەی فارسی ئەو وشە قورسانەن لەوانەیە فارسێک تێیان نەگا و پێویستی بەوە بێ لە فەرهەنگدا بیاندۆزێتەوە. ئەم جۆرە وشانەش هەندێ جار لە شیعری سالمدا دەبینرێن. ئەگەر ئاوور لە وشە فارسییەکانی دیکە بدەینەوە کە مانایان ئاشکرا و دیارە و خوێندەواری کورد ئاشنایانە ئەم جۆرە وشانە زۆرن، بەڵام بەجۆرێ کار لە ڕیتم و مۆسیقای شیعرەکە ناکەن، بەڵکو بەم وشانەوە ئاوازی شیعرەکە ناسکتر و ڕەوانتر دەبێ. هۆی ئەم دیاردەیە لە شیعری سالمدا ئەوەیە لە فارس نزیک بووە، لە ئێران ژیاوە، نەک تەنیا لەناو کەسوکاری خۆی کە لە کوردستانی ئێران بوون، بەڵکو لە ناوچە فارسییەکان و بەتایبەتی لە تاران ژیاوە.

بەشێکی زۆر لە شیعری سالم لە بابەت ناوەرۆکەوە ئەڤین و دڵداری و وەسفی سروشتە، کەچی ئەو بەشەی دیکەی کە لە بابەت کۆمەڵ و سیاسەت و سوارچاکی و قارەمانی و نیشتمانپەروەری و کوردایەتییە لە چاو شاعیرانی دیکە گەلێ زۆرە، لەبەر ئەوەیە لە مێژووی ئەدەبی کوردی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا لە کوردستانی باشوور بەڕوونی و ئاشکرایی شیعری سالم ئاوێنەیە شیعری کۆمەڵایەتی و سیاسی تێیدا ڕەنگ دەداتەوە. شیعری لەم بابەتەی پێویست بوو نالی و مستەفا بەگی کوردی دایبنێن؛ سالم ئەو جۆرە شیعرەی هێنایە ناو ئەدەبی کوردی لەو ڕۆژگارەدا.

بەگشتی سالم گۆرانی بۆ دڵداری و جوانی و سروشت وتووە، هەندێ تەنگوچەڵەمەی ژیانی کۆمەڵایەتی دەستنیشان کردووە، ڕق و کینی بەرامبەر بەدوژمنانی میللەتی کورد دەربڕیوە، شین و شەپۆڕ و لاواندنەوەی بۆ ڕووخانی میرنشینی بابان و لەدەستچوونی ئازادی بووە. بەمە سالم خۆی کردووە بەشاعیری میللەت و ژیان.



## بەشی دەیەم

## ناوەرۆکی شیعری سالم

لە بەرهەمی شیعری کلاسیکی کوردیدا بەگشتی سنوورێکی بەرچاو بۆ بابەت و مەبەس و ماناکان نابینرێ، زۆرجار چەند مەبەسێک تێکەڵ بەیەکتری دەبن، هەندێ جاریش دەتوانرێ بەرهەمێک بخرێتە خانەیێکی تایبەتییەوە، وەک تەنیا وەسف یا دڵداری یا مەدح... هتد.

لە بەرهەمی ئەدەبی سالمدا هەست بەوە دەکرێ پارچە شیعرێک چەند مەبەسێکی گرتبێتە خۆ لە بابەت ناوەرۆکەوە، ئەم جۆرە شیعرە بەزۆری لە بەرهەمی شاعیردا دەکەوێتە بەرچاو، بەڵام بێ گومان بەرهەمی دیکەی شیعری سالم مەبەسیان ئاشکرایە و لە دەوری بابەتێک کۆ دەبنەوە بەتایبەتی قەسیدە درێژەکانی، دیارە شاعیر یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی بایەخێکی زۆریان بەقەسیدە داوە.

شاعیر هەوڵی نەداوە لە ڕووی ناوەرۆکەوە لە هەموو بابەتە کلاسیکییەکانی شیعری هەبێ، ڕەنگە بەگشتی هەندێ مانای ئەم بابەتانە لە شیعریدا بدۆزرێنەوە، بەڵام شیعری بەتایبەتی بۆ ئەو مەبەسانە تەرخان نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشا لەناو بەرهەمەکانیدا ناوە ناوە پەنجەیان بۆ درێژ دەکا.

دیوانی سالم ئەوەی لە بەردەستدایە شیعری ئایینی (ئیلاهییات، موناجات، نەعت...)ی دەور نەکردۆتەوە، بەگشتی بەرهەمی شیعری سالم لە دەوری وەسف و دڵداری و سوارچاکی و کوردایەتی و نیشتمانپەروەری دەسووڕێتەوە. هەندێ جار داشۆرین (هەجوو) و پێدا هەڵدان (مەدح) و شین و شەپۆڕ و ماتەمنامە و مەبەسی دیکە دەکەوێتە بەرچاو.

### وەسف و دڵداری

هەرچەندە وەسف و دڵداری دوو بابەتن لە ئەدەبی کلاسیکیدا، بەڵام سالم لە زۆربەی بەرهەمەکانیدا ئەم دوو مەبەسە گرنگەی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. ئەگەر تەنیا وەسفی ڕووکەشی بەهار (سروشت) یا دلبەری کردبێ، بێ گومان زۆر جار سروشتی بۆ دڵداری بەکارهێناوە.

لە غەزەلێکیدا سالم نێرگس و گوڵاڵە بۆ بەراووردی چاو و ڕوو وەردەگرێ، سپیبەتی ڕوخسار و ڕەشی زولف بۆ بەیانی جەژن و شەوی یەڵدا بەکار دێنێ. دلبەری شاعیر ئەوەندە جوانە گەردوون یەکێکی دیکەی وەکو ئەوی نابێ، واتە وەک مریەم کە تەنیا عیسای بوو. دەستی سپیی مووسا ناگاتە گیرفانی یار، چونکە دەستی ئەم خۆشەویستە لە دەستی مووسا بەهێزترە و کەراماتی زیاترە. ئینجا شاعیر دێتە سەر وەزعی دەروونی خۆی، ڕەنگی زەردی پاییزی سالم بەختیاری و خۆشییە بۆ یار. ڕۆژی ڕەشی مەجنوون کلە بۆ چاوی لەیلا، لە هاواری شاعیر دڵی گای هەڵگری زەوی دەلەرزێ، دڵی ئەستێرەی کەیوان (زوحەل) بەئاهی شاعیر لە ئاسمانی هەفتەمین ئاسمان دەسووتێ:

غولامی دیدەیی مەخمووری تۆیە نێرگسی شەهلا
لە ئاب و تابی ڕوویی تۆ داغدارە لالەیی حەمرا

بەیازی ناسیەی تۆ بوو سفیدی دایە سوبحی عید
لە نوسخەی قیرگۆن زولفت سیاهی برد شەوی یەڵدا
عەقیم ئاسا لە زک وەستایەوە حەملی نەما ئیتر
لە پاش تۆ دایەیی دونیا بەمیسلی مادەری عیسا
لە قوببەی نووری پوستانت یەدی بەیزا نەمووداره
ئەبەد ناگاتە دوگمەی جێی جامەیی تۆ کەفی مووسا
خەزانی ڕەنگی زەردم باعیسی نەشئونەمای تۆیە
سیاهی ڕۆژی مەجنوون سوورمەیە بۆ دیدەیی لەیلا
لە سەیحەم هاتە لەرزش قلبی گاوی ژێر زەمین ئەمشەو
دڵی کەیوان لە ئاهی من لە هەفتەم ئاسمان سووتا
دوو سەد جار وەزعی چەرخی ئاسمان گۆڕا بەسەعدوشووم
ستارەی نەحسی (سالم) بوو لە قەرنێکا نەبوو ئاوا

لە شیعرێکی دیکەیدا سالم لە کرداری خراپەی دلبەر دەگەڕێ، ئەم خراپەیە دەبێتە مایەی ئیلهام بۆ شیعرێک خۆشەویست دەخاتە ڕوو وەکو خونکارێکی زەبر بەدەستی لە کوشتن و بڕین بەولاوە هیچی تر نەزانێ. شاعیر کە ئەم کارە دەکا مەبەسی ئەوەیە دلبەر بەهەموو شتێک بزانێ، بەگەورەییێک لەو گەورەتر نییە. جا ئەگەر خۆی بەبچووک دانەنێ گەورەیی دلبەر ناکەوێتە ڕوو، بەم جۆرە بچووکی و دیلیەتی بۆ خۆی دەوێ بۆ ئەوەی گەورەیی و دەسەڵات بکەوێتە بەر خۆشەویست:

خەراب بێ خانەیی دڵ هەر وەکو خانەی خەراب کردم
خوداوەند ئابڕووی دیدەم بەرێ وەک ئابڕووی بردم
هەتا زیندووم دەچێنم تۆوی هەر خارێ لە دڵ شایەد
کە بێی بۆ سەر مەزارم دامەنت بگرن ئەگەر مردم
دەبینی مووی مۆژەی مووریچە میسلی زەڕڕەبین میرئات
لە فیکری مووشکافی مووی میانت وا بەدەم وردم
لە سەرمای قەوسی سەردی میهری تۆدا وا بەیەک هاتم
لە ڕێی چەوگانی میحنەتدا وەکو گۆ دائیما گردم
بەبێ سەددی تەنم بۆ دڵ ڕەهی غەم کە لەبەر ئەشکم
هەمیشە بۆ عوبووری قافڵەی جەورت وەکو پردم
(مەِ پارس زَبانم گُفت (سالم) شَرحِ حالَت گو)
وتم جانا بەلەد نیم ئیستیلاحی ئێوە، من کوردم



شاعیر بەخەیاڵ لە پارچە شیعرێکی دیکەدا شانۆی دروست کردووە، ساقی لە پەردەکانی پشتەوە وەک ئەکتەرێک دێتە سەر شانۆ بەشداری لە کۆبوونەوەی دڵداران دەکا، پۆل پۆل خاوەن دڵان ڕوو دەکەنە کۆڕی عاشقان. یاری شاعیر پەیدا دەبێ، بەڵام نەک بەتەنیا، بەڵکو لەگەڵ ڕەقیب دەستیان خستۆتە ناو دەستی یەک. ئەمە مایەی پەژارە و دڵتەنگییە بۆ شاعیر، چونکە یارەکەی پشتی تێ کردووە و دڵداری تازەی دۆزیوەتەوە. هەروەها شادمانیشە چونکە چاوی بەیار کەوتووە.

لەم بڕە شیعرەدا سالم وێنەی جوانی ڕەوانبێژی دژ بەیەکتری و پێچەوانە دروست دەکا، وەکو ئارەزووی ئەوەی بوو ڕوو بکاتە مزگەوت، بەڵام چووە گوزەری مەیفرۆشان، یاری شاعیر ئازاد و ڕوو کراوەیە و سەرپۆش ناگرێتەوە، بەڵام ڕووی لە دڵدار وەردەگێڕێ وەکو ئەوە دەردەکەوێ بۆ دڵدار پەچەی گرتبێتەوە. ئەم کۆبوونەوەی عاشقانە هەموو گیروگرفتەکانی ناو دڵی شاعیر دەشارێتەوە و لە بیری دەباتەوە. لەو کۆڕەدا دلبەر و دڵدار یەکەمیان جامی مەی پڕ دەکرد و، دووەمیان مەزەی دابەش دەکرد.

ساقی لە پەردە دەرهات جامی شەرابی هێنا
دڵ خیرە ما لە حیرەت مەه ئافتابی هێنا
یەک زەڕڕە عەکسی پرتە و دەرکەوت تووڕی سووتاند
ئایینە سەخت ڕوو بوو لەو عەکسە تابی هێنا
تیماری چاکی سینەم ڕاجیع بەچاوی مەستە
بەختیش موافیقی عیشق بۆ من خەرابی هێنا
یارم لە ئەندەروون هات دەستی ڕەقیب لە دەستا
غەمناک و شادمانم ڕەحمەت عەزابی هێنا
بۆ تۆبە سوویی مەسجید هاتم بچم لە ڕێدا
بۆ کۆیی مەیفرۆشان عەزمم شتابی هێنا
ڕوو هەر لە من دەپۆشێ وا حاڵییە کە جبریل
هەر خاسسە بۆ من و ئەو ئایەی حیجابی هێنا
وەی وەی چ مەجلیسێ بوو دوێنێ لە دیدە و دڵ
دلبەر شەڕابی گێڕا (سالم) کەبابی هێنا

لە وەسفی ڕووکەشی هەست پێکراوی ئەندامی لەشی یار سالم دوو کۆمەڵە وشە بەرامبەر بەیەکتری دادەنێ، کۆمەڵێکیان سەر بەخۆشەویستەکەیەتی، وەکو: لەشولار، دەم، غەمزە، قووڵایی چەناگە، قەد و قامەت، بسک، ڕوومەت، برۆ و هی دیکە، ئەمانە بەکار دێنێ بۆ لێکدانەوە و دروستکردنی وێنەی هونەری لەگەڵ وشەکانی گوڵ، غونچە، تیر، باغ، درەختی سەروو، گوڵاو و هی دیکە، شاعیر دەڵێ:

بەنەزاکەت نییە گوڵ وەک بەدەنت
غونچە دڵ تەنگە لە حەسرەت دەهەنت

سینه پڕ چاکه له تیری غەمزەت

دڵ گرفتاره له چاهی زەقەنت

باغەبان ئەمڕۆ له باغا قەدی یار

پەستی کرد قامەتی سەرووی چەمەنت

کاشیفی کوفره له ڕوو کافری دین

تاری گێسوویی خەمی پڕ شکەنت

ئەی گوڵاو جێگەیی تۆ شیشە نییە

عاریزی دلبەره ئەسڵی وەتەنت

سەجدە بەر تاقی برۆی یار بەره تۆ

وەسەنی بی مەپەرستە وەسەنت

دادی شیرین کە دە (سالم) بەقەڵەم

نییە قەندی قەڵەمی وەک سوخەنت

له غەزەلێکیدا شاعیر له وەسفی شته جوانەکانی دلبەر له لاسایی شیعری کلاسیکی نەچۆته دەرەوە، له کاتێکدا هەندێ وێنەی ڕەنگینی هونەری دروست کردووە وەنەبێ ئەو وێنانە تازە بن، بەڵام شاعیر دەسکاری وەستایانەی ئەو وێنانەی کردووە و کەسێتیی تایبەتی بۆ دروست کردوون. لێرەدا مەبەس لێکدانەوە و شیکردنەوەی غەزەلەکە نییە، چونکە مانا و وێنەکان ساکار و جوانن، هەموو کەس تێیان دەگا، بەڵکو کێشی شیعرەکەیە جۆرە ڕیتم و مۆسیقاییێکی ڕەوانی داوەتێ.

بەپێی دەستووری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی ئەم غەزەلە پێویستە بەبەحری عەرووز بکێشرێ. بەحری عەرووزی ئەم غەزەلە موزاریعی (٨)ی ئەخرەبە (مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن)، کێشی نیوەدێڕی هەموو نیوەدێڕە شیعرێک (مفعول فاعلاتن) لەگەڵ کێشی (٧) سیلابی خۆماڵی شیعری میللی کوردی (هەلوور بەلوور تەکامە) یەکتری دەگرنەوە، واتە دەتوانرێ ئەم غەزەلە کە له شەش دێڕەشیعر، یا دوازدە نیوەدێڕ شیعر پێکهاتووە بیکەین بە(٢٤) پارچە، هەر پارچەی دەبێتە (مفعول فاعلاتن)، ئەمە بەکێشی خۆماڵی (٧) کەرتی سیلابییە کە له کێشە هەرە سووکەکانی شیعری کوردییە و هەر ئەوەشە بۆتە هۆی ڕەوانی و سووکی ڕیتم و مۆسیقای شیعرەکە.

پڕ چینە زولفی پڕ خەم نەقشە له ڕوویی یارا

وەک میللەتی مەجووسی هەر دێن بەدەوری نارا

توڕڕەت کە دێ بەڕوودا وەک عەینی کوفری حوسنە

بۆ ڕەونەقی کلیسا با هەر بێن نەسارا

غەمزەت له تیرەباران زولفت دڵی پەنادا



بەم ڕەنگە حوسنی ئەخلاق کێ دی له جینسی مارا

مەی گەر حەرام و تاله ساقی بەچاوی مەستت

(أشْهى لَنا وأحْلى مِن قُبلَةِ العَذارى)

ئەی ئەو کەسەی کە شەو هات یادت ئەنیسی دڵمە

یەک لەحزە دێمە یادت داخوا له ڕۆژگارا

تۆ ناتەوان و مسکین دوژمن قەوی و بێ دین

(سالم) له عەهدی ئەودا کوا چارە جوز مودارا

شاعیر له غەزەلێکی دیکەیدا وەسفی یار و سروشتی تێکەڵ بەیەکتری کردووە، بەراوردەکانی ناخۆشی بەخۆشی لێکدەداتەوە، ڕەقە بەرامبەر بەنەرم، وشکە له ڕاست تەڕ. له لای شاعیر مانای جوان له ڕەشبینیدا دروست دەبێ، کە یاری خۆشدەوێ بەحسێب پێویستە ئەویش شاعیری خۆش بووێ، بەڵام سالم ئەوەندە هۆگری یارەکەیەتی ئەگەر ڕووشی لێ وەربگێڕێ ئەو هەر خۆشی دەوێ. دڵداری له شیعری کلاسیکیدا بەبێ تەنگوچەڵەمە نابێ، بۆیە بەئاسانی چنگ ناکەوێ. لەبەر ئەوەیە دەتوانرێ بیر لەوە بکرێتەوە پارچە غەزەلێکی لەم بابەتە مەرج نییە بۆ خۆشەویستێکی دیاریکراو وترا بێ:

ئەگەرچی سینە بۆ دڵ وەک سوپەر بوو

وەلێ زەخمی خەدەنگت کاریگەر بوو

له وەختی حاسیلا زانیم بەتەحقیق

نیهالی سەرووی قەددت بێ سەمەر بوو

لەبت سەر چەشمەیی ئاوی حەیاتە

وەلێ بۆ کوشتنی من بەرقی شەرەر بوو

له ڕەشکی لێوی تۆ غونچە شەقی برد

له خەندەت موعجیزەی شەقولقەمەر بوو

دەسووتێ دڵ بەیادی ڕەنجی فەرهاد

ئەویش وەک من غەریب و دەربەدەر بوو

بەبێ ڕووی تۆ فەزای باغی (سەنەندەج)

لەناو دڵما وەکو ناری سەقەر بوو

له زاهید مەگرە دڵ (سالم) کەدوورەت

له ئەسراری مەحەببەت بێ خەبەر بوو

سالم له بەرهەمێکیدا کە دەچێتە خانەی وەسفەوە دوور نییە تەنیا لەبەر ئەوە داینا بێ بڵێین توانای ئەوەی هەیە شیعری سووک و ئاسان و ڕەوان و تیژ بڵێ، ئەو شیعرە لەسەر ئاواز و مۆسیقاییێکی دیاری

کراو ڕێکخراوە. ئەوەی زیاتر ئاوازی ڕەوانی داوە بەمۆسیقای شیعرەکە ئەوەیە، وشەکانی لەسەر یەک کێشن و دووبارە کراونەتەوە. لەبەر ئەوەی شاعیر تەنیا بایەخی بەڕێزکردنی وشە داوە و گوێی نەداوەتە مانا، لە شیعرەکەدا یەکێتیی مانا و هارمۆنی ڕووداوی تێدا نییە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ڕستەکان هەرچەندە پێوەندییان بەیەکەوە نییە، بەڵام هەریەکەیان بەتەنیا مانا دەبەخشێ و غەزەلەکە وەک بەرهەمێکی ڕەنگینی ئەدەبی گوێ وەری دەگرێ:

وێل و فیراری عیشقی تۆم شەهر بەشەهر سوو بەسوو
پوشتە بەپوشتە تەل بەتەل دەشت بەدەشت کوو بەکوو
قەیدە لە گەردەنی دڵم زولفی سیاهی پڕ خەمت
حەلقە بەحەلقە چین بەچین عوقدە بەعوقدە موو بەموو
تەنگ دەهانی دلبەرم حەسرەتی دایە گوڵڕوخان
وا دڵی غونچە بوو بەخوێن پەردە بەپەردە توو بەتوو
جۆششی ئەشک و مەوجی خوێن کەوتە کەناری موڵکی ڕۆم
سەیل بەسەیل و شەت بەشەت دیجلە بەدیجلە جوو بەجوو
چەرخی زەمانەکەی دەدا بەزمی ویساڵی یار و من
بۆسە بەبۆسە لەب بەلەب دیدە بەدیدە ڕوو بەڕوو
نەفحە بدا لە عەتری زولف لەوەدەمە بۆ دەماغی خوشک
تەپلە بەتەپلە مشک بەمشک نافە بەنافە بوو بەبوو
خەرمەنی (سالم)ی فەقیر سووختەیە بەناری عیشق
خۆشە بەخۆشە گوڵ بەگوڵ دانە بەدانە جوو بەجوو

لە غەزەلێکیدا سالم لە ڕووی خۆشەویستییەوە دلبەری کردووە بەخوێنڕێژ، ئارەزووی ئەوەیە هەمیشە بەهێز بێ. ئەو کچە سەرکردەیە بەتوانا و بەدەسەڵاتە، کەچی شاعیر کۆیلە و دیل و پێش خزمەتە. شاعیر خەلیفەی دووەمی ڕاشیدینی هەڵبژاردووە «عومەری کوڕی خەتاب» وەک کەسێکی پیرۆز سوێندی پێ دەخوا. سالم بەسەر کردەوەکانی یار هەڵدەڵێ کە مایەی ئازاری خۆیەتی، لەو کاتەی ئەو کردەوانە دەخاتە ڕوو سوێندەکە بەعومەر دەخوا. بۆ بەهێزکردنی وێنە شیعرییەکانی کە عومەری کردووە بەڕەمزی ئایینزای سوننی، ناوی «عەلی کوڕی ئەبوو تالیب»یش دێنێ وەک ڕەمزی شیعی لە ئیسلامدا، نەوەک ئەو دلبەرەی وەسفی دەکا لەسەر ئایینزای شیعە بێ.

ئەمە و ئەم شیعرە لە دیوانی مستەفا بەگی کوردیشدا بەرچاو دەکەوێ، ئێمە زیاتر بۆ ئەوە دەچین لە بەرهەمەکانی سالم بێ، خۆ ئەگەر ڕاستییەکەش ئەمە بێ شتێکی وا لە مەسەلەکە ناگۆڕێ، چونکە ئەم شیعرە گرنگییێکی تایبەتی هەیە لە مێژووی ئەدەبی کوردی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا، لەبەر



ئەوە لەم کتێبەدا تۆمار کرا.

قەوسی ئەبرۆ و موژەت تیر و کەمانە بەعومەر
نیگەهت قەیدی دڵ و ئافەتی جانە بەعومەر
تیرەبارانی نیگاهت لە دڵی عاشقی زار
تیژ و سوهان زەدە وەک نووکی سینانە بەعومەر
پرتەوی عاریزی یار و دڵی سەد پارەیی من
قیسسەیی شەوقی مەه و چاکی کەتانە بەعومەر
تیغی ئەبرۆیی خەمت سووڕەتی سەیفی عەلییە
باعیسی زەمزەمە و شۆری جیهانە بەعومەر
بەعەلی سوێندت دەدەم شیعەی ئەگەر ڕەحمەت بێ
خۆ ئەگەر سوننی ئەی شۆخی زەمانە بەعومەر
بەشەرارەی غەمی تۆ نەخلی مورادم سووتا
باغی شادیم هەمە دەم فەسڵی خەزانە بەعومەر
زۆر نییە (سالم)ی بێچارە ئەگەر کۆهکەنە
دلبەری هەر وەکو شیرینی زەمانە بەعومەر

سالم لە وەسفێکی موتوربە کراو بەدڵداری هەناسەیێکی کۆمەڵایەتی دەداتە غەزەلەکەی، بەوەی پەنجە بۆ هەندێ دیاردەی جوگرافی درێژ دەکا و ناوی چەند شار و ناوچە و شاخ دەبا وەکو قەندیل و لاجان لە کوردستاندا و، مەسقەت لە وڵاتی عەرەب لە جزیرەدا. ئەم غەزەلە و زۆربەی شیعرە دڵدارییەکانی سالم یەکێتیی مانا و بابەتی چیرۆکییان تێدا نییە و، هەر دێڕەشیعرێک لە مانادا سەربەخۆیە و، وەک قسەیێکی نەستەق و پەندی پێشینانێک و ئیدیۆمێک و ڕەستەیێکی ڕەوانبێژی جوان خۆی دەنوێنێ.

لە مەحشەردا ئەگەر بێ ڕوویی تۆ، مایل بەجەننەت بم
لە لای یارانی ئەهلی دڵ سەر ئەفگەندەی خەجالەت بم
قیامەت قامەتم، ڕۆژی قیامەت دەرکەوێ هەرسوو
نەکەم گەر سەجدە بۆ میحرابی ئەبرۆی تۆ بەلەعنەت بم
شنۆی ئوردی بەهەشتی وەسڵی یار ئەر بێ بەسەر مندا
لە لام (قەندیل) و (لاجان)ە بەهاوین گەر لە (مەسقەت) بم
لە وەختی پاسەبانیتا من و نامەحرەمی دوورن
لە خەودا بۆسە نەزدیکە ئەگەر جۆیایی فرسەت بم

له کوشتنتا ئەگەر ڕەحمت نەبێ مایەی تەرەحومتە
له سایەی زامی تیغت بێڵە با ئەهلی شەهادەت بم
غەمم دەریا دڵم زەورەق منم تاجر وەسڵ بەندەر
دەبێ یا تەرکی بەندەر کەم وە یا نەزدیکی ئافەت بم
کە تیری غەمزە دڵ کون کاسەفی تێکەڵ دەبن موژگان
له من قاتیل دەبێ ون بێ ئەگەر ساحیب کەرامەت بم
تەمەنناى مەرحەمەت (سالم) لە دلبەر قەت نەکەی ئامان
لەگەڵتا ئیلتیفاتی با نەبێ نەک فێری عادەت بم

له شیعرێکی دیکەیدا لە وەسفکردن و پێدا هەڵدانی دلبەری خۆشەویست سالم دیمەن و کردەوەی وا دروست دەکا بۆ چاکەی خۆی نەگەڕێتەوە، بەمەبەسی ئەوەی هێز و توانای دلبەر پیشان بدا، بەلای شاعیرەوە ئەم هێزە پێویستە هەمیشەیی بێ، لەبەر ئەوە بەرهەڵستی ناکاو پاش قافیەی (ناکەم)ی بۆ شیعرەکەی داناوە. دەتوانرێ شایەتیی ئەم شیعرە دێری هەرە دوایی بێ کە شاعیر لە ئێران بێزارە، هەر کاتێک لەوێ قورتار ببێ جارێکی دیکە ڕووی تێ ناکاتەوە. بەم جۆرە ئەگەر هەموو وێنەکانی ئەم شیعرە بۆ مەبەسی ڕەوانبێژی و جوانکاری ئەدەبی دەست بدا، دێری دوایی بڕیارێکە شاعیر داویەتی، بێزاری خۆی دەربڕیوە بەرامبەر بەئێران و ناتوانێ بیکا بەمەڵبەندی ژیانی. ئەگەر ئەو جارە ڕزگاری لێی ببێ، جارێکی دیکە ڕووی تێ ناکاتەوە:

بەمن بێ سینەیی سەختم بەقەڵغانی نەزەر ناکەم
نیشانەی تیری خوێنڕێژیت بەجوز لوختی جیگەر ناکەم
دەمی نازت بەڕوو سەختی کەتابی تیری غەمزەم بوو
له ڕێی تیغی جەفاتا بەعەدەزین جەوشەن لەبەر ناکەم
لەناو شانت لە چینی زولفتا دڵ حەلقەهای لێدا
خودا گەر وا بدا قەدرت بەمن کەس دەربەدەر ناکەم
ئەگەر پایانی بێ هیجرەت لە دەرگاتا هەتا دەمرم
بەمەحزی جەوری حاجیب یەک وەجەب مەیلی سەفەر ناکەم
له ڕەشکا گەر سەراسەر نوتقی تووتی بێتە سەر هەجووم
له مەدحی لێوی شیرینی تۆ من وەسفی شەکەر ناکەم
له فەردی وەسفی یارا عارە ناوی موددەعی بردن
له ڕشتەی فیکر ما خەرمەوهرە هەم سیلکی گوهەر ناکەم
له یاقووتی لەبت یەک بۆسە مایەم بێ دەمی ئاخیر



تەلەف کەم گەر سەر و ماڵم لە سەوداتا زەرەر ناکەم
لەگەڵ دڵ شەرتە (سالم) گەر نەجاتم بێ لە تارانا
بەهەشت ئەر بێتە دەشتی (ڕەی) بەئێرانا گوزەر ناکەم

سالم لە کۆمەڵێک شیعریدا ملکەچی ئاواز و ڕیتم و مۆسیقایە، لە کەرتکردنی ناوەوەی دێڕەشیعر وردەکارییەکی ژیرانە بەکار دێنێ. دیارە ئەگەر نیوەدێڕی شیعرێک بکا بەدوو کەرت، ئەمە جۆرە ڕەوانییەک بەدێڕە شیعرەکە دەدا، وەکو لە بەڵگەکانی پێشتر پەنجەی بۆ درێژ کرا، بەڵام ئەگەر نیوە دێڕە شیعرێک بکا بەچوار کەرت، واتە دێڕەشیعری تەواو بەهەشت کەرت، ئەمەیان لە ڕووی مۆسیقییەوە ڕەوانتر دەبێ.

لەم شیعرەدا یاریی هونەری شاعیر دەخاتە بەندێکەوە لە ڕووی ماناوە نەتوانێ داهێنانێکی بەرچاو دروست بکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سالم لەم شیعرەدا وەسفی ئەندامەکانی پەیکەری دلبەر دەکا، هەرچەندە ڕستەکانی کورتن و مانا دەگەیەنن، بەڵام شاعیر وەستایانە توانیویەتی ڕستەکان بەیەکتری ببەستێتەوە و مانای ڕووکەشی جوانیان لێ دوروست بکا. بەهەموو جۆرێک شیعری لەم بابەتە لە ئەدەبی کلاسیکیدا جوانییەکەی لە دەنگی وشە و ڕەنگی ڕستە و بەیەکتری بەستنیانەوە دەبێ.

بەروخ ڕەنگین مەیان لاغر کەمەر زەڕڕین
نیگەهـ شاهین موو موشکین زەنەخ سیمین لەب شیرین
لەبت شەککەر خەتت عەمبەر موژەت خەنجەر قەدت عەرعەر
له عیشقت دڵ وەکو بولبول لە ڕووتا گوڵ وەکو گوڵچین
سەهی قامەت قەوی شەوکەوت قەمەر تەلعەت مەلەک خەسلەت
کەمان ئەبرۆ نیگەهـ ئاهوو فەڕەنگی خوو موو موشکین
بەڕوخ وەک شەم بەئەبرۆ خەم سیەهـ پەرچەم لە من بێ غەم
گوارەی تۆ کە هاتوچۆ موتاوین بەمەهـ و پەروین
بەچینی زولف وەک سونبول ئیحاتەی دا لە دەوری گوڵ
بەموو هەر سوو لە ڕێگەی موو بەڕووی دڵما دەکەی پەرژین
چوار فەسلی لە هەر فەسلێ بەیەک دەم وا لە لای (سالم)
بەهار ئەشک و خەزان ڕەنگ و زەمستان ئاهـ و دڵ هاوین

ئەمە گوڵبژێرێک بوو لە شیعری وەسفی دلبەر و سروشت لە دیوانی سالم کە بەڕاستی زۆربەی هەرە زۆری بەرهەمی ئەدەبی ئەو شاعیرە ڕەندەی داگیر کردووە.

## شیعری کۆمەڵایەتی

بەگشتی ئەو شیعرە زۆرانەی سالم کە ڕەنگدانەوەی لایەنی جەنگ و سوارچاکی و بەرگریکردنن لە

دەسەڵاتی کورد و گەلێ لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتیش دەور دەکەنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شیعری بۆ هەندێ دیاردەی کۆمەڵایەتی و بەسەرهاتی خۆی وتووە هەندێ لە پێوەندی کەسانی کۆمەڵ بەیەکترییەوە ڕوون دەکەنەوە و لە تەلی ڕەوشتی ئادەمزاد دەدەن.

لەم ماوەیەدا هەندێ بەڵگەی کۆمەڵایەتی لە شیعری سالمدا دەخەینە ڕوو.

- ١ -

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمدا لەدوای ئەوەی سوپای عوسمانی سلێمانی داگیر کرد، بەتایبەتی لە پاش ئەوەی عەبدوڵڵا بەگی لە قایمەقامی قەزای سلێمانی لابرد و دەسەڵات کەوتە دەست مووچەخۆری سویل و جەندرمەی عەسکەری عوسمانییەوە، وا دەردەکەوێ هەڵسوکەوتی سالم بەدڵی بەڕێوەبەرانی سلێمانی نەبووە، لەبەر ئەوە هەوڵیان داوە کارێکی ڕەسمی بۆ بدۆزنەوە، بۆ ئەم مەبەسە ناردوویانە بۆ شاری حیللە لەوێ میوانی ماڵێک بووە، ئەو ماڵە ڕەوشتی میوانداری بەجێ نەهێناوە، لەبەر ئەوە دڵی ئێشاوە. گێڕانەوەیێکی دیکەش لەم لایەنەوە هەیە دەڵێ دەسەڵاتی تورکی عوسمانی سالم لە سلێمانی دوور دەخاتەوە. ئەم جۆرە ئاوارەکردنە لەو سەردەمەدا باوبووە، ئینجا لەو حاڵەتەدا ئەو ئاوارەیە دەبوو لە ماڵێک یا خانێک بژی کە دەسەڵات دیاری دەکرد، بۆ ئەوەی بەرچاو و دەست بەسەر بێ و نەتوانێ ڕا بکا. ئیتر ئەو ماڵەی بۆی دەستنیشان کراوە دیارە ئەوەی پێویست بێ بۆیان نەکردووە، هەر چۆنێ بێ ئەم قەسیدەیە زادەی ڕەووشتێکی ناشیرینە خانەخوێ بەرامبەر بەمیوان کردوویەتی:

شاعیر دەڵێ:

حەسرەتا دڵ غافڵە نازانێ قیسمەت چی دەکا
ئەمڕۆ ئێرەم بوو بەمەسکەن ئاخۆ فەردا کوێم دەبا
بەدرەقەی میحنەت نمایە شاتیری تەقدیر مودام
دەستی کەشمە و پێش ڕەو دەمبا بەمەنزیلگای بەلا
نا بەلەد بێ چارە بوو دڵ ئارەزووی ئارامی کرد
هات و نەیزانی لەپڕدا کەوتە ناو چاهی جەفا
حیللە خورمایە منیش مێش جسری دامی عەنکەبووت
نەفسی سەرکەش وام نەدیوە ڕوو لە شیرینی دەکا
گەردوشی دەوران جڵەوکێش بردمیە ماڵی عارەبێ
چووم و دیم ئەمما نەچوومایە دریغا حەسرەتا
تەلخ کام و تەلخ وەقت و تەلخ ڕووم کرد ساعەتەن
تەلخییێکم خستە ڕووی زەهریش بەئینسانی نەکا
عالەمی ئینسانییەت لاچوو لە لا ئەمن و ئەوێ



من لە تاو عیجزی زەمیری ئەو لەبەر فەقدی وەفا
لای یەساری دیدە و گوێ بوو نەما سەمع و بەسەڕ
ئەهلی دەستی چەپ لە یومنی من ئومێدیان لێ بڕا
هێندە مات دانیشتم و نەیپرسی ئەژنۆم هاتە ژان
ناعیلاج وەک پووش لە مەوجی نابەلەد خۆم گرتە لا
حوجرەیێکم کەوتە دەست و چوومە ناوی وەک قەفەس
کەبک چەنگ ئاسا لە برسان دڵ لە سینەم سەر دەدا

لەم شیعرەدا سالم دیاردەیێکی ڕەشبینی لە کۆمەڵێکی دیکەدا دەبینێ کە کۆمەڵی عەرەبە لە حیللە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ئەو هەڵوێستەی ئەو ماڵە لەگەڵ شاعیردا نواندوویانە هەڵوێستی هەموو تاکێکی عەرەب بێ، بەڵکو ئەمە لەناو هەموو کۆمەڵێکدا هەیە بەتایبەتی کۆمەڵی سالم خۆی کە کوردەوارییە. لە پاشانا وەکو لە دوو توێی هەموو قەسیدەکە دەردەکەوێ، پەردەیێکی تەنکی کۆمیدی لەناو وێنە کۆمەڵایەتییەکاندا هەست پێ دەکرێ بەزۆری لەو وێنانەی ئەسپی شاعیر دەبێ بەقارەمان و هاوبەشی شاعیر لە گێڕانەوەکەیدا.

خۆم چەپۆکم دا بەسەرما ئەسپەکەم شێوەنیەتی
تازەمان کرد هەردوو لا شینی شەهیدی کەربەلا
ئەهلی کووفە فەقدی ئاویان کرد لە میوانی عەزیز
خانەخوێی من مەنعی نان و نوێن و جێگە و ڕێ دەکا
خانەخوێم میوان نەوازە وەرنە سەیری حورمەتم
دۆشەکی خۆم خاک و خۆڵە سەرکەشی ئەسپم سەما
شیشی سوور بێنن وەرن خالیگەمان داغ کەن بە جووت
چونکە ژانمانە من و ئەسپم لەبەر سەردی هەوا
توورەکەی ئەسپم زەمین و موتتەکای خۆم زانووە
قووتی من خوێنی جیگەر خۆراکی ئەو تەسویری کا
کورکە کورکیە ئەسپەکم خۆشم دەناڵم جار بەجار
ئەو لە داخی ئاخوڕ و جۆ من لە حەسرەت جێ و چرا
با منو بارگیری کووێت هەردوو بنووین بەشکم بەخەو
من ببینم ڕووی تەعام و ئەو ببینێ ڕوویی کا
ئاخوڕی ئەسپم هەوایە خوانی خۆراکم خەیاڵ

لازمە بۆ دەفعی جووع هەردوو بکەین دەممان لە با
ئاهی خۆم بۆ نانی جۆ سمکۆڵی ئەسپم بۆ حەشیش
ئەم گەیشتە پشتی ماسی ئەو گەیشتە ڕووی سەما
چاوی قووچان ئەسپەکەم باقل تەویلەی هاتە یاد
دڵ لە سینەم ماتە، تەحقیق یادی جێگەی خەو دەکا

شاعیر لەم بڕە شیعرەدا کە باس لە خۆی و ئەسپەکەی دەکا دیمەنی شانۆییێکی کۆمیدی دەنوێنێ و بینەر دێنێتە پێکەنین، بێ گومان ئەم جۆرە داهێنانە هونەری و ئەدەبیانە دەچنە ناو دراما و موبالەغەیان تێدا دەبێ، هەر ئەمەشە نرخی جوانکاری دەداتە بەرهەمەکە و وەک داهێنانێکی ئەدەبی و هونەری دەکەوێتە بەرچاو.

لووتی دا ژەن ئەسپەکەم خۆم دەستە ئەژنۆ ماتی غەم
من لە فیکری حاڵی ئەو، ئەو شینی حاڵی من دەکا
ئەمن و ئەسپ ئوستاد و شاگردین لە تەسویری خەیاڵ
ئەو لە نەقشی توورەکە ئەمنیش لە وەزعی بووریا
شامە موغناتیسە بۆ بۆنی کەبابی سەر گوزەر
لێوی ئەسپم جازیبی پووشە بەمیسلی کەهرەبا
مژدە بێ یاران لە برسانا ددانی ئەسپەکەم
بۆ بژاردەی پووشی ناو خشت کاری دیواربڕ دەکا
سەنگ کرۆژێکە لە برسانا ددانی گردە کوویت
هەر دەڵێی مێبازی ناو شارە خەیاری نوێ دەخوا
زۆر دەترسم تا سەحەر دوو پڕ سیفەت بێ تەوسەنم
وا لەحەسرەت پووشی خورما دەم لە کلکی خۆی دەدا
وا دەزانێ زینەکەی پاڵانی پووشە گردە کوویت
وەک مەقاش جار جار لەلاوە لچ لە لا پیچگەی دەخا
سانی عەنقایە، وە یا گۆگردی ئەحمەر پیاوەتی
لەم دەرە میوانی مەزلووم ئەر نەچێ چۆن دەر دەبا
مەجلیسێ بۆ زیب و زینەت جیم و ڕێی پێ لازمە
ئیبتیدا ئیسمی لە سرری ئەلف و نوونی موقتەزا
گەر عەرەب بەم نەوعە بن با شیری وشتر بێتە ناو



وەرشەبیب تەبعن هەزاران مەرحەبا ئەهلەن سەفا
من لە فیکری حاڵی خۆمدا ئەسپەکەش هازا لقیاس
تۆی خودایا قادر و تۆی ڕەببەنا موشکیل گوشا
هەمنشینم قەت نەبێ ئیتر عەرەب تا حاڵی مەرگ
ئایینەی کەسبی جەلا حەیفە لە خاکستەر بکا

لە کۆتایی شیعرەکەدا سالم بێزاری خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر بەڕەوشتی ئەو ماڵەی بەم جۆرە ناشیرینە پێشوازییان لێ کردووە، دیارە ئەم ماڵە عەرەب بوون. بەڕاستی بێزاری شاعیر بەرامبەر بەماڵەکەیە نەک ئەو نەتەوە عەرەبەی خاوەن شارستانیەتێکە مێژوو شایەتی بۆ دەدا. نموونەی ئەدەبی لەم جۆرە لەناو هەموو نەتەوەکانی گێتیدا هەیە، بەتایبەتی لە هەر نەتەوەییێکدا بەرامبەر بەهاوسێکانی. لەم لایەنەوە هەڵوێستی هاوسێیانی کورد (عەرەب و فارس و تورک): قەشمەریکردن پێی و بەکەم زانینی زۆر زیاترە لە هی کورد بۆ ئەوان.

– ٢ –

سالم لەلایەن «مەلا بەکر» ناوێکەوە بانگ دەکرێ بۆ ئاهەنگێکی نان خواردن بەکۆمەڵ، ئەو ئاهەنگە دەبێتە سەرچاوەی ئیلهامی شیعرێک، یاخۆ دوور نییە شاعیر بەخەیاڵ ئەم بەرهەمە کۆمیدییەی دانا بێ و ناندەرەکەش نەبوو بێ و خۆی دروستی کردبێ. لە کاتی نان خواردندا شاعیر دەکەوێتە تەنیشت کابراییێکی زۆرخۆرەرە، وەسفی خواردنی دەکا و ناوی ناهێنێ، دوور نییە ئەو زۆرخۆرە خاوەن زیافەتەکە خۆی بێ.

چوومە سەر زیافەتی مەلا بەکری عالی جەناب
چ بڵێم خەڵکینە بۆم نایەتە بەر مەددی حیساب
خولاسە جێبەجێ بووین ڕیزێ لە خوار ڕیزێ لە ژوور
هێنایان هەر بەدوو کەس سینی یاپراغ و کەباب
ئەوی مەقبوول بێ لە لای خەڵکی قسەی موختەسەرە
بوو بەهاوسینیی من زۆرخۆرەکەی خانە خەراب
هەموو جارێ چواردە یاپراغ و دوو جووت نانی قەوی
بای دەدا لوولی دەدا قووتی دەدا میسلی دەواب
چنگی گورگی کە بەیەک حەملە لە گۆشت ڕامالی
هاتە یادم ساعەتی زەحمەتی مەڕ جەوری قەساب
دەروونی هاتە جۆش و تەلەبی دۆی ترشی کرد

کاسە دۆی نایە سەر و دوو قومی لێدا بەشیتاب
ئەلقیسسە ئەو شەوە بەدبەختە وەهای کرد بەخورش
وەختە بوو قیرتەبەق و نان لە مەلا بێتە جواب

سالم لەو وێنە شیعرییانەی بۆ زۆرخۆری بەکارهێناوە موبالەغەی کردووە بەجەوهەرێک ئەدگاری کۆمیدی بەبەرهەمەکە داوە. زۆرخۆرەکە هەر پارووییێکی بریتی بووبێ لە چواردە یاپراغ و دوو جووت نان، واتە چوار نان، ئەمە ڕەنگە بەهەندێ زۆرخۆر بکرێ، بەڵام ئاسایی نییە و زۆربەی خەڵک ئەوەندەیان بۆ ناخورێ، لەبەر ئەوە ناوەرۆکی ئەم شیعرە بووە بەمایەی پێکەنین.

- ٣ -

لە شیعرێکیدا سالم وا خۆی پیشانی خەڵکی دەدا کەسانێک بێ لە زەریای خۆپەرستی نوقوم بووبێ، لە خۆی بەولاوە هیچ شتێکی دیکە نەبینێ، بەڵام لێرە پیاو دەبێ وا بۆ مەسەلەکە بچێ سالم مەبەسی نەتەوەپەرستییە، واتە ئەگەر میللەتی خۆی هەموو مافێکی بەدەست نەخستبێ بەو چی، نەتەوە و خەڵکی دیکە سەربەست و ئازادبن. لێرەدا بیری شاعیر ڕەنگدانەوەی ئامانجی میللەتێکە لەبەر ئەوە ئەم بیروڕایانەی بەخۆپەرستی دواکەوتوو بۆی حسێب ناکرێن و لە مرۆڤایەتیش دوور نەکەوتۆتەوە.

هەروەها لەم قەسیدەیەدا سالم لاپەڕەییێکی تری فەلسەفەی ژیانمان بۆ دەکاتەوە. باوەڕی سالم لێرەدا ئەوەیە خەبات لە نێوان دوو هێزدا لەناوەوەیە. ئەم دوو هێزە (من) و (تۆ)ین. (من) لە لای ئەو میللەتی کوردە، (تۆ)یش تورکە عوسمانییە داگیرکەرەکانن. ئەم دوو هێزە دوژمنی یەکترین، سەرکەوتنی هەرلاییێکیان جێگەی ڕەنجاندن و دڵگیری لاکەی تریانە، جا ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەیە کامە لا لەسەر هەقە، پێویستە لایەنگری ئەو لایە بکرێ، بێ گومان کوردە ژێرکەوتووەکان کە بەزەبری سونگی دیل کرابوون، لەسەر هەق بوون و تورکە خوێنخۆرە داگیرکەرەکان لەسەر ناهەق بوون، بۆیە دەبێ تەنیا لەبەر ڕۆشنایی ئەم بیروباوەڕانەوە تەماشای ئەم قەسیدەی خوارەوە بکرێ، ئەگینا دەبێ سالم بەشاعیرێکی دڵڕەقی خۆپەرست لە قەڵەم بدرێ، ئەمەش لە ڕاستییەوە دوورە.

ئەگەر نەخلی مورادم بێ سەمەر بێ
بەمن چی باغی عالەم جوملە بەر بێ
ڕەقیب! یار ئەو بەمن بۆ سێ کەرەم کا
بەتۆ چی گەر هەمووی شەهد و شەکەر بێ
لە وەختێکا سەری خۆم بێ کولاه بێ
بەمن چی تاجی شاهی پڕ گوهەر بێ
ڕەقیب ئەمجا لە دلبەر ڕامە بۆ من
بەتۆ چی گەر هەموو شام و سەحەر بێ



کە خۆم ڕەختی غولامێ شک نەبەم هیچ
بەمن چی خواجە گەر زەڕڕین کەمەر بێ
ئەیا دوژمن کە بەختم هاتە یادی
بەتۆ چی گەر قەبای شاهیم لەبەر بێ
لە کونجێکا لەگەڵ یار ئەر بنیشم
بەمن چی عالەمێ زێڕ و زەبەر بێ
ئەرێ حاریس کە مونعیم پێم کەرەم کا
بەتۆ چی سەد تمەن گەر بیشتەر بێ
بەنەومێدی دەرم کا گەر لە دەرگا
بەمن چی تاق و حوجرەی پڕ لە زەڕ بێ
کە (سالم) بازی دەوڵەت بێتە سەر من
بەتۆ چی دوژمن ئەر خاکی بەسەر بێ

ئەم شیعرە هەوەسێکی شاعیرانەیە، دوور نییە سالم بۆ ئەوەی وتبێ خوێنەر بڵێ شاعیرێکی بەدیمەنە لە هەموو بابەتێکی وتووە. نابێ ئەو تیۆرییە لە بیر بکرێ کە دەڵێ؛ گیانی ئیستێتیکا سنووری نرخی هونەری داهێنان دەکێشی و دیاری دەکا نەک ئیدیۆلۆجیا و بابەت و ناوەرۆک.

## شیعری داشۆرین (هەجوو)

بابەتی شیعری داشۆرین لە بەرهەمی سالمدا کەم بەرچاو دەکەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا بایی ئەوەندە شیعری هەیە وەک نموونەییێک لە هونەری داشۆرین دیوانی شیعری کوردی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم ڕەنگین بکا.

- ١ -

سالم لە شیعرێکی داشۆریندا ئەستۆی «برایم ئاغا»ییێکی گرتووە، ئەوەی با بەدەواری شڕی ناکا، ئەو بەبرایم ئاغای کردووە:

فەرەنگ و داسنیی و ئەرمەنی و جوو
نوسەیری و دەیلەمیی و گەبری بەدخوو
بەحاڵی من نەبن هەرگیز ئەمانە
هەزار جار ئۆف برایم ئاغا لە دەس توو
قورمساغە ئەوەندە بەد سروشتە
بەدایم خوێرییە وەک شیری سەر کوو

له دەنگی جۆرە جۆری سوێسکەکانی
دوو گوێی سووکم بەجارێ هەردوو کەڕ بوو
وەرن سەیر کەن لەبەر چینەی کەوی شێن
کە عالەم گەردە هەروەک تۆزی ئۆردوو
قەجەر ناوت بەچاوی خۆم نەبینم
کە قوشجی بازی تێبەردا بە قووقوو
کەوە دۆمت شەڕانی و کەو بەزێنە
ئیلاهی دۆمەژن لێی نێ بەکاردوو
شەپۆلت شەڕکەر و چاک و پەسەندە
شەپۆل داسا لە خوێنا یاخودا زوو

ئەو برایم ئاغایەی کەوتۆتە بەر نەشتەری سالم وەک کەسێکی کەوباز تەماشای دەکا، یاخۆ بەخەیاڵ کردوویەتی بەکەوباز بۆ ئەوەی هەندێ دیمەنی کۆمیدی لە کەو و سوێسکە و کردەوەکانیان لە چینە و خوێندنی قاسپە قاسپدا دروست بکا.

کەوە لاڵت مەزەندە زۆر عەزیز بوو
شوکور بۆیە لەبەر بێنی دەراتبوو
کەو و سوێسکە و قەفەس دانێن لە هەر لا
دڵی زەرد و برایم ئاغاش بەمردوو
بەغەیرەز ئەم کەوانە و باڕەکانیش
سەری ئاغا بەکوزی ژنی داچوو
لەسەر من قەرز و فەرز و شەرت و عەهد بێ
ئەگەر حاڵی برایم پاشا وەها بوو
لە سورمەی شادمانی هەردوو چاوم
وەها ڕەش کەم وەکو پەڕی پڕ ئەستوو
کەوی لۆتی بەکەیفی خۆت بخوێنە
خودا وای کرد کە حاڵی من وەها بوو
ئیلاهی قارەکەوتان قەت نەمێنێ
چەقەڵ بیخوا سەر و سنگ و پەلوپوو
برایم ئاغا لە قوڕنیشێ سەراپا
وەکو باب مردووان بۆی بکا خواروو



سالم لە سەرانسەری شیعرەکەیدا لە گێتیی کەو و کەوبازی ناچێتە دەرەوە، کەوەکان ئاسایی نایەنە بەرچاوی، بەڵکو وەکو خاوەنیان خوێڕی و نزمن. لە کاتێکدا شاعیر لە برایم ئاغا هەڵدەچێ نەک تەنیا کەو و باڕەکانیان بۆ ناوگەڵی ژنی دەنێری، بەڵکو سەری برایم ئاغا خۆشی.

- ٢ -

لە شیعرێکی دیکەیدا سالم (ڕەشە) ناوێک هەجوو دەکا، ئەمە سووکە ناوی (ڕەشید)ە. بەزۆری ئەم کەسە بوونی نییە، بەڵکو دروست کراوە، بۆ ئەوەی ناوەکە لەگەڵ وشەی (ڕەش) بگونجێ کە لە کوردیدا بەمانای سمت هاتووە. ئەم شیعرە هەجوێکە شاعیر تەنیا خەریکی ڕەشی ڕەشەیە بۆ ئەوەی هەندێ وێنەی ڕەوانبێژی لە ئاواز و مۆسیقای دەنگی تیپەکان دروست بکا، هەروەها (ڕەشە)ش وەک کابراییێکی حیز بخاتە بەرچاو، لە کوردەواریدا ئەم سیفەتە مایەی سەرشۆڕی و نزمی خاوەنەکەیەتی لە کۆمەڵدا.

ڕەشە تیغی شکەمی کەر بەڕەشت
ڕەشە پاپاغی ڕەشت ڕاست بەڕەشت
ڕەشە هیندووی خەبیست میهمان کەم
بەڕەشی خۆی ڕەشەگیر کا لە ڕەشت
تاوی دا تاری ڕەشت مەترەقی تەڕ
ڕەشە دوور بێ ڕەشی مەردم لە ڕەشت
ڕەشە نازانی لەبەر چی ڕەشە مووت
دایکوتاوە ڕیشە ڕەشە لە ڕەشت
ڕەشە زەربی گەل ئەگەر زەربی کەسە
ڕەشە مەشاکی کەری ڕەش بەڕەشت
چوارچێوەی کورسی بەپشتی کەفەڵت
ڕەشە وەک تاقی خەلووزانە ڕەشت
مەسرەعی ماوە شەریتەی وەسفت
تا ڕەشە ماوە، ڕەشە سوور بەڕەشت

لەم شیعرەدا بێ گومان شاعیر مەبەسی داشۆرینە، بەڵام بەڕاستی لە ئەدەبی کوردیدا داشۆرین هەرچەندە بابەتێکی سەربەخۆیە و لە شیعری کراوە (سێکس) جیا دەکرێتەوە، بەڵام ئەو دوو مەبەسە لە یەکتری وەردەگرن، وەکو لەم شیعرانەی سالمدا دەردەکەوێ، لە بنجدا مەبەسی شاعیر داشۆرینە، بەڵام لە شیعری کراوە ڕزگاری نەبووە و لەم بەڵگانەدا ئیمایێکی سووک هەیە بۆ ئەندامە شارراوەکانی ژن و پیاو.

## شیعری شین و شەپۆڕ و ماتەم

سالم ماتەمنامەی کەمە بەشیعر، ئەوەی هەیەتی بۆ کەسی دیاریکراو نەوتراوە لە خزم و دۆست و برادەرانی. شین و شەپۆڕی تێکەڵ بەلایەنی کۆمەلایەتی و سوارچاکی کردووە، هەموو لاواندنەوەی بۆ ئازادی و سەربەستیی لە دەستچووی نەتەوەی کورد بووە کە هۆی لەناوبردنی میرنشینی بابان و ڕووخانی پایتەختە ڕەنگینەکەی شاری سلێمانی لە لایەن دەسەڵاتی تورکی عوسمانییەوە بووە.

- ١ -

لە شیعرێکیدا سالم وشەی ئەلوەداع (ألوَداع)ی عەرەبی بەمانای ماڵاوایی دوایی (مردن و کۆتایی هاتنی ژیان) دەکاتە پاش قافیە، شین و واوەیلایەتی بۆ ڕووخانی میرنشین:

ئەلوەداع ئەی مولکی بابان ئەلوەداع
ئەلوەداع ئەی ئەهلی ئیمان ئەلوەداع
وەک ئەسیری تورکمان دەمبەن بەزۆر
ئەلوەداع ئەی شاهی خووبان ئەلوەداع
موستەعیدم بۆ بیلادی ڕافزی
ئەلوەداع ئەی جانی جانان ئەلوەداع
دەشتی هیجرەت تاڵە وەک دەریایی قیر
ئەلوەداع ئەی میهری ڕەخشان ئەلوەداع
ڕووبەڕووی مەشریق دەچم بۆ مولکی (ڕەی)
ئەلوەداع ئەی قیبلەیی جان ئەلوەداع
ئەشکی دیدەم ڕەنگی گوڵناری هەیە
ئەلوەداع ئەی ناری پوستان ئەلوەداع
سیحەتی دا وەسڵی تۆ هیجری مەرەز
ئەلوەداع ئەی دەرد و دەرمان ئەلوەداع
دڵ بەرابەر زولفی تۆ وازیح دەڵێ
ئەلوەداع ئەی سونبولستان ئەلوەداع
زەخمی دڵ بۆ ئابی پەیکان توشنەما
ئەلوەداع ئەی تیری موژگان ئەلوەداع
گەرچی بۆ ئەحواڵی (سالم) بێ غەمی
ئەلوەداع ئەی نامسوڵمان ئەلوەداع



خۆشەویست و دلبەری شاعیر میرنشینی بابانە، بەدەستی دوژمنان لەناوچووە، سالم سەر ئەڵقەی لەخۆدان و شین و شەپۆڕە، بۆ کارەسات دەلاوێنێتەوە، هەموو میللەتی کورد لە سنگی خۆی دەدا و (ئەلوەداع)ەکانی شاعیر دەگێڕێتەوە.

- ٢ -

سالم کارەسات و ڕەنجەڕۆیی میللەتی کورد لە ڕووخانی میرنشینی باباندا دەبینێ، تێکشکانی کۆمەڵی کوردەواری لە سلێمانی لە ڕۆژگارانی فەرمانڕەوایی «ئەحمەد پاشای بابان» بوو، چارەنووسی ئەوە بوو لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی ئەودا میرنشین بڕووخێ، ئەم ماتەمنامەیە وەکو بەرهەمێکی شیعری دەکەوێتە بەرچاو شاعیر بۆ کۆچی دوایی ئەحمەد پاشا وتبێتی کەچی ڕاستییەکە ئەوە نییە، بەڵکو بۆ ڕووخانی میرنشین وتوویەتی، وێنەی ئەم ڕووخانەی لە ئەحمەد پاشا دیوە چونکە دوا میری میرنشین بوو.

نەما ڕەنگم بەبێ دیداری ئەحمەد
چ دڵ تەنگم بەبێ ڕووخساری ئەحمەد
سەری پڕ شۆرشم سەودایی هیجران
دوو چاوم تا سەحەر بێداری ئەحمەد
دەبارێ ئەشکی خوێن گول گول لە چاوم
وەکو لەعلی لەبی گوڵناری ئەحمەد
بینایییم تار و ئەشکم سوور و ڕەنگ زەرد
دەروون پڕ نار و لەب پڕ باری ئەحمەد
لە دەور قوتبی خەیالم وەک جەدیوار
لە مەغریب تا بەیان دەوواری ئەحمەد
زەمانە مەرکەز و ئەو قوتبەکەی ناو
دڵم دەوری نوقتە پرگاری ئەحمەد
درەختی کون فەکان ئەووەل کە نێژرا
جیهان هات شاخی پڕ گۆباری ئەحمەد
لە ژێر باری خەفەت (سالم) سەبوور بە
دەنێرێ ئەحمەدت موختاری ئەحمەد

پیاو کە ئەم ماتەمنامەیە دەخوێنێتەوە وا هەست دەکا بۆ پێغەمبەر وترا بێ، چونکە هەردووکیان ناویان ئەحمەدە و موختاریش ئەگەرچی لە بنجدا لەقەبی پێغەمبەرە، بەڵام بەهەموو ئەحمەدێکیش دەوترێ. هەرچۆنێ بێ ئەگەر ئەم شیعرە لەگەڵ ئەوەش بگونجێ بۆ پێغەمبەر وترا بێ ڕاستییەکەی ئەوەیە بۆ ئەحمەدەکەی پاشای بابان وتراوە.

- ٣ -

ڕەشبینی و توانەوە لەناو کارەساتی ژیان لە ئەنجامی ڕووخانی میرنشینی بابان لە لای شاعیر گەیشتۆتە پایەیێک لە دڵ و دەروونیدا کرمی کردووە، شاعیر ڕاستگۆ بووە لە خۆشەویستی نیشتمانی، بەشێوەییێک نەیتوانیوە بەهیچ جۆرێ ئەم مەینەتییە گەورەیە لە بیر بکا. ڕووخانی میرنشین شێت و شەیدای کردووە، چونکە سەربەستیی نەتەوە بۆ سالم ئامانج و هیوا و بیروباوەڕ بووە، ئەگینا چاوەنۆڕ ناکرێ شاعیرێکی موسوڵمان و خواناس لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا ڕوو بکاتە ئاسمان و لەباتی ئەوەی لێی بپاڕێتەوە گلەیی لێ بکا:

بۆ منی سەرگەشتە ئەلحەق پڕ فەنا بوو ئاسمان
دەرحەقم ئەمجارە یەکسەر بێ وەفا بوو ئاسمان
تێکی دا بنیادی وەسڵ و شیشەیی بەزمی شکاند
بۆ خراپەی مولکی دڵ پڕ موددەعا بوو ئاسمان
ئەلغەرەز هات ڕۆشنایی دڵ لەبەر شەمعی موراد
دەرحەقی بەختم نەسیمی سوبحگا بوو ئاسمان
چاک چاک و لەت لەتی سینەم لە ئەندۆهی فیراق
بۆ دڵی خوێنینی من تیری قەزا بوو ئاسمان
چونکە زانی دڵ موحەسسەن بوو لەناو جەیشی فیراق
وەک عەلەم لەشکری میحنەت بە پا بوو ئاسمان
تێکی دا غورفەی مورادم بوومەلەرزەی ئینقیلاب
بۆ بناغەی مولکی عیشقم بەد بینا بوو ئاسمان
وەک هوماوەردانی مەیدان چاو و ڕووی هەروا لە من
بۆ کەمینم گەردوشی ڕوو بەر قەفا بوو ئاسمان
مولکی بابان پڕ لە غەوغا خاکی کوردستان لە غەم
مایەیی فیتنە و فەساد و ماجەرا بوو ئاسمان
حەققی سوحبەت بۆ چ بەچاو نادیری (سالم) بەسیەتی
یا لە وەسڵا چەند ڕۆژێ ئاشنا بوو ئاسمان

لە دیوانی سالمدا شیعری وەسف و دڵداری لێ دەربچێ، لە شیعری دیکەیدا بۆ هەر مەبەسێک وترا بن هەست بەوە دەکرێ پیشەی هەمیشەیی شاعیر غەم و پەژارە بووە، شین و شەپۆڕی بووە بۆ لەدەستچوونی میرنشینی بابان لە سلێمانی.



## بەشی یازدەم

# شیعری کۆمەڵایەتی و نیشتمانی سالم

### جەنگی ڕووخانی میرنشین و داگیرکردنی سلێمانی

دوا هێرشی سوپای تورکی عوسمانی بۆ سەر شاری سلێمانیی پایتەخت و داگیرکردن و ڕووخانی میرنشین، کارەساتێکی گەورە بوو، هەموو نەریت و ڕەوشت و ئەدگارێکی نەتەوەیی شێواند، لایەنی سایکۆلۆجی لە هەموو شتێکی دیکە زیاتر دەروونی هاووڵاتییە دڵسۆز و نیشتمانپەروەرەکانی هەڵتەکاند و تووشی ڕەشبینییێکی کوشندە بوون.

سالم یەکێک بوو لەو کەسانەی بەچاوی خۆیان دیمەنی شەڕوشۆڕی ناو شاریان دیبوو. پیاو دەتوانێ بەخەیاڵ بڵێ شاعیر لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم وەک پەیامنێرێک خۆی لەناو جەنگەکە دیوە، ئەوەی چاوی پێ کەوتووە، شیعرییانە یاخود بەشیعر گێڕاویەتییەوە و ئەم بەرهەمە ئەدەبییەی لێ دروست بووە.

شاعیر بەم دێڕانە ئەوەی ناو دڵ و مێشکی دابوو دەگێڕێتەوە:

لێم گەڕێن با گۆشەگیر بم دەستەوئەژنۆ کەف زەنان
گێژەڵووکەی بای نەدامەت تاری کرد سەفحەی جیهان
بەزمی سەیدی ئێمە سەییادی فەلەک کارێکی کرد
ڕەنگە باڵای تیر قەددان بێتە تەرکیبی کەمان
زیعفی تالیع جازیبە وەک کارەبا بۆ خوێن و دەم
سەیری چەهرەی بەختی من کەن بوو بەڕەنگی زەعفەران
نەوبەهاری من خەزانە وەقتەکەی سوبحم تەمووز
پرتەوی ماهە غەم و چاکی دەروونم وەک کەتان
تورکی قورسی خۆر کە تالیع بوو تولووعی کرد بەڕەقس
کەوکەبەی ماهی موڕادی ئەهلی بابان بوو نیهان
دڵ لە میحنەت کەیلە مەیلی سەیری ناوشارم نییە
عەینی چاوم خوێنی تێزاوە لە داغی مەردومان
ئەهلی بابان گریە کەن بۆ خانەدان و ئاغەتان
نیمی مەحبووس، نیمی مەقتوول، نیمەیی مەنفی کران
کەوڵ بەدۆش، یا خەرقەپۆش بن تاج و کەشکۆڵ هەڵگرن

ڕوو کەنە ئەملاکی (پیترو) بچنە شاری خامۆشان
ئاگری نەکبەت لە خەرمەنهایی تالیع کەوتووە
شەمعی دەوڵەت هەر تەرف دەگرا هەموو خامۆش کران
کێ دوعای کردبێ بەسۆز ئەم ساڵ لە گشتی (شارەزوور)
وا ببارێنی لە تەن خوای تەرزە ڕوویی ئاسمان

سالم شێن و شەپۆڕ بۆ کارەساتی لەناوچوونی سەربەخۆیی میرنشینی سلێمانی دەکا، بەسەرهات ئەوەندە گەورە بوو گێژەڵووکە و ڕەشەبا گێتیی کرد بەتاریکستان. ئێمە لە خۆشیدا بووین، ژیانمان سەیران و ڕاووشکار بوو، بەڵام گەردوون (فەلەک) ئێمەی ڕاو کرد و خەڵکی ئێمە تەندروست و باڵا ڕێک بوون وەک تیر، بەڵام هەموویان لە داخانا چەمانەوە وەک کەوانیان لێ هات. بەدبەختی لەوەدایە وەک کارەبا چۆن شت ڕادەکێشی بەم جۆرە خوێنی ئێمە لە لەشمانا دەکێشرێ، لەبەر ئەوەیە چارەی بەختمان زەرد هەڵگەڕاوە و وەک زەعفەرانی لێ هاتووە. ڕووداو وای لە شاعیر کردووە بەهاری تازەی لێ ببێ بەپاییز و فێنکی بەیانییانی لێ ببێ بەگەرمای تەمووز و ڕووناکی ڕۆژ ون ببێ لەبەر ڕووناکیی مانگ، ئەو خەفەتە بەدی دەکرێ کە پەراسووی سنگی هەلا هەلا کردووە. لە بابەت هێرشی سوپای تورکی عوسمانییەوە وەک تیشکی خۆر کە هەڵدێ هەموو لایێک ڕووناک دەکاتەوە. سەربازی ئەو سوپایەش هەموو لایێکی داگیر کرد، ئەمە بووە هۆی ئەوەی کەوکەبەی مانگی ئامانجی خەڵکی بابان بزر ببێ. دڵی شاعیر پڕ لە ناسۆری ژیان دەبێ، شار بەجۆرێک تێک و مەکان بووە نایەوێ چاوی پێی بکەوێ، ئەو چاوەش خوێنی تێزاوە لە داغی خراپەکاری. شاعیر ڕوو دەکاتە خەڵکی سلێمانی و پێیان دەڵێ شێن و شەپۆڕ بکەن بۆ پیاو ماقووڵانتان ئەوانەی هەندێکیان خرانە بەندیخانەوە، هەندێکیان کوژران و هەندێکیان ئاوارە کران، ئەوەی ماوەتەوە وەکو دەروێش کەوڵ و خەرقە لەبەر بکەن و کەشکۆڵی خۆتان و تانجی میرنشین هەڵگرن و ڕوو بکەنە وڵاتی پیتر (مەبەسی پیتری گەورەی قەیسەری ڕووسیایە) بۆ ئەوەی لەو ئاقارە دوورانە کۆتایی بەژیانتانا بێ، چونکە ئاگری نەکبەت بەربۆتە خەرمانی بەخت، ڕووناکی دەسەڵاتی دەوڵەت لە هەموو لایێک کوژایەوە. دەبێ دوعای کێ بێ هاتبێتە دی و خوای تەرزە شارەزووری وێران کردبێ!

ڕاستە گەردوون چاپوکە بۆ ڕەنگی بەدرێتن وەلێ
نارژێنێ ڕەنگی بەم ڕەنگە بەموددەی سەد قران
حەلقە دەن یاران بلا ئاشفتە بەخت و تیرە دڵ
ڕۆژگار دونیای لە ئێمە کرد بەزولفی دلبەران
(شارەزوور) بەحر و (سلێمانی) لەسەر ئەم گەمیەڕەنگ
بۆ شکستی وەک نەهەنگ بۆ فیتنەیی ئاخر زەمان
ساعیقە و بەرقی نەدامەت زوڵمەتی دا شەرق و غەرب
بەردەبارانە بەمەخسوسی لەسەر مولکی بەبان



چاوی عیبرەت هەڵبڕە ئەی دڵ لە وەزعی دەهری دوون
سەیر کە ساتورکی فەلەک چی کرد بەزومرەی کورد زمان
عەرسەیی مەیدانی چەرخە ئێستە جەولانگاهی بووم
بوو بەلانەی زاغی بەدخوو ئاشیانەی بالەبان
بێ زەبان کوو کوو زەنان هەر خانەدان تێدەفکرم
عەنکەبووت خواجەنشینە جوفتی جوغدە دیدەبان
چارەسەر کەن ئەهلی دەروێش نانی مونعیمتان بڕا
لوولە بوو سفرە و نەوالە، ون کرا زەرف و خوان
ئەهلی سادات و مەلا و حاجی بلا شێن کەن بەسۆز
دەفتەری ئەهلی وەزایف دیم عموومەن حەک کران
حاکمە ڕۆمی لەسەر تەختی (سلێمانی) درێغ
کەوتە دەستی دێوی دوون موهری سلێمان ئەلئەمان

بەڕووخانی میرنشین سالم گەیشتۆتە حاڵەتێک خۆی ون کردووە، لە هۆی ڕووخانی دەسەڵات نەگەڕاوە، بیری لەوە نەکردۆتەوە کارەسات ڕوویداوە و چۆن گیروگرفت ڕاست دەکرێتەوە، تەنیا وەک شاعیرێک ئەوەی بۆ ماوەتەوە گریە بکا و بەشێوازێک بیلاوێنێتەوە و شیعرێکی پڕ لە هونەری بەرز و وێنەی جوان و بیری داهێنراو دروست بکا.

هەندێ لە وێنەکانی شاعیر ئەوەیە: لە حەژمەت ڕووخانی میرنشین گەردوون گێتیی ڕەش کردووە وەک ڕەشی زولفی دلبەران، شارەزوور زەریایە و سلێمانی کەشتیی سەر ئاوە. هەموو جێیێک بووە بەنیشتمانی کوندەبوو، ئینجا شاعیر باس لە وەزعی نالەباری خەڵکی دەکا، بەتایبەتی دەروێش و سۆفی و سەید و مەلا و حاجی و مووچەخۆرانی دەوڵەت نانیان بڕاوە، خوانی نان پێچراوەتەوە. داخی گران فەرماندەی ڕۆم (تورکی عوسمانی) لەسەر تەختی سلێمانی دانیشتووە، دێوێکی بێ کەڵک و بەدفەڕە و مۆری سلێمانی کەوتۆتە دەست. لێرەدا شاعیر تەختی پاشای بابانی سلێمانی بەتەختی سلێمان پێغەمبەر دەچوێنێ، پاشای سلێمانیش مۆری بووە وەکو مۆرەکەی سلێمان پێغەمبەر و کەوتۆتە دەست داگیرکەران.

ئەسکەمل بێنن قەراریان دەن لە جێی ئاغەلەران
مەجلیسی شوورا ئەمێستە خاسسە بۆ ئەسنافەکان
وا (کەریم ئاغەی نەنێ) تەدبیری هەستەی جاف دەکا
(خالە هۆمەر) دارۆغەی شار و مودیر (حاجی ئەحان)
کەس نەچێتە پێشەوە (حاجی غەنی) تەدبیرییە
مەئمووری تەبتی نوفووسە و شاغیلی باجی دوکان

مەجلیسێ وا بێ موحەققەق دوودی گۆگرد عوودە بۆی
(دەروێش ئاغا) بوو لە جێی (مستۆ) هەموو شەو نەغمەخوان
عەزل و نەسبی کرد بەتەدبیری کەیا مەنسووبی ڕۆم
قاوەچی (ئەولای قالە) بێتو سواران پالەوان
ئالوگۆڕی مەنسەبی دوو شەخسی عالیجا کرا
(مەحموود ئاغای) زل حەکیم باشی حەمامچی (بابەجان)
(حاجی میرزا) کەوتە ناوشار و تەرازووی شاردەوە
مەسرەف ئاسا حاسیبە بۆ خاسسە جاتی (مالوان)
کێ دەکا تەقسیمی مەنسەب وا موقابیل شانی شەخس
بۆ (عەزیز) سەربازە کۆم و (حاجی قادر) ئاشەوان
میری (خورماڵ) و (دەلێن) ئەم ساڵ مەزەننە (ساڵح)ە
باز بە (جەببار)یان سپارد باقل ئومووری دۆمەکان
(ئاغە تەها) مەشوەرەت جۆیە لەگەڵ سەر کاتبی
وا دەزانم وەرگری حوکمی چیا سەوز و شوان

لەم دێڕانەدا و لە هەندێ دێڕی دیکەی ئەم قەسیدەیە ناوی هەندێ کەس هاتووە. ئەم ناوانە لە زۆربەی دەسنووسی شیعری سالمدا نەنووسراونەتەوە و جێی ناوەکان بەبەتاڵی ماونەتەوە بۆ ئەوەی ناوەکان بەنهێنی بمێننەوە. بێ گومان هۆی ئەم کارە ئەوەیە خوێنەر ئەو کەسانە نەناسێ کە ناویان هاتووە، نەوەک ئەگەر بەخراپە باسیان لێوە کرابێ بۆ کەسوکاریان خراپ بێ و ناویان بێ بزڕێ، بەتایبەتی ئەوانەی ئێستا لە ژیاندان. دەسنووسە گرنگەکەی «نەجمەدین مەلا» کە لای ئێمە پارێزراوە ئەو ناوانەی نووسیوە و ئەو تێکستانەی لێرە دەخرێنە بەرچاو لەو دەسنووسە وەرگیراون.

لەم بڕە شیعرەدا سالم باس لە وەزعی ناوشاری سلێمانی دەکا لەدوای ئەوەی تورکە عوسمانییەکان داگیری دەکەن. شاعیر لێرەدا زیاتر لە هەڵسوکەوتی هەندێ کەس دەدوێ، ئەمانە هەندێکیان خراپەیان لەگەڵ کۆمەڵ کردووە بەوەی یارمەتی داگیرکەریان داوە، هەندێکی دیکەیان هەڵوێستی نیشتمانپەروەرییان بووە، لەوانە ناوی کۆمەڵێک خەڵکی ئەو سەردەمە دەبا وەکو: (کەریم ئاغای نەنێ و خالە هۆمەر و حاجی ئەحان و حاجی غەنی و دەروێش ئاغا و مستۆ و ئەولای قالە و مەحموود ئاغا و باباجان و حاجی میرزا و عەزیز و حاجی قادر و ساڵح و جەبار و ئاغە تەها). جگە لەوە ناوی شوێنی جوگرافی وەکو (شارەزوور و سلێمانی و مالوان و خورماڵ و دەلێن) و هی دیکە دەهێنێ.

(بالەنی) و (ئەولا سووتەڵ) هەردوو شەریکی قیسمەتن
تەبتی توغرا بوون بەحوکمی (ماوەت) و سەمتی (قەشان)



وەک مەگەس ڕۆمی لە لایان فەرقی پاک و پیس نەبوو
لەقلەق و نێری دەچن بۆ زابیتی نەهری (موان)
بۆ گەڕانی دەوری شار ئەم شەو (مەلا یوونس) دەچێ
مشتەکەی گورز و کەمەندی کشتەک و دەرزی سینان
(حامید) و (وەستا حوسێن کل) وا لە شارا گیزمەچین
هەردوو بۆ خوێن ڕشتنی کوو بەکوو توشنەن بەجان
شیری قەمچی، تیری دەرزی، خڕکی نێو گورز، زەرعی ڕم
نخ کەمەند، ئەسپە ڕووت و جەوشەنیەتی بەر بەر ددان
غەڵبە غەڵبی هەی بکوژ هەڵسا لە دەشتی (چوارباغ)
(قادری دەللاک)ە هەر شەو تا سەحەرگە پاسەوان
کەس نەلێ ڕۆمی لە تەسخیری مەمالیک چابوکن
سستیی بەختی عەشیرەت بوو بەچالاکی ئەوان
وەرنە ڕۆستەم وەک ئەوان کەی دێتە دەست بۆ چابوکی
وا بەغیرەت، وا بەجورئەت وایەل و ساحیب سینان
وەقتی حەملەی ڕۆژی مەیدان موددەعی وا کز دەکەن
دێتە لەغزش پێی ریکاب و سست دەبێ دەستی عینان
شێری بیشەی مولکی بابان مەردی مەیدان زاهیرە
گەر کەسی بینێتە خاتیر دەستوبردی گەرمیان

لە بەشێکی تری ئەم قەسیدەیەدا دیسانەوە شاعیر خەریکی ناوهێنانی هەندێ کەسە لە خەڵکی شار کە دەوریان بووە لە شەڕ و ئاژاوەکاندا وەکو: «بالەنی و ئەولاسووتەڵ و مەلا یوونس و حامید و وەستا حوسێن کل و قادری دەلاک». جموجۆڵی و تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵ تەنیا پێوەندی بەشاری سلێمانییەوە نەبووە، بەڵکو ناوچەکانی نزیک و دەرەوەی شاری سلێمانی دەوریان بووە، وەک (ماوەت و قەشان و زێی موان و چوارباغ) و هی دیکە.

گیانی نیشتمانپەروەری لە لای سالم بۆتە هۆی ئەوەی تەنیا ئازایی لە جەنگاوەری کوردی پارێزەرانی سلێمانی ببینێ و، هەمیشە ئەمانە وەک ڕۆستەم بکەونە بەرچاوی و، کەچی جەندرمەی ڕۆمی (تورکی عوسمانی) لای شاعیر دەبن بەڕەمزی ترسنۆکی.

مەردی مەیدان هاتە جەولان باز لە دەنگی تەپڵی باز
حەیتە وەک شاهۆیی گێژ و کورد بەمیسلی بالەبان
مەرگی تورکانی جەفاجۆ سەد قەدەم پێش گوللە کەوت
تاپ لە ئەنگوشتی بۆسی، ئەو گەیشتە سەر نیشان

ئیختیراعی تورک له دڵدا مەشق جۆی شێوەی شەغال
یەککەتازی کورد له دونبال هەروەکو شێری ژیان
خۆ لە بیمی تیغی جانفرسای عەزیز، ئەو ڕۆژه تورک
میسلی کەو باڕی هەڵۆ بین شەش جیهەت لێک دابڕان
هەرکە شوعلەی ماهیچەی تیغی بەرەهنەی بوو زوهوور
وەک قوڵنگی شەوچرا بین تێکەڵاو بوون ڕۆمییان
گوللەتۆپ وەک تۆپی قایش بوو لە ئاقار غیرەتی
تەبع جۆیای بەزمی شیلگ بوو له جێی سینەکەمان
بۆ قوماری مەعرەکە تیغی بەڕووتی نابڕێ
بۆ جەلای جەوهەر لە خوێنی موودەعی وەردەگرێ قان
ئیسمی قابیز بوو لە جێی جەوهەر له حەربەی ڕمی ئەو
وەک چەپەر پۆستەی ئەجەل هات و بەتورکی دا نیشان
تورک وەکو تیلکی زەعیف و کورد ئەسەدخوو هاتنە پێش
جەنگجۆ بوون یەک بەیەک هەر سوو وەکو بەبری بەیان
سرری مەخفی ڕۆمیان زانیوته بۆ زاهیر دەبوو
نووکی ڕم دەیخوێند لە دڵیا تا هەموو ڕازی نیهان

لەم دێڕانەدا شاعیر هەوڵی ئەوە دەدا لە جەنگی ناوشاردا ئازایی کورد بخاتە ڕوو، جەنگاوەری کورد لە بەکارهێنانی چەک پسپۆڕ و شارەزا بووە، مەشقی سیلاحشۆڕی زۆر بووە و لە نهێنییەکانی چەک و سیلاحی جەنگی ئەو سەردەمە گەیشتووە. لەو شیعرەدا سالم لە ڕووی دڵسۆزی و موبالەغەی شیعرییەوە تورک بەتوولە سەگی بێ توانا و، کورد بەشێری نەڕی بەهێز دەچوێنێ، بەڵام ڕاستی ئەوە نەبووە، بەڵکو سوپای تورکی عوسمانی لە کورد بەهێزتر بووە، لەبەر ئەوە جەنگاوەرانی بابان نەیانتوانیوە بەرهەڵستی بکەن و شار لە لایەن ئەو بێگانانەوە داگیر کراوە.

وەختە بۆتان پیرەهەنیان بێتە جامەی ئاخیرەت
هەر لەناکاوا نیزام دایان لە ڕێزی باڵەبان
هەی خوداڕۆ لەودەمە چی کرد تەقەی تۆپ و تفەنگ
سەر زەمین تاریک و دونیا تۆز و کەڕ گوێی ئاسمان
ماهی تالیع ڕێی مەحاق و ڕۆژی نەکبەت جیلوەگەر
خەرمەنی شادی لەبەر با بەرقی غەم ئاتەش فشان
لاغری تالیع شکاندی حەسرەتا بازووی قەوی
ئەختەری بورجی موزەففەر خۆی لە ئێمە کرد نیهان



گەرچی پێشاپێش بەهەیبەت بوون و ئازا چوونە پێش
حەسرەتا باز هەم نەیانزانی نیزام وا بێ حەیان
پێشی دەمیان شیلکی تۆپ پشتی سەر ئەو ئاگرە
گەییە چەرخی هەفتەمین لەوعانەدا ئاه و فوغان
گوێ فەلەک کەڕ بوو لەبەر ناڵەی نەفیری ئەهلی شار
لامەکانی گرت سەدای ناڵە و فوغان و ئەلئەمان
موددەعی کوێر بێ، نیزام ئیفلیج، مەکان زێڕ و زەبەر
(میری سورداش) و (ئەمینە)ی پیاوی هەردوو ئەنگوان
گەر عەشیرەت گریە کەن هەریەک هەتا دەمرن کەمە
کوشتنی میر بای موخالیف بوو بەشەمعی دوژمنان
ڕۆژی قەتل ئەمڕۆیە ئەلحەق (وا حوسێنی) پێ دەوێ
بۆ ئەدای تازی سەراسەر نیلگوونە ئاسمان

بێ سەروبەری و ئاژاوەی ناو کۆمەڵ بەهۆی جەنگی ناو کۆڵانەکانی سلێمانی گەیشتبووە ڕادەیێک سالم کراسی بەری جەنگاوەران بکا بەکفنی ئەو شەهیدەی بەرەو گێتییەکەی دیکە کەوتۆتە ڕێ. تەقەی تۆپ و تفەنگ سەر زەوی تاریک کرد و گوێی ئاسمان کەڕ بوو، مانگی یەک شەوە بوو بەمانگی مەحاق، بەختی بێ هێز و لاواز بەسەر بازووی بەهێزدا زاڵ بوو. کارەساتێکی ئەوتۆ بەسەر کورددا هات لە پێشەوە بەتۆپ و لە پشتەوە ئاگرباران کران، ئاه و ناڵەیان گەیشتە ئاسمانی حەوتەمین.

شاعیر دەستەو دوعا دەوەستێ بەدەم لاواندنەوەوە دەڵێ: دەسەڵاتی تورکی عوسمانی کوێر بێ، سەربازی تورک ئیفلیج بێ، زەوی بلەرزێ و بقڵیشێتەوە و زێڕ و زەبەر بێ. لەو دیمەنە تراجیدییەی شاعیر دایهێناوە میری سووررداش و ئەمین یا ئەمینەی پیاوی دەکوژرێن. سالم ڕوو دەکاتە خەڵکی و دەڵێ: هەتا مردن ئەگەر بۆ کوشتنی میری سووررداش بگرین و شیوەن بکەن هێشتا کەمە، ئەم کارەساتە بوو بەخۆشی بۆ دوژمنان. ئینجا شاعیر دەڵێ: ئەمڕۆ بەڕاستی ڕۆژی کوشتن و خوێن ڕشتنە، لەخۆدانێکی گەرەکە وەکو ئەو (وا حوسێنی)یەی بۆ شەهیدی کەربەلا دەکرێ، لەم تازییەیەدا سەرانسەری ئاسمان لە شین و شەپۆڕدایە.

یادگاری حاکمان و جانشینی سیلسیلە
نامراد و نەورەس و مەقسەد نەدیو و نەوجەوان
سەد کە ڕۆژی گریە بوو ئەمما ئەمن زۆر پێکەنیم
(پوورە ماتان) (ئەحمەد ئاغا)ی بردە شکلی دۆمەکان
دەرپەڕین باز مەیلی ئیقدامیان نەبوو لەو بیدعەتە
حەسرەتا یەک دڵ نەگەینە شیوەکەی گردی گولان

مەیلی لانیان بوو وەکو کەروێشکی پاش ڕاو هاتنەوە
دەرنەچوو چا بوو بەحەملەی دێڵە کەهیا کوڵ کران
سێ بلۆک لای پشتی گرت و سونگی دەوران هاتنە پێش
حەسرەتا باز هەم نەیانزانی نیزام وا بێ حەیان
سەر بلۆکیان (خاڵەکەی هەورامی)ی و (قالەی شەریف)
هەم رەفیقیان بوو (عەزیزە حیزەکەی) چووچانیان
ئاهی ئەم حاکمانە تەحقیقە ئەگەر نەگری نیزام
قەومی نوحیش دەچنە جەننەت بێ شک و شوبهە و گومان
سەرفی نەقدی ڕووحی شیرین بوو هەتا پەروەردە بوون
بەچکە گورگ ئاسا لە ئاخیر چوونە کۆزی دوودمان
فەرقی فەخری میرەڵایی گەییە بەهرام و ئەسەد
کەوتە قەعری چاهی غەم لەو حاڵە میری بازیان
باز وەکو بازی تەوار دەورێکی کرد و هاتەوە
دەوری کەهیا و شاری گرت دیسان بەرارای نۆکەران

ئەو کوژراوەی کە سالم ناوی نەهێناوە لەوانەیە «عەزیز بەگی بابان» بووبێ، چونکە ئەو سەرکردەی لەشکری بابان بوو لە سلێمانی لە سەردەمی هێرشی تورکی عوسمانی، لەم قەسیدەیە و لە شیعری دیکەی سالمیش ناوی هاتووە. لەم هەڵوێستە تراجیدییەدا کە مایەی گریان و پەژارەیی بوو بۆ شاعیر بەپێچەوانە گەڕایەوە و بوو بەمایەی پێکەنین، چونکە ئەوەی «پوورە ماتان» بەئەحمەد ئاغای کرد لە ئەنجامی ژێرکەوتنیدا با بەدەواری شڕی ناکا. وا دەردەکەوێ لە کاتێکدا لەشکری ئەحمەد ئاغا بەزی بێ دووبارە خۆیان کۆکردبێتەوە و توانیبێتیان بەرگری بکەن تا شیوەکەی لای گردی گولان، ئیتر لەوێ خۆیان نەگرتووە و بڵاوەیان لێ کردووە. گردی (گولان) ناوی کۆنی گردی (مامەیارە)ی ئێستا بووە لە سلێمانی. لەو کاتەدا کەهیا ناوزەدی سەرۆکی شارەوانی بووە، دەوری لە جەنگدا بووە، بەڵام نەیتوانیوە بەرگری بکا، بۆیە سالم بەچاوێکی نزم تەماشای کردووە. لە هەڵوێستێکی دیکەدا سێ بلۆک سەربازی بابان لەژێر فەرماندەی (خاڵەی هەورامی و قالەی شەریف و عەزیزی چووچانی) بوون، ئەمانە لە پراکتیککردنی یاسای جەنگ سەرنەکەوتن و لەشکری بابان لەسایەی هەڵەی ئەمانە زیانی زۆری لێ کەوت.

ئاغەلەر وەک گورچکی گا، هەریەکە فیکرێ لە دڵ
خۆ نیزامیش میسلی سووسەن جوملە دووڕوو و دووزمان
هاتە ژێر پاساری تەنگ لەشکر ڕیکاب ئەندەر ڕیکاب
کەوتە سەر کۆڵان و سەیریکە عینان ئەندەر عینان



بوو بەجێی بەبر و غەزەنفەر کووچە کووچە ناو سوقاق
سەر محەللە ڕەنگی بیشەی گرت لە نێزەی جانستان
ڕەنگی سەحرای مەحشەری بوو شیوەکەی لای پیرمەسوور
گرمەگرمی تۆپی ڕۆمی هەوهەوەی سوارەی بەبان
بوو بەجارووبی محەللە هەر تەرەف پەنجەی پەڕیو
پەی کراو بێ پێ لە مەیدان پەهلەوانی پاڵەوان
(سەن سەن)ی سوارەی نیزام و (گەل ئولان)ی تورک ئوشاغ
بگرە بگرەی کورد زمان و ئاخ ئاخی تورکمان
قەهرناک و سەر بو رەهنە ئاتەش ئەفشان حەملەوەر
جەنگ جۆ بوون یەک بەیەک هەر سوو وەکو بەبری بەیان
بەختی سووتێ سا لە ڕێی هەق، حەق حەقی لێ وەرگرێ
بەدنمەگ گیری نمەگ بی وەک ئەوان دایان بەمان
بۆ مەداری نان عەشیرەت قەت مەدارێکی نەبوو
ئاشەکەی تەبعی بەئاوی کەیدی ڕۆمی هاتە دان
شێری بیشەی موڵکی بابان بوو عەزیز ئەمما درێغ
وەک گڕی دا موسکی بێ قەومەکەی زوو هەڵوەشان
گەرچی میسرە شارەزوور ئەمما خراپە بێ عەزیز
ڕوو دەدا لەم خەلقە ئاخر حالەتی کەنعانیان
سا فەلەک کەیخوسرەوی خوێنی سیاووش گوم مەکە
رۆستەمی سانی عەزیزە موددەعی تووڕانیان
دیدە نابینایە وەک یەعقووب لە هیجرانی عەزیز
تۆ خودا ساحیب مەکان و تۆی خودایە لامەکان
کەوکەبەی بەختی لە چاها وا بەپرتەو بێتە دەر
شەعشەعەی ئەمری مونەووەر کا زەمین و ئاسمان
جەنگەڵی شەهبازی بازی بازیانی باز نەوی
فش هەڵات کەهیا لەسەر بەیزەی تەمەع وەک ماکیان

سالم وەسفی دیمەنێکی شەڕەکە دەکا لە دەوروبەری گەڕەکی پیرمەسووری سلێمانی. گرمەگرمی تۆپی دوژمن و هەوهەوەی هاندانی سوارەی بابان بۆ هێرشبردن کردبووی بەڕۆژی مەحشەر، لەو جەنگەدا ئەوەندە

دەست و پەنجەی پەڕیو زۆر بوو وەکو گەسکێک بوو بەبا کۆڵانەکانی گەسک دەدا. سەربازی کورد و تورک بەرامبەر یەکتری بوون و تێکترنجا بوون و هەڵمەتیان بۆ یەکتری دەبرد. قیژوهۆڕ و هاوار سەری کاس دەکرد، سەربازی سوارەی تورک بەزمانی خۆی (سەن سەن)ی بوو، واتە (تۆ... تۆ) و، کوڕە تورکیش (گەل ئولان)ی بوو، واتە (کوڕەکە وەرە)، جەندرمەی تورک ناڵە ناڵیان بوو، کەچی کورد بگر بگرەی بوو.

لە کۆتایی قەسیدەکەیدا شاعیر باس لە سەرکردەی جەنگەکە عەزیز بەگی بابان دەکا، بەشێری ناودارستانی وڵاتی بابانی دادەنێ. لە دواییدا ئاخ و داخی بۆ هەڵدەکێشی لەبەر ئەوەی لەم شەڕەیدا سەرنەکەوت. ئینجا شاعیر دەکەوێتە بزواندنی سۆز بەداهێنانی وێنەی شیعری. میسر و شارەزوور بەرامبەر بەیەکتریان دادەنێ، بەراووردیان دەکا، بەڵام دەڵێ شارەزوور بێ عەزیز بەگی بابانە، ئەمە نابێ ڕوو بدا، چونکە میسر بێ عەزیزی میسر (پووتیفار)ی وەزیری فیرعەون نەبووە. بەم جۆرە کوردی بابان دەربەدەر و ئاوارە بوون وەک کەنعانیانی فەلەستینی کۆنیان لێ هات.

ئینجا سالم ڕوو دەکاتە گەردوون و پێی دەڵێ: تۆ کە «خوسرەوی» نابێ خوێنی سیاووش ون بکەی، ڕۆستەمی دووەم «عەزیز بەگی بابان»ە و تۆرانی دەسدرێژییان کردووە، سالم دەڵێ: چاو کوێر بووە وەکو یەعقووب لە دووری عەزیز بەگ، با پرتەوی ئەستێرەی بەختی لەو بیرەدا بێتە دەر و ئاسمان و زەوی ڕوون بکاتەوە.

لەدوا دێڕی قەسیدەکەدا شاعیر مەبەسی لە شەهباز (شای باڵندەی باز) عەزیز بەگە، ئەمە ئەمیری بازیان بوو، بەگیرانی یا ڕزگاربوونی لە دەست دوژمن میرنشینی بابان کۆتایی هات، بەکورکبوونی گەهیا لەسەر هێلکەی تەمەع و چاوچنۆکی نیشتمان دۆڕا.

### شێری میرنشین عەزیز بەگی بابان

عەزیز بەگ کوڕی عەبدولڕەحمان پاشای بابان و مامی ئەحمەد پاشای دوا میری بابان بوو. ئازایەتی ئەم سوارچاکە لە کۆمەڵی وڵاتی سلێمانیدا بووە بەچیرۆک و خەڵکی وەک نموونەی قارەمانیەتی و نیشتمانپەروەری دەیگێڕنەوە. عەزیز بەگ هاوڕێی نزیکی سالم بووە، جگە لەوە برادەرایەتی لەگەڵ بنەماڵەی ساحێبقڕان بووە، ماوەییێک هاوکار و برادەری «مەحموود بەگی ساحێبقڕانی» خزمی سالم بووە. ئەوەی پێویستە لێرەدا بوترێ ئەوەیە بنەماڵەی ساحێبقڕان بەچەکمە ڕەق ناوبانگیان دەرکردووە، ئەمانە لە وێنەی سوارچاک و جەنگاوەرەکانی چینی سەرەوەی کۆمەڵی ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستیان دەکرد.

سالم لە قەسیدەی داگیرکردنی سلێمانی لە لایەن تورکی عوسمانییەوە عەزیز بەگی کردووە بەسەرکردە و قارەمانی جەنگەکە. ئیتر لەدوای ڕووخانی میرنشین و چوونی ئەحمەد پاشا بۆ ئەستەموول دەسەڵاتی عوسمانی «عەبدوڵڵا پاشا»ی بەپلەی قایمەقام لە سلێمانی دامەزراند. بێ گومان خەڵکەکە لەم لایەنەوە بوون بەدوو بەشەوە، هەندێکیان بەپیاوی دەسەڵاتی تازە وەک تاوانبار بەرامبەر بەکوردایەتی دەکەوتنە بەرچاو، بەشێکی دیکەیان خەباتیان دەکرد لە پێناوی گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی کورد. عەزیز بەگی بابان و مەحموود بەگی ساحێبقڕان سەرۆکایەتی ئەم تاخمەیان دەکرد. وا دەردەکەوێ عەبدوڵڵا پاشای قایمەقام



لایەنگری دەسەڵاتی عوسمانی بوو و هەڵسوکەوتی لە دژی عەزیز بەگ بوو.

عەزیز بەگ و مەحموود بەگ لەدواییدا یەکتریان گرت و بەهۆی یارمەتی عەشیرەتی هەمەوەند و هەندێ عەشیرەتی تری ئەو ناوە ڕێککەوتن بچنە مەیدان لە دژی عوسمانی. لە دوو شەڕی گەورەدا لە نزیک کرپچنە و لە دەربەندی بازیان بەشدارییان کرد، بۆ ئەوەی ڕێگە لە لەشکری والی بەغدا بگرن و نەگاتە سلێمانی. هەرچۆنێ بێ مەحموود بەگ بەفێڵ لە کەرکووک دەکوژرێ، دەسەڵاتی عوسمانی ئازاری زۆری هەمەوەندان دەدا. لەدواییدا عەزیز بەگ لە (بانی مەقان) ڕێگە لە لەشکری بەغدا دەگرێ، لەم شەڕەدا سەرناکەوێ و لە ئەنجامدا ئەویش دەکوژرێ.

هەموو ژیانی جەنگاوەریی عەزیز بەگ و ئەو شەڕانەی فەرمانبەری دەکردن بوون بەسەرچاوەییێک بۆ ئەو شیعرە مەدح و ستایشانەی سالم بۆ عەزیز بەگی بابانی وتوون، بەتایبەتی ئەم قەسیدەیە.

دەکا دونیایی پڕ شۆرش بەدایم فیتنەها پەیدا
بەنەیڕەنگ و فسوونی ئەو لە هەر سوویێ وەغا پەیدا
عەجەب ماخوولیایێ بوو دڵی دونیا موسەللەت بوو
لە سەودای موقتەزای تەبعی بەموختەس ماجەرا پەیدا
تەماشای جەوری دونیا کەن چ قەهرێکی لە خوسرەو گرت
نە بۆ تاجی نیشانی ما نە بۆ تەختی نیا پەیدا
بەمیسلی خوویی مەعشووقە دڵی دونیا لەگەڵ خەڵقی
بەدوژمن نیعمەت و لوتفی جەفای بۆ ئاشنا پەیدا
خوداوەند چادری دونیای بەدوو نییەت سەراپا کرد
برون سوور سوور و ئاوێنە دەروون هەر سوو عەزا پەیدا
جیهان گەر ڕووبەڕووی من بێ بەخوێنڕێژی زەفەر نابا
دەکەم بۆ حیرزی جان و دڵ بەچالاکی نیا پەیدا
پەناهم شەهسوارێکە گوزەر کا گەر بەئەلبورزا
دەکا زەربی سمی ئەسپی لە خارا تووتیا پەیدا
ئەگەر خورشیدی تیغی بێ بەسەر شەودا شەبەیخوون کا
دەکا بەرقی بەیەک پرتە و لە یەڵدادا زیا پەیدا
بەحوججەت نێزەگەر لێدا سوپەر وەک کاغەزی قەندە
بەهەر زەربی لەگەڵ بازوویی ئەو حوکمی قەزا پەیدا
بەبادی سمی ئەسپی گەر بکا جەولان لە مەیدانا
دەکا عومری عەدوو وەک سوبحدەم وەزعی فەنا پەیدا

لەم بڕە شیعرەدا یا لە هەموو شیعرەکەدا ئەگەر بەشوێن شا بەیتدا بگەڕێین، بێ گومان ئەم دێڕەشیعرە

دەکەوێتە بەرچاو:

پەناهم شەهسوارێکە گوزەر کا گەر بەئەلبورزا
دەکا زەربی سمی ئەسپی لە خارا تووتیا پەیدا

لە گەلێ ڕووی هونەری و جوانکاری شیعرییەوە ئەم دێڕە دەبێتە ڕەمزی قارەمانیەتی و سوارچاکی ئەو کەسەی شاعیر قەسیدەکەی بۆ وتووە کە عەزیز بەگی بابانە. وێنە داهێنراوەکەی شاعیر بەهێزە، ئەو سوارچاکە ئەگەر بەشاخێکی یەکجار بڵند و سەخت سەر بکەوێ کە شاخی ئەلبورزە، سمی ئەسپی ئەو سوارچاکە کە بە بەردی خارا دەکەوێ وای ورد دەکا دەبێ بەتووتیا. هەروەها ئەگەر شمشێر هەڵکێشێ ڕووناکییێک پەیدا دەبێ (شەوی یەڵدا) ڕووناک دەکاتەوە. شەوی یەڵدا درێژترین و تاریکترین شەوی ساڵە دەکەوێتە ٢١ی کانوونی یەکەمی هەموو ساڵێک و، لە شیعری کوردیدا بۆتە مایەی داهێنانی بەرز.

ساڵم لەسەر باسکردنی ئازایی عەزیز بەگ دەڕوا و دەڵێ: ئەگەر نێزە لێ بدا سوپەر (زرێ سنگی سەربازان) وەک کاغەز دەدڕێ و خاوەنەکەی بێ گومان دەکوژرێ. ئەسپی سوارچاک کە لە مەیدانی جەنگدا جەولان دەکا تەمەنی دوژمن لە مردن نزیک دەکاتەوە.

هەماوەردی عەرووسی قەبر و تیغی ماشیتەی مەرگە
لە زەخمی مەردوان بۆ دەست و پێ ڕەنگی حەنا پەیدا
لە مەیدانا مەگەر ئەسپی گران مایەی دەئاخێوی
لە ناڵەی گاھ و ماهی بوو لە ژێر خاکا سەدا پەیدا
سفیدە چاوی بەدخواهی لە حەسرەت نێزە و دەستی
زیای دیرعی دەکا بۆ دوژمنان ڕۆژی سیا پەیدا
غوباری سمی ئەسپی ئەو مەگەر ئەجزایی ئیکسیرە
لە چەهرەی دوژمنی بێخود سەف ئەندەرسەف تەلا پەیدا
لە پیشا پیشی ئەو ڕەنگی عەدوو وەک جیوە بۆ زیوە
دەکا ئەجزایی تیغی ئەو لە قەلبا کیمیا پەیدا
نەهەنگ ئاسا لە دەریای خاترا قەهری کە گەردش کا
لە گەشتی عومری بەد خواهی سەراسەر ڕەخنەها پەیدا
بەگەرمی ڕۆژی مەیدانی عەدوو لەب تیشنە نایێڵێ
بەئاوی تیغی جەوهەرداری ئەو کاری سەقا پەیدا
لە سامی حەملەیی ئەو بوو عەدوو هەر جا حەزەر لازم
لە دەس ئەو بوو کراسی ڕۆمی یان شێوەی کەوا پەیدا
دەبێ گەر بێتە ڕووی مەیدان وەکو بەبری بەیان ساتێ
لیباسی ڕوو بەهی دەردەم لە ئەندامی گیا پەیدا



ئەگەر ئاوی بەقای نۆشی بێ دوژمن فائیدە نادا
لە مەوجی جەوهەری تیغی حورووفی لابەقا پەیدا

لەم بەشە شیعرەی قەسیدەکەدا ساڵم خەریکی پێدا هەڵدان و وەسفی سوارچاکی و چەکمە ڕەقی عەزیز بەگی بابانە. وەک لە وێنە شیعرییەکانیدا دەردەکەوێ ئەسپەکەی دەوری باڵای هەیە لە ئازایی و جوامێری خاوەنەکەی. بەشێکی زۆر لە هێرش بردن بۆ سەر دوژمن دەگەڕێتەوە بۆ ئازایی ئەسپەکە.

لە وێنە شیعرییەکاندا ساڵم کوژراوانی جەنگ لەگەڵ ئاهەنگی ژنهێنان بەراوورد دەکا. لە زەماوەندا خەنە پێویستی خەنەبەندانە، بۆ ئەم مەبەسە خوێنی ڕژاو دەکا بەخەنە. لە داهێنانێکی دیکەیدا جموجۆڵی و سمکۆڵ و هەڵبەزین و دابەزین و حیلکەی ئەسپ ڕۆژی حەشر دروست دەکا، گرموهۆڕ دەگاتە پلەیێک سەری گا و ماسی کە زەوییان لەسەر شان یا شاخی خۆیان داناوە کاس دەکا و ناڵە و هاواریان لێ هەڵدەستێ.

لە ڕووی ڕەوانبێژی شیعری کلاسیکی کوردییەوە لەم پارچە شیعرەدا ساڵم وەستایەتی نواندووە لەو وێنە داهێنراوانەی دروستی کردوون. کەس پەی بۆ ئەم قسانەی شاعیر نەبردووە، چونکە سەرچاوە زۆر کەم بووە لە شیعری کوردیدا، لە شیعری نالی و مستەفا بەگی کوردی بەولاوە نموونەی دیکەی لە بەردەست نەبووە. لەم بەشە شیعرەدا دەتوانرێ وێنەی داهێنراوی تریش بکەوێتە بەرچاو، وەکو ئەوەی لە ترسی هێرشی عەزیز بەگ دەبوو دوژمن زۆر ئاگاداری خۆی بێ، چونکە ئەو دەیتوانی کراسی سەربازی ڕۆمی یان (تورکی عوسمانی) بکا بەکەوا، دیارە جیاوازیش لەنێوان کراس و کەوا ئەوەیە کەوا لەتکراو یا هەڵزڕاوی کراسە. هەروەها شاعیر عەزیز بەگ بە پڵنگ دەچوێنێ، بەرامبەر بەو سەربازەی دوژمن کراسی پێستی رووبەهی لەبەرە، ئەمە ئاژەڵێکە لە سەگی بچووک دەکا، ئیتر ئەو سەربازەی پێستی ئەم ئاژەڵە بێ هێزەی لەبەربێ چۆن خۆی لەبەر شێرێکی وەکو عەزیز بەگ دەگرێ!

ئەگەر وەک کێوی قاف موحکەم بێ دوژمن وەقتی حەملەی ئەو
لە مەیدانا گوریزان دێنەوە ڕوو بەر قەفا پەیدا
لە خاکا خوێنی مەرجانی دەبێ مەخلووت و بێ حورمەت
دەکا ئەڵماسی دشنەی ئەو لە گەردندا سەخا پەیدا
بە زەربی زەرگی ئەو دوژمن وەکو پووشە بەدەم باوە
لە موغناتیسی دووربینی فوونوونی کەهرەبا پەیدا
لە دەریای مەعرەکەی تیغی نەهەنگی گەر نەمایان بێ
لەناو ئۆردوویی تورکانا دەبێ شین و سەدا پەیدا
عەسای مووسایە سەر نێزەی لە ڕەغمی مشتی فیرعەونی
بەبەرقی ئاتەش ئەفشان و بەشکڵی ئەژدەها پەیدا
وەلێ تالیع نەبێ پۆشیدەیە جەوهەر لە ڕووی دونیا

بەمەردانی دلاوەر حاسیلی کۆشش جەفا پەیدا
(عەزیز)ە وا لە ناوچاها خوداوەندا نەجاتی دەی
لە چەهرەی ئەو بکا یەعقووب دڵی شێوەی سەفا پەیدا
خودایە مولڵکی بابان بێ رەواج و قەڵبە سا لوتفێ
بەئەکسیری وجوودی ئەو بکا وەک مس بەها پەیدا

لەم دێرانەی کە سالم دوایی بەقەسیدەکەی دێنێ لەپێشانا بەئازایی عەزیز بەگی بابان هەڵدەڵێ لە جەنگدا، ئینجا دەستەو دوعا دەوەستێ و بۆ کارەساتی بابان و چارەنووسی عەزیز بەگ دەلاوێنێتەوە.

لە وێنە هونەرییەکانی شاعیر بۆ ئازایی عەزیز بەگ دەڵێ: دوژمن ئەگەر وەک کێوی قاف بەهێز و پتەو بێ لە شەڕدا سەربازی ڕاکردوو پشت لە مەیدان دەکەن، ئەگەر ئەو زەرگ بوەشێنێ دوژمن وەک پووش و پەڵاشێکی لێ دێ کە بەدەم باوە بێ. سەری نێزەی عەزیز بەگ داردەستی (عەسای) مووسایە، وەکو هەورەتریشقە بەوێنەی ئەژدەها خۆی دەنوێنێ. لێرەدا شاعیر ئاوڕ لە عەسای مووسا دەداتەوە کە دەبێتە مار و هەڵوێستی فیرعەونیش بەرامبەر بەمووسا ئاشکرایە. ئینجا سالم دەکەوێتە پاڕانەوە لە خودا و لاواندنەوە بۆ ڕووخانی دەسەڵاتی بابان و سەرنەکەوتنی عەزیز بەگ، دەڵێ: بەخت یار نییە. لە خودا دەپاڕێتەوە عەزیز بەگ لە زیندان ڕزگار بکا، لێرەدا عەزیز بەگ لەگەڵ یوسف پێغەمبەر بەراوورد دەکا، بەم ڕزگارکردنە خۆشی دەکەوێتە دڵی یەعقووبەوە. ئینجا شاعیر بەتەواوی بێ ئومێد دەبێ، هەر ئەوەندەی بۆ دەمێنێتەوە داوا لە خوا بکا، دەسەڵاتی بابان لەم مەینەتییە ڕزگار بکا.

### سالم بەشیعر وەرامی نالی دەداتەوە

نالی لە وڵاتی ئاوارەیی لە کاتێکدا سلێمانی لە لایەن تورکە عوسمانییەکانەوە داگیر کرا بوو، قەسیدەیێکی نووسیوە ڕەنگدانەوەی هەستونەستی ناخی دەروونیەتی بەرامبەر بەو کارەساتەی بەسەر نیشتمان و نەتەوەکەی داهاتبوو. لە قەسیدەکەی نالیدا هیچ نیشانەیێک لە ناوەوە نییە بۆ کەسێکی دیاریکراوی نووسی بێ، بۆ بەڵگە بۆ یەکێکی وەک سالمی هاوڕێی، بەڵام ئەوە هەیە کارێکی بەجێیە شاعیرێکی وەکو سالم وەرامی بداتەوە.

نالی لە دەوروبەری ڕووخانی میرنشینی بابان، واتە لەدوای لابردنی ئەحمەد پاشای بابان لەسەر تەختی میرنشینی لە سلێمانی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم لە شامەوە قەسیدەیێکی بۆ سلێمانی ناردبوو، تیایدا نووسیبووی بگەڕێتەوە وڵات یا نا؟ ئیتر سالم وەرامی نالی دەداتەوە و پێی دەڵێ نەگەڕێتەوە. لەبەر ئەوە نالی لەوێوە ڕوو دەکاتە ئەستەموڵ و تا کۆتایی ژیانی لەوێ دەمێنێتەوە.

قەسیدەکەی شاعیر (٣٦) دێڕەشیعرە، لە دە دێڕی سەرەتاییدا سالم وەستایانە و هونەروەرانە وەکو نالی لە (با) دەدوێ، چونکە نامەبەری هەردوولایان (با) بووە، بەهۆی ئەوەوە نالی قەسیدەکەی بۆ سلێمانی ناردووە، هەر بەهۆی ئەویشەوە سالم وەرامی بەشیعر بۆ ناردۆتەوە. لە سەرەتای قەسیدەکە شاعیر بە دە دێڕ وەسفی (با) دەکا و ئەوە دەخاتە بەرچاو کە سوودی تەنیا لەوەدا نییە نامەبەرە، بەڵکو



کەڵکی دیکەی هەیە، هەندێ وێنەی جوانی ئەو کەڵکانە دەکێشێ، وەکو چۆن (با) کاکۆڵی جوانان دەلەرێنێتەوە، غونچە دەپشکوێنێ و گیان دەدا بەڕووەک و شینایی:

جانم فیدای سروەکەت ئەی بادەکەی سەحەر
وەی پەیکی شارەزا لە هەموو ڕاهی خەتەر
ئەی میروەحەی جەمالی مەهـ ئاسایی دلبەران
وەی شانەزەن بەکاکۆڵی کوردانی سیمبەر
جارووکەشی مەنازیلی جانان لە خەڵوەتا
فەڕاشی فەرشی هەوری بەهاران لە دەشت و دەر
مالش دەدەی بەدەم لە دەمی خوابی سوبحدەم
هەم زولفی قیرگۆنە و هەم چەهرەیی قەمەر
باری بەسروەکەت بەشنەی ئەنگەبینی گەز
گرتوویە جونبوشت بەهەم ئاغووشی نەیشەکەر
وەختێ تەوافی عاریزی دلبەر شنۆیی تۆ
لەغزش دەخا بەتوڕە لە سەرتا بەپێی کەمەر
کەی دێتە خەندە غونچە دەمی بێ وەزیدەنت
گەر تۆ نەبی درەختی چەمەن ناگرێ سەمەر
ئیحیاکەری جەمیعی نەباتاتی عالەمی
ڕەعنا گوشا لە تەربیەتت قامەتی شەجەر
ئاوی حەیات و ئاتەشی ئەفسووردەیە دەمت
تەحریکی تۆیە گڕ لە تەندوورا کە دێتە دەر
میحنەت ئەوەندە زۆرە دڵم هێندە تەنگ بووە
دوودی هەناسەی سەحەرم هەوری گرتە بەر

ئینجا سالم (با) هان دەدا جوامێرانە فریا بکەوێ و زوو وەرام بەرێ بۆ لای نالی بۆ وڵاتی شام:

هیممەت کە چاپوکانە بەئیجرایی مەتلەبم
لەم سەر بڕۆ وەکو بەرید و لەوێ بێ وەکو تەتەر
بۆ مولکی شامە نامەیی من سوویی (نالی)یە
هەر حەرفی ئەوە لە وەزعی ویلایەت دەدا خەبەر
پرسیویە زاهیرەن لە ڕەفیقانی یەک جیهەت
ئەحوالی ئەهلی شار و ڕەفیقانی سەر بەسەر

لەپاش ئەمە سالم دێتە سەر باسی شاری سلێمانی، لەدوای ئەوەی لە لایەن تورکە عوسمانییەکانەوە داگیر کرابوو. لێرەدا شاعیر لەگەڵ ئەوەی بەشێوەییێکی هونەری وەسفی شارمان بۆ دەکا، بەڵام لەگەڵ داهێنانی ئەدەبی پڕ لە جوانکاریدا هەندێ ڕاستی مێژووییش دەخاتە ڕوو لە وێرانکردن و تاڵان و دزی و جەردەیی تورکە عوسمانییە جانەوەرەکان.

ئەگەر بگەڕێینەوە لای قەسیدەکەی نالی دەبینین شاعیر یادی هەموو ئەو جێگە و شوێنانەی شاری سلێمانی و دەوروبەری کردووە، بێ گومان لە هەموو ئەو شوێنانە یادگارێکی هەیە و پرسیار دەکا ئایا ئەو جێیانە، ئەو شتانە وەکو خۆیانن، یا گۆڕانیان بەسەردا هاتووە؟ سالم لەم بڕە شیعرەدا وەرامی پرسیارەکانی نالی دەداتەوە و پێی دەڵێ ئەوەی ئەو دیویەتی وەکو خۆی نەماوە، هەموو شتێک گۆڕاوە، هەموو دیاردەیێک خراپ بووە، هەموو دیمەنێکی جوان ناشیرین بووە.

لەو ساڵەوە حاکمانی بەبە دەربەدەر کران
نەیدیوە کەس لە چەهرەی کەس جەوهەری هونەر
تا بوو بەجایی مەتلەعی خورشیدی بەختی ڕۆم
سووتا گیاه و تەشنە و خوشکیدە بوو سەمەر
ناکەن هەوایی هیچ کە بابێ زەلیلی شار
بوریانە باس لە ناری غەما پەڕەی جیگەر
جوز گاهی ئاه و نالە لە ئەییامی ڕۆمییان
نەمدیوە وا بێ لە فەڕی عەدالەت بەنی بەشەر
(سەیوان) پڕە لە شەخسی ستەمدیدە خوار و ژوور
هەر قەبرێ پڕ غەمانە لە هەر لا دەکەم نەزەر
جێی تورکەکانی ڕۆمە دەروژووری خانەقا
غافل هەموو لە جایی مریدانی با خەبەر
ئەو حەوزە پڕ دەبوو کە وەکو چاوەکانی تۆ
تەغییرە ئاوی وەک دڵی مەردانی پڕ کەدەر
ئەو دەشتە جایی بازی یارانی حوجرە بوو
یەکسەر مەقامی ڕۆمییە هەروەک تەهی سەقەر
سووتا دڵم بەحاڵەتی جۆباری (سەرچنار)
لێڵاوە چەشمەساری وەکو چاوی بێ بەسەڕ
زستانی ئەوەلین بوو دڕا بەرگی (شێخە باس)
ڕۆمی ئەوەندە شوومە لە شەخسیش دەدا زەرەر
ئەو بەردەکانی ناوی نرا قسنی شەخسەکە
دایان بەشاخ و دارەکەیا تورکی بێ هونەر



وەک فیکری بێ غەمانە هەموو (شیوی ئاودار)
بەس موشکیلە لە چەشمەی ئەو قەترە بێتە دەر
تا وەقتێ دوزدی نیوە شەون تورکی بێ نیزام
دەدزن هەموو لە خەرمەنی مونعیم وەکو شەرەر
ئەوسا مەکانی ئاسکە بوو (کانی ئاسکان)
ئێستە لە دەنگ و ڕەنگی ڕۆمییە پڕ لە کەدەر
وەک پیری ساڵخوردە خەمەداری (پیرمەسوور)
مەشغوولی لەغزشە هەمەجا پایی تا بەسەر
شارێکە پڕ لە زوڵم و مەکانێکە پڕ لە شین
جاییێکە پڕ لە شۆر و وڵاتێکە پڕ لە شەرەر
ئەمڕۆ فەزای بازیەکەی جایی ڕەهزەنە
لەو دەشتە دێ لە غەیبەوە ئاوازی ئەلحەزەر!
سەربانی پڕ لە کەژدوم و دیواری پڕ لە مار
کۆڵانی پڕ لە ڕەهزەن و سەحرایی پڕ خەتەر

ئینجا سالم دێتە سەر باسی حوجرەکەی نالی، وەستایانە و دڵسۆزانە بەدوو دێڕ وەسفی دەکا. دەزانێ نالی هێزی تێدا نەماوە لە دووری حوجرەکەی، کەچی لەو کاتەی ئاگاداری ئەوەیە ئازاری گیانی زیاتر دەبێ، بەڵام هەر ڕاستییەکەشی پێ دەڵێ. حوجرەی بێ خاوەن بووە بەشاری تار و پوودی جاڵجاڵۆکە:

دڵ نایەڵێ بڵێم چییە سامانی حوجرەکەت
هەر تاری عەنکەبووتە حیجابی بیروون و دەر
نایێ سەدا لە پەنجەرەکەی جوز فوغانی جوغد
غەیری شەقامی موور نییە شوێنی پێ گوزەر

دوا ئامۆژگاری سالم بۆ نالی لە ئەنجامی ئەو ڕوون کردنەوانەی لەم قەسیدەیەدا خراونەتە ڕوو ئەوە دەگەیەنن کە شاری سلێمانی و دەوروبەری لەم حاڵە پەژمردەییەدابن با نالی نەگەڕێتەوە:

تۆ خوا بڵێ بەحەرزەتی (نالی) دەخیلی بم
بەم نەوعە قەت نەکا بەسلێمانییا گوزەر
ئەم مولکە نەزمی نابێ بەبێ عەدل و واریسی
بێ ئەو بەقەسدی ئەم تەرەفە با نەکا سەفەر
(سالم) سیفەت لە بێ کەسییا با نەبێ هیلاک
من کردم ئەو نەیکا لە غەما خوێنی خۆی هەدەر

ئەو پەیامە شیعرییەی نالی لە وڵاتی شامەوە بۆ شاری سلێمانی و شارەزوور و دەوروبەری ناردووە بڵێسەیێکە لە دەروونی شاعیرەوە هەڵقوڵاوە، ئەو هەموو پرسیارانە بووکی خەیاڵی شیعری نالییان لە گێتیی ڕۆمانتیک و سیمبۆلیزم ڕازاندۆتەوە. ئەو پرسیارانە پێویستییان بەوەرام نییە. شاعیر کە پرسیاری کردووە وەرامەکەی زانیوە، خوێنەریش چاوەنۆڕی وەرام نەبووە، ئەو وەرامە لەناو دڵ و دەروونی هەموو کوردێک بووە. ئیتر شەرەفی دەربڕینی وەرامەکە بەتۆمار کراوی بەر سالم کەوتووە و بەقەسیدەیێک وەرامی داوەتەوە، لە ڕووی هونەرییەوە لە پلەی شیعرەکەی نالیدایە.

***

ئەگەر نالی دامەزرێنەری قوتابخانەی شیعری کلاسیکیی نوێی کوردی بێ لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم لە ناوچەی سلێمانی لە کوردستانی باشوور «ئەورەحمان بەگی سالم» یەکەمین قوتابیی ئەم قوتابخانەیە و دووەمین دامەزرێنەریەتی لە دوای «نالی». ئەوەی گرنگ بێ لە ژیانی شیعری ئەم کەڵەشاعیرە ئەوەیە ئەو دەلاقانەی دامەزرێنەر نالی لە مەبەسەکانی شیعری کلاسیکی لە ئەدەبی کوردی کردبوونیەوە، سالم دەلاقەی تازەی پێویستی خستۆتە سەر ئەوانەی نالی. ئەو مەبەسانە بریتین لە کێشەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و نیشتمانپەروەری و کوردایەتییەکان.

شیعری سالم ئاوێنەیێکە وێنەی غەم و پەژارەی سایکۆلۆجی ناوەوەی کوردی ئەو سەردەمەی گرتووە، شین و شەپووڕی بووە بۆ لەناوچوونی سەربەخۆیی کورد لەو سەردەمەدا لە پەیکەری میرنشینی بابانی سلێمانی خۆی نواندووە. سالم شاعیری سوارچاکی و هێرش و هەڵمەت بووە. کوردیزانێکی باش بووە، شیعری کوردی بەوشە و زاراوە و تەعبیری ئەدەبی بەرز و لێهاتووی نووسینی نەتەوە هاوسێکانی کوردی ئەو سەردەمە دەوڵەمەند کردووە.

# بەشی دوازدەم

## کوردی ١٨١٢-١٨٥٠

### ژیانی کوردی

زانیاری لە بابەت ژیانی «مستەفا بەگی کوردی»یەوە زۆر کەمە، تەنیا ناوی خۆی و بنەماڵە و باب و باپیری دەزانرێ. ژیانی کورت بووە، شیعری کەمە، ئەفسانە تێکەڵ بەژیانی بووە. ئەو شیعرەی بەمیرات بەجێی هێشتووە ماڵی ئەدەبی کوردی ئاوەدان کردووە، چونکە بابەتێکە دەبوو هەبێ، ئەو شاعیرە بەفریای کەوت و پێشکێشی کرد.

کوردی نازناوی مستەفا بەگی کوڕی مەحموود بەگی کوڕی ئەحمەد بەگی ساحێبقرانە، ئامۆزای ئەورەحمان بەگی سالمی شاعیرە. لە ساڵی ١٨١٢ لە سلێمانی لەدایکبووە، لەو کاتەدا لەمێژ نەبوو هەندێ لە ئەندامانی بنەماڵەی قەرەجەهەنەم لە کوردستانی ئێرانەوە هاتبوونە تازە (پایتەختی میرنشینی بابان) شاری سلێمانی.

شاعیر خوێندەواری لە حوجرەی مزگەوت وەرگرتووە، بەمەبەسی ئەوە نەیخوێندووە ببێ بەمەلا، لەگەڵ ئەوەشدا بایەخی زۆری بەخوێندن داوە، ئارەزووی ئەو زانستییانەی بووە کە پێوەندییان بەفەلسەفە و سۆفیزم و جوانی کردگارەوە بووە. هیچ هۆیێک بۆ کوردی لەناوەوە نەبووە خوێندنی حوجرە تەواو بکا و ببێتە مەلا، لەبەر ئەوە تارمایی ئەو خوێندەوارییەی لەمەڕ زانستییەکانی مەلایەتییەوەیە لە لای شاعیر بەئاشکرا نابینرێ. بەرهەمی شیعری کوردی ئەوە دەگەیەنێ بابایێک بووە لە گێتییێکی سۆفیزمی گەلێ ئاڵۆزدا ژیاوە، ئەو سەرسامە خەیاڵییە سەری لێ تێکداوە، هۆش و هەستونەستی داگیر کردووە، تا گەیشتۆتە پلەیێک وەک نەخۆشێکی سایکۆلۆجی دڵ بریندار بکەوێتەوە، ئەو نەخۆشییە ناخی دەروونی هەڵتەکاندووە.

کوردی لە ژیانیدا تووشی دڵدارییێک بووە ویستوویەتی بەدڵداری حەقیقی لە قەڵەمی بدا، نەک مەجازی، واتە ئەو دڵدارییەی دوور لە شەهوەت و سێکس، دڵدار و یار هەردووکیان لە پێوەندی سێکس بەدوورن، نێر و مێیەتییان تێدا نییە، سۆفییەکان ئەم چەشنە دڵدارییە بەناوی دڵداریی خودایەتی (الحب الإلهي) لێک دەدەنەوە. ئیتر هەرچەندە لە ئەدەبدا ئەو دڵدارییە لە ژن و پیاویشدا پیشان دەدەن (یوسف و زولەیخا) و (شیرین و فەرهاد) و (لەیلا و مەجنوون) بەمانای ئەوەی لە سێکس دووری دەخەنەوە، بەڵام زیاتر مەبەسیان لەم دیاردەیە ئەوەیە بەتەواوی سێکسی تێدا نییە. کەسێکی وەکو شاعیر دەیەوێ دڵدارییەکەی وا لێک بدرێتەوە، دڵدارییێکی حەقیقییە و توانەوەیە لەناو کردگار، یاری ئەو کوڕێکە ڕەمزی کردگارە. ناوی قادرە و کوردی خەڵکی سلێمانییە و بەڵگەی ئەو دڵدارییەیە وەکو لە پاشانا لە پیشاندانی نموونەی بەرهەمی شاعیر دەکەوێتە بەرچاو.



بەڕاستی مەسەلەی ئەم دڵدارییەی شاعیر نازانرێ تیۆری بووە یا پراکتیکی یا لاساییکردنەوە. لە هەموو حاڵێکدا شاعیر کۆمەڵێک شیعری ڕەسەنی جوانی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە، شێوازێکی تایبەتییان هەیە و ئەدەبی نەتەوایەتییان دەوڵەمەند کردووە. مەبەسی شاعیر بۆ خۆی هەرچی بووبێ گرنگ نییە، ئەوەی گرنگ بێ ئەوەی وتوویەتی ڕەنگدانەوەی ناوەوەی هەموو ئادەمزادێکی پڕ لە هەستونەستە، ئەڤین و خۆشەویستی و دڵدارییەکە بێ گومان ژن و مێردایەتی، یا نێر و مێ تەنیا دیمەنێک بێ لەو دیمەنانەی مرۆڤایەتی لە ڕووی گیانی و ماددییەوە تیایاندا دەژی.

کوردی لە هەندێ جێگەی شیعریدا ناوی ئەو (قادر)ەی خۆشەویستی هێناوە، بەخوێندەوارانی دەناسێنێ، ئەگەر ئەو ناوەشی نەبردایە، خوێندەوار دەیتوانی وێنەی ئەو کەسە لە خەیاڵی خۆیدا بکێشێ کە شاعیر مەبەسی بووە. شاعیر هاتوچۆی ئێرانی زۆر بووە، بەتایبەتی لەو ڕۆژگارانەی ئاژاوە باڵی بەسەر کۆمەڵی میرنشینی بابان لە سلێمانی کێشاوە، شیرازەی پێوەندی نێوان خەڵکی شێواوە و ئاسایی نەبووە. شاعیر لە کوردستانی ئێراندا بەهۆی خزمەکانییەوە جێگەوڕێگەی بۆ دابین کراوە. وا دەگێڕنەوە گۆیا جارێکیان دەبیستێ قادر ئارەزووی چوونی هەیە بۆ شاری سنە، ئیتر شاعیر پێش ئەو ڕوو دەکاتە سنە بۆ ئەوەی لە پێشوازیی قادردا بێ. هەندێ ڕووداو لە ژیانی شاعیر دەگێڕنەوە لە ئەفسانە دەکەن، باوەڕ ناکرێ بەڕاستی پێوەندییان بەژیانی شاعیرەوە هەبێ، لەبەر ئەوە بەهەموو جۆرێک ئەم ڕووداوانە پێویستە پشتگوێ بخرێن، چونکە نە لە بەرهەمی شاعیر ڕەنگیان داوەتەوە، نە کاریشیان لە لایەنی جوانکاری بەرهەمی شاعیر کردووە. جگە لەوە ئەو ڕووداوەی بۆ ژیانی دروست کراوە وەکو ئەوەی ئاگری عەشق سووتاندوویەتی و بووە بەهۆی کۆچی دوایی، ئەمە لەوانەیە ببێتە سەرچاوەیێک بۆ داهێنانی شیعرێک، بەڵام بەهیچ جۆرێ باوەڕ بەوە ناکرێ گڕی ئاگر لە گەرووی شاعیر هاتبێتە دەرەوە و بەوە مردبێ.

کۆمەڵێک شیعری کوردی بەنازناوی (هیجری)یەوە بڵاو کراوەتەوە، بێ گومان ئەم نازناوە لەگەڵ وەزعی ناوەوەی دەروونی شاعیر ڕێک دەکەوێ و دوور نییە ئەم نازناوەی لە سەردەمی ژیانی ئێرانیدا لە شیعریدا تۆماری کردبێ، چونکە ماوەیێک لەوێ لە ئاوارەیی و مەڵبەندی دوور وڵاتیدا ژیاوە. ژیانی شاعیر کورت بووە، نەخۆشیی دەروونی جەرگ و هەناوی داوەشاندووە، مەینەتی و کارەساتەکانی میرنشین هیچیان بۆ نەهێشتۆتەوە ئەوە نەبێ شانازی بەنەتەوەی خۆیەوە بکا و نازناوی (کوردی) بۆ تۆماری شیعرەکانی هەڵبژێرێ. کوردی لە ساڵی ١٨٥٠ لە سەردەمی ئاوابوونی میرنشینی بابان لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان نێژراوە.

### ڕوخساری شیعری کوردی

ئەو مەرجانەی شیعری کلاسیکی لە ڕووی ڕوخسارەوە لە شیعری دیکە جیا دەکەنەوە گەلێ زۆرن. شاعیرانی کورد پێڕەوی هەموو مەرجەکانیان نەکردووە، لەم لایەنەوە لە گەورە شاعیرانی کورد کەم شاعیری وا دەبینرێن زۆربەی بابەتەکانی (ژانر یا هونەرەکان) شیعری کلاسیکی لە بەرهەمەکانیاندا بەرچاو بکەوێ. بەڵام ئەمە بەهیچ جۆرێ پێوەندی بەلایەنی بەرزی بەرهەمی ئەدەبییەوە نییە لە ڕووی

جوانکارییەوە.

ئەو تێبینییانەی لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە لە شیعری مستەفا بەگی کوردی لە بابەت ڕوخسارەوە دەکەونە بەرچاو لە چوارچێوەی زانیارییەکانی لای خوارەوەدا دەبینرێن:

١- شیعری دیوانە بچووکەکەی کوردی ئەوەی تا ئێستا بڵاو کراوەتەوە زیاتر لە شەست غەزەل و قەسیدەیە. ئەگەر بۆ بەرهەمی کوردی سنووری نێوان غەزەل و قەسیدە دوازدە دێڕ شیعر بێ، لە دیوانی کوردیدا تەنیا چەند قەسیدەیێک دەدۆزرێتەوە ژمارەی دێڕەکانیان لە دوازدە دێڕ تێپەڕی کردبێ تا دەگاتە بیست دێڕە شیعر. هەرچی غەزەلەکانیشە دەکرێ لە بابەت پێڕەوکردنی ژمارەی دێڕی غەزەل بوترێ کوردی لە شاعیرانی دیکەی ئەدەبی کوردی زیاتر پێڕەوی ژمارەی غەزەلەکانی کردووە، بۆ بەڵگە غەزەلی حەوت دێڕە شیعری و نۆ دێڕە شیعری لە ئەدەبی کلاسیکیدا زۆر زیاترە لە غەزەلی پێنج و شەش و هەشت دێڕە شیعری. بێ گومان کوردی لە هەموو جۆرەکانی هەیە لە ڕووی ژمارەی دێڕی شیعرەوە، بەڵام نیوەی زیاتری غەزەلەکانی لە حەوت دێڕ و نۆ دێڕە شیعر پێک هاتوون.

٢- بەم جۆرە شاعیر لە غەزەل و قەسیدە و مولەممەع بەولاوە هیچ جۆرە شیعرێکی دیکەی وەکو چوارین و پێنجین و پێنج خشتەکی و موستەزاد و تەرجیع بەند و تەرکیب بەند و هەموو جۆرەکانی دیکە لە دیوانی کوردیدا نابینرێن.

٣- لە بابەت کێش و قافیەوە هەموو بەرهەمی شاعیر لەسەر بەحرەکانی عەرووز هۆنراوەتەوە، یەکێتیی کێشیان تێدایە. هەموو غەزەلەکانی لەسەر کێشی ڕەمەل و هەزەج داناوە، بەدەگمەن کێشی موزاریع لە بەرهەمیدا بەرچاو دەکەوێ لە بەحرەکانی دیکەی هەر نییە.

لە ڕووی قافیەشەوە کوردی بەتەواوی پێڕەوی یەکێتیی قافیەی کردووە، بەڵام هەموو دەنگەکانی ئەلف و بێی عەرەبی نەکردووە بەقافیە، لە زمانی کوردیدا دوو دەنگی (ۆ) و (ێ) نەبێ هیچ دەنگێکی دیکەی ئەلف و بێی کوردی نەکردووە بەقافیە. هەندێ لەو دەنگانەی کردووە بەقافیە کە لە هەردوو ئەلف و بێی کوردی و عەرەبیدا هەن، وەکو (ا، ت، ر، ز، ق، ل، م، ن، ی)، جگە لەوە کوردی لە هەندێ غەزەل و قەسیدەکانیدا پاش قافیەی بەکار هێناوە.

٤- هونەری مولەممەع لە بەرهەمی شاعیردا سێ پارچە شیعر بەرچاو دەکەون. هەریەکەیان نیوە دێڕی یەکەمیان کوردییە و نیوە دێڕی دووەمیان عەرەبی یا فارسی یا تورکی عوسمانییە، بەژمارەی دێڕیش هەریەکەیان لە نۆ دێڕە شیعر پێک هاتووە، لە ڕووی کێشیشەوە لەسەر بەحری ڕەمەلی (٨)ی مەحزووف (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) ڕێکخراوە. دوور نییە شاعیر ئەمەی بۆ ئەوە بووبێ بەخەڵکی بڵێ ئەو زمانانە دەزانێ، یا ئەو شیعرانەی بۆ یاری خۆشەویست داناوە، ئیتر ئەو یارە ئەگەر ئەو زمانانە دەزانێ با تێیان بگا، ئەگەر ناشیانزانێ شاعیر بۆ ئەوە ئەو شیعرانەی داناوە؛ ئەو تێیان نەگا.

وەک نموونەیێکی لەم بابەتە مولەممەعە (کوردی - عەرەبی)یەکەی شاعیر لێرەدا تۆمار دەکەین:

حۆرییی ڕەوزەی جینانی یا گوڵی باغی ئیرەم
(أم نُجومُ العَرْشِ أم شَمْسٌ عَلَت فَوقَ العَلم)



سەرکەشی عێلی گەلاڵی شۆخی بابان و عیراق
(نُورُ أبصارُ العَرب ظِلُّ الرؤَساء العَجَم)
کوشتن و عەفووت لە لای من هەردوویان هەر ڕەحمەتن
(لَو تُمِتني تَرحَمني لَو تُعفِني عين الكَرَم)
ئاخری کوشتت بەهیجران ئاسکەکەی دەرماڵی خۆت
(كَمْ نَديت بِالندا لا تقتلُ الصَّيدَ الحَرَم)
کوشتمت ئەمما لە پاشانیش پەشیمانی دەبەی
(يا حَبيبي بَعدَ قَتلي لا حُصولَ للنَّدم)
وەک تەبیب ئەر بێی عیلاجی ئەم برینانەم بکەی
(أعطِكَ الروحَ لَئِن تَقْبلهُ في حَق القَدَم)
سەد کە مەحزوون و نەخۆش بم نامەکەت گەر بێتە لام
(يَندفع حُزْني وما يَبقى بِقَلْبي مِن أَلَمْ)
گەر وەکو عیسا لە پاش مردن بەسەرما ڕابوری
(تَجمعُ العظمَ الرَميمَ تُحييني بعدَ العدم)
چونکە نامەی دەردی (کوردی) قەت نەهاتە ئینتیها
(نَفَدَ القرطاسُ جَفَّ الحِبرُ وآنشق القَلَم)

دوو مولەممەعە کوردی - فارسی و کوردی - تورکییەکەی شاعیر لە بابەت کێشەوە لەسەر بەحری هەزەجی (٨)ی سالم (چوار جار مفاعیلن) ڕێکخراون.

مولەممەعە (کوردی - فارسی)یەکە بەم دێڕە دەست پێ دەکا:

خۆشم قوربان بەبەندیخانە و زەخمی سیاهـ مارت
(بشرط آنکه نیاری بر سر من طعن أغیارت)

نیوە دێڕی فارسییەکە بەم مانایە هاتووە (بەمەرجێ تانەی ڕەقیب و ئەغیارم نەیەتە سەر).

مولەممەعە (کوردی - تورکی)یەکەش بەم دێڕە دەست پێ دەکا:

دیسان وا هاتە گەردش چەرخی چاوی مەستی فەتتانی
(گیول إقلیمک اوزره برده سوردی صفی مژگانی)

نیوە دێڕە تورکییەکە بەم مانایە هاتووە (برژانگی دیسان هێرشی بردە سەر دڵستان «مەملەکەتی دڵ»).

لەو زانیارییانەی سەرەوە لە بابەت شیعری مستەفا بەگی کوردییەوە ئەو ڕاستییە دەردەکەوێ شاعیر دەستی بۆ هەموو هونەر و ژانرەکانی شیعری کلاسیکی نەبردووە لە ڕووی ڕوخسارەوە، تەنیا خووی

داوەتە غەزەل و قەسیدە. بەو پێیە لە ناوەرۆکیشدا پەلی نەهاویشتووە بۆ هەموو بابەت و مەبەس و ژانر و هونەرەکانی شیعری کلاسیکییەوە، بەزۆری تەعبیری لە هەستونەستی دڵدارییێکی تایبەتی کردووە لەوەوە خەیاڵی هەڵێنجاوە و شیعرێکی بەرزی لەم ڕووەوە بەرهەم هێناوە.

### ناوەرۆکی شیعری کوردی

شیعری کوردی بەگشتی ڕەنگدانەوەی دڵدارییێکە بەهیچ جۆرێ لە دڵداریی زەمینی یا مەجازی نزیک نابێتەوە. شاعیر دەیەوێ بەدڵدارییێکی سۆفیزمی خوایی لە قەڵەمی بدا، بێ گومان مەبەسی ئەوەیە ئەم دڵدارییە سۆفیزمییە گیانییە لە گێتیی میتافیزیک دەری بێنێ و بیخاتە خانەی مەتریالییەوە. لێرەدا ئەم دڵدارییە لە کوڕێکدا دەبینێ، لەبەر ئەوەیە لە سەرانسەری شیعرەکانیدا سیفەتی ناسکی مێیینەی بەکار نەهێناوە، ئەگەر بەکاریشی هێنا بێ ئەو سیفەتانەیە کە بۆ کوڕیش دەست دەدەن. لەوانە بەزۆری باس لە کاکۆڵ دەکا، هەرچەندە ئەم وشەیە هاومانایە لەگەڵ قژ و پرچ و زولف و کەزی، بەڵام بۆ کوڕ بەکار دەهێنرێ. جگە لەوە زاراوەی (یار) کە هاوڕێ و برادەر دەگەیەنێ لەگەڵ ئەوەی بۆ نێر و مێ هەردووکیان دەشێ، بەڵام زیاتر بۆ نێرینە بەکار دەهێنرێ.

چاو لە لای کوردی دەوری گرنگی هەیە، هەرچەندە لە ئەدەبی کلاسیکی بۆ ژن بەکار دەهێنرێ، بەڵام دەکرێ بۆ جوانی کوڕیش بەکار بهێنرێ، وەکو چاوی مەست، چاوی ڕەش، چاوی فەتتان. هەروەها خاڵی ڕەش، بەتایبەتی لەسەر ڕوومەت نموونەی جوانییە لە شیعری کلاسیکیدا بۆ ژن، بەڵام دەکرێ بۆ جوانی نێرینەش بەکار بێ. ئەمە و هەندێ لەو سیفەتە هەست پێکراوانەی بۆ جوانی ژن لە شیعری کلاسیکی داهێنراون بەگشتی وەستایانە شاعیر توانیویەتی بۆ یارەکەی بەکاریان بێنێ، بەڵام ڕاستەوخۆ ئەو سیفەتانەی تایبەتین بەمێیینە کوردی لە شیعریدا بەکاری نەهێناون، وەکو سنگ و مەمک. بەم پێیە لە هەموو شیعریدا مستەفا بەگی کوردی وەسفی سروشت و پەیکەری ژنێک یا کچێکی نەکردووە، ناوی سنگ و مەمک و هەموو ئەندامە دیار و نهێنییەکانی تایبەتی بە ژن نەهێناوە. بەزۆری شاعیر وشە و زاراوە و تەعبیری تایبەت بەئەدەبی سۆفیزم و غەزەل بەنێرینەی بەکار هێناوە وەکو: یار، چاوی مەست، مەعشووق، خاڵی سەر ڕوو، ڕووحی شیرین، نەخۆشی، تەبیب و گەلێکی دیکە.

شاعیر وەسفی سروشت و پەیکەری ژنی نەکردووە، لەبەر ئەوەیە وێنەی مەتریالی لەناو شیعریدا نابینرێ، هەموو شیعرەکانی وەک موناجات و پاڕانەوە و ئامۆژگاری دەکەونە بەرچاو. بەم جۆرە شاعیر کۆمەڵێک مانا و وێنەی شیعری داهێناوە دوور لە گێتیی مادی، لەگەڵ ئەقڵدا قسە ناکەن، بەڵکو لەگەڵ دڵ و دەروون و ویژدانی ئادەمزاد. لە قوتابخانەی شیعری کوردستانی باشووردا مستەفا بەگی کوردی بوو بەخاوەنی ئەم جۆرە شیعرە و، دیوانی شیعری نەتەوەیی پێ دەوڵەمەند و ڕەنگین کرد.



## بەشی سێزدەم

# گوڵبژێری دیوانی کوردی

زۆربەی شیعری کوردی بۆ یەکێک وتراوە، وێنە و ماناکانی تەنیا لە دەوری ئەو کەسە دەسووڕێنەوە. یاری شاعیر و قارەمانی شیعری ناوی (قادر) بووە، لای کوردی و هەموو ئەو شاعیرانەی ئەم جۆرە شیعرەیان نووسیوە بووە بە(موتلەق). ئەو نێرینانەی بەناوی جیاوازەوە وەک (ڕەمزی کردگار) کەوتنە ناوەوە بوون بەقارەمانی ئەو چەشنە شیعرەی سۆفیزم، سەرپشکی ئەمانە بێ گومان «یوسفی کوڕی یەعقوب» بوو.

### سەدای کاروانی فیرقەت

شاعیر دەبیستێ قادری یاری سەفەری سنە دەکا. لێرەدا یا ئەوەتە کوردی لە سلێمانییە و بەم سەفەرە قادر لێی دوور دەکەوێتەوە، یا ئەوەتە شاعیر ڕوو دەکاتە سنە بۆ ئەوەی لەوێ پێشوازی بکا، هەموو مەبەسیشی ئەوەیە لێی دوور نەکەوێتەوە، بۆ ئەم مەبەسە شیعرێک دادەنێ، ئەم غەزەلە یا لە سلێمانی نووسراوەتەوە و پێش ئەوەی قادر سەفەر بکا، یا لە سنە نووسراوەتەوە لەو کاتەی شاعیر لە پێشوازیدا بوو:

سەدای کاروانی فیرقەت دێ دەڵێن سەرقافڵەچی یارە
زڕەی پێشەنگی میحنەت دێ دەڵێن کالایی غەمبارە
ترنگەی تەپڵی باز ئاتلانی چاوەش دەنگی جارچی دێ
بەتیپی غەم دەڵێن نامەرد ئەسەر دڵ ئەمڕۆ یەلغارە
دەڵێی ئەسپی فیراق سمکۆڵ دەکا وا لێڵە بیناییم
دەڵێی تەپڵی تفاقیان ژەند کەوا گوێم پڕ لە هاوارە
لە پێش بەیداغی شادی یار ئەوا ئەسپی دەئاخێوی
لەسەر تیپی سوپاسالار و هەم پێشەنگ و دوندارە
مەزەندە هەوری ڕەحمەت ئاسمانی عەشرەتی پۆشی
کەوا ڕووناکی ڕۆژ ئەمڕۆ لە بەرچاوم شەوی تارە
ئەمان سەرقافڵەچی کاروان دەخیل سا چەرخەچی لەشکر
جڵەو هەڵکێشە ڕەحمێ کە کە جارێکە و هەر ئەم جارە
ئەوا ئێوە دڕۆن حەق بێ بەپارێزگارتان ئەمما
بەکێی دەسپێرن ئێوە تۆ خوداتان ئەم بریندارە

که ڕۆیین تۆ خودا کێ بێته سەر بالین و نالینی
که بمرێ کێ هەڵیگرێ و دەفنی کا ئەم موردە بێچارە
ئەگەر نایەن لەگەڵ خۆتان بەکوشتن سا عیلاجی کەن
که وەڵڵا ئەو لە پاش ئێوە لە رووحی خۆشی بێزارە
بەوەڵڵا حاجەتی قەتلی نییە هیجرانتان مەرگە
چ فایدە هەر وەکو (کوردی) ئەویش گیان سەخت و بێعارە

لەم شیعرەدا شاعیر لە دوو لایەنی داهێنانی ئەدەبیی سەرکەوتووە. یەکەمیان قارەمانی دڵدارییەکەی، واتە خۆشەویستەکەی کردووە بەسوارچاک و سەرلەشکر و پێشەنگی کاروان، ئەمە لەگەڵ وەزعی یارەکەی دەگونجێ کە کوڕە. دووەمیان وەسفی ئێش و ئازاری ناوەوەی دەکا وەکو خۆی دەڵێ: ڕووناکی ڕۆژی لێ بووە بەشەوی تاریک، کە یار لە دڵداری بریندار دوور بکەوێتەوە کێ دەتوانێ جێی یار بگرێتەوە! کێ بێتە سەر سەرینی لە کاتی گیان سپاردندا! ئەگەر بمرێ کێ ئەو مردووە بێچارەیە دەنێژێ! ئەگەر لە یارەوە نزیک نەبێ مردن بۆ ئەو باشترە، بێ گومان ئەو مردنە بەکوشتن بێ چاکترە.

## وەسفی یار

لە بەرهەمی شیعری کوردیدا وەسفی یار بەزۆری وەسفی ڕووکەش دەکەوێتە بەرچاو، لێرەدا لە هەندێکیان دەکۆڵرێتەوە.

– ١ –

لە غەزەلێکیدا شاعیر دەڵێ:

ڕوخی وەک گوڵ تەنی وەک سیم لەبی وەک لەعلی ڕوممانی
دەهان وەک فندق و غەبغەب وەکو نارنجی ئیمانی
فەقێی یاخۆ نیزامی یا نەخۆ پێش خزمەتی شاهی
دوڕی مولکی سلێمانی رەئیسی ئێلی جافانی
بەحوسنی یوسف ئاسات و بەخولق لوتفی شیرینت
چراغی بەزمی خوسرەو نووری دیدەی پیری کەنعانی
بەزاهیر سادە لەوحی وەک ڕوخت وەحشی وەکو دیدەت
لە دڵدا بۆ حەکیمی و عاقلی ئوستادی لوقمانی
عەرەب ئەندامیی و فارس کەلام و تورک ڕەفتاری
نیگاه ئاه و، ڕەوت کەبکی، زمان تووتی خۆش ئەلحانی
ئەگەرچی قادری بۆ قەتلی من فیکرێ بکە قوربان
لەسەر سەفحەی ڕوخت وەختە عەیان بێ خەتتی رەیحانی



وەکو بولبول فەغان کە دائیما (کوردی) لە دەوری گوڵ
وەکو قومری بناڵێنە لەتاو سەروی خەرامانی

لەم شیعرەدا کوردی بایەخی بەجوانی ڕووکەشی پەیکەری قادری یار و یاوەری داوە، باس لە ئەندامانی لەشی دەکا، لە ڕوومەت و دەموچاو و چەناگە و غەبغەب، ئەم ئەندامانە بەهەندی دیاردەی سروشتییان دەچوێنێ. ئینجا لە لایەن ڕەوشت و پیشەی ئەم یارەوەیەوە، بەلایەوە لە تەمەنێکی ئەوەندە بچووک و ناسکدایە شایانی ئەوەیە پێش خزمەتی شاهان بێ، لەو تەمەنەدا دەکرێ فەقێ بێ یا تازە بووبێتە سەرباز. بەو جوانییەی ئەوەی لە یوسف دەکا چرایێکە کۆڕی بەزموڕەزمی خوسرەوی پەروێزی ڕووناک کردۆتەوە، یا ڕووناکی داوەتە چاوی پیری کەنعان. لەگەڵ ئەم کەم تەمەنییە قادر دانایێکە بەمامۆستای لوقمانی حەکیم دەشێ.

– ٢ –

لە غەزەلێکی دیکەیدا لە مەبەسی وەسف نەچۆتە دەرەوە:

بەئەبرۆ و خەتت و خاڵ خووبی بەبالا جوست و چالاکی
بەزاهیر بێچووە دەروێشی بەدڵ جەللاد و سەفاکی
بەئایینەی ڕوخ ئەسکەندەر بەجامی دیدە جەمشیدی
بەتەختی سینە پەروێزی بەماری زولف زەحاکی
سوپای خەت هات و غەیرەز تیغ کەسێ ناتوانی چاری کا
بەدەریای عیلمەوە هیچم نەکرد با بچمە دەللاکی
لە ڕق باوکی بگرییێم یا لە بۆڵەی دایکی هاوار کەم
لە زوڵمی خۆی بناڵم یا لەبەر جەوروجەفای کاکی
گەلی سۆفی ئەوا هاتن کە میراتی فەقێ بەش کەن
بەڵێ مەعلوومە خۆ وەحشی کە مرد سەگ دەچنە سەر لاکی
عەجەب دەست و گریبانم بووە (کوردی) لە دونیادا
مەگەر قیسمەت بوو بۆ من ڕۆژی ئەووەل عیجز و غەمناکی

لەم غەزەلەدا کوردی وەسفی ڕووکەشی هەندێ لە ئەندامەکانی یاری خۆشەویستی دەکا، بەڵام زیاتر مەبەسی دیارکردنی هێمنی و لەسەرخۆیییە لە ڕەوشتی دەرەوە و ئاشکرای کە بەچاو دەبینرێ، هەروەها پێچەوانەی ئەو لە ڕەوشتی ناوەوە و مەزەندەی دەروونی دەدوێ کە بەچاو نابینرێ، ئەمە خوویێکی کوشندەیە بەرامبەر بەدڵدار دەیخاتە پراکتیکەوە. ڕەوشتە خۆش و جوانەکان لە ئەسکەندەر و خوسرەوی پەروێز و ڕەوشتە ئازاردەرەکان لە جەمشیدی جەم و زەحاک کۆ دەکاتەوە بۆ یاری خۆشەویستی بەکاریان دێنێ. ئاوڕدانەوەیێکی کوردانە لەم پارچە شیعرەدا دەبینرێ، یەکێک گرفتاری کچێک یا کوڕێک بێ

هەڵوێستی کەسوکاری بەرامبەر ئەم دڵدارییە چۆن دەبێ! کوردی وەک خۆی دەڵێ چۆن دەتوانێ باری قورسی ڕقی باوک و بۆڵەی دایک و زوڵمی خۆی و ستەمی کاکی واتە برا گەورەی هەڵبگرێ.

- ٣ -

ئەم وەسفەی کوردی وا دەکەوێتە بەرچاو کەسێک داوای لێ کردبێ باسی یارەکەی بکا، وەرامی شاعیر وەک وەسفێکی ئاسایی خۆی دەنوێنێ لە غەزەلی کلاسیکیدا. ئەم جۆرە وەسفە بەزۆری و بەگشتی بۆ دڵداری مەجازی مێیینە بەکارهێنراوە، بەڵام شاعیر بەڕوونی ئاشکرای دەکا ئەگەر هەندێ سیفاتی مێیینەشی بۆ یارە نێرەکەی بەکارهێنابێ بۆ ئەوەی سەر لە خوێنەر نەشێوێ وتوویەتی (غولامی زولف و ئەگریجەی غولامانەی غولامێکم):

عەزیزان من ئەسیری قامەتی نەوتوول نەمامێکم
غولامی زولف و ئەگریجەی غولامانەی غولامێکم
گرفتاری کەمەندی مەهوەشێکم تیفل و بێ ڕەحمە
خەریک و وێڵ و وەحشی ئاهوویی شیرین خەرامێکم
هەموو عومرم بەزایەع چوو لە ڕێگەی عیشقدا چونکە
گرفتار و ئەسیری داوی عیشقی تیفل فامێکم
ڕەواجی سیککەیی ساحیبقڕانی مولک و میللەت بووم
ئەمێستا وێڵ و سەرگەردانی گەرداوی عەوامێکم
شەهی ئیقلیمی عیشقم پیری ڕەندانی خەراباتم
ئەگەرچی زاهیرەن تیفل و نەزان و ئەبلە فامێکم
ئومێدی وەسل و دیداری نەما (هیجری) ئەمێستاکە
هەمیشە ئینتیزاری نامەیی پەیک و سەلامێکم

لەم غەزەلەدا وەکو دیارە شاعیر بەنازناوی دووەمی (هیجری) شیعرەکەی بەخەڵکی ناساندووە.

- ٤ -

لەم شیعرەی ئێستادا، لەم شوێنەدا تۆمار دەکرێ شاعیر بەشێوەیێک خەریکی ناساندنی یارەکەیەتی بەپێی ئەو زانیارییانەی دەیاندا بەدەستەوە، هەموو کەسێک دەتوانی ئەو یارە بدۆزێتەوە، تەنانەت جێگەی ماڵیشیان دیاری دەکا. بەم جۆرە بەپرسین پیاو دەتوانێ چاوی بەو خۆشەویستە بکەوێ، کە بەرەوڕووی دەبێتەوە بەهۆی وەسفی شاعیرەوە دەیناسێتەوە. هەروەها شاعیر خەریکی دیارکردنی ئەو سیفەتانەیە سنووری خووورەوشت و کردەوە و بزووتنەوەی یاری شاعیر دەخەنە ڕوو، وەکو یار تاجی سەری هەموو شاهانی گێتییە، ڕۆژی هەموو گەردوونە، ڕووناکیی بەزمی هەموو دەروێشانە و هەندێ



وێنەی دیکەی داهێنراوی هونەری، لە کۆتاییدا ناوی ئەو ڕێبەرەی دەبا کە (قادر)ە.

ئەی دوڕی تاجی سەری شاهانی ئیقلیمی جیهان
شەمسی ئەفلاکی کەمال و شەمعی بەزمی عاریفان
ئەی بەنادیدە بەشوهرەت سەد وەکو من موختەلیف
وەی لە تاوی فیرقەتت عالەم هەموو ڕەنجیدە جان
سابیقی پرسی کە دڵ ئەفسوردە و سەودا سەرم
یا لەسەر مایەی هەوا و میهر و شۆری دلبەران
واقیعی شیرین سوئالێکە بەڵان لیکن دەبوو
مەسئەلە بڕوا بەلای شەخسێکی دانا و حاڵ زان
من دڵم شێواوە یەکسەر دەفعی کاروباری خۆم
سا چلۆن پێم دەکرێ ئیتر حەللی عوقدەی سائیلان
گەر دەپرسی مەنزل و شکل و لیباس و تایەفەی
مالیان نەزدیک بەبەندیخانە و ئاشی ئەحان
ئەسمەرە لاغیرتەنە باڵا میانە کەچ کولاه
سوخمە سەوزە مەیتەن ئاڵە چاو خومار ئەبرۆ کەمان
عاقل و دانا و موئەددەب وەحش و مەغروور و عەجوول
گەه دەڵێ سندان بەعاشق گەه دەڵێ چاوم قوبان
زوود خیز و توند ڕەوتە مەستە دایم چاو بەخەو
گاهی بەدخوو و زاڵمە گەه موشفیقە شیرین زمان
سا لە هەر کوێیی کە مەستت کرد سوئالی لێ بکەی
ڕازی پەنهانی سەراسەر بۆت دەکا ئەلبەت عەیان
ڕەهرەوت (قادر) بێ بۆ ئیعتای جەوابی مەسئەلەت
وەرنە (کوردی) ناتوانێ حاڵی خۆی بۆت کا عەیان

- ٥ -

لە شیعرێکی دیکەیدا کوردی لە وەسفی یاریدا دەڵێ:

ڕەنگی سووری گوڵ وەکو ڕوخسارەکەت ڕەنگین نییە
شەککەری میسری وەکو گوفتارەکەت شیرین نییە

ئەهلی چین نەققاشی چاکن خۆ بەلاّن تەسویری تۆ
نەقشی خامەی کردگارە کاری وەستای چین نییە
مەنعی من عەمدەن دەکا ئەغیارەکەت یاخۆ کەرە
تالیبی پووش و گیایە خواهیشی نەسرین نییە
من کە کوشتەی تیغی عیشقم ڕۆژی دیوانی خودا
بۆچی شاهید بێنم ئاخر کفنەکەم خوێنین نییە!
من کە ڕیسوا بووم و تەپڵی عاشقیم لێدا ئیتر
(کوردی) ئەزپەروای سەر و ئیمان و دین نییە

مەبەسی شاعیر لە دانانی ئەم شیعرە ئەوەیە پەیکەری یارەکەی بەبەرهەم و هونەرێکی کردگاری دابنێ، ئەو هونەروەرە کردگارە، خەڵکی چین نییە کە گەورەترین و شارەزاترین وێنەگرن لە هەموو گێتیدا، یاری شاعیر ئەگەر کردگار دروستی کردبێ مانای ئەوەیە لەسەر شێوەی خۆی جیلواندوویەتی، لەبەر ئەوە هیچ باکی پێ نییە بێ دین لە قەڵەم بدرێ، چونکە یار دەپەرسترێ وەکو لە شیعرەکەدا دەردەکەوێ. کوردی لەم شیعرەدا کە باسی گوڵی کردووە و ناوی گوڵی نەسرینی هێناوە، بەهیچ جۆرێ مەبەسی لە گوڵ وەسف و پێدا هەڵدان نییە وەک دیاردەییێکی جوانی سروشت، بەڵکو بۆ ئەوە بەکاری هێناوە بڵێ ڕوخساری یار لە گوڵ ڕەنگینترە، گوڵی نەسرینیش لە پووش و گیا جوانترە.

– ٦ –

شاعیر لەم غەزەلەی خوارەوەیدا خەریکی وەسفی جلوبەرگی یارەکەیەتی، لە کورتەک و کەمەرچین و قاپووت کە جلی تایبەتین بەپیاوان، هەروەها باس لە کەوا دەکا، ئەمەیان بەرگی ژنان و پیاوانە. کوردی لە شیعریدا وەسفی جلوبەرگی ژنانە ناکا. لە ئەندامانی لەشی یاریش لەم شیعرەدا چاو و دەوروبەری وەک برۆ و برژانگ کەوتوونەتە بەرتیشکی بیری تیژی مستەفا بەگی کوردی، لەدواییدا بەم وتەیە دوایی بەشیعرەکە دێنێ و بەخوێنەر دەڵێ: چوار شت لە گێتیدا داوایان مەکە و بەتەمایان مەبە، لە خۆت (واتە شاعیر) عەقڵ، لە دڵ سەبر، لە بەخت ئیمداد، لە یار یاری:

کەوا دارایی زەڕ کورتەک کەمەرچین جوببە گوڵناری
کڵاو لار چاو خومار شیرین سوار خاڵ شکڵی تاتاری
کە (مانی) هاتە سەر تەسویری ئەبرۆی تۆ لە پاش چاوت
لە مەستی دەستیدا لەرزی کە کەچ هات خەتتی پرگاری
گوڵ ئەمڕۆ خۆی موقابیل کرد بەڕوخسارت لە لای خەڵقی
بەڵێ هەردەم دڕاو و هەرزەگۆن شۆخانی بازاڕی
دوعام کرد چاوەکەت خۆش بێ کە خۆش بوو ئەمنی بیمار کرد



ڕەفیق ئامان دوعا کەن ڕەببی زاڵم هەر بەبیماری
ئەگەر تۆ ڕاست دەڵێی و قاتیلی دڵ نی ئەدی بۆچی
بەیەک یەک تیری موژگانت بەخوڕ خوێن دێ لە سوفاری
وەکو فوارە خوێن دەتکێ لە گۆشەی میحوەری گەردوون
لە چاوەی چاوەکانی من لە دووریت هێندە خوێن باری
مونەجیم گۆشەیی چاوتی کە دی نووسی لە تەقویمدا
کە ئەمساڵ زوو زەنەب تالیع بووە ئیفسادە ئاساری
ئەتۆش تەقلیدی زولفی یار دەکەی دووبارە ئەی عەقرەب
حەیا هەر وا لە چاودا چی بڵێی ئەی کوێرە موختاری
لە چوار چشت قەت مەکە خواهش لە دونیا (کوردی) تا ماوی
لە خۆت عەقڵ و لە دڵ سەبر و لە بەخت ئیمداد لە یار یاری

ئەو نموونانەی لە دیوانی کوردیدا لە بابەت وەسفی یارەکەیەوە پیشان دران جوانترین ڕەنگدانەوەی ئەم جۆرە مەبەسەن لە لای شاعیر. لە خوێندنەوەی ئەم شیعرانەدا ئەو ڕاستییەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە شاعیر لە سروشت دوور بووە، هەروەها سروشت نەبوو بەئیلهام بۆ وەسفی سروشت خۆی، وە نەبووە بەسەرچاوە بۆ بەکارهێنانی بۆ یار، چونکە دیاردەکانی ناسکی لە سروشتدا زیاتر بۆ مێیینە بەکار دەهێنرێن.

### موناجات

موناجاتی کوردی دوورە لە لاهووت، پێوەندی بەئایینەوە نییە، بەڵام هەندێ جار کە بەبەرگێکی سۆفیزم خۆی دەنوێنێ وەک موناجاتی خودایی دەکەوێتە ڕوو، چونکە یار دەبێ بە(موتڵەق)، واتە کردگاری هەموو کەسێک. ئەو (یار)ەی کە موتڵەقە و مستەفا بەگی کوردی هەندێ جار گفتوگۆی لەگەڵدا دەکا گلەییشی لێ دەکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر عەبد و کۆیلەیەتی.

– ١ –

لە شیعرێکیدا کوردی موناجات لەگەڵ یاری دەکا، دوو سێ سیفەتی کوڕ پیشان دەدا، لەوانە (لەسەر ڕێی چوونی بۆ مەدرەسە) یا (بەسواری ئەسپەوە) یا (ئەڵقەی کەمەری)، لەگەڵ ئەم سیفەتانەی کوڕ هەندێ سیفەتی تریش لە شیعرەکەیدا بەکار دێنێ بۆ کوڕ و کچ دەست دەدەن، وەکو (خاکی بەری پێت) یا (موژەی وەک تیر) یا (گۆشەی نەزەر). بەگشتی شاعیر هەموو ئەو سیفەتانە بۆ ئەو (موتڵەق)ەی خۆی بەکاری دێنێ کە کوڕە و ناوی (قادر) یا (قالە)یە.

جانا وەرە ئەم جەژنە بەقوربانی سەرت بم
بۆ تیری قەزای چاوی حەسوودان سوپەرت بم

شادن لە تەماشای نەزەرت مەحرەم و ئەغیار
مروەت نییە تەنها هەر ئەمن دەربەدەرت بم
ڕازیم بەدەنم هەر وەکو خاکی بەری پێت بێ
شایە کە لە ڕێی مەدرەسەدا ڕەهگوزەرت بم
تۆ بەو دوو ڕوخی خۆتەوە وەک شاهیی و فەرزە
دایم کە لە پێش ئەسپەکەتا وەک نەفەرت بم
وا قاڵ و زەعیف بووم لە هەتیتەی غەمی دووریت
شایستەم ئەمێستاکە کە حەلقەی کەمەرت بم
بۆ قەتلی منی خەستە موژەت هەر وەکو تیرە
ئەی من بەفیدای تیری نیگای پڕ خەتەرت بم
ئەر خەشمە وەگەر لوتفە بە(کوردی) نەزەری کە
قوربانی غەزەب گرتن و گۆشەی نەزەرت بم

- ٢ -

شاعیر لە موناجاتی ڕابردوودا خۆی بەکەم زانیوە بەرامبەر بەیار، لەگەڵ ئەم هەموو درشتییەی یار لەگەڵ دڵداری دەکا ئەو خۆی هەر بەبچووک دادەنێ. بەڵام لە غەزەلێکی دیکەیدا هەرچی ئەو خراپەیەی لەگەڵ شاعیر کردوویەتی بۆی دەژمێرێ، لێرەدا نەک شاعیر لێی خۆش دەبێ، بەڵکو دەسخۆشی لێ دەکا و دەکەوێتەوە وەسفی ڕووکەشی هەندێ لە ئەندامە جوانەکانی یار.

لەیلەکەی بێ مەیلەکەی مەحبووبەکەی عەییارەکەم
شۆخەکەی بەدبەختەکەی بێ ڕەحمەکەی غەددارەکەم
زاڵمەی لە خوا نەترسەی کافرەی بێ مروەتە
قاتیلەی عاشق کوژەی جەللادەکەی خونخوارەکەم
گوڵ بەدەن سیمین زەقەن خەت یاسەمەن فندق دەهەن
ئەسمەرەی قەد عەرعەرەی ناز و نەزاکەت دارەکەم
نەوجەوان ئەبرۆ کەمان شیرین دەهان و نوکتەدان
تورک ڕەفتار و پەری ڕوخسار و کاکۆڵدارەکەم
ئەی ڕەقیب سەد جار دەرمکەی یا جنێووم پێ بدەی
ناعیلاج هەر دەبێ بێم بۆ سەلاحی کارەکەم
زەهری دووری چەشتووە (هیجری) ئەمێستا بۆیەکە
تەلخ گوفتارە کەلام لەعلی شەککەر بارەکەم



- ٣ -

کوردی دوو غەزەلی دیکەی تەرخان کردووە بۆ موناجات لەگەڵ یاری، بەرستەی بانگکردن (عەزیزم...!) دەست پێ دەکەن. لە ڕووی کێشەوە هەردووکیان لەسەر بەحری هەزەجی (٦)ی مەحزووف (مفاعیلن مفاعیلن فعولن) ڕێکخراون. لە ڕووی قافیەشەوە دەچنە ناو دەنگی (م)، یەکەمیان (...ییم)، دووەمیان (... ـارم). وەکو دەبینرێ لە هەموو لایەنێکی هونەری شیعر و مانا و وێنە داهێنراوەکان هەردوو غەزەل وەکو یەکن، تەنیا لە کێشی قافیەکانیاندا نەبێ، لەبەر ئەوە ناتوانرێ تێکەڵ بەیەکتری بکرێن.

لە هەردوو غەزەلدا شاعیر لە یار دەپاڕێتەوە وەکو خولقێنەر و کردگارێک، هەروەها بۆ خۆی دەلاوێنێتەوە وەکو مردوویێک لە پێناوی عیشق و توانەوەی لەناو کردگاردا. بەلای شاعیرەوە (قادر) موتڵەقە، ئەمە خودای گەورە و قالەی یاریەتی، هەردووکیشیان هەر یەکێکن بەپێی تیۆریی سۆفیزمی مەنسووری هەلاج.

غەزەلی یەکەم:

عەزیزم نووری عەینەینم حەبیبم
سەبووری بەخشی جانانی شەکیبم
وەرە ڕەحمێ بەحاڵم کە عەزیزم
لە یار زویر و لە مەسکەن بێ نەسیبم
ڕەهەندەی دەستی کەس نیم خۆت دەزانی
فیراری جەوری ئەغیار و ڕەقیبم
دوو شەش بۆ داوی نەگبەت هەر لە ڕێدا
لە بەختی شەشدەر و یاری عەقیبم
ئومێدی زیندەگیم ناوە بەلاوە
کە قاتیل بوو بەجەرراح و تەبیبم
عەجوولی و وەحشەتی ئەو وەختە خۆم بووم
کە دیدەت بوو بەئوستاد و ئەدیبم
ئەوەی دەیلێم ئەگەر ئیغراقە (هیجری)
هیلاکی دەستی مەیتەن قرمزی بم

غەزەلی دووەم:

عەزیزم وا لە دووریت دڵفگارم
کە خوێن دەڕژێ لە دیدەی ئەشکبارم

وەها فرمێسکی خوێنین دێ لە چاوم
وەکو دامانی ئەلوەندە کەنارم
لە گەردی قاسیدی یەئسی ویساڵت
بەکوللی کوێرە دیدەی ئینتیزارم
کە ئومێدی ویساڵی تۆم نەماوە
بەمەرگی تۆ بەمەرگ ئومێدەوارم
لە چاوی خۆت بپرسە ئەو دەزانێ
کە من بۆ وا عەجوول و بێ قەرارم
مەکەن مەنعم کە سەرگەردان و وێڵم
بەدەست عیشقە زەمامی ئیختیارم
لەگەڵ عیشقت وەها یار و ئەنیسم
لە تۆش حەتتا بەکوللی بەر کەنارم
وەکو مەنسوورِ ئەگەر بیشم سووتێنن
(ئەنالقادر) دەڵێ گەرد و غوبارم
ئەگەر تالیع ببێ (کوردی) سزایە
بەحوقە دورِ و گەوهەر کەن نیسارم

– ٤ –

لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوەرۆک موناجات؛ کوردی ڕوو دەکاتە یاری و بەهێمنی و لەسەرخۆ لێی دەپرسێ، ئایا زانیویەتی لەبەرچی خەوی نییە! لە وەرامدا دەڵێ پێشخزمەتە و ئەم جۆرە کەسانە بەشەو ناخەون. شاعیر هەمیشە یار لەناو خەیاڵیدا دەژی، ئیتر لێرە بێ یا لەوێ، واتە لێیەوە دوور بێ یا نزیک. هەروەها پێی دەڵێ عەقڵ و هۆشی بەخۆڕایی پێشکێشی کردووە، کەس هەیە سامانێکی مفتی بدرێتێ و ئاوڕی لێ نەداتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر وەسڵی یار و بەهەشت بخرێنە بەردەستی وەسڵی یار هەڵدەبژێرێ، دۆزەخیش ببێتە بەهەشت نایەوێ.

ئەم شیعرە هەندێ وێنەی داهێنراو دەور دەکاتەوە، لە کەلێنی ڕستەکانیدا هەست بەزاراوە و لێکسیکۆنی سۆفیزم دەکرێ.

چاوەکەم زانیوتە بۆچی خەو لە چاوم ناکەوێ
چونکە من پێش خزمەتم پێش خزمەتان نانوون شەوێ
ڕۆژ و شەو دایم لەبەر دیدەی خەیاڵم حازری
سا چ فەرقێکی هەیە بۆ من ئیتر ئێرە و ئەوێ



بەس نییە لێرە دەوێرم جار بەجار باست بکەم
نەمدەوێرا قەت لەبەر ئەغیار کە ناوت بەم لەوێ
دڵ لەبەر زامی فیراقت دائیما زاری دەکا
ڕۆژ بەڕۆژ مەنعی دەکەم باز دەردی سەختە و ناسرەوێ
عەقڵ و هۆشم داوە پێت لێشی دەتۆرێی ماڵوێران
دەوڵەتێکی مفت بێ ساحێبە بۆچی ناتەوێ
گەر موخەییەر بم لە مابەینی بەهەشت و وەسڵی یار
وەسڵی تۆ بۆ من جەهەننەم پڕ لە جەننەت نامەوێ
ئەی ڕەقیب وێڵم لە دەستت لێرە بۆ لێم ناگەڕێی
باوکە کوشتەت نیم ئەرێ هەی بەد مەزەب چیت لێم دەوێ
هەر وەکو کۆهی دەماوەندی سەرم پڕ شۆرشە
قەت تەمی هیجران و غەم ساتێ لە دەوری نارەوێ
گەردنی (کوردی) لە کێوی بێستوون موحکەمترە
چونکە سەد ساڵە لە ژێر باری غەمایە و نانەوێ

## پەرێشانی و پاڕانەوە

سەرانسەری شیعری دیوانە بچووکەکەی مستەفا بەگی کوردی وێنەی پەرێشانی ناوەوەی جیگەر و هەناوی گرتووە، ئەم نەخۆشییە دەروونییە بووە بەنەخۆشی ڕاستی و هەموو ئەندامی لەشی داوەشاندووە و لە هێزی خستووە. ئەم ئاژاوەیەی ناو هزر و دڵی بووە بەهۆی هەمیشە دەستەو دوعا لە پاڕانەوەدا بێ، پەنا بۆ هەموو شتێک ببا، بەڵکو تۆزێک لە ئازاری کەم بکاتەوە.

– ١ –

ئەمان مردم عیلاجێ سا لە ڕێی پێغەمبەرا چارێ
ویساڵ یا قەتل یا تەسکین لە هەرسێ بۆم بکەن کارێ
وەها سووتاوم ئەسلەن تابی فەریادم نەما سادەی
ڕەفیقان نیوە سووتوون ئێوە نامەرد عەرزە هاوارێ
لە کونجی سینە دەنگی ئای و وای دڵ دێ بەمەحزوونی
وێران بێ نەمدی ساتێ لێی نەیە ناڵەی بریندارێ
ئەلای هەرکەس دەچم مەنعم دەکا خۆت بۆچی ڕیسوا کرد
درێغ کوا حاڵ زانێ ڕەببی تووشم بێنێ بیمارێ

له ژێر باری غەما وا شانی سەبرم ڕێژە ئێستاکە
فیراقی یار لەبەر ئاخر شەڕی لێم بۆتە سەرباریٚ
له نەزعا پێی دەڵێم قوربان جەفا بەس بیٚ دەڵێ کافر
ئەمە چیت دیگە تۆ سەگ مەرگی کارم ماگە پێت جاریٚ
سەبا یارانی مەجلیس گەر هەواڵی من دەپرسن لێت
بڵێ کێشاویەتە مەیخانە چاوی بێچووە عەییاریٚ
دوڕڕ و یاقووت دەباریٚ لەم کەلامە شیرینەی (کوردی)
خوا سا کوا لە دونیادا قەدرزان و خریداریٚ

کوردی لەنیوەدێڕێکی ئەم شیعرەدا تەعبیرێکی ناوچەیی شێوەزاری سنە (ئەردەڵان)ی دیالێکتی کرمانجیی باشووری زمانی کوردی بەکارهێناوە:

ئەمە (چیت دیگە) تۆ سەگ مەرگی (کارم ماگە پێت) جاریٚ. ڕستەکانی (چیت دیگە) و (کارم ماگە پێت) تایبەتین بەشێوەزاری سنە، لە شێوەزاری سلێمانی دەبن بە(چیت دیوە) و (کارم ماوە پێت)، ئەم دیاردەیە لە شیعری کوردیدا ئەوە دەگەیەنێ (قادر)ی یاری لە بنجدا خەڵکی سنە بووبێ، وەکو لە هەندێ گێڕانەوە لە بابەت شاعیرەوە بەدەم بیستراون، بێ گومان گەشتەکەی (قادر) بۆ سنە و شیعرەکەی کوردی (سەدای کاروانی فیرقەت) بەڵگەی ئەوەن یاری کوردی سنەیی بوو بێ.

کوردی لە کاتێکدا ئەم شیعرەی تەرخان کردووە بۆ وەسفی ئەو نەخۆشییەی تووشی بووە و بەشوێن پزیشکدا وێڵە کەچی بۆی نادۆزرێتەوە، لەناو تەمومژی ئەم هەموو حاڵەتە سایکۆلۆجییە و مەینەتییە و بیرییەی تووشی هاتووە بەسەر شاعیرییەتی خۆیدا هەڵدەڵێ. قسەکانی دوڕڕ و یاقووت دەبارێن بەزمانی شیرینی کوردی، بەڵام کەس نرخیان نازانێ، هەندێ لە شاعیرانی کورد ئەم مانایەیان درکاندووە، زۆریان لەدوای کوردی ژیاون.

لەم شیعرەیدا کوردی پەرێشانی خۆی گەیاندۆتە پلەیێک پاڕانەوە دەردی تیمار ناکا، بۆیە تەنیا مردن دوایی بەئێش و ئازاری دێنێ. لەمەوە خۆی دەرباز دەکا و لەم مەبەسە ناچێتە دەرەوە و پارچە شیعرێکی دیکە دادەنێ، ئەستووری بیروباوەڕی خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر بەدڵداری و ئایین، وەک لە تێکستی شیعرەکە دەردەکەوێ لە لای خوارەوە.

- ٢ -

ڕەفیقی کونجی میحنەت عاجزن هەر شەو لە ناڵینم
بزانن گەر لەبەر لێشاوی بەحری مەوجی ئەسرینم
ئەگەرچی ڕۆژ و شەو مەشغوولی نەغمەی موتریبم ئەمما
لە غەم خاڵی نییە ساتێ دڵەی مەحزوون و غەمگینم



تەبیب دێنن دەوای دەردم بکا خۆ من زەدەی دووریم
بەبێ داروویی وەسڵی ئەو نییە ئارام و تەسکینم
ئەگەر مومکین نەبوو ژینم کە من مردم وەسییەت بێ
لەباتی قەوم و خوێشانم لەسەر مەیتم بکا شینم
شەهیدی عیشقم و مەمشۆن و کفنم بۆ مەکەن یاران
گەواهی حەشرە بۆ دەعوای شەهادەت بەرگی خوێنینم
بەپەردەی زاهیری گەر بێ سەدای ئەو عاشقی یارم
ئیتر حاجەت نییە بێنن مەلا بۆ وەعز و تەلقینم
عەبەس (کوردی) مەلائیک دێن دەپرسنو مەزهەب و دینت
کە قادر خۆی دەزانێ من لەسەر کام مەزهەب و دینم

لەم شیعرەدا کوردی بەتەواوی خۆی ساغ کردۆتەوە کە دڵدارێکی گەردوونییە، سێ کوچکەی (بوون) لە لای شاعیر (خۆی و کردگار و قادر)ە. دیارە قادریش هەرچەندە لە قاڵبی کوڕێک بەرجەستە بووە، بەڵام بە وشە یەکێکە لە ناوەکانی کردگار. بەم جۆرە بۆ دیاریکردنی هەڵوێستی کوردی لە سۆفیزمدا ئەم سێ کوچکەیە کردگار و مورشید و دەروێش، واتە (کردگار و قادر و کوردی) لەناو یەکتریدا تواونەتەوە. جا ئەم حاڵەتە لە لای کوردی ئەگەر پراکتیکیش نەبوو بێ، بێ گومان لە ڕووی تیۆرییەوە باوەڕی پێی بووە، ئەوەی بۆ ئەدەبیش گرنگە، ئەگەر شاعیر بەڕاستی بووبێ یا نا، ئەو بەرهەمە شیعرییە نازدارەیە بەزمانی کوردی لە قەڵەمی مستەفا بەگی کوردی چۆڕاوەتەوە.

## دووری لە یار

چارەنووسی دڵداری (عیشقی) شاعیر و مەبەسی هونەر لە داهێناندا وەک بەرهەم لەوەدایە دڵدار و یاری نەگەنە یەکتری، هەمیشە لە یەکترییەوە دوور بن. زۆربەی شیعری مستەفا بەگی کوردی خەریکی دوورییە، لە هەندێ بەرهەمیدا ئەم ئامانجەی شاعیر لەبەرچاوە، ئەگینا سیفەتی گشتی لە دڵداریی ناو شیعری دوور بوون و دوور کەوتنەوەیە لە یەکتری.

- ١ -

چێشتم ئەمڕۆ ژەهری مار و ڕووحی شیرینم نەهات
زەخمی کۆنەم هاتە ژان و مەرهەمی برینم نەهات
من غەمم خوارد و غەمیش خوێنی جیگەرمی خواردەوە
بۆیە گریام چەند بەچەند فرمێسکی خوێنینم نەهات
غەم سەری لێدام و یارم قەت سەرێکی لێ نەدام

ســـەبر و هۆشم ڕۆییـــــوە غـــــارەنگەری دینم نەهات
دڵ دەسـووتێ چین بەچین دەشکێـتـە سەریەک وەک فـەنەر
ســاحـــیـــبی ڕووی ئاتەشین و زولفی چین چینم نەهات
دیدە وەک هەوری بەهاران خـــوێن دەگـــریێنێ و ســـەدای
پێکەنینی غـــــونچـــــەیی نەوســــەبزە پەرژینم نەهات
گـۆی سـەرم چەوگـانی مـیـحنەت دایە بەر خـۆی ڕایفـڕاند
ئەلعــــەجــــەب بۆ شــەهســـــواری خـــانەیی زینم نەهات
کـەوتمە ناو نەزع و غـەم خـسـتـمـیـە حـاڵی غـەرغـەرە
(کوردی) بێ کەس خۆم لە هیچ لایێ سەدای شینم نەهات

لەو شیعرەدا کوردی وەستایەتی نواندووە لە دروستکردنی هەندێ وێنەی ڕەوانبێژی. مەبەسی سەرەکی شاعیر بێ گومان دوورکەوتنەوەی خۆشەویستە لێی، لەبەر ئەوە پاش قافیەی شیعرەکە (نەهات)ە، هەموو شتێک دێتە لای تەنیا یار نەبێ. گەلێ شت لە شاعیرەوە نزیکن: ژەهری مار، کولانەوەی برینی کۆن، غەم، کەچی ئەوەی لێی دوورە تەنیا یارە، ئەگەر لە شاعیر نزیک ببێتەوە هەموو دەردێکی دەرمان دەکرێ و هەموو برینێکی ساڕێژ دەبێتەوە، بەڵام ئەمە ڕوو نادا.

- ٢ -

لە شیعرێکی دیکەیدا هەر بەناوی دوورکەوتنەوە و جیابوونەوە دەڵێ:

ئاغـە گـیـان تۆ خۆت دەچی بۆ شـار و من لەم غـوربەتە
زەحـــمـــەتە یاران خـــەلاسـیـم بێ لە دەس ئەم فـرقـەتە
هەر کـەسێ شـەهدی ویسـاڵ و ژەهری دووری چەشـتـبێ
ئەو دەزانێ دەردی دووری چەند گـرانە و زەحـمــەتە
دێ بەتاو ئەشکی دوو چاوم هەر وەکـو دیجلە و فـورات
مـەزرەعـەی غـەم سـەبز و دڵ تێـراوە وەک ئەم دوو شـتـە
تا ئەسـیـری داوی تۆم ڕەحـمێ بەحـاڵم کـە توخـوا
مــوددەیێکی تر لە دەســت ڕادەبوورم فــرسـەتە
دڵ ئەمـانەت بوو لە لات ئێـسـتـاکـە وا حـاشـا دەکـەی
وەرنە ســەیر ئەم کــافــرەی بێ ئایین و بێ مــروەتە
جـەننەتە جێم چونکە ئەم شـۆخـە بەناحـەق کـوشـتـمی
هیند شـەریف و پاکـە حـەتتـا کـوشـتنیـشی ڕەحـمـەتە



ڕوو لە قـیـبلەی مـسـتـەفـا ناکـا دەڵێ (کوردی) هەتا
تاقی مـــیـــحـــرابی برۆی دەرخـــا لە عـــالەم ئەم بوتە

یار و خۆشەویستی کوردی ئەگەرچی پیاوە، یا ڕاستتر مێردمنداڵە، بەڵام بەپێی دەستووری گێتیی سۆفیزم بۆ شاعیر بووە بەشێخ و مورشید، لە گێتیی کۆمەڵایەتی دەرەوەی ئایین و سۆفیزم بووە بەئاغا. کوردی بیری لە لای ئەوە نییە خۆی مستەفا بەگە و هەڵگری لەقەبی سوارچاک و چەکمە ڕەقەکانی بابانە، بەڵکو خۆی بەبچووک دەزانێ، لەبەر ئەوەیە یاری خۆشەویست بەئاغا بانگ دەکا و بەشارستانیی بەخەڵکی دەناسێنێ، خۆی بەکەم و نەفام و لادێیی دادەنێ، یاری بەشارستانی حسێب دەکا بۆ ئەوەی لە خۆی گەورەتر بیخاتە بەرچاو. لە پاشانا دیسانەوە دەکەوێتەوە پاڕانەوە و داوای لێ دەکا بەزەیی پێدا بێتەوە، کەچی بەلای شاعیرەوە مەسەلەکە پێچەوانەیە، ئەگەر ڕەقیش بێ لەگەڵی تا کوشتن، ئەو کوشتنە ڕەحمەتە.

- ٣ -

لە غەزەلێکیدا شاعیر باس لە دەردی دووری و ئاوارەیی دەکا، پاش قافیەی (ئەم شەو)ەیە. شەو لە شیعری کلاسیکیدا لە ڕووی ڕەوانبێژی و جوانکارییەوە دەوری گرنگ و باڵای هەیە، بووە بەبەڵگەی داهێنانی بەرز لە مانا و وێنەی شیعریدا. هەرچەندە شەو خۆی پڕ لە گیروگرفت و نهێنی و تەلیسم و سیحر و نادیارییە، ئەوەندەش بووە بەمایەی دروستکردنی بەرهەمی بەرز. سۆفی و عاشق و خاوەن دڵ و هونەروەر و پیری موغان و هەموو خاوەن هەستی ناسک شەوپەرستن، لەبەر ئەوە درێژترین شەو بووە بەڕەمز لە گێتیی شیعرایەتیدا و ڕۆمانتیکییەتی ژیانی ئادەمزاد.

کوردی غەزەلەکەی بە(شەوی یەلدا) دەست پێ کردووە، ئەم شەوە لە ڕۆژژمێری کۆنی هەتاوی (ڕۆژژمێری نەورۆزیی) درێژترین شەوی ساڵە، دەکەوێتە شەوی ٢٠-٢١ی کانوونی یەکەم، لەپێش ئەو شەوە، شەو هەر دێ و درێژ دەبێ، تا ئەو (شەوی یەلدا)یە، لەدوای ئەو هەر دێ و کورت دەبێتەوە، تا لە شەوی نەورۆز ٢٠-٢١ی مارت (ئادار) درێژی شەو و ڕۆژ وەک یەک دەبن و، ئەو ڕۆژە ڕۆژی یەکەمی سەری ساڵە.

شـــەوی یەلدایە یا دەیجــــوورە ئەم شـــەو
کـــە دیدەم دوور لە تۆ بێ نوورە ئەم شـــەو
دڵم وەک حــاکــمی مــەعــزوورە قـــوربان
خــەلاتی وەســڵی تۆی مــەنزوورە ئەم شــەو
کـە تۆی شـای کـە چ کـولاهی دیدە مـەسـتـان
چ باکم قــەیســەر و فــەغـفـوورە ئەم شـەو
ســـرشکم نەقـــشی ناوی تۆ دەکـــێـــشێ
جـێگام سـێـدارەکـەی مـەنسـوورە ئەم شـەو

دڵیش مایل بەدەیدەی تۆیە بۆیە
لە من وەحش و ڕەمیدە و دوورە ئەم شەو
لە خەو هەڵساوی یا ئاڵۆزە چاوت
هەمیشە وایە یا مەخموورە ئەم شەو
لە دووریت من وەکو بولبول دەناڵم
بەوەسڵت عالەمێ مەسروورە ئەم شەو
سوپای موژگان و تیغی ئەبرووانت
شکستی فیرقەیی تابوورە ئەم شەو
ئەگەر یاران دەپرسن حاڵی (کوردی)
لە کونجی بێ کەسی مەهجوورە ئەم شەو

لەو شیعرەدا کوردی هەندێ ڕووداوی مێژوویی لەمەڕ گەورە پیاوانی فەرمانڕەوایی دەوڵەت و گێتیی سۆفیزم دەور دەکاتەوە. یاری خۆی لە قەیسەری ڕۆم (ڕۆمان) و فەغفووری چین گەورەتر دەزانێ، لەبەر ئەوە سەرێ بۆ ئەو خۆشەویستە دادەنوێنێ نەک بۆ ئەوان.

وێنەیێکی جوان لەو غەزەلەدا دروست دەکا کە دەبێژێ فرمێسک لەسەر ڕوومەتیدا ناوی یار تۆمار دەکا یا دەنەخشێنێ، وە خۆی لە سۆفیزمدا دەگەیەنێتە پلەی مەنسووری هەلاج. ئەم مانایانەی مستەفا بەگی کوردی لەم غەزەلەدا داهێنانی سۆفیزمیان تێدا نەبێ، بەڵکو لە وەسفی گێتیی سۆفیزم نزیکی دەکەنەوە.

## عیشق و عاشق

لە شیعرێکیدا کوردی بیری لە کۆمەڵە کەسانێک کردۆتەوە بەدرێژایی مێژوو وەکو خۆی تووشی دڵداریی حەقیقی بوون، هەندێکیان ڕەمزی دڵدارییان کچ بووە، بڕێکیان نێرینە بووە. ئەوانەی ناویان دێنێ ئەمانەن:

لە ڕۆژگارانی زۆر کۆن (سامیری) هەڵدەبژێری، ئەمە کەسێکی جادووگەر و ساحیر بووە لە سەردەمی مووسا پێغەمبەر ژیاوە. لەناو عەرەبی پێش ئیسلام (سەحبان کوڕی زەفەری ئەلوائیلی) دانا و زانای کۆمەڵی خۆی بووە و لەدوای ئیسلام کۆچی دوایی کردووە. لە سەردەمی پێش ئیسلام و فەرمانڕەوایی ڕۆمانەکان (لوقمانی حەکیم) و (سەتیحی) گەورە کاهینانی پێش ئیسلام هەڵدەبژێرێ. لە شاعیرانی عاشق ناوی (حافزی شیرازی و سەعدی شیرازی و نیزامی گەنجەوی و نوورەدینی جامی) دەبا. لە دڵدارانی حەقیقی ڕەمزی ژنانە باس لە قەیس (مەجنوون) و (فەرهاد)ی دڵدارانی لەیلا و شیرین دەکا. لەناو شازادە و سوڵتان و فەرمانڕەوایاندا (خوسرەوی پەروێز و ئەمیر خوسرەوی دهلەوی و سوڵتان مەحموودی غەزنەوی) دەدۆزێتەوە. مستەفا بەگی کوردی سەرتۆپی عاشقان لە (شەمسی تەبریزی مورشیدی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی و مەنسووری هەلاج) دەبینێ.



کوللی عالەم وا بوون سەرگەشتە و حەیرانی عیشق
هیچ کەسێ نازانی ئەحوالی سەر و سامانی عیشق
بادە پەیمانانی ئیدراک و کەمالی عاریفان
لەنگ و عاجز بوون لە ڕێی تەی کردنی مەیدانی عیشق
گەرچی غەوواسانی فیکرەت غوتەوەربوون مووەدەتێ
قەت نەبوون واقیف لە قەعری بەحری بێ پایانی عیشق
سامیری و سەحبان و جارەڵڵا و لوقمان و سەتیح
موخبیر کوللی عولوومێ بوون و سەرگەردانی عیشق
حافز و سەعدی و نیزامی قەیس و جامی و دهلەوی
فەیز خواه و مەعریفەت جۆبوون لە شاگردانی عیشق
خوسرەو و مەحموود و فەرهاد هەرسێ شا و شازادە بوون
ئاخری بووشن بەعەبد و چاکری سوڵتانی عیشق
شەمس و مەولانا و مەنسووڕ کەی بەسیر مەحرەم دەبوون
تا نەیان خواردایە ڕێزەی نانی سفرەی خوانی عیشق
زاهیدا خوێندووتە تەفسیری (لِکُلٍّ وِجْهَةٌ)
قەت مەدە تەعنە لە مەستی و بێخودی ڕەندانی عیشق
مولتەجی نابێ بەکەس (کوردی) لە دونیا و ئاخیرەت
ڕۆژی دیوانی خودا دەستی من و دامانی عیشق

کوردی لەناو داهێنانی ئەم عاشقانە دوور نییە دڵداری نێوان خۆی و قادر بەراوورد بکا لەگەڵ دڵداریی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی لەگەڵ ئەیاز (لەناو کوردەواریدا بەناوی هەیاسی خاس بەناوبانگە) کە بەمەعشووق و غولامی سوڵتان مەحموود لە ئەدەبیاتدا ناوی دەرکردووە. لە هەموو هەڵسوکەوتێکدا پێوەندی ئەم دوو عاشقە بەیارەکانیانەوە لە یەکتری دەکا. هەر لەو شیعرەدا کوردی پێچەوانەی حاڵەتی خۆی و سوڵتان مەحموودی هێناوەتە گۆڕێ، ئەویش پێوەندی نێوان شەمسی تەبریزی و مەولانای ڕۆمییە، مەعشووق کە شەمسی تەبریزییە بەتەمەن بیست و دوو ساڵ لە عاشق گەورەترە کە مەولانا جەلالەدینی ڕۆمییە.

## بەزمی ڕەندان و کۆڕی عاشقان

(پیری موغان) سەرکردە و شاهنشای بەزمی ڕەندان و کۆڕی عاشقانە، لەو کۆبوونەوە نهێنی و سیمبۆلییەدا عاشقان و مورشیدیان کە وێنەی کردگارن هەموویان لە یەک پلەدان، گەورە و بچووکیان تێدا نییە و لەناو یەکتریدا تواونەتەوە. مستەفا بەگی کوردی شیعرێکی بۆ ئەم مەبەسە گیانییە هۆنیوەتەوە،

بەڵام لە دەستی دەرچووە وەکو خۆی دەڵێ، واتە وەسفە شیعرییەکەی لە کۆبوونەوەیێکی خودایییەوە بووە بەکۆبوونەوەیێکی زەمینی، لەبەر ئەوەیە لەدوا دێڕی شیعرەکەیدا پەشیمان بۆتەوە و داوای پۆزشت دەکا و، دەڵێ ئەم شیعرەی تەنیا بۆ ئەوە وتووە خەڵکی پێی نەڵێن بۆ شیعری لەم بابەتەی نەوتووە.

کوردی هەرچەندە سەرەتای شیعرەکەی بەهەناسەیێکی سۆفیزمی و ڕۆمانتیکی و سیمبۆلییانە دەستی پێ کردووە و کەشوهەوای گیانییانەیە نەک مەتریاڵییانە، بەڵام ئەو قاووغە بەهەشتییە دەگوێزێتەوە کۆڕی بەزم و ئاهەنگی خوسرەوی پەروێزی ئێرانییانی کۆن و شانۆ و پەردەی مۆسیقا و گۆرانییەکانی بەغدای هاڕوونی ڕەشید.

کوردی لە شیعرەکەیدا دەڵێ:

دڵ لە میحنەت کەیلە ئەی پیری موغانی بەزم ساز
هەر ئەتۆی بۆ بارەگای عەیش و تەرەب مەسنەد تیراز
مەی حەرامە گەر بەفەتوای زاهید و قەولی جەدید
پیری من جار جار بەقەولێکی قەدیم داویە مەجاز
بانگ کەنە زاهید نەماوە وەرنە گۆشەی خانەقا
بێن کەوازە دەرکی مەیخانان و خەلوەتگاهی ڕاز
خوابی غەفلەت نازیلە بۆ چاوی شەحنە و موحتەسیب
فرسەتە جامی ئەسەرکێشی بەلا بێ ئیحتیراز
با لە شەرتی بادەمەر ئەفگەن بێ ساقی نەوجەوان
دیدە سیونگی و کلاو کە چ کات و دوگمەی سینەواز
زولف و کاکۆڵی غولامانەی هەموو ئەفشان بکا
بێ بەزانوو دا بدا جامێ بەعیشوە و شەرم و ناز
دەستی یار و گەردنی قەڕڕا بەلێوی جامی مەی
فێس و تەرلک بگەڕێ دەورەیی دیدە میسلی باز
خاوکەرەی خانمە قەتارەی سۆل و سۆزەی نەسمەجان
ڕەقسی سمکە نازی شەهر ئاشووب و غەمزەی سەروی ناز

لەدوای ئەمە شاعیر ناوی کۆمەڵێک هونەرمەندی مۆسیقار و گۆرانبێژ دەبا، لەگەڵ ناوی گۆرانی و بەستە و مەقامەکانی ئەو سەردەمە، ناوی چەند ئامێرێکی مۆسیقاش دەهێنێ. ئەو هونەرمەندانەی ناویان لە شیعرەکەیدا دەنووسێ زۆرن، لەوانە: «ئاغە زەننوون (ئەمە ڕەنگە لە بنەچەدا تورکی ئاسیای ناوەڕاست یا لە قاجاران بوو بێ)، ئەلکە، ئەسعەد، مستۆ ئیبراهیمی ئاوڕەحمان، مستەفا، یوونس، ڕەسووڵ، ساڵح، محیەدین، قەرە». لە ئامێرەکانی مۆسیقا باس لە (تەنبوور و دەف و چەنگ و ساز) دەکا. ساز



بەهەموو ئامێرەکانی مۆسیقاش دەوترێ، ئینجا ناوی کۆمەڵێک گۆرانی و بەستە و مەقام دەهێنێ، وەکو: (نەوا، فەتحی حەزین، ناری، سێگا، شاری، حیجاز، ڕاست، نیوەشەو، چوارگا، قەزاز). هەروەها لەم بەزمی گۆرانی و ئاواز و مۆسیقا و سەمایە کارێکی ئاساییە ناوی هەردوو گۆرانیبێژ و مۆسیقاری سەردەمی خوسرەوی پەروێزی ساسانیان باربوردونەکیسا (نیگیسا) ببا. مستەفا بەگی کوردی لە سەرووی ئەم هەموو ناوانەوە ئەیازی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی لە بیر نەکردووە، ئەیاز لای سوڵتان وەک قادری کوردی بووە:

دائیرەی میسری چەقانە گەوهەر و لەنجەی سەمەن
دەنگی چاوش بێ بەڵا هاوێتە گیانم بێ نەواز
(ئاغە زەننوون) لێبدا سینەکەمان فارس گرفت
(ئەلکە) تەنبوور و دەف و (ئەسعەد) بدا دەستی بەساز
(مستۆ ئیبراهیمی ئەوڕەحمان) نەوا و فەتحی حەزین
(مستەفا) ناری و سێگا (یوونس) بڵێ شەهری و حیجاز
با (ڕەسووڵ) هەڵداتە ڕاست، (ساڵح) بڵێ نیوەشەوێ
(محیەدین) چوارگا و (قەرە) دەنگی بڵند کا بۆ قەزاز
جار بەجار بەکزێکەوە هەڵسێ لە پەردەی زاهیری
یارەکەی عاشق کوژ و مەعشووقەکەی دوژمن نەواز
موتریب ئەروا بن فیدایان بێ (نیگیسا) و (باربەرد)
ساقی ئەڕوا بێ بەقوربانی دوو دیدەی بێ ئەیاز
مەجلیس ئەڕوا بێ هەزار جەمشیدی جەم فەڕڕاشییە
مەی ئەگەر وا بێ بەهای جامێکی ئێران و حیجاز
ڕێ مەدە لەم بەزمە سۆفی تەکیە و شێخی خانەقا
کۆنە لۆتی جننەپەروەر سفلەیی بەچچە نەواز
وەنییە (کوردی) مایلی ئەو نەوعە ئەتوارانە بێ
لازمە شاعیر لە هەر نەوعێ بلێ بۆ ئیمتیاز

ئەم شیعرەی مستەفا بەگی کوردی جگە لە نرخی هونەری و ئیستێتیکی، سەرچاوەیێکی گرنگە بۆ لێکۆڵینەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و هونەری ناوچەی سلێمانی لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا، ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێ کوردی نارەزایی دەربڕیوە بۆ وەسفی ئەو ئاهەنگە پڕ لە خۆشییە، چونکە ئەو لە هەموو ژیانیدا لە پەرێشانی و پەژارە بەولاوە هیچی دیکەی نەدیوە.

## له سایەی نالیدا

تارمایی شیعری «نالی» له هەندێ شیعری هەردوو شاعیری سلێمانی «سالم و کوردی» دەکەونه بەرچاو. سالم له شیعریدا ناوی نالی بردووه و وەرامی نامه شیعرییەکەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم...)ی داوەتەوه. کوردی ئەگەرچی ناوی نالی نەهێناوه، بەڵام ئاشنای بووه و شیعری خوێندۆتەوه، جگه لەمه شاعیرییەتی نالی کاری لێ کردووه، له برێک شیعری کوردیدا له هەموو لایەنێکی هونەرییەوه کارکردنی نالی پێیەوه دیاره.

بەڵگەی ئەم قسانه ئەوەیه نالی دوو غەزەلی هەیه یەکەمیان:

دەروونم پڕ کـــــەباب و دەرده بێ تـۆ
دڵم گـــەرم و هەناســـەم ســـەرده بێ تۆ

دووەمیان:

نەمـــردم من ئەگـــەر ئەمـــجـــاره بێ تۆ
نەچم شــــەرته هەتا ئەو خـــواره بێ تۆ

کوردی هاتووه شیعرێکی لەسەر کێش و قافیەی نالی داناوه. کێشی شیعری هەردووکیان هەزەجی (٦)ی مەحزووفه (مفاعیلن مفاعیلن فعولن)، هەردووکیان پاش قافیەیان (بێ تۆ)یه، تەنیا ئەوه هەیه قافیه بنچینەییەکانی ئەو شیعرانه جیاوازییان تێدایه، غەزەلی یەکەمی نالی (... ـەرده)یه، ئەوەی دووەمی (...اره)یه، کەچی غەزەلەکەی کوردی (... ینه)یه، بەڵام لەگەڵ ئەو جیاوازییه ئەو شیعرانه وا دەکەونه بەرگوێ وەکو قافیه بنچینەکانیشیان یەک ئاواز و وەکو یەکتری بن.

دەروون زامـــدار و دڵ غـــەمگینه بێ تۆ
ســـەرم گـــێـــژ و لەشم بێ تینه بێ تۆ
خـــەوم بێ هۆشـــیـــه بەرگم پەلاسـه
خـــۆراکم زەهره شـــادیم شـــینه بێ تۆ
جـێگام سەحرایه وەحشـیم یار و هاودەم
درک فـــەرش و گـــەوەن بالینه بێ تۆ
له ئەشک و ئاهی ســـەردم ئاییـنەی دڵ
قـــەبان زەرد و ڕەش و ژەنگینه بێ تۆ
سەرم سەمتووره سینەم چەنگ و دڵ دەف
خـــەفـــەت یار و مـــەقـــام بالینه بێ تۆ
کەباب دڵ خوێن مەیه ساقی فیراقت
قـــەدەح چاو و مـــەزەم ئەســرینه بێ تۆ



دەروون گـولزار و خوێن گـوڵ باغـەبان دڵ
فـەغـان بولبـول جـەفا پەرژینه بێ تۆ
ڕەقـیب ڕوو ترش و ئەشکی دیده سوێره
حـەیات تەلخ و ئەجەل شـیرینه بێ تۆ
زەمـستان مەیلەکەت پاییز براکەم
بەهاری عـومری من هاوینه بێ تۆ
ئەوا من بووم بەشا و سوڵتان و والی
توخوا سا کاکه گیان بێ ژینه بێ تۆ
کـه هەمسایان له تاو ناڵینی (کوردی)
دوعای مـەرگم دەکەن ئامینه بێ تۆ

مستەفا بەگی کوردی بەگشتی کە هەندێ جار لاسایی نالی کردۆتەوه شیعرەکانی له ڕووی ڕوخسارەوه بەتایبەتی کێش و قافیه و وشه و هەندێ تەعبیری کوردییەوه له شیعری نالی دەکەن، بەڵام له ڕووی ناوەرۆکەوه داهێنراوی ڕەسەنی شاعیرن. ئەو شیعرانەی کوردی ئەگەر له دیوانی خۆیدا نەبن و نازناوی تیایاندا تۆمار نەکرابێ دەشێ بەهی نالی حسێب بکرێن. ئەم دیاردەیه تەنیا پێوەندی بەشیعره سووک و مانا له ڕووەکانی نالییەوه هەیه، ئەم جۆره شیعره له دیوانی نالیدا کەمن، وەکو ئاشکرایه شیعری نالی بەگشتی قورس و داخراوه، بەپێچەوانەی شیعری مستەفا بەگی کوردییه.

## وەسیەت و ماتەمنامه و ماڵاوایی

دەروونی کوردی شانۆی ژیانی کوردەواری بوو، کەموکوڕی و تەنگوچەڵەمەی ئادەمزادی لەسەرا پیشان دەدرا. هاوار و گریه و پاڕانەوه و عەشق و دەروێشی مستەفا بەگی کوردی ڕاسته گیانیی بوو، بەڵام هەر لەو کاتەدا ڕەنگدانەوەی بەسەرهاتی کوردیش بوو، دڵدارێکی ڕاستەقینه بوو، لەبەر ئەوه دڵسۆزی ئادەمزاد بوو.

ئەم قەسیدەیەی لێرەدا تۆمار دەکرێ یەکێکه له شا شیعرەکانی دیوانه ڕەنگینەکەی، تەنیا وەک وەسیەتنامه ناکەوێتە بەرچاو، بەڵکو ماتەمنامه و ماڵاوایییێکه خۆی بۆ خۆی نووسیوه پێش کۆچی دوایی. کوردی ئەم وەسیەتنامەیەی بۆ تاکه کەسێک یا تاقمێک له خزم و کەسوکار و هاوڕێیانی نەنووسیوه، بەڵکو بۆ هەموو میللەتی کورد:

عـــــەزیزان من ئەوا ڕۆییم لەلاتان
له مـــــەزلوومـــان بلا چۆڵ بێ وڵاتان
کـــه ئێـــوەن پادشـــای لوتف و عـــەدالەت
بەخـــوا حـــەیفـــه بڕەنجـــێنن گـــەداتان

سەفەرمان چونکە ڕێی هات و نەهاتە
دوعامان بۆ بکەن ئێوە و خوداتان
ئەگەر سەر بوو ئەگەر ڕووح بوو ئەگەر دڵ
هەموو ڕۆیین چییە ئیتر تەماتان
سەیادان وەحشییان بێن دەستەمۆ کەن
نەوەک بەربێ شکاری خانەزاتان
ئەگەرچی خاک و خۆڵی رەهگوزارم
بەسەرما خۆ گوزەر ناکا سەباتان
لە گوڵستان عومری خۆم سەد جار تەلەف کرد
نییە عومرم بەمەرگی خۆم وەفاتان

کوردی بەهەموو نەتەوەی کورد دەڵێ: من تاقە کەسێکم دەمرم و دەڕۆم، بەڵام ئێوە دەمێنن، واتە کۆمەڵی کورد، لە پاش من با وڵات کەساس و هەژاری لێ نەمێنێ، چونکە چەوساندنەوە و ستەم و زۆرداری لە ڕەوشتی کورد نییە.

بڵا سا شار بەشار و دێ بەدێ بم
لە دەست یاران بکەم تەیی وڵاتان
لەبەرگی عەیش و سیحەت خۆم دەکەم ڕووت
بەڵا دەستی من و چاکی کەواتان
کە من ڕۆییم جەهەننەم پڕ مەکەن لێم
لە من خاڵی مەکەن خۆشک و سەراتان
وەرن بنوارنە چاوی پڕ لە خوێنم
بەتەفسیلات ببینن ماجەراتان
منم سەرکردەتان بۆ لەشکری غەم
دەترسم من بڕۆم بشکێ سوپاتان
مەڵێن کەڵکی نەبوو ڕۆیی جەهەننەم
سەرم قەڵغانە بۆ تیری قەزاتان
لە پێشا لەفزیان بێ گفتوگۆ بوو
ئەمێستا نابیەم حەتتا سەداتان

لەم دێڕەشیعرانەدا کوردی ژیانی نالەباری خۆی بەکورتی دەور دەکاتەوە، هەمیشە ئاوارە و دەربەدەر



بووە، بێ لانە و داڵدە بووە، خۆشیی لە ژیانا نەدیوە. لە خەڵکی کورد دەپاڕێتەوە لەپاش مردن بەخراپە باسی لێوە نەکەن، هەروەها کۆشک و سەرایان لە ناوی ئەو بێ بەش نەکەن. ڕاستییەکەش ئەوەیە ناوی کوردی بەهیچ جۆرێ لە کۆمەڵی کوردەواریدا ئاوا نابێ، چونکە دیوانی شیعری هەیە، شیعر کەسایەتی میللەت دەپارێزێ. بەخەڵکی کورد دەڵێ ژیانی هەژاری و پڕ لە ناسۆری خۆی ڕەنگدانەوەی ژیانی هەموو میللەتە. لەبەر ئەوەی مستەفا بەگی کوردی نموونەییێکی ڕەسەنی کوردە بەچاکە ناوهێنانی لە چاکەی کورددایە:

هەتا من بێ هەواتر بووم بەسەد ڕەنگ
لە دەرهەق من زیاتر بوو هەواتان
بەسەد جەور و جەفا تا ڕاغیبەت بووین
نەبوو غەیری جەفا و زۆرێک جەزاتان
جەفاتان دام و کوشتمتان بەزاری
نوزوولی ڕەحمەتە جەور و جەفاتان
نەسیمی کۆیی تۆ خاتر دەکا شاد
بەبۆی توورڕەی پەشێوی پانیاتان
ئیلاهی من ببم ڕۆژی دوو سەد جار
بەقوربانی گەدا و پادشاتان
ئەوەند ئەرجوو دەکا (کوردی) کە جار جار
بکەن یادی موحیببی بێ ڕیاتان

هەرچەند شاعیر گلەیی لە خەڵکی کورد دەکا و ئەوان دەکاتە هۆی هەموو ناخۆشییێک لە ژیانیدا، بەڵام دیسانەوە لێیان خۆش دەبێ، نەک تەنیا خۆش بوون، بەڵکو خراپەی ئەوان چاکەیە بۆ شاعیر. لە کۆتایی شیعرەکەیدا خۆی بەقوربانی هەموو میللەتی کورد دەکا، گەورە و بچووک، دەوڵەمەند و هەژار، وەکو خۆی دەڵێ گەدا و پادشای میللەت. هەروەها تکا دەکا لەپاش مردن لە بیری نەکەن و جار جارە یادی بکەنەوە.

مستەفا بەگی کوردی با لەدوای مردنیش لەوە دڵنیا بێ نەتەوەکەی لە بیری ناکا، چونکە یادگارێکی بەنرخی بۆ بەجێ هێشتووە (دیوانی شیعری کوردی). ئەم کتێبە هەموو نامەخانەییێک و دەلاقەی ماڵی هەموو ڕۆشنبیر و خوێندەوارێکی کوردی ڕووناک کردۆتەوە و، شیعری ڕەنگینی لەسەر زاری هەموو کوردێکی دڵسۆزە.

***

هەر کەسێک بە وردی دیوانە بچووکەکەی کوردی بخوێنێتەوە هەست بەڕاستییێک دەکا: دەروونێکی

پڕ لە ئازار، دڵێکی تێکشکاو، نەبوونی هیوا و ئامانج. لەوانەیە ڕاستەوخۆ هەست بەئازاری کۆمەڵ نەکرێ، بەڵام ئەم هەموو ئاه و هەناسە ساردییەی مستەفا بەگی کوردی ڕەنگدانەوە کۆمەڵەکەیەتی. ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە شیعری کوردی تەنیا لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بەها و نرخی بەرز نییە، بەڵکو لە لایەن ڕوخسارەوە لەو کەمتر نییە، گرنگترین ئەدگاری شیعری مستەفا بەگی کوردی لە زمانەکەیەتی. ئەم زمانە لە ڕووی ڕەوانییەوە تایبەتییە بەخۆی.

شیعری نالی و سالم گرنگترین سەرچاوەی بەرهەمی شیعری ئەو شاعیرە گەورەیەمانن، بەڵام لە زمانا لاسایی ئەوانی نەکردۆتەوە، بەڵکو زمانی ئەو لە هی ئەوان ئاسانتر و ڕەوانترە. ئەگەر لای نالی زمانی قورس و لای سالم زمانی هەڵبژاردە ڕەونەقێک بدەن بەشیعرەکانیان، لای کوردی پێچەوانەیە، زمانی ئاسان ڕەونەق دەدا بەشیعرەکانی.



# بەشی چوارەم

## پێوەندی لەنێوان دوو دیالێکتی زمانی کوردی گۆرانی و کرمانجیی خواروودا

لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا بەدوورودرێژی باس لە پەیدابوون و پەرەسەندن و گەشەکردنی ئەدەبی کوردی کراوە لە سەربنج و بناوانی دیالێکتی گۆرانیدا. هەزار ساڵ لەمەوبەر لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئەدەبێکی بەرزی ئایینی یارسان (ئەهلی هەق) کەوتە ناوەوە. هەروەها لە بەرگی دووەمی ئەم کتێبەدا باس لە هۆز و تیرەکانی گۆران کراوە، زانیاری لە بابەت عەشرەتەکانیانەوە خراوەتە بەرچاو. لە ڕووی جوگرافییەوە جێگە و مەڵبەند و زێدی ژیانیان پیشان دراوە.

### دیالێکتی گۆرانی

شەرەفخانی بدلیسی (١٥٤٣-١٦٠٣) لە کتێبی شەرەفنامەدا «کورد»ی بەسەر چوار تیرەی گەورە دابەش کردووە: کرمانج و گۆران و لوڕ و کەلهوڕ، تۆفیق وەهبی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ئەم دابەشکردنە زانستییەی شەرەفخانی شیکردەوە، لەدوای لێکۆڵینەوەییێکی قووڵ گەیشتە ئەو ئەنجامەی دیالێکتی گۆرانی لە چوار گۆڤەر (دیالێکتی بچووک) پێکهاتووە:

هەورامانی، زەنگنە، کاکەیی (ماچۆ)، باجەلانی، هەروەها نەخشەی جوگرافی ئەم دیالێکتانەی کێشا و جێگەکانیانی دەست نیشان کرد.

لە سەرەتای پەیدابوونی ئەدەبی کوردییەوە لەو ناوچانەدا بەتایبەتی لە هەوراماندا بەرهەمی ئەدەبی کوردی بەردەوام بوو، گۆرانەکان لەلای باکوور و، ڕۆژهەڵاتیان هاوسێی کرمانجی باشوور بوون (موکریان و سۆران و بابان و ئەردەڵان)، لە هەموو لایەنێکی ژیانەوە پێوەندییان بەیەکترییەوە هەبووە. هەریەکەیان لە هەموو ڕوویێکەوە کاری لە ئەوی دیکە کردووە. بەدرێژایی مێژوو گۆرانەکان ئەدەبی کوردییان بەزمانەکەی خۆیان پاراستووە تا سەدەی هەژدەم، لە ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان ئەوان نوێنەری ئەدەبی کوردی بوون. لەپێشانا ئەدەبی ئایینی یارسانان و لە مەلا پەریشانەوە (١٣٥٦-١٤٢١) بەملاوە ئەدەبی ئاسایی دوور لە لاهووت.

لە سەدەکانی پێش سەدەی نۆزدەم لە ناوچەکانی هەورامان و شارەزوور و ئەردەڵان و کرماشان و کەرکووک و شوێنی دیکە ئەدەبێکی بەرز بەدیالێکتی گۆرانی لەناوەوە بوو. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمدا دیالێکتی کرمانجی باشوور خەریکبوو خۆی دەگرت و ناوە ناوە شیعری پێ دەوترا. لەو سەردەمەدا هەرگیز لە وزەیدا نەبوو خۆی بەرامبەر بەدیالێکتی گۆرانی ڕابگرێ، لە سەدەکانی شازدەم تا هەژدەم دیالێکتی گۆرانی بەتەواوی زمانی ڕەسمی ئەدەبی کوردی بوو لە کوردستانی باشووردا، لەسەر بنجی تاقیکردنەوەی کۆنی ئەم دیالێکتە ئەدەبێکی بەرز هاتبووە ناوەوە.

لە ناوچەکانی سلێمانی و شارەزوور و هەورامان و ئەردەڵان شێوەی قسەکردنی خەڵکی تێکەڵاو بوو،

واته بەدیالێکتەکانی گۆرانی و کرمانجی خواروو بوو، بەڵام زمانی ڕەسمی خوێندن و نووسین و شیعر وتن بەدیالێکتی گۆرانی بوو، بەتایبەتی لە ئەردەڵانا، والییەکانی ئەو میرنشینە بایەخیان بەشیعر و ئەدەب دەدا، لە سایەی ئەوانەوە ئەدەبی کوردی پێشکەوت، هەندێ لە والییەکان خۆیان شیعر و ئەدەب دۆست بوون.

دوا سالانی سەدەی هەژدەم کە بۆ مەبەستی فەرمانڕەوایی شاری سلێمانی دروست کرا و لە قەلاچۆلانەوە پایتەختی میرنشینی بابانیان گواستەوە بۆ سلێمانی، ئەم شارە تازەیە پەرەی سەند و بە قەوارە گەورە بوو، چینی تازە لە کۆمەڵی کوردیدا پەیدابوو، وەکو سنفی بازرگانان، هەروەها پیشەسازی ناوخۆیی و ناوچەیی لە شارا پەیدابوو. زمانی پاشاکانی بابان دیالێکتی کرمانجیی خواروو بوو، هەروەها خەڵکەکەش بەم زمانە قسەیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کەسانێک هەبوون بەتایبەتی دەرەوەی شار زمانی قسەکردنیان کرمانجیی خواروو بوو، تازەکردنەوەی میرنشینی بابان یا مۆدێرن کردنی بە بناغەلێدانی شاری سلێمانی هۆیێکی گەلێک گەورە و گرنگ بوو بۆ پەیدابوونی نالی.

## پەیدابوونی نالی

کە نالی دەستی بەشیعر دانان کرد بەدیالێکتی کرمانجیی باشوور ئەدەبی دیالێکتی گۆرانی بەردەوام بوو، چونکە ئەو ئەدەبە بنجێکی پتەوی مێژوویی کۆنی هەبوو و ئەدەبی کرمانجیی باشوور بەئاسانی نەیدەتوانی بەسەریدا زاڵ بێ، وە لەلاییێکی ترەوە خەڵکی دەوروبەری سلێمانی بەم دیالێکتە قسەیان دەکرد، لەبەر ئەوە هەتا ئێستاش نەیتوانیوە بەتەواوی دیالێکتی گۆرانی لەناو ببا لە ناوچەی سلێمانی و ئەردەڵاندا، بەڵام دیالێکتی باشوور لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم و تاڕادەییێک تا ئێستاش بوو بەبنج بۆ پەرەسەندن و گۆڕانی ئەدەبی کوردی و پەیدابوونی ڕێبازی نوێ لە شێوە و ڕوخسار و ناوەڕۆکی ئەدەبی کوردی بەشێوەییێکی گشتی، کەچی ئەدەبی دیالێکتی گۆرانی هەر ئەوەندەی پێکرا لە جێی خۆی بوەستێ و تەنیا لە مردن خۆی ڕزگار بکا.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا، کە لە ناوچەی سلێمانی «نالی و سالم و کوردی» دەرگای ئەم ئەدەبە تازەیان کردەوە لە ولاتی سلێمانی و ئەردەڵاندا، مێژووی ئەدەبی کوردی ناوی شاعیری گەلێ گەورەمان بۆ دەور دەکاتەوە، کە بەدیالێکتی گۆرانی نووسیویانە، وەکو «مەولەوی و مەلا جەباری و مەلا وەلەدخان و ئەحمەد بەگی کۆماسی و حەمە ئاغای دەربەند فەقرە و میرزا شەفیعی جامەڕێزی» و گەلێکی دیکەش.

ئەگەر زانستییانە لەو بەرهەمە ئەدەبییە بکۆڵرێتەوە کە بەم دوو دیالێکتە کەوتوونەتە ناوەوە بەڕوونی بۆمان ئاشکرا دەبێ هیچ جۆرە پێوەندییێک لەنێوان شاعیرانی هەردوولادا نەبووە، بەپێچەوانەوە ئەو شاعیرانەی بەدیالێکتی کرمانجیی باشوور شیعریان وتووە پێوەندییێکی بەهێز لەنێوانیاندا بووە و باسی یەکتریان کردووە، هەروەها ئەو شاعیرانەی کە بەدیالێکتی گۆرانیش شیعریان وتووە پێوەندی لەنێوانیاندا بووە، بۆ بەڵگە پێوەندی لەنێوان مەولەوی و شاعیرانی دەوروبەری خۆی بووە کە شیعریان بەدیالێکتی گۆرانی وتووە. لەم لایەنەوە ئەوەی زانراوە ئەوەیە دۆستایەتی لەنێوان مەولەوی و مەحوی



بووە، بەزۆری ڕەنگە تەریقەتی دەروێشی نەقشبەندی ئەم دوو شاعیرەی لە یەکتری نزیک کردبێتەوە، بەڵام لە ڕووی هونەری شیعری و داهێنانی ئەدەبیدا هیچ جۆرە پێوەندییێک لەنێوانیاندا نییە.

## زۆرانبازی لەنێوان دوو دیالێکت

ئەدەبی کوردی دیالێکتی گۆرانی مێژوویێکی کۆن و تاقیکردنەوەییێکی بەپێزی هەبوو لە بەرهەمی ئەدەبی کلاسیکی نووسراو و ئەدەبی میللی نەنووسراودا، بەرامبەر بەو لە ناوچەی سلێمانی وەک مەڵبەندێکی هەردوو دیالێکت ئەدەبێکی میللی نەنووسراوی بەرز لەناوەوە بوو، شاعیری میللی نەخوێندەواری هەبوو وەکو (عەلیی بەردەشانی) کە بەرهەمی شیعری دەچێتە ناو ئەدەبی میللییەوە (فۆلکلۆر)، بەڵام ئەدەبی کلاسیکی ئەوەی ناونراوە ئیسلامەوی یا عەرووزی بەهۆی نالییەوە لەدوای بیناکردنی شاری سلێمانی وەک پایتەختی میرنشینی بابان پەیدا بوو.

ئەم دوو دیالێکتە لە زمانی ڕۆژانە و زمانی نووسیندا، بەتایبەتی لە شیعردا کاریان لە یەکتری کردووە، تا ئەوەی دەتوانرێ لە بەرهەمی هەندێ لە شاعیرانی گۆرانی هەست بەزمانێکی تێکەڵاو بکرێ لەنێوان هەردوو دیالێکتدا.

جگە لەوەی کۆمەڵێک بەرهەمی ئەدەبی لە کلاسیک و میللی لەناوەوەیە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری هەردوو دیالێکت، لەمانە بۆ بەڵگە لێرەدا هەندێ گۆرانیی میللی کوردی تۆمار دەکەین بەزمانێکی تێکەڵاو لە هەردوو دیالێکتی کرمانجیی خواروو و گۆرانی هۆنراونەتەوە:

هەر مانگی نۆ و بێ حالم پەشێوەن
هیلال چون شێوەی ئەبرۆی تۆی پێوەن

***

شەوان شەونالە و ڕۆژان ڕۆ ڕۆمە
یەکجار پەژارەی دووریەکەی تۆمە

***

یاخوا هەر شەوبێ لە ڕۆژ بێزارم
نەوا بۆ و کاران پەی بوون بەکارم

***

کارەکان گەردوون ئەشێ هەروا بێ
لەیلێ دەوڵەمەن مەجنوون گەدا بێ

***

چەن شاران گەڕیام چەن دوکان بەستم
وێنەی خاڵەکەت نەکەفتە دەستم

***

هەرکە لەم دونیا نەداروو یاریٚ
وەسە بیٚ پوولیٚ ڕوو بکا لە شاریٚ

***

سەرت پەتی کە بینم زوڵفانت
تا گیان شیرین بکەم قوربانت

***

لە بیرت مەیۆ شەوەکەی سەرجۆ
شەفا و لالەی من مەکەو لاوەی تۆ

***

ئەگەر بزانی بەحاڵی دەردم
گریانت مەیۆ پەی ڕەنگی زەردم

***

ئیمشەو چەن شەوە دوور لە یارانم
وەک باغچەی بیٚ ئاو تشنەی بارانم

هەروەها شاعیرێکی میللی هەیە ناوی (عەبدوڵڵا حەسەن) بووە، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا ژیاوە. شیعرێکی هەیە بەحسێب بەهەناسەی دیالێکتی کرمانجیی خوارووی ناوچەی سلێمانییە، بەڵام کاری دیالێکتی گۆرانی بەسەریدا زاڵە. ئەم شاعیرە لە کۆمەڵی ناوچەی سلێمانی بەناوبانگە، شیعرەکەش لەناو خەڵکیدا بڵاوە و زۆر کەس لەبەریان کردووە، وەکو لە ناوەرۆکی شیعرەکەدا دەردەکەویٚ لەو شیعرانەیە زۆر کەس بە بۆچوونێکی سۆفیزمی بەرگری لیٚ دەکەن، ئەگەر نا دەچێتە ناو بیری لادان لە ئایین و خودانەناسی بەوەی گلەیی لە خودا دەکا، یا بەناوی قۆشمەیی و بەکارهێنانی قسەی هەق لە جێی خۆیدا خودا لێی خۆش دەبیٚ، چونکە خۆی لەسەر هەقە، دەتوانین بڵێین مەسەلەی ئەم شاعیرەی ئێمە لە مەسەلەی عومەر خەیام دەکا.

عەبدوڵڵا حەسەن لە شیعرەکەیدا دەڵیٚ:

خوایە! من و تۆ بابێینە حساو
هیچ درۆی نەویٚ وە بیٚ چاو و ڕاو
سەنەدی عومرم وە پەنجا گەیی
لەژێر سایەتا ڕەحەتیم نەیی
چل ساڵی ڕەبەق ڕەمەزانم گرت
لە ماڵی خۆما ئیفتارم نەکرد



ئەگەر کەلاشێک هەبوایە لەپام
بیست دیٚ ئەگەڕام بۆ چێشتی وەتام
لەبیرت مەیۆ لە ماڵ قولیخان
سەد شەقیان لێدام لەسەر کوتیٚ نان
چاووت تێوە بوو نەهاتیتە جواو
ئێستەکەش یێژی فلان کەس خراو
گوایە یە نان بووە تۆ دان وەبەنە
وە هەولی قوڵ و وەزۆری چەنە
ژێرم خاک ئەکەی سەرم سەنگ ئەکەی
کە من دەنگ نەکەم تۆ بۆ دەنگ ئەکەی

لەمەدا ئەوە دەردەکەویٚ هەردوو دیالێکت کاری زۆریان لە یەکتری کردووە، وەک زمانی قسەکردن و نووسین. لێرەدا مەبەس ئەم لایەنە نییە، بەڵکو بیرکردنەوەیە لە دوارۆژی دیالێکتی گۆرانی. لەگەڵ پەیدابوونی نالی و قوتابخانەی شیعری کلاسیکی لە کوردستانی باشووردا؛ دیالێکتی گۆرانی بەرەو کزی دەرۆیشت. زمانی ڕەسمی میرنشینی بابان کرمانجیی باشوور بوو، ناوچەی سلێمانی لە هەموو لاییێک تیرە و هۆز و عەشرەتەکانی گۆران دەوریان دابوو. لەلای باکووری شار نەبیٚ، واتە هێڵی قەلاچۆلان و شارباژێر. گەرمیانی گەورەی کەرکووک، کفری و کەلار و دەربەندیخان سەر بەدیالێکتی گۆران بوون، هەموو عەشرەتەکانیان گۆران بوون. لە بازاڕی سلێمانی دیالێکتی کرمانجیی خوارووی خۆی دەسەپاندە سەر هەموو ئەو کەسانەی بەگۆرانی (هەورامی) قسەیان دەکرد. تا ئێستاش لە سلێمانی کە دەڵێن «شار» واتە سلێمانی، کە دەڵێن «لادیٚ» واتە شارەزوور و هەورامان.

بەشێوەیێکی دیکە دەتوانین لەم دیاردەیە بدوێین: لەباتی شار و لادیٚ تەعبیری کورد و گۆران لەناوەوەیە. لێرەدا ڕاستتر ئەوەیە بڵێین کرمانج و گۆران. کرمانجیی باشوور، واتە کوردی؛ زمانی ڕەسمی ئەو عەشیرەتانە بوو کە سەر بەئێران و زمانی فارس بوون، چونکە لە کۆنەوە ناوچە کوردییەکانی گۆرانەکان سەر بەئێرانی سەفەوی و قاجار بوون. بیٚ گومان ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوون لە وڵاتی سلێمانی و زمانی قسەکردن و نووسینیان گۆرانی بوون، ئەمانە زیاتر دەشکانەوە سەر گۆرانەکانی ئێران، بەم جۆرە دەبینین لە نێوەندی خوێندەواری سلێمانیدا زمانی تورکی عوسمانیش لەناوەوە بوو تەنیا لەو ناوچانەی دیالێکتی کرمانجیی خوارووی نەبیٚ. بەم پێیە دیالێکتی کرمانجیی خوارووی «بابان» زمانی ڕەسمی تەریقەتی قادری بوو، بەپێچەوانەوە دیالێکتی گۆرانی زمانی ڕەسمی تەریقەتی نەقشبەندی بوو. بەهۆی سەرکەوتنی کرمانجیی باشوور ، نەقشبەندییەکانی هەورامان و هەموو لاییێک ئەم دیالێکتەیان کرد بەزمانی خۆیان لەباتی دیالێکتی گۆرانی.

بەم جۆرە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم لە شارەکاندا دیالێکتی گۆرانی کزبوو

لەسەر حسێبی دیالێکتی کرمانجی، بەڵام لە گوند و دێهات و لەناو کۆمەڵی نەخوێندەوار تا ئێستاش دیالێکتی گۆرانی لە پراکتیک نەکەوتووە، هەروەها شیعریشی پێ دەووترێ، بەڵام بەهۆی بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیری و هۆشیاری نەتەوایەتی، خوێندەواری گۆران بەدیالێکتی کرمانجیی باشوور دەنووسێ و خەڵکی دیکەش قسەی پێ دەکەن لە کوردستانی عیراقدا. بەم جۆرە دیالێکتی کرمانجی باشوور بوو بەزمانی یەکگرتوو و هیچ جۆرە تەنگوچەڵەمەییێک لەناوەوە نەماوە.

# بەشی پازدەمین

## غولام ڕەزا ئەرکەوازی ١٧٧٥-١٨٤٠

### ژیانی شاعیر

ناسین و ناوبانگی ئەم شاعیرە لەلایەن خەڵکی ئەو ناوچەیەی شاعیری تێدا ژیاوە کارێکی ئاسایی بووە، بەڵام لە هەرێمەکانی دیکەی کوردستانی پان و بەرین و، لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا پەردەی نادیاری بەسەر ژیان و ئەدەبی داکێشرابوو و ئەوەندە ناسراو نەبوو. لەم دواییەدا زاهیر سارایی کتێبێکی بەنرخی بڵاوکردەوە بەناوی «شاعر قلەهای آلود» لە تاران لە ساڵی ١٣٧٩ (٢٠٠٠م)دا چاپکراوە، بریتییە لە مێژووی ژیان و لێکدانەوە و ساغکردنەوەی شیعری غولام ڕەزا ئەرکەوازی شاعیری بەناوبانگی ئیلامی، ئەم سەرچاوەیە یارمەتییێکی زۆری هەبوو بۆ نووسینەوەی ئەم بەشە.

غولام ڕەزا ئەرکەوازی کوڕی حەسەن بەگ کوڕی میرزا بەگ کوڕی میەسم کوڕی ئەحمەد قولییە، لەناو خەڵکی بەغولام ڕەزا خان ئەرکەوازی و، غولام ڕەزا ئەرکەوازی ئیلامی ناسراوە، لە هەندێ شیعریدا نازناوی «غولام»ی بەکارهێناوە.

غولام ڕەزا لە ساڵی ١٧٧٥ لە ئاوەدانی «سەرچەفتە» کە بەشێکە لە ناوچەی «بان وێزە»ی سەر بەشارستانی ئیلام لەدایکبووە. جێی لە دایکبوونی شاعیر نزیکی سنووری عیراقی ئێستایە، دەشتێکە شاخەکانی باوەیاڵ و سەروێشە و هانی سەونز و بەلەوان دەوریان داوە.

ئەرکەواز یەکێکە لە عەشرەتە گەورەکانی کورد، هۆز و تیرە و بنەماڵەی زۆرە، لەبەر ئەوە بەیەکێتیی عەشایەر دەژمێررێ. غولام ڕەزا لە تیرەی «میەسم»ە، ئەم «میەسم»ە باپیری باوکی غولام ڕەزایە یەکێکە لە بنەماڵە و تیرە گەورەکانی ئەرکەواز.

ئەرکەوازی لە بنەماڵەیێکی خوێندەوار و دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتوو پەروەردە بووە، حەسەن بەگ باوکی مەلا و خاوەن دەست و قەڵەم بووە، غولام ڕەزا سەرەتای خوێندنی لەلای باوکی و مەلا و میرزایانی ئەو سەردەمە بووە. لە قۆناغی ناوەندی ژیانی خوێندەواری گەشتی نەجەف و کەربەلای بووە. ئەو شارانە ئێستا و ئەوساش نێوەندێکی گرنگی قوتابخانەی ئایینی ئایینزای شیعە بوون، لەو دەسگا زانستی ئایینییانەی شیعە قورئان و حەدیسی خوێندووە، شارەزای زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و ئایینزای شیعە بووە، بەڵام قوتابییێکی ڕەسمی دەسگا زانستییەکانی نەجەف و کەربەلا نەبووە و، لەو جێیانە هەموو قۆناغەکانی خوێندنی تەواو نەکردووە

ئەرکەوازی وەک کوڕی بنەماڵەیێکی دەوڵەمەند لە منداڵییەوە فێری گەلێ کردەوە و جموجۆڵی کراوە کە لەگەڵ ڕەوشتی چینی ئوروستوکراتی سەرەوەی کۆمەڵ بگونجێ، وەکو سوارچاکی و بەکارهێنانی چەک و سیلاح، پسپۆڕی لە تیرەندازی، بەشداریکردن لە جەنگ، لەمەوە هەلی بۆ ڕێکەوتووە مەشقی



جەنگاوەری بکا و ڕاووشکار مایەی پشوودان و سەردەمی سەیرانی بووە، ئەمە ڕێگەی بۆ خۆشکردووە شارەزایی لە دروستکردن و ڕێکخستنی ئەو چەک و سیلاحانە هەبێ لە ڕووی پیشەسازی و چاککردنەوەیانەوە، بەتایبەتی هەموو کارێکی پێوەندی بەپیشەی چەخماغسازییەوە هەیە.

بێ گومان ئەرکەوازی سەرپەرشتی کاروباری بنەماڵەیی و عەشرەتی کردووە، وەک بەگ و سەرکردەیێک ئەرکی کۆمەڵایەتی زیاتر بووە لە کەسێکی ئاسایی ناو کۆمەڵ. بنەماڵەی نزیکی والی و پیاوماقووڵ و دەوڵەمەندانی چینی سەرەوەی سەردەمی خۆی بووە. شاعیر کچێکی خزمی خۆی هێناوە. لەوانەیە ئامۆزای بووبێ. دوو کوڕی لەو ژنە بووە، یەکێکیان ناوی محەمەد ڕەزا بووە، دووەمیان ئەحمەد خان. ئەمەیانی بە «کەلوەلایی» واتە بە(کەربەلایی) ناسراوە و لە تەمەنی لاویەتی سەری ناوەتەوە. شاعیر ماتەمنامەی بۆ مەرگی ئەم کوڕەی وتووە.

ئەرکەوازی ماوەیێک خەریکی کاروباری سەرۆکایەتی خێڵی خۆی بووە، لە ساڵی ١٨٠٤ لە والیی ئیلام (پشتکۆ) حەسەن کوڕی ئەسەد خان نزیکبووە، لەدواییدا برادەرایەتی بەدوژمنایەتی گەیشتۆتە ئەنجام. والی و ئەرکەوازی دەبن بەدوژمن، والی لە شاعیر بەهێزتر دەبێ بۆیە دەیخاتە بەندیخانەوە، تەنیا بەبەندکردن وازی لێ ناهێنێ، بەڵکو لە بەندیخانە بەپێوەند و زنجیر دەیبەستێتەوە، ئەو ئازارانەی شاعیر چێشتوونیەتی لە موناجاتە شیعرییەکاندا ڕەنگیان داوەتەوە. ئەوەی والی لەگەڵ شاعیر کردوویەتی نموونەی دڕندەیی فەرمانڕەوا ئۆتۆکراتییەکانی سەردەمی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتییە.

هۆی ناکۆکی نێوان حەسەن خانی والی و ئەرکەوازی بەتەواوی نازانرێ، ئەوەی لەناوەوەیە گۆیا شاعیر دڵی چۆتە کچێکەوە، پێش ئەوەی خوازبێنی بکا حەسەن خانی والی ناوبانگی جوانی ئەو کچەی بیستووە و ئاگاداری ئەوە بووە کچەکە شەیدای ئەرکەوازی شاعیر بووە. لەبەر ئەوە شاعیری خستۆتە زیندانەوە ئەرکەوازی ئەگەرچی ناوی حەسەن خان وەک زۆردارێک دێنی، چونکە هەموو ئازارەکانی بەفەرمانی ئەو بووە، کەچی باس لەوە ناکا فەرمانی دەرکردبێ بۆ ئازاردانی ئەرکەوازی، هیچ جۆرە بەڵگەیێک لەم لایەنەوە لەناوەوە نییە.

بەندکردن و ئازاردانی ئەرکەوازی بووە هۆی مەینەتی و ناخۆشیی بنەماڵە و عەشرەتی. لەدوای ئازادبوونی لە بەندیخانە، ئاوارەیی و غوربەت و پەراگەندەیی بەش و چارەنووسی بوو، وڵات بە وڵات بەبێ هیوا و ئامانج دەسووڕایەوە. وەک لە هەندی لە شیعرەکانی دەردەکەوێ، لە ژیانی ئاوارەییدا ناچاربووە ڕووبکاتە خاکێکی بێگانە یا دوژمن. بەڵگە لەناوەوە نییە ئەو جێگەیە دەستنیشان بکرێ! نەوەی شاعیر دەڵێن ئەو جێیە ناوچەی کرند بووە، لەوانەیە ئەمە ڕاست بێ، چونکە تا ئێستا لە کرند بنەماڵە هەن خۆیان بەنەوەی ئەرکەوازی دەزانن. هەروەها شاعیر ئاماژە بەوڵاتی تورک زمانیش دەکا، بەڵام ناچێتە ئەقڵەوە ڕووی کردبێتە وڵاتی عوسمانی، ڕەنگە مەبەس لە وڵاتی تورک زمان کرند خۆی بووبێ، چونکە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم بۆ ماوەیێک ناوچەی کرند لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییان بووە، جگە لەوە لە سەردەمی ئاوارەیییەکەیدا ئاماژە بەوە دەکا ماوەیێک لە «مەخمەل کۆ» و «یافتە»ی لوڕستان دەست بەسەربووە.

ئەرکەوازی باس لە ڕۆژگاری ئاوارەیی و دەست بەسەری دەکا لە دەرەوەی زێدی لەدایکبوونی، ئەوە دەردەخا شەو و ڕۆژ لە کووچە و بازاڕاندا بێ سەروشوێن سووڕاوەتەوە و چاوی بەخەڵکی تورک کەوتووە و زمانیانی نەزانیوە و لە قسەکردنیان نەگەیشتووە.

شاعیر لە ژیانیدا دەوڵەمەند بووە و مەقامی لەناو کۆمەڵدا بەرز بووە، لە فەرمانڕەوا و کاربەدەستانەوە نزیک بووە، چونکە ئەویش سەرۆکی بنەماڵەییێکی گەورە و تایەفەییێکی ناودار بووە، بەڵام دژی ئەو فەرمانڕەوایانە بووە کە لە سنوورەکانی کرماشان و کوردستان و خۆزستان و عوسمانی دەستدرێژییان دەکرد، ئەمەش هۆیێکی دیکە بووە تووشی بەندیخانە و ئەشکەنجە و ئازار ببێ. ئەرکەوازی بەشیعر و خوێندەواری بەربەرەکانی دواکەوتوویی دەکرد.

وا دەردەکەوێ دوا قۆناغی ژیانی ئەرکەوازی دوور لە مەڵبەندی خۆی لە وڵاتی ئاوارەیی بووبێ و، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردبێ. سەرچاوە وا دەگەیەنێ هاوڕێیانی تەرمی مردوویان گواستبێتەوە عیراقی ئەو سەردەمە کە لەژێر دەسەڵاتی عوسمانی بوو و لە شاری نەجەف ناشتبێتیان و، گۆڕی دیار نییە وەکو هەموو ئەوانەی لە نەجەف و کەربەلا دەنێژرێن.

ساڵی مردنی ئەرکەوازی بەتەواوی نازانرێ، ئەگەر شەست تا حەفتا ساڵ ژیابێ دەبێ لەنێوان ساڵانی (١٨٣٤-١٨٤٤)دا کۆچی دوایی کردبێ، ئێمە ساڵی (١٨٤٠)مان بەڕاست زانیوە بۆ کۆچی دوایی غولام ڕەزا ئەرکەوازی.

## شیعری ئەرکەوازی

شاعیری کوردی گۆرانزەمین سەید ساڵحی نیعمەتوڵڵاهی ماهیدەشتی (١٨٣٤-١٩٠٧) لە بابەت غولام ڕەزا ئەرکەوازییەوە دەڵێ:

غولام ڕەزا نیتەو شۆر موناجات

جو مووسا لە تووڕ قازی یەلحاجات

شیعری ئەرکەوازی بەشێکە لەو شیعرەی خاسیەت و ئەدگاری تایبەتیی خۆی هەیە، ڕەنگدانەوەی ئەو شیعرەیە کە لە نەوسوود و پاوەی هەورامانی تەخت و، تەوێڵە و بیارەی هەورامانی لهۆن لەناو خەڵکی ساکار و ڕۆشنبیر و خوێندەوار پەسەندکراون، شیعری غولام ئەرکەوازی ئیلامی دەچێتە خانەی شیعری شاعیرانی وەک میرزا شەفیعی کولیایی ئەردەڵانی و خانای قوبادی.

شیعری ئەرکەوازی لە ڕووی کێش و قافیەوە ساکار و سادەیە؛ وەکو شیعری هەموو شاعیرانی گۆرانزەمین لە کوردستاندا. کێشی خۆماڵی دە سیلابییە، بەزۆری وەستانێک لە ناوەڕاستدا هەیە (-- ب--/ ب ب ب --)، لەڕووی قافیەوە جووت قافیەیە (مەسنەوی = موزدەویج) (اا، ب ب، جـ جـ...) هەندێ جار شاعیر یاری بەقافیە دەکا.

شیعیری ئەرکەوازی لەڕووی ناوەرۆکەوە بەسەر ئەم مەبەسانەدا دابەش دەکرێ:



١- موناجات

ئەم بابەتە شیعرییە لەلای ئەرکەوازی لە بەرهەمی ئەدەبیدا لە هەموو بابەتەکانی دیکە زیاترە، دەتوانرێ بەشاعیری موناجات لە ئەدەبی کوردیدا ناوببرێ. لەم بابەتە شیعرە ٢٤ لیریکی هەیە، هەمووی دەکاتە ٦١٠ دێرەشیعر (١٢٢٠ نیوە دێڕ شیعر). سەرچاوەی بنچینەیی ئەم جۆرە شیعرەی قورئان و حەدیس و قسەی ئیمامی عەلی و ڕووداوی مێژوو و چیرۆکی ئەفسانەیی و زانیاری لە بابەت ئیسلامەوەیە. لەم بابەتە شیعرەدا وشە و ڕستەی عەرەبی و مانا و وێنەی ئامادەکراوی شاعیرانی دیکە بەزۆری بەکاریان دێنێ.

لەم بەرهەمی موناجاتە شیعرییە هەشت لیریکی یەکەمی موناجاتە لەگەڵ خودا، لێی دەپاڕێتەوە، هەرچەندە هەناسەییێکی شیعەگەرییانەی تێدا دیارە، بەڵام وەک موناجاتێکی ئاسایی ئایینی ئیسلام دەکەونە بەرچاو، لە لیریکی نۆیەمەوە تا دوایی موناجاتەکانی هەموویان بەرەو ڕووی ئیمامی عەلی کراون. لەم لایەنەوە هەندێ لە موناجاتی ئاسایی ئیسلامی یا ئایینزای سوننی دەچێتە دەرەوە، چونکە موناجات یا ئیلاهییات وەک مەبەستێک تەنیا لەگەڵ خودادا دەکرێ. لەو موناجاتانەدا شاعیر ئەفسانەکانی ئایینزای شیعی دەگێڕێتەوە. شاعیر باوەڕی بەوە هەبوو کە عەلی سواری هەور بووە تا گەیشتۆتە کێوی ئەفسانەیی قاف و لەوێ هەموو پێغەمبەرانی دیوە، جگە لەوە هەندێ لەو ئەفسانانەی بۆ توانای ئیمامی عەلی هەڵبەستراون شاعیر ئاماژەی پێ کردوون.

بڵاوکەرەوەی دیوانی شاعیر لەسەر ئەو ڕایەیە کە بیروباوەڕی ئەرکەوازی لە بیروڕای یارسانەوە (ئەهلی هەقەوە) دوورە و هیچ پێوەندییێکی بەوانەوە نییە، بەڵام ئەوی ڕاستی بێ ئەوەیە بێ گومان ئەرکەوازی لەسەر ئایینی یارسان نەبووە، بەڵام وەکو شیعەییێک هەڵوێستی بەرامبەر بەئیمامی عەلی تا پلەییێک بووە لەوان نزیک بۆتەوە، یا بەشێوەییێکی دیکە مەعریفەتی شیعەی وەک ئایینزاییێک لە هەستی سۆفیزم نزیک کردۆتەوە و هەردووکیانی تێکەڵ بەیەکتری کردووە، لەبەر ئەوە کە موناجاتەکانی دەخوێنینەوە هەندێ جار وەک کەسێکی سەر بەئایینی یارسان دەکەوێتە بەرچاو و هەندێ جاری دیکە وەک شیعەیێکی دوازدە ئیمامیی دەبینرێ. لێرەدا ئەرکەوازی لەڕووی بیروباوەڕی ئایینزاییەوە گەلێ لە شاعیری کوردی گۆرانزەمین سەید ساڵحی نیعمەتوڵڵاهی ماهیدەشتییەوە نزیکە.

٢- ماتەمنامە

ئەرکەوازی دوو شیعری ماتەمنامەی هەیە بۆ ئەحمەد خانی کوڕی وتووە، کۆچی دوایی ئەم کوڕەی کارێکی زۆری تێ کردووە. شیعرەکانی بەناوی «باوە یال»ەوەن. باوە یال ناوی شاخێکی نزیک مەڵبەندی لەدایکبوونی شاعیرە، ئەرکەوازی لە موناجاتە پرسەنامەکەیدا ڕوودەکاتە باوە یال و گفتوگۆی لەگەڵدا دەکا.

٣- ئاوارەیی و دوور وڵاتی (غوربەت)

«غوربەت» ناوی لیریکێکی شاعیرە، وێنەی ڕاستەقینە و نموونەی ڕەنگدانەوەی ڕۆژانی مەینەتی

ئاوارەیی و بەندیخانەیە.

٤- غەزەل

دیوانی ئەرکەوازی دوو پارچە غەزەل دەوردەکاتەوە بەناوی «زلێخام شوران» و «زلێخام ژ چین». ئەم دوو بەرهەمە لە غەزەلی ئاسایی ئەم جۆرە شیعرەی ئەدەبی کوردی ناچنە دەرەوە، بەڵام ئەوە هەیە گومانیان لێ دەکرێ کە شیعری شاعیر بن، چونکە مەبەسەکانی دیکەی ئەرکەوازی لە غەزەل و دڵداری و ماچوموچ دوورن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا شێوازی ئەم دوو غەزەلە لەوە دەکا لە بەرهەمی ئەم شاعیرەمان بژمێررێن.

ئەرکەوازی شاعیرێکی ناسراو و خۆشەویست بووە لە وڵاتی خۆیدا، شیعرەکانی لەسەر زاری خەڵکی بوون، نەک تەنیا خوێندەواران بەڵکو نەخوێندەواریش لەبەریان کردووە، بەتایبەتی ئەوانەی پابەندی ئایین بوون. لەبەر ئەوە دەسنووسی دیوانی زۆرە، ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی بەرهەمی شیعری لەسەر بنج و بناوانی ئەو دەسنووسانە ساغ بکرێتەوە.

## گەشتی دیوانی ئەرکەوازی

### موناجاتی خودا

لەم ماوەیەدا دوو موناجاتی خودا لە بەرهەمی ئەرکەوازی وەک نموونەیێک هەڵدەبژێرین، یەکەمیان ژمارە دووەمە و دووەمیان ژمارە شەشەمە.

لە موناجاتی یەکەمدا دەڵێ:

ڕازق ڕەززاق

یا ڕازق ڕزق ڕازق ڕەززاق
ئسای سەما و ئەرز نوە چەرخ و هەفت تاق
نەجات دەهەندەی ڕەفڕەف و بوراق
حەیێ لایەنام بینای لەم یەزەل
بێ خوەردو بێ خاو یەکتای بێ بەدەڵ
قاهیر و لعەدو قەییووم لایەزەڵ
خالق مەخلووق یەکتای بێ خەلەل
نووربەخش جەلای شەمس وەلقەمەر
قازی یەلحاجات ماڵک مەحشەر
سەفحەی یەوم و لەیل ژە هەم سەواکەر
تەبیب مەریز مەخفی دەواکەر



غەفوور لایەزاڵ لەم یەزەڵ غەففار
ڕازق ڕزق بەخش سێ پەنج سێ هەزار
کەردیشان ژە سڕ سونعەت نەوازان
هەر یەک پەی نەوای پەی کارێ تازان
هەفت تەبەقەی ئەرز ساختی ژە وجوود
قەرار دای وەپێشت بەقەرچەنی حووت
وەلحاسڵ وەو تای یەکتائی زەینت
وەو نوور جەلای بابولحوسەینت
وەو هەزار و یەک ئسم عەزیمت
وە ئایەی تەورات مووسای کەلیمت
وە عیسا و ئینجیل داوود و زەبوور
تو خەڵق خەلیل ئاراستی ژە نوور
وە عززەت نوور ئدریس و ئەیییووب
ئسماعیل ئسحاق یووسف و یەعقووب
وە سەد و چاردە سوورەی قورئانت
وە موستەفا خەتم پەیغەمبەرانت
وەلحاسیل وە جەمع گرۆی پەیغەمبەر
وە عەکس جەلای مورتەزای سەڤدەر
وەو دوازدە ئیمام بەرگوزیدەی وێت
وەو جەمع خاسان گیان توفەیل ڕێت
عاسی عسیان بار دوور ژە تاعەتەم
گومرای شێت و شووم ڕای عیبادەتم
ژە خەوف پرسان مونکەر ماتشان
ژە کردار وێم خەجالەتشان
عەفوکەری ڕەدی بەدی کردارم
ئیسا ژە کەردەی وێم شەرمسارم
(غولام) کەمتەرین کەلب دەرگاتەن
چون سەنعان ژە کار کەردەی وێش ماتەن

واتاکەی:

ڕازق ڕەززاق
یا ڕازق ڕزق ڕازق ڕەززاق
ڕاگری ئاسمان و ئەرز، نۆ گەردوون حەوت تاق (ئاسمان)
ڕێ پیشاندەری ڕەفرەف و بوراق (دوو وڵاغی پێغەمبەرن)
زیندووی بێ خەو چاوی نەنوستووی جاویدانی
بێ خواردن و خەو یەکتای بێ وێنە
دوژمن شکێنی هەمیشەیی
کردگاری هەموو خەڵک، تەنیا بێ کەموکوڕی
ڕووناکی دەبەخشی بەڕۆژ و مانگ
ڕازونیاز دەگەیەنی بەئەنجام خاوەنی ڕۆژی حەشری
ڕووی ڕۆژ و شەوت لە یەکتری جیاکردۆتەوە
ئەو پزیشکەی نەخۆش بەنهێنی تیمار دەکەی
هەمیشە بەتوانای و بەتوانا دەبی
ڕزقی هەموو کەسێک دەدەی
هەموو کەسێکی خوڵقێنراو و دروستکراو
هەر یەکێکی ئاراستەی کارێک دەکەی
حەوت تەبەقەی ئەرزت دروست کردووە
لەسەر پشتی مانگا و مانگا لەسەر پشتی حووت
هەرچۆنی بێ سوێند بەتاکانەی و ڕووناکیت دەخۆم
بەو ڕووناکییەی لە باوکی حوسێن (عەلی) دەپژێ
بەو هەزار و یەک ناوە مەزنەت
بەو ئایەتی تەوراتی مووسای کەلیم
بەو عیسا و ئینجیل، داوود و زەبوور
بەو ئیبراهیم خەلیلەی لە ڕووناکی خۆت دروستت کرد
بەگەورەیی ڕووناکی ئیدریس و ئەیووب
ئیسماعیل، ئیسحاق، یووسف و یەعقووب
بەسەد و چوارده سوورەی قورئانت
بەمستەفای خەتمی پێغەمبەرانت
بەهەموو نزیکانی پێغەمبەر



بەڕووناکی ڕوونی مورتەزای سەفدەر (عەلی)
بەدوازدە ئیمامی هەڵبژاردەی خۆت
بەو پیاوچاکانەی هەمیشە لە دواتەوەن
گوناهکارم لە تاعەت دوورم
گومڕام، شێتم لە عیبادەت دوورم
لە ترسی پرسیاری مونکیر مات و خامۆشم
لە کردەوەکانم ڕوو سوورم
تۆ لە هەموو کردارە بەدەکانم خۆش دەبی
ئێستا لە کردەوەکانم شەرمەزارم
(غولام) کەمترین سەگی دەرگای تۆیە
وەکو سەنعان لە کردەوەکانی پەشیمانە

زۆربەی وشە و ڕستەی عەرەبی لەم موناجاتەدا و ئەوانی دیکەی شاعیریش ئاماژەیە بۆ ئایەتەکانی قورئان. شاعیر لە دروستکردنی گەردوون دەدوێ لەلایەن خوداوە، یادی ئەفسانەی ئایینی دەکاتەوە. ئاسمان لەسەر ئەرزە، ئەرز لەسەر ماسییە. شاعیر سوێند بەنووری باوکی حوسێن دەخوا کە عەلییە، سوێند بەناوی خودا و تەوراتی مووسا و عیسا و ئینجیل و داوود و زەبوور و، پێغەمبەرانی پێش ئیسلام دەخوا، ئینجا داوا لە خودا دەکا لە گوناهی خۆش بێ، چونکە کەمترین سەگی دەرگای خودایە وەکو شێخی سەنعان لە کردەوەکانی پەشیمانە.

لە موناجاتی دووەمدا ئەرکەوازی دەڵێ:

مەعسیەت بارم
مەعبوودا من عەبد مەعسیەت بارم
ژە فیعل قەبیح وێم شەرمسارم
وە سزای ئەعمال بەدگرفتارم
من عەبد زەلیل شەرمسار شوێم
تو ڕەب راحم رەحمان ڕەحیم
بیلقووە قەلیل عەزابم کەردەن
راحم ژ رەحمەت رەحمان ویەردەن
نەئایەی کەلام مەجید ئزهارەن
سەد عسیان لاحەول یەک ئستغفارەن
من ئستغفارم کەردەن وە ئەوراد
یا غافرەتتەوب ئەغفر ئەلعیباد

یارەب وە رەحمەت ئەسامی ئەعزەم
وە پەنج فەخر ئال نەبیی خاتەم
حەق چار کتاب مەجید مەوجوود
تەورات مووسا زەبوور داوود
ئینجیل عیسا فورقان ئەحمەد
موحەممەد مەحموود ئەحمەد موحەممەد
وە رتبەی ڕەوان شای کەونەین وەقار
بێ تەعلیم عیلم عالەمولئەسرار
میعمار کەونەین کەهبای کاینات
ستوون ئەیوان سەبعە سەماوات
وە باقر وارس عیلم نەبی یین
ستوون ڕەوشەن ئاسمان دین
وە سدق سادق سددیق مەعسووم
ستوون مەزهەب وارس علووم
وەو دوو لەمعەی نوور دوو بەدر دوجا
مووسا بن جەعفەر عەلی بن مووسا
وە تەقی نەقی سالکان دین
دوو بەدر کامل دوو نوور موبین
وە پاکی تینەت ئەتهار عەسکەر
وە مەهدی هادی ئاقای دین پەروەر
وە لەب تشنەکان دەشت کەربەلا
ژە جەور زاڵم بەڵا موبتەلا
وە موخەددەرات تەهارەت مەئاب
عسمەت نشینان پەروەردەی حیجاب

واتاکەی:

من گوناهکارم
ئەی خودا من بەندەی گوناهکارم
لە هەموو کردەوەییێکی خراپم شەرمەزارم



گرفتاری سزای کردەوە خراپەکانم
من بەندەی زەلیلی شەرمەزارم
توخودای میهرەبان و میهر بەخش و لە گوناه خۆش دەبی
هەرچی پێم کرایە کردوومە
لە خودای میهرەبان چاوەنۆڕی ڕەحمەتم
لە ئایەتی کەلامی گەورەی خودا دیارە (لا حول ولا...)
سەد گوناه بەیەک تۆبە دەسڕێتەوە
بەپاڕانەوە و موناجات تۆبە دەکەم
تۆ لە تۆبەکار خۆش دەبی لە بەندەکانت خۆش بە
ئەی خودا لە سایەی ناوە مەزنەکانت
بەپێنج گەورەکانی ئالی پێغەمبەر (ئالی عەبا)
بەهەقی چوار کتێبی پیرۆزی کە لە ناوەوەیە
تەوراتی مووسا ، زەبووری داوود
ئینجیلی عیسا ، قورئانی ئەحمەد
بەمحەمەد و مەحموود و ئەحمەد (هەموویان ناوی پێغەمبەرن)
بەهەقی پلەوپایەی شای هەردوو گێتی (عەلی)
بەبێ فێرکردن هەموو ڕاز و نهێنییێک دەزانێ
میعماری هەردوو گێتی فەرمانبەری گەردوون
کۆڵەگەی هەیوانی هەر حەوت ئاسمان
بەهەقی باقر میراتگری زانستی هەموو پێغەمبەران
کۆڵەگەی ڕووناکی ئاسمانی ئایین
بەهەقی ڕاستگۆیی سادق مەعسووم
کۆڵەگەی ئایینزای (شیعە) میراتگری زانستی
بەدوو تیشکی ڕووناکی، دوو مانگی دوجا (حەسەن و حوسێن)
بەمووسای کوڕی جەعفەر و عەلیی کوڕی مووسا
بەتەقیی پاکی ڕێبەری ئایین
دوو مانگی چواردەی تەواو، دوو ڕووناکی دیار
بەهەقی پاکیەتی پاکانی عەسکەر
بەمەهدی ڕێبەر ئاغای ئایینپەروەر
بەلێوی تینوانی دەشتی کەربەلا

گیرۆدەی زوڵمی زۆرداران بوون
بەهەقی هەموو ئەو پاکانەی
مەعسوومن و پەروەردەی ئەودیوی پەردەن

لە سەرەتای ئەم موناجاتە وەکو ئەوانی دیکە لە هەندێ لە گوناهەکانی خۆی دەدوێ و لە خودای گەورە دەپاڕێتەوە لەو گوناهانە خۆش بێ. دیسانەوە هانا دەباتە بەر ئەو کەسانەی لەلای خودا خۆشەویستن یا ئەو کردارانەی تەنیا لە توانای خودایە و هەر خۆشی دەیگەیەنێتە ئەنجام. شاعیر ئەم هەموو وێنە و بەڵگانە دێنێتەوە کە لەلای خودا گەورەن و دەیانکا بەرەمز و بەهۆی ئەوانەوە لە گوناهەکانی خۆش دەبێ، بەلای ئەرکەوازییەوە ناوە گەورەکان زۆرن، لەوانە پێنج کەسی ئالی نەبی کە ئالی عەبایان پێ دەوترێ، پێغەمبەر و فاتیمە و عەلی و حەسەن و حوسێن، چوار کتێبی گەورە تەوراتی مووسا و زەبووری داوود و ئینجیلی عیسا و قورئانی محەمەد. هەرسێ ناوی پێغەمبەر ئەحمەد و محەممەد و مەحموود. لەدواییدا یەکە یەکە ناوی هەموو ئیمامانی شیعە دەبا. ئەمانە هەموویان لای خودا خۆشەویستن، ئەگەر لە خودا داوا بکەن، کردگار لە گوناهی ئەرکەوازی خۆش دەبێ.

### موناجاتی عەلی

لەم ماوەیەدا سێ موناجاتی عەلی لە بەرهەمی ئەرکەوازی هەڵدەبژێرین. یەکەمیان ژمارە نۆیەمە، دووەمیان ژمارە دوازدەمە، سێیەمیان ژمارە بیست و دووەمە.

لە موناجاتی یەکەمدا دەڵێ:

ئاگای سرِ غەیب
یا عەلی عالی ئاگای سرِ غەیب
گوستاخ خەلوەت بێ هەمتای لاڕەیب
پاک و مونەززەه موبەرا ژە عەیب
مەولای خافیقەین میر مەمالک
هادی موجتەبا رەهنمای سالک
خانەزای خالق عاری ئاب و خاک
خاجەی هەشت بەهەشت زیبەندەی لەولاک
عالیمولئەسما عەرش ئەعزەم تووڕ
هەم سرِ سانیع هەم سیراج نوور
ئایەتولکورسی فورقانی سانی
واقیف ژە ئیلهام حەیی ڕەببانی
مونشی چار کتاب موفتی چار دەفتەر



وەسی موستەفا وەکیل داوەر
مورتەزای فورقان ئیلیای (ئەلیاسی) تەورات
میعمار کەونەین ئەرز و سەماوات
شەهسوار دین شای نوسرەت شیعار
قەڵلاع ماددەی بتخانەی کوففار
کلید مفتاح ئەبواب خەیبەر
قازی مەنع باز ناجی کەبووتەر
فەدات بام مەزهەر کولل عەجایب
غەنی ژە ئەوساف ئاشکار و غایب

واتاکەی:

ئاگاداری نهێنیی داپۆشراو و نادیار
یا عەلی بڵند ئاگاداری نهێنیی داپۆشراو و نادیار
ئاگاداری لە بارەگای خودا
پاک و بێ خەوش و دوور لە هەموو کەموکوڕییێک
سەرداری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و میری هەموو مەملەکەتان
ڕێ پیشاندەری ڕاستی هەموو سۆفییان
ئەی ئەو کەسەی لە ماڵی خودا (کەعبە) لە ئاو و گڵ دروست نەبووە
خاوەنی هەشت بەهەشت و شایستەی (لەولاک)
زانای ناوەکانی خودا و عەرەشی گەورە و کێوی تووڕ
نهێنی خودا دەزانی، تۆ چرای ڕووناکی
ئایەتولکورسی کە قورئانی دووەمە
ئاگاداری ئیلهامی خودای گەورەی
نووسەر و دانەری چوار کتێب و دەفتەری
جێنشینی پێغەمبەر و باوەڕ پێکراوی خوداوەندی
مورتەزای قورئان، ئیلیای (ئەلیاسی) تەورات
میعماری هەردوو گەردوونی، زەوی و ئاسمانەکان
شاسواری ئایین، شای بەڵگەی سەرکەوتن
بنبڕکردن و ڕماندنی بتخانەی کافران
کلیل وکلۆمی دەرگاکانی خەیبەر

ئەی فەرمانڕەوا و ڕزگارکەری کۆتر لە زوڵمی باز
ئەی ڕەمزی هەموو سیفەتێکی بێ کەموکوڕی
بێ بەشی لە هەموو وەسفێکی دیار و نادیار

لەم دێڕە شیعرانەدا ئەرکەوازی وەک پێشەکییێک بۆ توانای ئیمامی عەلی هەڵدەڵێ. بەلای ئەوەوە عەلی ئاگاداری هەموو نهێنییێکە، بێ کەموکووڕییە، خاوەنی «بوون» و گەردوونە، دروستکەری ئاسمان و زەوییە، سەرداری هەشت بەهەشتەکەیە، نووسەر یا دانەری هەر چوار کتێب یا دەفتەرەکەیە (تەورات و زەبوور و ئینجیل و قورئان)، کەسێکە لە وەسف بەدوورە. ئەگەر بەوردی لەم قسانەی شاعیر بکۆڵینەوە بیروڕای ئایینزای سوننی ئیسلامی تێدا دەدۆزینەوە، بەڵام ئەگەر تۆزێک لە داهێنانی هونەری و ئیستێتیکی شیعری دوور بکەوینەوە (هونەرمەند بۆی هەیە هەموو شتێک بکا و بڵێ) ئەم شاعیرەمان لە بیروباوەڕی یارسان (ئەهلی هەق) نزیک دەکەوێتەوە. لێرەدا مەبەسمان ئایینی یارسانی ناو کوردەواری قۆناغی دوای ئیسلام، دەورەی عەلییە، لە پاشانا گردگارەکانیان بەپێی تیۆریی (دۆنادۆن) لە دوای عەلییەوە هەموویان کورد بوون تا ئێستاکە.

لە ئەدەبی کوردی، بەتایبەتی لە نێوەندی کوردی شیعەی ئیسلام نموونەی وەک ئەرکەوازیمان هەیە، وەکو لە سەرانسەری ئەم کتێبە دەردەکەوێ، ئەم شاعیرانە بەبیروباوەڕ موسوڵمانی شیعەن، بەڵام بەرهەمی ئەدەبییان تا پلەیێک لە بیری ئایینزای شیعە هەندێ لا دەکەوێ و لە بیری ئایینی یارسان (ئەهلی حەق) نزیک دەبێتەوە. ئەم دیاردەیە لە داهێنانی ئەدەبیدا کارێکی بەجێیە ئەگەر شاعیر بتوانێ بەرهەمی شیعری بخاتە ناو چوارچێوەیێکی جوانکاری ئەوتۆ لە ناوچەییەوە دەری بێنێ بۆ گەردوونێکی بێ پایان، شاعیر لە دوای ئەم دێڕانە دەکەوێتە باسکردنی خۆی:

هایە چەن وەقتەن عەبد سەنا گوو
ژە عەین عەزاب شەومەکەم ئەو ڕوو
تەوقم گەردەن گیر قەرە بوغرا تەنگ
زوان ژە عوسرەت لا حەول وانا لەنگ
پاقەید نە بوغاو کوند هەم عەلاوەن
شەو دیدەم ژە ئێش بوغاو بێ خاوەن
مەخلووقات عاجز شەو بیدایمەن
بێداریم ژە جەور عوسرەت باریمەن
بووم و باوەقوش ژە ناڵەم عاسەن
باوەقوش مەدهووش بووم هەم هەراسەن
مەحبووسیم نیەن وەڕەسم قانوون
تەرح تازەبوون ئختەرای ژە نوون



کوند ژە هام بالای بالاّم زیادەن
پام دوو زنجیر چار پەریش ئامادەن
ماه موبارەک مەخسووس داوەر
پەری من بیەن وە یەمولمەحشەر
فتوور بار لیو سوحوور ئاه سەرد
پووشاک پووس گیان سەرینگان ژە بەرد
کەسان مەیلشان وە خاسی نیەن
حەق نەسان نەفکر حەقناسی نیەن
قەتع ئمیدم ژە ئنسان کەردەن
وێم وە شەهنشای نەجەف سپەردەن

واتاکەی:

ئەمە چەند ماوەییێکە بەندە ستایشی تۆ دەکا
بەئازاری کوشندە شەو بە ڕۆژ دەکەمەوە
تۆق لە ملمدایە قەرەبوغرا دەیگوشێ
زمانم لەنگ بووە ئەوەندەی بڵێم لاحەولەوەلا
پێم بە کەلەپچە و کۆ بەستراوەتەوە
شەو چاوم لەبەر ئێش بێ ئارامە
هەموو کەس ئۆقرە ناگرێ لە بێداری من لە شەودا
بێداریم لە حاڵی پەریشانمەوەیە
کوندەبۆ و بایەقوش بۆ من دەناڵێنن (هەردووکیان یەکێکن)
بایەقوش مەدهۆش و کوندەبۆ هەراسان بووە
بەندکردنم بەپێی دەستوور و قانوون نییە
ئەو خراپەیەی لەگەڵ مندا کراوە داهێنانی تازەیە
کۆت و پێوەندم لە بالاّم درێژترە
من دوو پێم هەیە بەڵام بەچوار زنجیر بەستراوە
مانگی پیرۆز (ڕەمەزان) کە مانگی خودایە
بەڵام بۆ من وەک ڕۆژی حەشری لێهاتووە
لە ڕۆژوو شکاندنم لێوم بەبارە لە پارشێو هەناسەم ساردە
جلم پێستەی لەشمە، سەرینم بەردە

خەڵکی مەیلیان بۆ کاری باش نییە

بەڕاستی بیر ناکەنەوە و ڕاستی پەرست نین

ئومێدم لە ئادەمزاد بڕیوە

خۆم بە شەهنشای نەجەف سپاردووە (عەلی)

لەم چەند دێڕانەدا ئەرکەوازی دەکەوێتە وەسفی پەرێشانی خۆی بۆ ئیمامی عەلی. ئاه و هەناسەییێکی بەکوڵ هەڵدەکێشی بۆ ڕۆژگارانی سەختی بەندیخانە. باس لەو ئێش و ئازارانە دەکا کە لە وزەی ئادەمزاد نەبووە بەرگەی بگرێ، لەدواییدا بەم دێڕانە کۆتایی بەموناجاتەکەی دێنێ:

یاشا فەدای کلک موعجیز نمات بام

سەرگەرد ئەنگوشت خەیبە گوشاد بام

دەست بە دولات مەر تەبدیل بیەن

عەلاقەت ژە زڵم زاڵمان نیەن

بلا تەش مەر زوو بازووت نەمەنەن

زاڵم رای نەجات ژە مەزلووم سەنەن

وەکو چی ئەو زوور بازوێ عفریت بەن

کوو ئەنگوشت فەتح باب خەیبەرکەن

یا عەلی بیەن بەنەی بێ تەقسیر

یەی گەردەن دوو تەوق دوو پاچار زنجیر

زام زەنجیرەش من زینهار کەردەن

زەنجیر ها نەپا تەوق ها نەگەردەن

دشوارتەر نیەن ژە قاپی خەیبەر

یا غەوسولغالیب یا ساقی کەوسەر

هەنی نەداroوم من قووەی عەزاب

(فەرریجنا عەننی) یا نوسرەت مەئاب

ئەی حازیرولوەقت جاڕ هانائ

تو دەسگیر دەس ناتەوانائی

غەیر ژە تۆ باشا فەریاد ڕەس نیەن

کەس عیلاج نمای کار کەس نیەن



واتاکەی:

ئەی شا فیدای ئەنگوستی پڕ لە موعجیزەت بم

دەست و پەنجەی خەیبەر گوشات بم

دەستی خودایی تۆ خۆ نەگۆڕاوە

پێوەندیت بەزوڵم و زاڵمان نییە

هەرچەندە تۆ دووربی هێز و بازووت توانای هەیە

نایەڵی زاڵم ڕێی ڕزگاربوون لە مەزلووم بگرێ

ئەو ڕۆژەی بازووی عفریت

بەئەنگوستی دەرگای خەیبەری کردەوە

ئەی عەلی بگەرە بەندەی بێ گوناه

دوو تۆق لە گەردن و چوار زنجیر لە پێ

برینی زنجیر ئارامی لێ بڕیووم

زنجیر لەپێیە تۆق لە گەردنە

لە دەرگای خەیبەر دژوارتر نییە

ئەی غەوسی سەرکەوتوو (شێخی گەیلانی) ئەی ساقی کەوسەر

ئیتر هێزی بەرگریم نەماوە لە ئازار

ئەی خاوەن سەرکەوتن ڕزگارم بکە

ئەی ئەو کەسەی لە کاتی خۆیدا دەگەیە هانا

هەمیشە بەفریای بێ توانایان دەگەی

جگە لە تۆ ئەی شا بەفریاگەیشتن نییە

کەس چارەی دەردی کەس ناکا

لەدوای باس کردنی شپرزەیی حاڵی خۆی و ئازاری جەستەیی لەم دێڕانەی سەرەوەدا گەڕاوەتەوە سەر وەسفی توانای عەلی و، داوای لێ دەکا ئەو مەینەتییەی بەسەری هاتووە بۆی حسێب بکا و تۆڵەی بکاتەوە و جارێکی دیکەش لە گوناهی خۆش بێ.

لە موناجاتی دووەمدا شاعیر دەڵێ:

ئیعجازات کامەن

یا موعجیز نما ئیعجازت کامەن

دایم وە دەرگای تو ئیلیتجامەن

ئیلیتجام ژە هەوڵ خەوف و رەجامەن

مەدداحیت ورد شام و سەبامەن
قەڵبم ژە لای تۆ قایم مەقامەن
مەجمووعەی مەخلووق وەنەم بیرامەن
یا ساقی کەوسەر مەیل شەفامەن
یا غەوسولغالیب بە ئیقتیزامەن
بەشەرت تەریق خاجە و غولامەن
من غولام تو نامم غولامەن
غولامیم وە شەوق حەسب و ڕزامەن
ئەر نجات مەدەی حەدد ئیکرامەن
ونە غولامیم وەنەت حەرامەن

واتاکەی:

کوا ئیعجازت
ئەی خاوەن موعجیز کوا ئیعجازت
هەمیشە هانام بۆ دەرگای تۆیە
هانام هیواییێکە لە ترس ڕزگارم دەکا
ستایشی تۆ ویردی شەو و ڕۆژمە
دڵم پڕ لە ئومێدە بۆ لوتفی تۆ
گەلێ خەڵک وێڵ و سەرگەردانن
ئەی ساقی کەوسەر داوای شیفا دەکەم
ئەی بەهانا گەیشتوو ئومێدم هەیە
ئەمە ڕێگەی عەهد و پەیمانی خواجە و غولامانە
من غولامی تۆم ناوم (غولام)ە
غولامیم (خزمەتکاریم) بەشەوق ڕەزامەندی خۆمە
ئەگەر من ڕزگار دەکەی ئەوە لوتف و ئیحسانە
ئەگینا بەندیی و غولامی من بەرامبەر بەتۆ حەرام دەبێ

لەم موناجاتە کورتەدا ئەرکەوازی لەڕووی باوەڕێکی هوشیارانە خۆی بەبەندەی عەلی دادەنێ، بەلایەوە ئەگەر ئیمام تۆسقاڵێک گومانی لە بەندەیی شاعیر و گەورەیی خۆی هەبێ پێویستە ئەم پێوەندییە هەڵبوەشێتەوە. ئەمە ئاوڕدانەوەیێکی شیعرییانەیە، ئەگینا شاعیر لەناوەوەی خۆی لەوە دڵنیایە کە خۆی بەندەیە و عەلی گەورەیە و هەردووکیشیان ئاگاداری ئەم بیروباوەڕن و پێی ڕازین.



شاعیر وەکو دیارە لەم پارچە شیعرەدا یەکێتیی قافیەی بەکارهێناوە، ئەم جۆرە قافیەیە لە شیعری گۆرانزەمینی کوردستاندا کەمە، زۆربەی هەرەزۆری قافیەیان جووت قافیە (مەسنەوی، موزدەویج) (اا ب ب ج جـ...)ە

موعجیز بێ پایان
یا موعجیز نمای موعجیز بێ پایان
یا نەقش زینەت ئایەی کەلامان
یا شەهنشای دین ئامان سەد ئامان
یا بەد خودا سڕ لاهی زات
وەکیل کەونەین کەهیای کاینات
چیەن ژە بارەم زڵم بێ سامان
یا شەهنشای دین ئامان سەد ئامان
یا کەعبەی مەقسوود یا قیبلەی حاجات
یا مەنسوور دین یا ناجی نەجات
یا دەس بالای دەس نام باڵای نامان
یا شەهنشای دین ئامان سەد ئامان
یا مورەی بن قەیس وە دونیمەکەر
یا قاپی خەیبەر قیمە قیمەکەر
یا کام دەهەندەی جوملە ناکامان
یا شەهنشای دین ئامان سەد ئامان
یا خەلیفەی حەق ڕوی خوم غەدیر
ژە لوتف عامەت باوەڕم و ویر
یا خاستر ژە کول خاسان و عامان
یا شاهنشای دین ئامان سەد ئامان
تا شاهێ وێنەی تو ئاقای وێمەن
دیگەر ئیلیتجا و ئومێد وە کێمەن
غەیر ژە تۆ وەکی بووم دەس وەدامان
یا شەهنشای دین ئامان سەد ئامان

واتاکەی:

ئەی خاوەن موعجیزەی بێ پایان
ئەی موعجیزە بەخش، ئەی خاوەن موعجیزەی بێ پایان
ئەی خاوەنی نەخشی ئایەتی قورئان
ئەی شاهنشای ئایین ئامان سەد ئامان
ئەی دەستی خودا، تۆی ڕازی خودا
ئەی وەکیلی هەردوو گێتی و گەورەی گەردوون
لەبارەی منەوە زوڵمێکی زۆر کراوە
ئەی شاهنشای ئایین ئامان سەد ئامان
یا کەعبەی پێویست یا قیبلەی حاجات
ئەی سەرکردەی ئایین ئەی ڕزگارکەر
ئەی دەست باڵا ناوت لەسەر هەموو ناوێکە
ئەی شاهنشای ئایین ئامان سەد ئامان
ئەی ئەوەی موررەی بن قەیست کرد بەدوو نیوە
ئەی ئەو کەسەی دەرگای خەیبەرت پارچە پارچە کرد
ئەی ئەو کەسەی چاکە دەدەیە ناکامان
ئەی شاهنشای ئایین ئامان سەد ئامان
ئەی جێگری هەق (خودا) لە ڕۆژی غەدیری خوم
بەزەییت بۆ ئێمە بێنەوە بیرت
ئەی چاکتر لە هەموو خاس و عامان
ئەی شاهنشای ئایین ئامان سەد ئامان
تۆ شاهـ و وێنەی گەورەی منی
لە تۆ بەولاوە ئومێدم بەکەس نییە
جگە لە تۆ دەست و دامەنی کێ بم
ئەی شاهنشای ئایین ئامان سەدە ئامان

شاعیر لەم موناجاتەیدا دەستی پان کردۆتەوە و ڕووی لە ئاسمان کردووە، گفتوگۆ لەگەڵ عەلی دەکا، لە زۆربەی نیوە دێڕ شیعرەکانیدا بە یا (ئەی) بانگی دەکا و سیفەتەکانی کردگاری بۆ دەژمێرێ و داوای لێبووردنی لێ دەکا، ئەم موناجاتە و زۆربەی موناجاتی ئەدەبی کوردی و ئەدەبی گێتی لە هەموو ئایین و ئایینزا ئاسمانییەکان و ئایینەکانی دیکە تا دەگاتە بت پەرستەکانیش لە ڕۆژگارانی دێرین و تازە و سەردەمدا لەلایەن هیچ کەسێکەوە ڕەت ناکرێتەوە، ئەو کەسە لەسەر هەر ئایینێک بێ.



ئەم موناجاتەی ئەرکەوازی لەسەر بنچینەی چوارین (دوو بەیت) دانراوە، لەدوای هەموو سێ نیوەدێڕ شیعرێک چوارەمیان دووبارە و سێ بارە دەبنەوە «ئەی شاهنشای ئایین ئامان سەد ئامان».

## باوەیال - ١

ئەم بەرهەمەی ئەرکەوازی یەکێکە لە شیعرە درێژەکانی، لە زیاتر لە سەد نیوەدێڕ شیعر پێکهاتووە، دەتوانرێ بەپۆیێم یا قەسیدەییێکی درێژ ناوببرێ. باوەیال لە «بابا عەڤدال» یا «بابا عەبداڵ»ەوەیە، ناوی شاخێکە لەو ناوچەیەی شاعیری تێدا لەدایکبووە. ئەم شاخە نزیکەی حەفتا کیلۆمەتر لە شاری ئیلامەوە دوورە و لە دەوروبەری سنووری ئێران و عیراقی ئێستادایە، دار بەڕوو لە دارستانەکانیدا گەلێ زۆرن.

وا باوە ئەحمەدخانی کوڕی شاعیر لەم شاخەدا ماری پێوەداوە و بۆتە هۆی مردنی. لەم شیعرەیدا بەشین و شەپۆڕ و وتەی ماتەمنامە ڕوو دەکاتە شاخ و بۆ کوڕی خۆشەویستی دەلاوێنێتەوە، لە سەرەتای شیعرەکەدا دەڵێ:

وە باوە یاڵ دیم
ئەو ڕوو وا وەیلا وە باوەیاڵ دیم
هاواس پەریشان حاڵش حاڵحاڵ دیم
سەر تا بەرگش سیا زخاڵ دیم
سەر قولەی کاوان وە سیا تەم دیم
درەختان ژ غەم چو چوگان چەم دیم
داران درەختان کەلاغی پووش دیم
کەپوو کەم دەماغ بلبل خاموش دیم

واتاکەی:

لە باوەیاڵ دیم
ئەمڕۆ لە باوەیاڵ وا وەیلام دی
هەوەسی پەرێشان بوو حاڵی ناحاڵ بوو
سەراپای بەرگی ڕەنگی ڕەشی زوغالی بوو
سەر قولەکان تەرمی ڕەش داپۆشت بوو
درەختەکان چەمابوونەوە وەک گۆچان
دارودرەخت ڕەشیان پۆشی بوو
کەپوو هۆشی لە خۆی نەماوە، بلبلم بەخامۆشی دی

سروشت بە شاخ و دارودرەخت و بەردەوە ڕەشی پۆشیوە و لەگەڵ شاعیر شیوەن دەکا. باڵندەکان شێواون باڵندەییێکی بچووکی وەکو کەپوو لە هۆشی خۆی چووە و بلبل خامۆش بووە. ئینجا دەڵێ:

کەپوو وەو شین گاڵ کەرمەوە
چمان مردەی داشت وە روو تەرمەوە
من و باوەیاڵ عەهدمان کەردەن
من غەم و ئەو تەم تا ڕووژ مەردەن
ڕووڵە یە ئاسار شکارگاهتەن
یە چاگەی کەڵڕەم شوون ڕاهتەن
ئەرا چو جاران دیارت بنەن
مەر گڵکوو وە بان مەزارت بیەن
گڵ وە بانم کەن گڵ وە بانت دیم
ئێ دنیا وە کام دژمنانت دیم
کەلێ ژە کەلان مەخواس مزگانی
ئەحمەدخان مەردەن وە نەوجەوانی
بێ تو چو ماهی ئوفتادەی خاکم
بەرگم پەلاسەن جامە چاکچاکم
ڕوو لە ژە هیجرت ئەفسوردە گیانم
جز ڕوو ڕوو گوو نیەن زوانم
میقراز مەرگت تێژ باڵم کەنەن
شوور و شەوق و زەوق زنگانیم سەنەن
شەو خاوم شەریک تاف تێژاوەن
یا حوباب نەڕوو گێژە گەرداوەن

واتاکەی:

شێوەن و ئاه وناڵەی کەپوو گەرم بوو
جەستەی خۆشەویستی وەک تابووت وابوو
من و باوەیاڵ پەیمانمان بەست لەگەڵ یەکتری
من غەم و ئەو تەم تا ڕۆژی مردن
ڕۆڵە! ئەمە شوێنەواری ڕاووشکارتە
ئەمە ئەو ڕێگەیەیە کە تۆ بەسەری تێپەڕیوی
لەبەرچی وەکو جاران دەرناکەوی



دیارە خۆل بەسەر مەزارتەوەیە
کە خۆڵ بەسەرمەزاری تۆ بێ پێویستە لەسەری منیش بێ
ئەم گێتییە بەچاوی کامە دوژمنانت ببینم
مژدە بدە بەلوتکەییێک لە لوتکەکان
ئەحمەدخان بەلاوی سەری نایەوە
بەبێ تۆ وەک ماسی گیرۆدەی خاکم
بەرگم پەڵاسە جلم دڕاوە
ڕۆڵە! لە دووری تۆ گیانم پەرێشانە
جگە لە «ڕۆڵەڕۆ» هیچی دیکە ناکەوێتە سەر زارم
حەژمەتی مەرگت پەروباڵی کردووم
جموجۆڵی و نیاز و چێژی لێ سەندووم
بەشەوان خەوم نییە هاودەمی دەنگی سولاوکەم
یا وەک حوبابێک (قەوزەییێک) دەکەوێتە بەر ڕەشەبا

لەم دێڕە لاواندنانەوەیەدا ئەرکەوەزاری دەڵێ لەگەڵ باوەیاڵ پەیمانمان بەستووە من غەم و ئەو تەم تا ڕۆژی مردن لێیان دوورنەکەوینەوە. ئاوڕدانەوەییێکی شیعرایەتی جوانە، باوەیاڵ بێ تەمومژ نابێ، ئەرکەوازیش لەبەر ئەحمەدخان تا مردن بێ غەم نابێ، چونکە ئەو کوڕە جوانەمەرگ بووە، باوکی بۆی سووتاوە بەرگی پەلاسە و هەناسەی تێدا نەماوە. شاعیر لە ماتەمنامەکەی بەردەوامە:

شەو تا رو رۆژ تار هەردگ تار وە من
دڵ چو تافەی ئاو بێ قەرا و وە من
چو سەید زەردەی تیر گرفتار وە من
چو وی نەروو ئاو لەرزان کار وە من
کراسی چاکچاکی یەخە دڕیامە
چو سەید زەخمی ژە کەل بڕیامە
فەدای گالاگاڵ ڕاوچیانت بام
شەل و پەل کەفتەی ئاهوانت بام
فەدای مەکەنزی ئاتەشبارت بام
بەزم بێ هەماڵ رووژشکارت بام
مەکنزیت ساختەی دەس حەسەن بوو
جەوماغ نوور عەلی کەریم پەسەن بو

واتاكەی:

شەو ڕۆژم بێ تۆ تیر و تاریکە
دڵم وەک تافگەی ئاو بێ ئارامە
وەک ڕاوچی گرفتاری زەدەی تیر بووم
وەک ئەو ئاوەم لێهاتووە لە قەراغ ڕووبار دەلەرزێ
کراسم پارچە پارچە بووە، یاخەم دڕاوە
بە برینی ڕاو لە خەڵکی جیابوومەتەوە
ڕۆڵە! قوربانی های های ڕاوچیانت بم
قوربانی مامزانی شەلوپەلی کەوتوانت بم
قوربانی تفەنگی مەکەنزی (ناوی تفەنگە)ت بم
قوربانی بەزموڕەزمی ڕۆژی ڕاووشکارت بم
تفەنگی مەکەنزی تۆ حەسەن دروستی کردبوو
(حەسەن ناوی وەستای تفەنگەکەیە)
چەخماغی تفەنگ نوور عەلی دروستی کردبوو

لەم دێڕە شیعرانەیدا ئەرکەوازی هەندێ وێنەی هونەری دادەهێنێ وەک ئەوەی لەلای ئەو تەنیا شەو تاریک نییە، بەڵکو ڕۆژیش تاریکە لەبەر مردنی کوڕەکەی، ئینجا دەکەوێتە ژماردنی کردەوە جوانەکانی وەکو ڕاوکردنی نێچیر و پسپۆڕی لە کاروباری ڕاووشکار. بەم جۆرە لەسەر هۆنینەوەی شیعرەکەی دەڕوا تا دەڵێ:

هانای هامدڵان زامم کاریەن
ئەلئەمان دەردم نادیاریەن
زامم کاریەن کارچیەن ژە دەس
مینای شکەستەم نمەبوو پەیوەس
شەو وە پەژارە رووژ وە هوڵمەن
چو سەرەی ئاسیاو دووما دووڵمەن
هەر چگە مەیەم دەلاڵەت وە دڵ
دەی دەلاڵەتە هوچ نیەکەم حاسڵ
هەر چگە مەیەم هور وە فامەوە
نیشتەجانیەن دڵ وە لامەوە
خەیاڵ پەرگەنەی دڵ تەرەف تۆنم



چو فەرهای شەهید پای بێستوونم
خەیالان سەنەن ژە دیدەم خاوان
شەوان گووش مەیەم وە تافەی تاوان
غەم و غوسسەگەت بوو وە پەژارەم
بوو وەئێشی سەخت کەفت نەگلارەم
عاجز وێنەی مرخ شکستە باڵم
مەلان کوان مەلوول ژە حالم
فەلەک وەفیکەی پاپیام کەردەن
شەوگارم شوومەن نازارم مەردەن
غەم خوراکمەن غەم خەڵاتمەن
یە ئاخر سەلات رووژ نەهاتمەن
بیان بنوورن وەی زاریمەوە
وەی کووس کەفتەی دیاریمەوە
وێنەی سەر سەوز کەلاوە کەنە
پەرپووم ژە دەور گوولاوان مەنە
دوەی دەروونم کوان تەم کەردەن
دڵم خاپوورەن شادیم ڕەم کەردەن
ئالوودەی دەردم شکستە باڵم
مدام پەشێوم دایم حاڵحاڵم

واتاكەی:

ئەی هاودڵانم بەهانام بگەن برینم کارییە
بەفریام بکەون دەردم نادیارییە
برینم کارییە، چارەی نییە
مینای شکاوم، شتی ترم پێویست نییە
شەو بەپەژارە ڕۆژ بەناسۆری
وەک بەرداش ئاوی لێ بڕا بێ
هەرچەندە لەم دیاردەیەی دڵ ورد دەبمەوە
هیچم دەست ناکەوێ

هەرچەندە هۆش و فامم بەکار دێنم
کەڵکی نییە و دڵم ئۆقرە ناگرێ
خەیاڵم پەڕاگەندە و دڵم لەلای تۆیە
وەک فەرهاد شەهیدی دامەنی بێستوونم
خەیاڵ ڕۆیشتوو، چاوم لە خەوە
بەشەوان گوێم لە خوڕەی ئاوانە
غەم و ناڵە بۆ تۆ، بووە بەمایەی پەژارەی من
بووە بەئێشێکی سەخت و کەوتۆتە ناو چاومەوە
مەلوولم وەک باڵندەی باڵ شکاو
باڵندەکان بۆ حاڵی من غەمبارن
گەردوون بۆ حاڵی من پەرێشانە
شەوانم شوومە، نازدارم مردووە
غەم خۆراکمە، غەم خەڵاتمە
ئەمە نیشانەی ڕۆژی دوایی و نەهاتیمە
وەرن بنوارنە گریە و زاریم
چۆن کۆستم کەوتووە تەماشاکەن
وەک باڵندەی ئاوی تەرپۆشم
پەڕ و باڵم لەناو ئاودا خنکاوە
دوکەڵی دەروونم شاخ تەماوی دەکا
دڵم ڕازاوەتەوە و شادی لێم دوورکەوتۆتەوە
باڵم شکاوە دەردەدارم
پەرێشانم و بێ حاڵ کەوتووم

لەو دێڕانەدا شاعیر کۆمەڵێک وێنە دروست دەکا، بەڵگەی وا دێنێتەوە هەر شتێک ڕەسەن و تاک و تەنیـا بێ ئاوزەی نەبێ و لەناوبچێ زیـانێکە جێـی پڕ نابێـتـەوە، وەک توحـفـەیێکی یەکـجـار جـوانی لە شووشە دروست کرابێ، ئەگەر ئەو شووشەیە وردوخاش ببێ جێی پڕ نابێتەوە، دڵشکانی شاعیر لەم بابەتەوە بۆ کۆچی دوایی ئەحمەدخانی کوڕی وەک ئەو شووشەیە وایە جێی پڕ نابێتەوە.

ئەرکەوازی لەسەر شیعرەکەی دەڕوا تا دەڵێ:

شـەرت بوو بپـووشم جـامـەی قـەترانی
چو مـەجنوون بنـەم سـەر نەوێرانی



شـەرت بوو خۆراکم وە لەختـەی خون کەم
وە ناخـون سـینەم چو بێسـتوون کەم
شـەرت بوو ئەندام پلاس نیـشـان کەم
شەو تا سوو قووقووی بایەقوشان کەم
تا رووژ مـەردەن سـیـا بەرگم بوو
ئێ بەرگـە کـفـن رووژ مـەرگم بوو
ئەو رووژە مووران سـەرکـەن وە گیـانم
نەمـینێ ژەگـووشت غـەیر لە سـخـانم
شـەوگـار تا وە رووژ کـارم زاری بوو
شـیـعـارم ئەفـغـان بێ قـەراری بوو
بنوورن خـەڵقـان روخسـارم زەردەن
تا باچن غـولام ئەحـمـەدش مـەردەن
چاوم کـەفت ئەو زێد مـینگەی هەر جـاران
زێـد هەر ئەو زێدەن لێش نیـەن باران
دەنگ دووس نیـەن مـرخ دڵ مـەردەم
زنـگـانـیـم بیـەن وەبـار گـەردەن

واتاکەی:

شەرت بێ جلی ڕەشی قەترانی بپۆشم
وەکو مەجنوون لە بیابانی وێراندا بژیم
پەیمان دەدەم خۆراکم خوێن بێ
سنگم وەک بێستوون بتراشرێ
پەیمان بێ ئەندامم وەک پەلاس پیشان بدەم
شەو تا بەیانی وەک بایەقوش بخوێنم
تا ڕۆژی مردنم بەرگم ڕەش بێ
ئەو بەرگە ببێتە کفنی ڕۆژی مەرگم
ئەو ڕۆژەی مار و مێروو سەردەکەنە گیانم
گۆشتم نامێنێ و هەندێ ئێسقان نەبێ
شەوگار و ڕۆژگارم هەمووی ڕاز و نیاز بوو
ناڵە و ئەفغان و بێ ئۆقرەیی دروشمم بوو

تەماشاکەن خەڵکینە ڕوخسارم زەردە
بۆ ئەوەی بڵێن چونکە غولام ئەحمەدی لە دەست چووە
چاوم بەمەڵبەندی زیندەگانی جاران کەوت
زێد هەر ئەو زێدەیە بەڵام یاران نەماون
دەنگی دۆستان نییە باڵندەی دڵ مردووە
زیندەگانی بووە بەباری قورس لەسەر گەردنم

لەم دێڕە شیعرانەدا ئەرکەوازی بەڵێن دەدا جلی ڕەش بپۆشێ، لە وێرانە بژی وەک مەجنوون، خۆراکی خوێن بێ شەو تا بەیانی لەگەڵ کوندەبۆ بژی، لە ماتەمنامەکەیدا دەگاتە ئەو بڕە شیعرەی هەرچی ناخۆشی هەیە بۆ خۆی تێیدا دەخوازێ:

بیلا بتکێ زووخ ژە چاوانم
تا بووگە ڕەنگ وەس یەقە و دامانم
بیلا بمرم هەروەی دەردەوە
وەی دەرد گران وەر مە گەردەوە
بیلا بمرم هەر وەی دەردەوە
سەربنەم ئەوبان سان سەردەوە
بیلا بمرم هەر وەی داخەوە
شەوان تیەرک بێ چراخەوە
بیلا بمرم وەنم بچوو زوور
زرەی خاک بێڵ زەینم بکەی کوور
بیلا بمرم بیاوان بوو جێم
هامدەمان بیان نەزانن من کێم
بیلا بمرم ڕازیم وە مەردەن
مەردەن بێترە ژە زووخاو خوەردەن
بیلا قەورەکەم نەڕێ خێلان بوو
نەڕێ نازاران کەژ وە پێلان بوو
بیلا قەورەکەم ژە قەرەوێل دوو بوو
نزیک وە نەجەف داخڵ وە نوور بوو



واتاکەی:

با خوێن و کێم لە چاوم بتکێ
بە یەخەو دامانم بێتە خوارەوە
با هەر بەم دەردەوە بمرم
بەو دەردە گرانە کە چارەی نییە
با هەر بەم داخەوە بمرم
سەر بنێمە سەر بەردی ساردەوە
با هەر بەم داخەوە بمرم
شەوانی تاریکی بێ چرا
با بمرم و ئێشی و ئازار لێم دوورکەوێتەوە
دەنگی هەڵکەندنی زەوی هۆشم بکاتەوە
با بمرم و بیابان جێگام بێ
دۆستانم بێن و نەمدۆزنەوە
بابمرم من بەمردن ڕازیم
مردن خۆشترە لە خواردنەوەی زاخاو
با گۆڕەکەم لەسەر ڕێی خێڵان بێ
لە ڕێی نازداران و جوانانی ڕەنگین پۆش
با گۆڕەکەم لە گۆڕەکانی دیکە دووربێ
نزیکی نەجەف و لەناو ڕووناکی (نوور) بێ

ئەم هەموو بەڵگانەی شاعیر بۆ مردنی خۆی ئەنجامی ئەوەبوو لەدوای جوانەمەرگی ئەحمەدخانی کوڕی ژیان بۆ خۆی ڕەوا نەبینێ، خۆشیی لەوەدابوو بەزووترین کات بچێتە لای ئەو. شاعیر بەم دێڕانە دوایی بەشیعرە درێژەکەی دێنێ:

عزرایل وە قەرار گیانم شرینەن
وە چاگەی مەچم کەس کەس مەوینەن
سزاش تاریکەن گوزەرگاش تەنگەن
نە یار نە دیار نە شنەی دەنگەن.

واتاکەی:

عزرایل گیانم شیرینە لەسەرخۆ بیکێشە
بۆ جێییێک دەچم کەس نەمبینێ

گۆڕەکەم تاریک و تەنگە
نە یار نە نیشتمان کەسی لێ نییە.

لەم دێڕانەی دواییدا ئەرکەوازی بەخەیاڵ گەیشتۆتە ئامانجی و بەمردن شادبووە بۆ ئەوەی لە کوڕە جوانەمەرگەکەی نزیک ببێتەوە. ئەم شیعرە نموونەییێکی بەرزە لە مەبەسی ماتەمنامە لە ئەدەبی کوردیدا.

**باوەیاڵ -٢**

ئەم قەسیدەیە پێوەندی بەقەسیدەی پێشەوە هەیە، لێرەدا شاعیر بەختیاری پێش مردنی کوڕی لەگەڵ بەدبەختی پاش ئەو مردنە تێکەڵ بەیەکتری دەکا، لەم بابەتەوە دەڵێ:

وە باوەیاڵ دیم
ئیمرووژ واوەیلا وە باوەیاڵ دیم
ئیمرووژ کوو خەم کوو زخاڵ دیم
داران نەتەکلیف سەنگ نەفەغان دیم
مرغان مردە موو کول وەحشیان دیم
پرسیم باوەیاڵ یە چ زاریتەن
بە چ زەمزەمە و عەزاداریتەن
باوەیاڵ پەری پەی نەوجەوانی
پەی نەوچە و نەوتوول ساحیب شەشخانی

واتاکەی:

لە باوەیاڵ دیم
ئەمڕۆ واوەیلا لە باوەیاڵ دیم
ئەمڕۆ شاخەکان وەک زوخال کەوتنە بەرچاوم
درەختان پەژمردە و بەردان دادیان بوو
باڵندە و دڕندان وەک مردوو کەوتنە بەرچاوم
پرسیم باوەیاڵ ئەمە چی شین و زارییە
ئەم شین و واوەیلایە و تازیبەتان بۆچییە
باوەیاڵ ئەمەی بۆ نەوجەوانییە
بۆ ناسک و نازدارێکی خاوەن تفەنگی شەشخانە

شاعیر ڕەنگدانەوەی هەستی دەروونی ناوەوەی لە باوەیاڵ دەبینێ، باوەیاڵ لە شین و شەپۆڕدایە، بووە بەرەمزی شاخی غەم و پەژارە، درەخت و بەرد و باڵندە و جانەوەر دەناڵێنن. لێی دەپرسی: ئەی باوەیاڵ



ئەم هەموو شین و واوەیلایە بۆچییە؟ باوەیاڵ تەڕ و ئاودار و جوانە وەک تفەنگی شەشخانە، ئەو تفەنگەی ئەحمەد خان بەکاری دەهێنا. دەنگ و سەدای تفەنگ لەناو دۆڵی کێوی باوەیاڵ دەنگ دەداتەوە، ئەمە جێی ڕاووشکار و تەڵەدانانەوەیە، ئەی کوڕی خۆم لە سایەی ئاڵای تۆ نەحەسامەوە و لە داخی تۆ منیش مردم. ئینجا بەم دێڕانە وەسفی ڕاووشکاری ئەحمەد خان دەکا:

ڕمەی ماردەمی ژەی دەروونەوە
ئێ کاو ژە ئوو کاو دەنگ مەسەنەوە
یەجای تەلارگاو جای شکارشە
جای نەشات کول سوو ئێوارشە
شوون تەلارگای میرزام دیارەن
کەلەی کەل دێدا کە لە مەنارەن
بەسە من مردم ژە داخت ڕووڵە
نەنیشتم نەسای بەیراخت ڕووڵە

واتاکەی:

گرمەی تفەنگی ماردەم لەناو دۆڵدا
دەنگ و سەدا دەداتەوە
ئەمە جێگەی ڕاووشکاریەتی
جێی جموجۆڵی بەیانی و ئێوارانیەتی
شوێنی مەڵبەندی میرزام دیارە
جێ لوتکەی ڕمبازی لەبەر چاوە
ئەی ڕۆڵە ئێستا من مردم لە داخی تۆ
لە سایەی ئاڵای تۆ نەحەسامەوە.

لەم دێڕانەدا ئەرکەوازی باس لە تفەنگی ماردەم دەکا، ئەمە ناوی تفەنگێکی ئەو سەردەمەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمە، هەروەها باس لە شوێنی ڕاووشکار و سەیرانگای ڕۆڵە جوانەمەرگەکەی دەکا. ئینجا بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنی:

واران مەوا ڕوو سەونز نەکەی گیا
خەڵکان بنیشن نەخاک سیا
واران مەواروو شەونمەداران
کەو نە شاقنێ سوو نە نساران
کاوان کورتەچین قەڵەم نەپووشێ

ژە ئەووەل کووره وەهار نەجووشێ
کوور پەکەناچان نەرەسن وەبەخت
شای چو کەیخوسرەو نەنیشێ ئەو تەخت
کەپوو نەنیشێ ئەو تەل داران
بڵبڵ نەخوەنێ نەغمەی وەهاران
کەپوو بەد دەماغ بڵبڵ مەیهووش بوو
داران درەختان کول سیاپووش بوو (Kiwli)
بەرزان بڵێنان داران درەختان
چونا بێ غەمن خوەزەو وە خوەتان
نەو تووڵ نەمامێ پەی وێم کەردم سەوز
سای نە دیدەم بو چو سەول نە روو حەوز
فەلەک هات بەردەی وە نەوەوایە
سەوڵم ئەڵکەنیا من مام بێ سایە
ستوون یانەم تاشا وە تێشە
نەوتووڵ نەمامم کەنی ژەرێشە

واتاکەی:

باران نابارێ گیا سەوز نابێ؛
با خەڵکی لەناو خاکی ڕەشدا بژین
بەشەوان نمە نمی باران نییە
بەیانییان لە نساراندا کەو ناخوێنێ
شاخەکان جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ ناپۆشن
لە سەرەتای بەهاردا گوڵ ناپشکوێ
کەناچان بە بەختی خۆیان شاد نابن (شوو ناکەن)
شای گەورەی وەک کەیخوسرەو لەسەر تەخت دانانیشێ
باڵندەی کەپوو لەسەر چڵی داران دانانیشێ
بلبل نەغمەی بەهاران ناخوێنێ
کەپوو مێشکی تێکچوو بلبل مەدهۆش بوو
دارودرەخت بێ گوڵ سیاپۆش بوون
ئەی دارودرەختانی بەرز



ئێوە بێ غەمن خۆزگەم بەخۆتان
تووله نەمامی تەڕ و ئاودار و سەوز
سەوڵ لێدانی سەر ڕووی حەوز ڕەنگی لە چاوم داوەتەوە
گەردوون هات بە ناوەخت بردی
سەوڵی هەڵکەندنم بێ سایە مایەوە
کۆڵەکەی ماڵم ڕووخا
تووله نەمامم لە ڕیشە دەرهێنرا

لەم دێڕانەدا ئەرکەوازی بەکوڵ بۆ خۆی دەگریێ و دەلاوێنێتەوە: باران نابارێ، گیا شین نابێ، خەڵکی لەناو خاکی ڕەش و بەدبەختیدا دەژین، شاخەکان بەرگی ڕەنگاوڕەنگ ناپۆشن، لە جەنگەی بەهارا گوڵ ناڕوێ، کچان ناگەنە بەختی خۆیان (شوو ناکەن)، کەیخوسرەو لەسەر تەختی شاهی دانانیشێ، کەپوو لەسەر لقی دار نابێ، بلبل نەغمەی بەهاران ناخوێنێ، کۆڵەکەی ماڵی ڕووخاوە، سەروی تازە نەمامی لە ڕیشە هەڵکەندراوە. ئەمە هەمووی لەبەر مردنی ئەحمەد خانی جوانەمەرگ بوو.

### غوربەت، ئاوارەیی

شیعرێکی ئەرکەوازی بەم دێڕانە دەست پێدەکا:

ژە غەم قاڵ بوای
یاران چو تلا ژە غەم قاڵ بوای
ڕاهی واو ڕەحمەت لایەزال بوای
یا واریدە وە زێد باوەیاڵ بوای
چەشمەی هانی سەونز سەروێشە و مەیان
کەفت نەخیاڵم وێنەی بیماران
بنیشتا واو برج سەرچەشمەی هانی
فاریغ بکردای زەمانەی فانی
بنوشیای ژەو ئاو پاک و زلاڵە
ژەو سەرچەشمە و حەوز کەوسەر میساڵە
سەیر بکردان نەخاک گەرمەسێر زەمین
جەوەڵ جەوەڵان شوون ماڵ جەمین
جەوەڵ جەوەلانگ وە جاهلی دیم
جەوەڵ پا بەرجا من ئاوارە بیم

یافته سەراوناز سوو ئێوارەمەن
مەخمەل کوو ماوای بەدقەرارەمەن
بەرزی بەڵەوان شووخی نەوەکوو
چو تەم دیارەن ڕوو وەیانەم ڕوو
گەردش فەڵەک سامانم کەنەن
هەوام و هەوەس جاران نەمەنەن
موفلیس و بەدبەخت ستارە لێڵم
مدام چون ئەنجوم نەگەیشت و گێڵم
مسکین و غەمگین وێنەی غەمباران
دەرمەنە و بێکەس نەگووشەی شاران
مەگێڵووم نەدەور کووچە و بازاران
بەڵکم یاری کەی تا لەم چوو جاران

واتاکەی:

لە غەم قاڵ ببی
یان وەک زیو لە غەم قاڵ ببی
ڕێگەی دڵسۆزی و دڵارامی بگری
یاخود بگەڕایتەوە باوەیاڵی زێدی خۆت
سەرچاوەی (هانی سەونز) و (سەرویشە) و (مەیان)
وەک برینداران کەوتە خەیاڵم
لەو بورجەدا ئاوی سەرچەشمەی هانی بنۆشی
ئەو زەمانە لەناوچووە لەبیر بکەی
لەو ئاوە پاک و زوڵاڵە بنۆشی
لەو سەرچاوەی حەوزی وەک کەوسەرە
سەیری ئەو خاکەی گەرمەسێرم بکردایە
لە ماڵ و شوێن و مەڵبەندی یاران بگەڕامایە
ئەو کێو و جەنگەڵانەی بەلاویەتی دی بووم
هەموویان لە جێی خۆیانن بەڵام من ئاوارە بووم
لە شاخی یافتە بەیانی و ئێوارە بیردەکەمەوە
جێگەی ژیان و مەڵبەندی منە



بەرزی و بڵندی و جوانی شاخی نەوەر
وەک تارماییییێک دیارە لە ماڵی منەوە
سووڕانی گەردوون سامانی بردم
هەوا و هەوەسی جارانم نەماوە
بێ چارە و بەدبەخت ئەستێرەم لێڵە
وەکو ئەستێرەکان لە گەردش و هاتوچۆ دام
بێ نەوا و غەمگین وەک هەموو غەمباران
دەربەدەر و بێ کەس لە گۆشەی شاران
دەگەڕێم لە دەوروبەری کووچە و بازاڕان
بەڵکو بگەڕێمەوە دۆخی جاران

لەم بڕە شیعرەدا ئەرکەوازی هەوڵ دەدا ئامۆژگاریی دانایانە بەرامبەر بەژیان بخاتە ڕوو و، ڕێگە بەئاسۆی بیرەوەری و یادی دەدا بەشێوەییێکی فراوان لایێکی گەورە بگرێتەوە. یادی شاخی «یافتە» دەکاتەوە کە ناوی لوتکەییێکە لە شاخەکانی خوڕەم ئابادی لوڕستان. هەروەها یادی «سەراوناز» دەکاتەوە کە دیمەنێکی جوانی ناو ئەو شاخەیە و جێی خەوهێنان و حەسانەوەی ئادەمزادە، ئینجا لەسەر شیعرەکەی دەڕوا و دەڵێ:

غەریب نەشاران ئەگەر وەشا بوو
ساحیب تەنتەنە و تیپ و سپابوو
سپای ژە سپای سا جەمشیر نەکەوم
گووشەی دەروونی مدام ها نەغەم

واتاکەی:

بێ کەس لە شاران با شەهنشابێ
خاوەنی تەنتەنە و تیپی سوپا بێ
سوپای لەوەی جەمشید کەمتر نەبێ
بەدبەختە ئەگەر ناخی دەروونی پڕ لە غەم بێ

لێرەدا شاعیر ئەوە دەردەخا کە ئاوارەیی کارێکی قورسە لە ژیانی ئادەمزاد، هیچ جیاوازییێک لەناوەوە نییە ئەگەر ئەو ئاوارەیە شاهنشا و خاوەن سوپا بێ، یا کەسێکی هەژاری بێ دەسەڵات بێ. ئەرکەوازی لەسەر شیعرەکەی دەڕوا و دەڵێ:

هامراز ترکان نەزان زوانم
دوورم ژە یاران هەمکەلامانم

ئاوارەی وەتەن خەیاڵ پەرگەنە

خەیالاّن خاوان ژە دیدەم سەنە

تاڵەی بەخت وێم ها نەکەمەینم

ڕووژێ ک مەچوو پێشتەر خەمەینم

هەرچەن من بەندەی کەمەینەی کەم فام

عاسی مەینەتبار سەرسەری سەرسام

ئاوارە و پەشێو سەودام هانەسەر

دەسم دامانت یا ئاقای قەنبەر

واتاکەی:

هاوڕێیەتی تورکم کرد، زمانیان نازانم

لە یارانی هاوزمانانم دوورم (هاوزمان مەبەسی کوردە)

ئاوارەی نیشتمانم، زۆر پەرێشانم

خەو لەناو چاومدا نەماوە

تالی بەختم چۆتە کەمینەوە

ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر غەمگین دەبم

هەرچەندە من بەندەی کەم فامم

لە خودا عاسی و مەینەبار و سەرسەری و سەرسامم

ئاوارە و پەشێوم، بگەرە فریام

دەستم داوێنت ئەی ئاغای قەنبەر

ئەرکەوازی لەم دێڕە شیعرانەدا ئەوە دەردەبڕێ، لە ژیانی ئاوارەییدا لە تورک زمانان نزیک بۆتەوە، زمانیانی نەزانیوە، ئەمەش بووە بەکێشەیێکی دیکەی سایکۆلۆجی، هەروەها دەڵێ دوورم لە یارانی لە زمانم دەگەن، ئاوارەی نیشتمانم وێڵ و سەرگەردان و بێ شوێن. هاوار دەبا بۆ ئاغای قەنبەر (عەلی) بەفریای بگا و لەم مەینەتییە ڕزگاری بکا. ئینجا بۆ حاڵی خۆی دەلاوێنێتەوە:

هەی دوو یەک هاورد دوو مێردی نەردم

هەی نسیو وە خاک موخالیف بەردم

سەد لەعنەت وەی بەخت سیای تار من

وەی مەحروومی سەیر نەوبەهاری من

قاقولەی کەوکان وە دارانەوە

نەشنەفیتم وە لووت ئەنارانەوە



هەی ئارەزوومەند کاومانێشت بووم

دیدە حەزرەتمەن هام دەمان گێشت بووم

نەنیشتم ئەو بان دیزە کەمەردا

نەکردیم ئەمساڵ سەیر و سەفەردا

نەنیشتم ئەو بان دێزە کەمەردا

نەکردیم ئەمساڵ سەیر و سەفەردا

پەی دین تفلاّن هەمزوان وێم

هەر وەختە بکەم قەسد گیان وێم

واتاکەی:

لە یاریی نەرد دوو یەکم هێنا

لەمەدا سەرنەکەوتم و دواکەوتم

سەد لەعنەت لە بەختی ڕەشی من

کە منی بێ بەش کرد لە سەیرانی بەهار

دەنگی خۆشی کەوەکانم لەسەر داران نەبیست

لەسەر لقی دار هەناران

زۆر ئارەزووی شاخی (مانێشت) بووم

ئارەزووی بینینی هاوڕێ و هاودەمانم دەکرد

لە دەوروبەری (عەودالاّن) گەشتم نەکرد

ئەمساڵ سەیرانم نەکرد وەک سالاّنی پێشوو

نەچووم بۆ (دیزەکەمەر)

ئەمساڵ سەیران و سەفەرم نەکرد

لە دەردی دووری منداڵانی هاوزمانم

خەریکە گیانم دەردەچێ

لەم دێڕانەدا ئەرکەوازی بێزاری لەو دڵتەنگییە دەردەبڕی کە ئارامی لێ بڕیوە، لەعنەت لە بەختی ڕەشی خۆی دەکا، چونکە لە سەیرانی نەوبەهاری کردووە، نەیتوانیوە بەشاخی خۆشەویستی (مانێشت) شاد بێ، بۆی نەکراوە هەموو یارانی بەسەر بکاتەوە، وەکو سالاّنی پێشوو سەیرانی عەودالاّن بکا. ئەمساڵ نەچۆتە (دیزەکەمەر)، ئەم هاوینەهەوارەی پێ خۆشە ئاواییێکە نزیک جێی لەدایکبوونی شاعیرە. لە حەژمەت دووری لە منداڵەکانی خەریکە لە پەلوپۆ دەکەوێ.

لەدواییدا شاعیر بەم دێڕانە دوایی بەشیعرەکەی دێنێ:

بچـیـام ئەو سـەر ئێڵ پەرگـەنە
قـەوم و ئەقـرەوای جـەور ژە جـاکـەنە
تـا گـەر ئـاوازەم پەخش بـوانە عـام
هاتە جـاگـەی وێش هاتەوە (غـولام)

واتاکەی:

کەوتمە سۆراغی ئەو ئێلە پەڕاگەندەیە
قەوم و خزم و کەسوکاری ستەمدیدە
کە ئەم قسانەی من بڵاو دەبێتەوە
(غولام) دەگاتەوە زێد و مەڵبەندی خۆی

ئەسـتووری بیـروڕای ئەرکـەوازی ئەوەیە گـەڕانـی بەشـوێن ئاوارەیی و پەڕاگـەندەیی بنەمـاڵـە و ئێڵ و عەشرەتی، بەوە ڕاست دەبێتەوە خۆی بگەڕێتەوە زێدی لەدایکبوون و ماڵی یەکەم و جاری جارانی.

## زولەیخام ژە چین

قسـە لەسـەر ئەم شیـعـرە هەیە کـە لە دانراوەکـانی ئەرکـەوازی نییـە، بەڵام بۆ کەسێکی دیکەش سـاغ نەبۆتەوە. لەبەرئەوەی نرخێکی هونەری هەیە و لە شێوازی شاعیریشەوە دوور نییە و لە شیعری ڕەندی دیوانی کوردی دەژمێررێ لەبەرئەوە تۆمار دەکرێ:

زڵەیخام ژە چین
چین زڵـف سـەنەن ژە خـەیاتـەی چین
ژە تـاوس توغـرای ئەڵـوانی مـشکین
عـەتریات ژە عـەتر ڕیح ژە ڕەیـاحین
ژە غـەوواس قـەوسین غـەزاجـوو پڕ کین
عـەین ژە غـەزالان وەحـشی بەعـید بین
عـشق ژە کـەمـووتەر قـووتە ژە بوورچین
چالاکـی ژە بـاز هەڵـمـەت ژە شـاهین
گـوناش ژە گـوڵنار لێـوە ژە لەعڵ کـان
فـەم ژە یەنابیع سـەرچەشـمـەی حـەیوان
دنـان چو سـەدەف یا لوئلو مـەرجـان
زەنەخ ژە لیـمـوو زنج ژە زەڕفنجـان
گـەردەن ژە مـینـای بەزم ئارای کـەیان



پێـچـان وە گـەردەن بلوورین حـەیان
سـینەش ژ سـەدەف یا ژە تەخـتـەی عـاج
خـاڵان مـەوەردن ژە مـاچین خـەراج
یان ژە تەسـویرات شـاپوور نەسـساج
یان دانەی ئەلماس نەسب جـیـقـەی تاج
مـەمـان ژە رومان یا لیـمـووی نەوڕەس
یا ژە شـەمـامـان نەوخـیـز یانیـمـڕەس
کـەمـەر چو جـەیران حـەواڵان مـاوا
شـەفـەین شـەعـشـەعـەی زەرد خـوەراوا
قـەیام ژە سـەوڵان قـامـەت ژە پەری
شـوعـاع ژە خـورشـیـد شـەوق ژمـوشـتـەری
وەفـا ژە شـیـرین تاقـەت ژە لەیلی
نـیم نـیگا مـەکـەرد هەم وەبێ مـەیلی
هەم لەیل هەم شـیـرین هەم گـوڵەندامـەن
پـووسـەنمـایان دیـدەی غـوڵامـەن

واتاکەی:

زولیخای چین
زولفی چین چینە بەوێنەی چین
لە تاوس بەرگی ڕەنگین و خۆش بۆی وەرگرتووە
بۆنی لە عەتر و ڕەیحانەوە وەرگیراوە
دوو کەوانی ئەبرۆی لە شەڕوشۆڕی پڕ گین وەرگرتووە
چاوی لە مامزی کێوی دووربین وەرگرتووە
عەشقی لە کۆترەوە بەهێزی لە باڵندەی ئاوییەوە
چالاکی لەباز و هەڵمەت لە شاهێنەوەیە
کوڵمی لە گوڵنار لێوی لە لەعل
دەمی لە کانی و سەرچاوەی ئاوی ژیانەوەیە
ددانی وەک سەدەف یا لوئلوء و مەرجان
چاڵی چەناگەی لە لیمۆ و فینجانی زێڕین وەرگرتووە
گەردنی مینای بلوورینی کۆڕی کەیانییانە

بسکی لە سنگ و گەردنی بلوورینی ئاڵاوە
سنگی لە سەدەف یا لە تەختەی عاج
خاڵی سەر ڕووی لە وڵاتی چین و ماچین خەراج وەردەگرن
یا نەخشێک بوو لە نەخشەکانی شاپوور
یا دانەی ئەڵماس کە تاجی نەخشاند بوو
مەمکی لە هەنار لە لیمۆی تازە
یا شەمامەی تازە پێگەیشتوو
ناوقەدی مامزی پڕ لە جموجۆڵی
دوو لێوی زەردەی خۆرئاوا دەپژێنێ
باڵا وەک سەروو قامەت وەک پەری
ڕووناکی لە ڕۆژ شەوق لە موشتەری
وەفا لە شیرین توانا لە لەیلێ
ئەگەرچی تەماشای کردم بەڵام بێ مەیل بوو
هەم لەیلایە، هەم شیرینە هەم گوڵەنام
چاوی (غولام) پڕ لە خۆشی دەکا.

زولەیخا لە ئەدەبی کوردیدا وەک بووکی شیعر چۆتە ناو بەرهەمی ئەدەبییەوە. ئەم زولەیخایە کچی تەیموورسی شای مەغریب زەمین و هاوسەری عەزیزی میسر پووتیفار یا (فووتیفار) بووە، پێوەندی بەیووسف پێغەمبەرەوە بووە و ناوی لە تەورات و قورئاندا هاتووە، ئەو کچە ڕەمزی جوانی بووە. شاعیر دەڵێ زولەیخای ئەو لە چینەوە هاتووە، زوڵفی چین چینە، واتە وەک زولەیخا جوانە. لە هەموو شتێک لە تاوس و لە بۆن و عەتر و ڕەیحان دەکا، باس لە ئەندامانی لەشی دەکا، برۆ و چاوی مامزی، سیفەتەکانی کۆتر و باز و شاهێنی هەیە، ڕوومەتی گوڵنار، لێوی لەعل، دەمی سەرچاوەی ئاوی ژیانە، ددانی سەدەف و لوئلوء و مەرجانە، گەردنی بلوور و پرچی وەکو مارە، سنگی سەدەفە یا ددانی فیل لە سپیەتی خاڵەکانی باج لە وڵاتی چین و ماچین وەردەگرن. ڕوومەتی ئەو ئەڵماسەیە تاجی شاهانی ڕازاندۆتەوە. سنگی باغی هەنار و لیمۆ و شەمامەی تازەیە. ناوقەدی مامزییە، باڵای سەرووی ڕەوانە، قەشەنگی لە ڕووناکی ڕۆژ و شەوقی لە موشتەری وەرگرتووە، وەفا لە شیرین، توانا لە لەیلا. بێ مەیلی لەگەڵدا مەکەن خۆشەویستی ئەرکەوازییە. هەم شیرین و هەم گوڵەنامە، چاوی (غولام) پڕ لە هەیبەت و شکۆ دەکەن.

***

غولام ڕەزا ئەرکەوازی یەکێکە لە شاعیرە دیارەکانی لوڕستان و گۆرانزەمینی کوردستان. شاعیرێک بووە هەموو ژیانی ئەدەبی بۆ شیعری ئایینی (موناجات و ئیلاهییات و ستایشی ئیمامی عەلی) تەرخان



کردووە. شەقڵی تەواوی ئایینزای شیعەی ئایینی ئیلام بەڕوونی لە شیعریدا دەردەکەوێ، گەلێ جار لەژێر پەردەییێکی تەنکی سۆفیزم لە ئایینی یارسان (ئەهلی هەق) نزیک دەبێتەوە، هەر چۆنێ بێ شیعری نموونەی شیعری ئایینی بەرزە لە ئەدەبی کوردیدا.

زمانی شیعری ئەرکەوازی شیرینە، هەرچەندە شەقڵی ڕۆشنبیری سەردەمی خۆی ڕوون و ئاشکرایە لە بەرهەمیدا، بەڵام هەندێ جار لە شێوازی ئەدەبی میللی نزیک دەبێتەوە، واتە شیعری بۆ نێوەندێکی فراوانی کۆمەڵی دەوروبەری خۆی وتووە لە ڕۆشنبیر و خوێندەواری بەرزەوە تا ئەو کەسانەی خوێندەوارییان کەم بووە، سنووری داهێنانی ئەرکەوازی لە چوارچێوەی ئایین و ماتەمنامە و ئازاری گیانی و لەش نەچۆتە دەرەوە، لە ئاییندا هۆگری عەلی بووە، بەمردنی ئەحمەد خانی کوڕی پشتی شکاوە، بە بەندیخانە و ئازار تووشی مەینەتی بووە، لەبەر ئەوە دڵداری و خۆشی ژیان لە بەرهەمی شاعیردا جێگەیان کەمە.

# بەشی شازدەمین

## شەفیع

## میرزا شەفیعی جامەڕێزی ١٧٧٦-١٨٣٦

### ژیانی شاعیر

شاعیری ئەم ماوەیەمان ناوی شەفیع کوڕی عەباسی دەلۆییە، لە ساڵی ١٧٧٦ لە گوندی جامەڕێز لە نزیک کەرکووک لەدایکبووە. لەناو خەڵکیدا بەمیرزا شەفیعی جامەڕێزی ناوبانگی دەرکردووە. شاعیر ناوی تایبەتی خۆی کە «شەفیع»ە وەک نازناو لە شیعریدا بەکاری هێناوە. زانیاری لەبارەی ژیانی ئەم شاعیرەمانەوە کەمە، لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی ئەو شیعرانەی لەبەر دەستمانن دەتوانین پلەی خوێندەواری تاڕادەیێک دەستنیشان بکەین.

شاعیر لە تەمەنی منداڵییەوە لە حوجرەی مزگەوت دەستی بەخوێندن کردووە. لەناو و ناوبانگی «میرزا شەفیع» بەئاشکرا ئەوە دەردەکەوێ نەبووە بەمەلا، بەڵکو بووە بەمیرزا، لەناو کوردەواریدا شوێنی وەرگرتنی خوێندەواری حوجرەی مزگەوت بووە، جگە لەوە خوێندنی تایبەتی لەناو ماڵ یا لە دیوەخانە لەناوەوە بووە، واتە دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتوو لە توانایاندا بووە مامۆستا بۆ فێرکردنی منداڵیان لە ماڵی خۆیانا ڕابگرن، بەتایبەتی لەدوای خەتمکردنی قورئان لە حوجرە، یا لە هەر قۆناغێکی دیکەی فەقێیەتیدا. بەم پێیە شەفیع سەرەتای خوێندنی لە حوجرە بووە، گەشتی خوێندنی بووە لە هەندێ حوجرەی مزگەوتەکانی کوردستانی ئەو سەردەمە، ماوەیێک لە سلێمانی ژیاوە ئەوجا گەڕاوەتەوە شوێنی خۆی.

وەک لە شیعری دەردەکەوێ شەفیع خوێندەوار بووە، کە نەیویستووە خوێندنی حوجرەی مزگەوت تەواو بکا لەبەرئەوەی بووە نەبێ بەمەلا. بەهەوڵ و تێکۆشینی خۆی زانست و زانیاری وەرگرتووە و بووە بەڕۆشنبیر، واتە خۆی خۆی فێر کردووە. بەم جۆرە شارەزایی لە مێژوو و جوگرافیا و ئەتنۆگرافیا و ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەواری پەیدا کردووە. لە ئەدەبدا بایەخی بەمێژووی دڵداری ڕۆژهەڵات داوە، ئاگادارییێکی تەواوی بووە لە حیکایەتەکانی دڵداری و بەسەرهاتی قارەمانەکانیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕستدا.

هەواڵی وا لەناوەوە هەیە شەفیع بۆ دابینکردنی لایەنی دارایی و ماڵداری و خێزان بەڕێوەبردن خەریکی کشتوکاڵ بووە، لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا میرزایەتی کردووە. لەو سەردەمەدا میرزایەتی پیشەیێک بووە، میرزایان هەموو کارێکی خەڵکی پێوەندی بەنووسینەوەی هەبوایە جێبەجێیان دەکرد.

شەفیع لە ناوچەی ژیانی خۆی لە ساڵی ١٨٣٦ کۆچی دوایی کردووە و لە گوندی جامەڕێزی مەڵبەندی لەدایکبوون و ژیانی نێژراوە.

***



مێژووی ئەدەبی کوردی شاعیرێکی دیکەمان بۆ دەور دەکاتەوە، ئەویش ناوی «شەفیع» بووە، بە«میرزا شەفیعی مامێزکی» ناسراوە، لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەم و، چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا (١٧٥٥-١٨٢٢) ژیاوە.

### شیعری شەفیع

شیعری شەفیع لەدوا ساڵانی سەدەی هەژدەم و نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم لە گەرمیانی کەرکووک و هەورامان لەسەر زاری ڕۆشنبیر و خوێندەوارانی کورد بووە، لە کۆڕی لاوانی دڵگیرۆدە و گرفتاری کیژۆڵان خوێندراوەتەوە، خاوەن بیر و هۆشی دنیایی بایەخیان بەناڵەی دەروون و گەرمیی فرمێسکیان داوە، چێژیان لە قسە جوانەکانی وەرگرتووە.

### شیعری شەفیع لە ڕووی ڕوخسارەوە

شێوازی شیعری شەفیع بەگشتی لە ڕووی بەکارهێنانی وشە و لێکسیکۆنەوە ئاسانە، لە شیعری میللییەوە دوور نییە. لە هەندێ هەڵوێستدا کە ئاماژە بۆ ڕووداوی مێژوو و ئەفسانە دەکا تێگەیشتنی ئەو وێنانە بۆ خۆی ئاسان و بۆ خوێندەواری ئاسایی قورسە.

شاعیر لە بەراوردکردندا وشەی «چون» واتە (وەکو) زۆر بەکاردێنێ، وەک هەموو شاعیرانی گۆرانزەمینی کوردەواری. خاسیەتێکی دیکەی ئەم بابەتە لیریکە ئەوەیە نیوە دێڕی یەکەمی هەموو شیعرێک دەکرێ بەدوو کەرتەوە، هەر کەرتێکی لە پێنج بڕگە پێک دێ، ئیتر شاعیر ڕستە پێنج بڕگەییەکەی دووبارە دەکاتەوە، وەکو «زلێخام چوون حوور، زلێخام چون حوور». لە دەسنووسە کۆنەکاندا دوو ڕستەی نیوە دێڕی یەکەمی لە یەکچوو، یەک جار تۆمار دەکرا، ئێستا لە دەسنووس و چاپ هەردوو بابەتیان بەکار دەهێنرێ. ئەم دیاردەیە لە هەندێ شیعری شەفیع دەبینرێ.

هەموو شیعری شەفیع ئەوەی ئێمە ئاگامان لێی هەیە لەسەرکێشی سیلابی (بڕگەیی) خۆماڵی ڕێکخراوون، وەستان لە ناوەڕاستیاندا هەیە (ب ا ا ب ب/ ا ب ا ب ب). هەرچی قافیەیە لەسەر بنجی جووت قافیە (مەسنەوی) (ا ا، ب ب، جـ جـ...) دادەنرێ.

### شیعری شەفیع لەڕووی ناوەڕۆکەوە

شەفیع هەوڵی ئەوەی نەداوە بەرهەمی لە بابەت هەموو مەبەسەکانی شیعری کلاسیکییەوە هەبێ، بۆیە لەم لایەنەوە سنووری شیعری تەسکە، کەچی لە ڕووی خەیاڵی شیعری و داهێنانی هونەرییەوە دەوڵەمەند.

لە لیریکی دڵداریی ڕووکەشدا شەفیع تازە گەرییێکی دیاری بۆ خۆی تۆمار کردووە. لەشیعری «زلێخام چون حوور...» دیارە وەسفی ئەندامە جوانەکانی لەشی زلێخا کارێکی تازە نییە لە ئەدەبی کوردیدا، ئەوەی تازە ئەوەیە باڵندەی خەیاڵی شیعری بفڕێنێ بۆ لای ئەندامی مێیینەی دلبەر کە دەکەوێتە خوار ناوکییەوە. بێ گومان مەبەس ئەوە نییە پەردەی لەسەر ئەم شتە شارراوەیە لاداوە، بەڵکو لە

وەسفکردنیدا هونەری نواندووە و وێنە و مانای تازەی دروست کردووە.

ئەگەر بمانەوێ بەچڕی لە خاسیەتەکانی ناوەرۆکی شیعری شەفیع بگەین، ئەم تێبینییانەی لای خوارەوە هەندێ لایەنیمان بۆ ڕوون دەکەنەوە:

١- بەگشتی شیعری شەفیع لە دەوروبەری دڵداری دەسووڕێتەوە، بەمانای خۆشویستنی ژن و نزیکبوونەوە لێی، ئەمە ڕێی بۆ خۆش دەکا لە هونەری وەسف سەرکەوتووبێ، لێرەدا لای شاعیر وەسف تەنیا ژن و سروشت دەگرێتەوە. ئەو شیعرانەی لەبەر دەستدان زۆربەیان دەچنە ناو ئەم دەلاقەیەی مەبەسی شیعری کلاسیکی کوردی کە وەسف و دڵدارییە.

٢- ڕەشبینی و بێزاری ناوەوەی ڕەنگدانەوەی ئەو کۆمەڵەیە کە تێیدا دەژی، لە دەروونیدا دەبێتە کێشەیێکی سایکۆلۆجی کەسایەتی، ئیتر دڵتەنگی دەردەبڕێ، هەندێ جار ئەمە پێوەندی بەناگزووری کۆمەڵەوە نییە، بەڵکو ئەنجامێکی ئاسایی ژیانە، وەکو پیری. لەم لایەنەوە بەڕوونی لە بەرهەمی شاعیردا ئاوڕدانەوەی هونەری بەرز دەبینین وەکو لە دیالۆجە شیعرییەکەی لەگەڵ پیرەدار کردوویەتی. ئەمە تەنیا هەستی کەسانی پیری نەبزوواندووە بەناوی ئەوەی پیرییان دیوە، بەڵکو کاری لەو لاوانەش کردووە، کە هێشتا تووشی ئەو ڕۆژگارە نەبوون و هیوایان وایە نەیبینن.

***

## یانەی دڵداری سۆفیزم

شاعیر لەم پارچە شیعرەیدا ناوی هەندێ لە قارەمانانی چیرۆکی دڵداری دەبا، شیعرەکەی تارمایی هەناسەیێکی سۆفیزمی ناو ئەم چیرۆکانە دەخاتە خەیاڵی خوێنەرەوە، لە شیعرەکەیدا دەڵێ:

زولفانەش چون تووا وەشتەن نووردا
ئەفسانەش نەدەور قورس قەمەردا
بزان بەتاقی ئەسلەش چ کەسەن
تەرسای بێ ئیمان شۆخ سەرمەسەن
(شێخ سەنعان)ەش نەواکەر بردەن
(بەرسیسا) پەریش جەدین وە بردەن
ئەی نەوبەر نەمام شای چەم سیاوان
باز شەش ڕەنگەن نە (شیروان) ئامان
ساحیب غەمزە و ناز عیشوەن تەیارەن
ماچی (شیرین) شای ئەرمەن شارەن
هەرکەس بوینۆ ئەو لەنجەولارە
دەرلاد مەپیکو ویش بەقەنارە



داغەن جەدووریش (گەنجە) و (داغستان)
شۆخ باش ئاخ ئۆلگەی (کوردستان)
فەرەنگی پرام تەرسای (تفلیس)ەن
چونکە گرفتار دەست ئیبلیسەن
دەستاخن نەدەست دێوی دێری خوو
بەد لەهجە و بەدخوو بەدزار و بەگوو
زوشت و بەقەوار سورخ و چاوکاڵی
بیبین وە هام ڕاز نەوبەر نەو نیهالی
یاران یاوەران بەچون ڕەوا بۆ
(شیرین) گرفتار دەست کەرا بۆ
هامراز بوجنی (شیرین) زولف دیز
نیشوو نەجایی (خوسرەو پەرویز)
سا چون ڕەوابوونە دەرگای داوەر
دێو وە بوستان (خورشید خاوەر)

واتاکەی:

زوڵفەکانی وەک تووڵە نەمام لەناو ڕووناکیدان
لە دەوری گۆی مانگ بڵاوبوونەتەوە
ئەگەر دەتەوێ بزانی ئەو شۆخە چی کەسێکە
گاووری بێ ئیمان و شۆخێکی سەرمەستە
(شێخی سەنعان)ی لە ئیمان بێ بەش کرد
(بەرسیس)ی پەرێشانی لە ئایین دەرکرد
ئەی نۆبەرەی نەمان وشای چاو ڕەشان
بازی شەش ڕەنگە لە (شێروان)ی ئامان
خاوەنی غەمزە و نازە، عیشوەی لە ڕووە
ماچی (شیرین)ی شای وڵاتی ئەرمەنە
هەرکەسێک ئەو لەنجەولارە ببینێ
دەربەست نییە، باکی بە قەنارەوە نییە
لە دووری ئەو، (گەنجە) و (داغستان) دڵیان داغ بووە
شۆخی بێ وێنەی وڵاتی (کوردستان)ە

مەسیحی و گاووری (تفلیس)ە
چونکە گرفتاری دەستی ئیبلیسە
دەستی خستۆتە ناو دەستی دێوی بەهێز
بەد لەهجە و بەدخوو، بەد ڕاز و بەدگۆ
زوشت و ڕەنگین و سوور و چاوکاڵە
میوەی تازە گەیشتوو و درەختی نەمام دەبن بەهاوراز
ئەی یاران! ئەی یاوەران! ئەمە چی ڕەواییێکە
(شیرین) گرفتاری دەستی سەودابێ
(شیرین)ی زلّف چین چین
لە جێی (خوسرەوی پەروێز) دابنیشێ
ئەمە چۆن ڕەواییێکە لە دەرگای دادوەر (گردگار)
دێو زەفەر بەجێی (خورشید خاوەر) ببا

مەبەسی سەرەکی شاعیر لەم لیریکەدا وەسفی دلبەرەکەیەتی، بۆ ئەم مەبەسە شیرینی خوسرەو یا شیرینی فەرهادی هەڵبژاردووە. ئەو شیرینە بەئایین گاوور و بەنەتەوە ئەرمەن یا گورج بووە. لەدوای ئەوەی وەسفێکی ئاسایی و کلاسیکییانەی خۆشەویستی دەکا، یادی ئەو خوسرەوی پەروێزەش دەکاتەوە کە گیرۆدەی دلّداریی شیرین بووە. ئینجا ناوی دلّدارانی وەکو شێخی سەنعان و بەرسیسی عابید دێنێ، ئەو حیکایەتانەی بەفراوانی لە ئەدەبی کوردیدا ڕەنگیان داوەتەوە، بەتایبەتی لای فەقێ تەیرانی شاعیری کوردستانی باکوور.

وەک ئاشکرایە ئەو شرینەی شەفیع باسی لێوە دەکا و بەئەرمەن دەیژمێرێ، یا لە گێڕانەوەی دیکە بەگورج حسێبی دەکەن، ئەرمەنستان و گورجستان هەردووکیان وڵاتێکن لە قەفقاس، لەبەر ئەوە دەبینی شەفیع لەم شیعرەیدا ناوی هەندێ شوێنی جوگرافی دێنێ لە شارانی قەفقاس، وەکو: شێروان، گەنجە، داغستان، تفلیس، ئەمانە هەموویان پێوەندییان بەو شانۆیە بووە کە وێنەی ڕووداوەکانی دلّداریی شیرین و خوسرەوی کێشاوە. سەرەڕای ئەمانەش ناوی کوردستان دەبا، چونکە لەبنجدا دلبەرەکەی کوردستانییە، ئەگەر پەیکەری لە هەر ئایینێکی دیکەی «ناموسوڵمان»، یا نەتەوەییێکی دیکەی «ناکورد» ببینرێ، ئەسڵەکەی هەر کوردە.

## پیرەدار

لەم قەسیدەیەدا شەفیع دیالۆج لەگەڵ پیرەدارێک دەکا، شاعیرانە هەستکردن بەپیریەتی بەزمانی درەختەکەوە دەردەبڕێ و ئاماژە بەلایەنێکی فەرمانڕەوایی ناوچەییێکی کوردەواری دەکا:

هەمسەران جارێ هەمسەران جارێ
ڕام کەفت وگوزەر درەختێک جارێ



درەخت چی درەخت قامەت چنارێ
بەرز بەرهەرەمەند ساوای وەن دارێ
سەر جە کەشکەڵان هەفتەمین و یەرد
ڕیشەی پا نە تەخت زەمین مەحکەم کەرد
واتم پیرەدار مەنەی هەزار ساڵ
شەرحێک جەی دەوران باوەر وە خەیاڵ
خەیلێ زەمانەن جەویر ئاوەردەن
شادیت وەزەمان کام شاهان کەردەن؟
دیم دەنگێک ئاما جەی نیگارەوە
جەی میناى شکست هەزار پارەوە
کە هیچ راویارێ لەی ڕاوو هەردە
سوئال ئی جەواب جە من نەکەردە
پەی چێش مەپەرسای دەور ئەییام
هەر لە نوێ بەدتەر کولناتۆ زامم
ئەوسا نەمام بیم توول یەک ساڵان
خزمەتم مەکەرد خواجە و غولامان
چونکە خوداوەند واستەش بی جاران
دەستەی کەناچان ڕۆیلّەی ڕەندان
شاهان سەرداران میر و بەگلەران
مەهاتنە سەهنم وە دەوران دەوران
ئیسا من پیر بیم چرۆم گشت ڕێزیا
جوانان جەسای سەحنم بێزیا
پیری کە ئامان وە پیریمەوە
هیچ نییەن وەتەنگ دلّگیریمەوە
جوانیم لوا پیریم وەجا مەند
پیری ڕیشەی من جە بنیاد هۆرکەند
تاف جوانیەکەم بەی وە دواوە
گلەی پیریەکەم مەکەم وەلاوە

ئەو ساڵە من تاف جوانیم نۆ بێ
وەسمانە قۆچاغ پادشای کۆ بێ
ترسم هەن نەفام وەنەم بۆ ئاهێر
سفتەم با بەرۆ باهێر وە باهێر
هەر بایێک بەیۆ لایێکم بەرۆ
هەر کرمێک بەیۆ وەڵگێکم وەرۆ

واتاکەی:

ئەی خۆشەویستان جارێکیان...
ڕێم کەوتە نزیک دارێک
دار چی دار باڵا وەک چنار
بەرز و بە بەهرە و بێ وێنە
سەری گەیشتبووە ئاسمانی حەوتەمینی کاکێشان
دەماری پێی لە زەویی گیر کردبوو
وتم: ئەی پیرەداری تەمەن هەزار ساڵە
باسی ئەم ڕۆژگارەمان بۆ بکە
کار و کردەوەی زەمانەت لە بیر ماوە
شادی و خۆشیت لە ڕۆژگاری کامە شاهان بووە؟
دەنگێک لەو نیگارەوە هەڵسا (پەیکەری پیرەدار)
وەک ئەو شووشە شکاوەی بووە بەهەزار پارچە
وتی: هیچ ڕێبوارێک لەم ڕێگەوبانە
پرسیاری وای لە من نەکردووە
لە بەسەرهاتی کۆن و ڕابردوومی نەپرسیوە
بۆ ئەوەی سەرلەنوێ برینم نەکولێنەوە
ئەوساکە نەمام بووم چرۆی یەک ساڵە بووم
گەورە و بچووک خزمەتیان دەکردم
چونکە جاران خوداوەند یاریدەی دەدام
دەستەی کەناچان و پۆلی کەسانی زیرەک
شاهنشاهان و سەرداران و میر و بەگلەران
لە هەموو دەورانێکدا لە سایەم دەحەسانەوە



ئێستا پیرم و هەموو چرۆکانم وەریوون
جوانان لە سایەم دوورکەوتوونەتەوە
پیری بەهانای پیریمەوە نەهاتوو
کەس بەتەنگ ئازار و ئێشمەوە نییە
جوانیم ڕۆیشت پیری مایەوە
پیری ڕیشەی منی لە بنیاد هەڵکەند
تافی جوانیم لەدواوە مایەوە
گلەیی لە پیرییەکەم ناخەمە لاوە (لە بیری ناکەم)
ئەو ساڵەی لە هەرەتی لاویەتیدا بووم
وەسمانە قۆچاغ پاشای کۆیە بوو
ترسم لەوەیە نەفامان بۆ ئاگرم ببەن
لقەکانم بابیبا یەک لەدوای یەک
هەر بایێک بێ لایێکم ببا
هەر کرمێک بێ گەڵایێکم بخوا

ئەو درەختەی شەفیع گفتوگۆی لەگەڵدا کردووە ڕەنگە پیرەدار بەڕوویێک بووبێ، ئاوڕدانەوەیێکی ژیرانە بووە کە شاعیر پیرەدارێکی هەڵبژاردووە و کردوویەتی بە بەڵگەی پیریەتی، لێرەدا مەبەسی شاعیر سەردەمی پیری خۆی و هەموو ئادەمزادێکی دیکەیە. ئەم گفتوگۆیە وێنەیێکی سیمبولی دەداتە بەرهەمەکە و دەبێتە هۆی دەوڵەمەندی ئەدەبی کوردی. قسەکانی پیرەدار ڕەنگدانەوەی ئارەزووی شاعیر خۆیەتی، واتە شەفیع دەیەوێ باس لە سەردەمی پیریەتی خۆی بکا. پیری پاش ڕۆژگاری لاویەتییە، لەبەر ئەوە درەخت دەڵێ، تا لاو بوو، سێبەر و سایەی مایەی خۆشی و شادی بوو بۆ هەموو کەسێک، کچی جوان، کوڕی قۆز، شاوگەدا، گەورە و بچووک، بەڵام کە لە جوانی کەوت هەموو ئەو خەڵکە لێی ڕەوینەوە، یا ئەو کەسانە خۆشیان پیربوون و هاتنە ڕیزی پیرەدار.

لەو شیعرەدا شەفیع بەزمانی پیرەدارەوە باس لە ژیانی خۆی دەکا و بەمە لاپەڕەیێکی مێژوو ڕوون دەکاتەوە کە دەڵێ: ئەو ساڵەی شاعیر لە هەرەتی لاویەتیدا بووە، وەسمانە قۆچاغ واتە عوسمان پاشای قۆچاغ، یا قۆچ پاشا فەرمانڕەوا بووە لە شاری کۆیە (کۆیسنجەق)، ئەم ماوەیە سەردەمی لاویەتی شەفیع بووە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەمدا.

### غەم و دڵتەنگی

شەفیع ئەم شیعرەی بۆ دەربڕینی غەم و پەژارەی ناو دەروونی تەرخان کردووە. ئەگەر بەپێی دەستووری شیعری تازە بمانەوێ ناوێک بۆ ئەم شیعرە دابنێین، بێ گومان دەبێ ناوی بنێین «غەم»، لە شیعرەکەدا دەڵێ:

سوپای غەم هوجووم ئاوەردەن ئەم شەو
ئەساسی شادیم گرد بەردەن ئەم شەو
تاڵ بیەن یەکسان ئەوقاتم ئەم شەو
سەبری سۆچنان گشت وەهەم ئەم شەو
تاکەی قامەتم خەم وەردەی غەم بۆ
تاکەی دەروونم وەغەم ماتەم بۆ
سەڵتەی سیای غەم تاکەی نەدۆش کەم
هەڵقەی نیێشی غەم تاکەی نەگۆش کەم
تاکەی بوازون ئاوات ئەو عەدەم
تاکەی میسلی غەم بکیێشۆ نەچەم
تاکەی ڕوخسارم چەنی داخ و دەرد
بگیێڵۆ وە ڕەنگ زەعفەرانی زەرد
وەی کزی دەروون هوون و هانام بۆ
هانای دەردی سەخت کەس نەزانام بۆ
فەلەک دەردی دڵ جەفای غەم تاکەی
پای شکستە و لەنگ ڕای ستەم تاکەی
بەرق تیغ جەور ڕۆژگار تاکەی
وارای سەیلی هوون هەوری تارتاکەی

واتاکەی:

سوپای غەم هێرشی کردووە ئەم شەو
هەموو خۆشی و شادیمانی بردووە ئەم شەو
هەموو کات و ساتم تاڵ بووە ئەم شەو
ئارامم هەمووی بەغەم سووتاوە ئەم شەو
لەشم بەغەم چەماوەتەوە
دەروونم بەغەم تاریک بووە
تاکەی کراسی ڕەشی غەم لەبەر بکەم
تاکەی گوارەی ئێش و ئازاری غەم لەگوێم بکەم
تاکەی ئاواتم لە گێتیی نەماندا بێ



تاکەی ئازاری غەم لەناو دیدەم بێ
تاکەی ڕوخسارم هەر داخ و دەرد بێ
وەک ڕەنگی زەعفەرانی زەردبێ
کرووزانەوەی دەروون خوێن و هانام بوو
هانای دەردێکی گرانی ئەوتۆ بوو کەس نەیدی بێ
ئەی فەلەک دەردی دڵ و جەفای غەم تاکەی
پێی شکاو و لەنگ، کردەوەی ستەم تاکەی
برووسکی تیغی زۆرداری ڕۆژگار تاکەی
بارین و لافاوی خوێن و هەوری ڕەش تاکەی

لەم شیعرەدا شەفیع حەوت جار وشەی «غەم»ی بەکارهێناوە، چونکە ماناکانی لە دەوروبەری ئەو وشەیە دەسووڕێنەوە، جگە لەوە لە شیعرەکەدا یەکێتی بابەت هەیە. وردەکارییە هونەرییەکانی لە دەوروبەری ئەو بابەتە دەسووڕێنەوە. غەم و ناسۆری دڵداری یا ژیان نیشانەی بابەتەکەیە لەناو دەروونی شاعیردا پەنگیان خواردووە و لە هەڵچووندان.

## زلێخام چون حوور

قەسیدەی «زلێخام چون حوور» لە بەرهەمە ناودارەکانی شاعیرە، زۆرجار لەناو هەندێ نێوەندی ئەدەب دۆست ڕەنگە شاعیر بەناوی قەسیدەکەوە بناسرێ، واتە شیعرەکە لە خاوەنی بەناوبانگترە:

زلێخام چون حوور زلێخام چون حوور
سەرتاپای باڵاش خاس ڕەشتەن چون حوور
لە فەرق تاریجلەین نەدارۆ قوسوور
تەبارەکەڵڵا نوورون عەلا نوور
عەکس پێشانیش بەرق وەهارەن
ئەگریجان عەقرەب گێسووش زوننارەن
ئەبروان چون سەیف دووباڵ کەمانەن
لاتەشبیە چون قەوس پای ئاسمانەن
برژانگان خەدەنگ شەڕجۆ شەڕفرۆش
عەین عەین جەیران خەواڵوو و خامۆش
گۆنای شەکەرسێو نادرەی خوونسار
قرمز هەم سفید یانێ چون گوڵنار

ئەنفەش کەشید سونع ئوستاد قودرەت
نەفەس بۆی ئەنفاس مەسیحا سیفەت
دەم دورج سەدەف دەریای عوممانی
کەیلەن جەلوئلوء چو ئاڤ نیسانی
زەنەخ زەرد وەرەق خاڵ فەیرووزەی ساف
چون پرشەی پەروین مەنمانا شەفاف
گەردەن چون بلوور سفید سادە
سافیش وە مینا سەد خەفەت دادە

واتاکەی:

زلێخام وەک حۆری وایە
سەرتاپای قەد و باڵای وەک حۆری داڕێژراوە
لە تەوقی سەریەوە تا هەردوو پێی بێ کەموکوڕییە
گەورەیی بۆ خودا نوور لەسەر نوورە
شەوقی نێوچەوانی وەک برووسکەی بەهارە
ئەگریجەی دووپشک قژی زوننارە
برۆی وەک شمشێر و لە دوولاوە وەک کەوانن
بێ بەراووردکردن وەک قەوسی ئاسمانن
(مەبەس لە یەکچوونە نەک قەوارە و گەورەیی)
برژانگی تیرە شەڕ بەئادەمزاد دەفرۆشێ
چاوی چاوی مامزە و خەواڵوو و نووستووە
کوڵمی شەکرە سێوە، سوورێکی بێ وێنەی خوێنستانە
سوور و سپییە واتە وەک گوڵنار
لووتی ڕێک و جوانی ئوستادی قودرەت دروستی کردووە
هەناسەی بۆنی هەناسەی عیسای مەسیحە
دەمی قوتووی سەدەفی زەریای عوممانە
پڕە لە مرواری ئاوی نیسان (ددانەکانی)
چەناگەی لاپەڕەی زەردە و خاڵی پیرۆزەی بریقەدارە
وەک جریوەی پەروین دەدروشێتەوە
گەردنی وەک بلووری سپی و سادەیە
لە شەوقیدا سەد خەفەتی داوەتە شووشە



لەم قەسیدەیەدا شاعیر وەسفی زلێخای یاری دەکا لە تەوقی سەریەوە تا بنی پێی. ئەم وەسفەی دەچێتە ناو وەسفی هەست پێکراوی مەتریالی ئەندامە جوانەکانی دلبەر، سۆزی دروونی و جوولەی دڵی کەم تێدایە. ئەوەی ئەم لایەنە پڕ دەکاتەوە لە بەرهەمەکەیدا ئەوەیە وێنەی جوانی لە سروشت دۆزیوەتەوە بۆ بەرامبەرکردن لەگەڵ ئەو ئەندامانەی دەیەوێ وەسفیان بکا، بەشێ لە ئەندامەکانی ئەمانەن: ئەگریجە، برۆ، برژانگ، چاو، لووت، کوڵم، ددان، دەم، چەناگە و گەردن. ئەو دیاردانەی لە سروشت وەری گرتوون لەم وێنانەدا دەبینرێن: برووسکی بەهار، دووپشک، شمشێر، تیر، مامز، شەکرەسێو، گوڵنار، زەریای عوممان، جریوەی ئەستێرەی پەروین. شەفیع ئەم دوو دیاردەیەی کۆکردۆتەوە، واتە ئەندامی لەشی خۆشەویست و وێنەی سروشت، دیارە مەبەسی شاعیر یەکەمیانە و دووەمی بۆ بەرجەستەکردنی ئەو بەکارهێناوە.

شاعیر لەسەر قەسیدەکەی دەروا و دەڵێ:

سینەش سیم ساف سافتەرەن نەعاج
خەزێنەی خەیاڵ دڵ کەردەن تاراج
جفتێ شەمامەی بن بەستی نەورەس
هێمای خەریدش نەکەردەن پەی کەس
کەف حەنا بەندە پەنجە قەڵەمکار
سەر پەنجە نە تەرز یاقووت ئاودار
کەمەربەند باریک شکەم ساف و نەرم
بەستەن وە دەسماڵ بەحوزوور و شەرم
ناف ناف ئاهوو مووشک چێش ڕێزۆ
جە یانەی دەروون غەوغا مەخێزۆ
گەنج باد ئاوەر لەپای حوجرەی ناف
قفلەش تلیسمەن جە زولمات ساف
روکبە و رجل و ساق سەر پەنجەی خوەش خەت
مەنیا وە زەمین پاوە سەد مەینەت
دارا و ئەسکەندەر پەرێش دەعواشان
خودا مەزانۆ وەکێ ڕەواشان
ئەسپەردەی بارگەی وەیس سالار بۆ
مەحفووز جە عەزاب دیدەی بەدکار بۆ
یە (شەفیع) واتەن فەبرش پڕ نوور بۆ
گۆڕش جە ئاهێر جەهەننەم دوور بۆ

واتاکەی:

سنگی زیوی سافە لە عاج (ددانی فیل) سافترە

خەزێنەی خەیاڵە دڵی تالآن کردووە

جووتێ شەمامەی سەرووی سنگی

نابێ کەس بیر لە کڕینی بکاتەوە

ناولەپی خەناوییە، پەنجەی قەڵەمییە

سەر پەنجەی (نینۆکی) وەک یاقووتە

ناوقەد باریکە، ناوکی لووس و نەرمە

لە شەرمان بەدەسماڵ داپپۆشیوە

ناوکی ناوکی مامزە موشکی لێ دەتکێ

لە یانەی دەروون ئاژاوە دەنێتەوە

ئەو گەنجینەیەی با هێناویەتی لە خوارووی قوتووی ناوکی

قفلی تەلیسمێکە وەک ئەوەی ئاوی ژیانە

ئەژنۆ و پێ و لاقی، سەر پەنجەی جوانی

بەسەد نازوفیزەوە پێ دەنێتە سەر زەوی

دارا و ئەسکەندەر لەسەری کەوتوونەتە جەنگ

خودا خۆی دەیزانێ بەکامیانی ڕەوا دەبینێ

با بە بارگەی وەیسی سالار بسپێررێ

لە چاوی پیس و بەدکار بپارێزرێ

بۆ (شەفیع) بڵێین گۆڕی پڕ نووری بێ

گۆڕی لە ئاگری دۆزەخ بەدووربێ

شاعیر لە وەسفەکەیدا لە چەناگە و گەردنی زلێخا دێتە خوارەوە بۆ ئەندامەکانی دیکەی وەک: سنگ و مەمک، دەست و پەنجە، کەمەر، ناوک، ئەندامی مێیینەی شاراوەی ژن، ئەژنۆ، لاق، پێ، بۆ دروستکردنی بۆچوونێکی شاعیرانە ئیلهام لە وێنەی ئەم دیاردانەی ژیانی ئادەمزاد و سروشت وەردەگرێ: زیوی سورمە، ددانی فیل، شەمامە، سووری خەنەیی، باریکی قەڵەمی و، موشکی ناوکی مامز، سەرچاوەی ئاوی ژیان.

لێکدانەوەی ئەو دێڕە شیعرەی شەفیع بۆ وەسفی ئەندامی مێیینەی زلێخای وتووە بەم جۆرەیە: ئەو ئەندامە بە «گەنج باد ئاوەر» دەچوێنێ، واتە ئەو خەزێنەیەی با هێناویەتی، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەفسانەیێک دەڵێ لە جەنگێکی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا (ئێران و ڕۆم)دا، با کەشتییێکی بۆ لایێکیان هێناوە باری خەزێنەی زێڕ و زیو و بەردی بەنرخ بووە، ئەو خەزینەیە کەوتۆتە لای خوارووی



قوتووی ناوکی زلێخا، قفڵی ئەو خەزێنەیە تەلیسمێکە وەکو ئاوی ژیان وایە ئەوەی لە ئەشکەوتێکی نهێنیی تاریکستاندایە.

شەفیع جوانی زلێخا دەگەیەنێتە پلەیێک دارای شاهنشای ئێران و ئەسکەندەری قەیسەری ڕۆم دەخاتە جەنگەوە لەپێناوی دەست خستنی ئەم نازەنینە، خودا خۆی دەیزانی بۆ کامەیان دەبێ، لەدواییدا زلێخا بەوەیسی قەرەنی دەسپێرێ لە چاوی پیس بیپارێزێ، لە خەڵکی دیکەش داوا دەکا بۆی بپارێنەوە لە ئاگری دۆزەخ بەدووربێ

***

میرزا شەفیعی جامەڕێزی لە ناوچەی کەرکووک و گەرمیان و گۆرانزەمین شاعیرێکی ناسراو بووە، بەرهەمی شیعری ئەم شاعیرەمان دەوری گرنگی بووە لە دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی کوردی بەوەی وێنەی شیعری تازە و ناوەرۆکی هەست بزوێنی مرۆڤایەتی داهێنەرانەی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە. لەوەپێش ئەو جۆرە داهێنانە لە ئەدەبی کوردیدا نەبوون یا کەم بەرچاو دەکەوتن.

## بەشی حەڤدەمین

## سەیدی ١٧٨٤-١٨٤٨

### ژیان و شیعر و نموونە

### ژیانی سەیدی

سەیدی ناوی محەمەد سلێمان کوڕی حاجی سەید مەحمووده، لە گوندی خانەگای نزیک پاوه لە ساڵی ١٧٨٤ لەدایکبـووه، لەناو خـەڵکی و لەنێـوەندی ئەدەبی بەنازنـاوی «سـەیدی» و «سـەیدی هەورامی» ناوبانگی دەرکـردووە. وشـەی «سـەید» لە (صـیـد)ی عـەرەبییـەوەیە بەمـانـای ڕاووشکار هاتووه، هیچ پێوەندییێکی بە(السید)ی عەرەبییەوە نییە.

سەیدی لە بابەت نازناوی خۆیەوە لە شیعرێکیدا دەڵێ:

عەرزه داشت بەندەی دڵ مەند و ڕەنجوور

(صیدی) دامی عەشق به(صیدی) مەشهوور

واتاکەی:

بەندەی دڵ مەند و زامدار پێتان دەڵێ

(سەیدی) بەدوای عەشقەوە بووه و به(سەیدی) ناوبانگی دەرکردووە.

ژیانی لە مـەڵبـەندی لە دایکبـوونی بردۆتە سـەر، سـەرەتای خـوێندن و قـۆناغـەکـانی لە حـوجـرەی مزگەوتەکانی هەورامان و شارەزوور تەواو کردووە، دوا پلەی خوێندنی زانستـییـەکانی زمانی عـەرەبی و ئایینی ئیـسـلامی لەلای مـەلا جـەلالی خـورمـاڵی بووه و لەسـەر دەسـتی ئەویش ئیـجـازەی دوازده زانستییەکەی وەرگرتووه.

لە مـاوەی خـوێندنی حوجرەی مەلایان، وەکـو هەمـوو فـەقـێـیـانی بابەتی خۆی بۆ خـوێندن گـەلێ شـوێن گـەڕاوه، لە هەورامـان و شـارەزوور لە گـوندەکـانی پایگەڵان و بیـاره خـوێندوویەتی. لەدوای خـوێندن و وەرگرتنی ئیـجازەی مەلایەتی دەگەڕێتەوه زێدی خـۆی لە هەورامانی تەخت و لەوێ نیـشـتـەجێ دەبێ و، وانەی زانستییەکانی مەلایەتی دەڵێتەوه، لەپاڵ ئەویشدا خەریکی کاری کشتوکاڵی دەبێ.

شاعـیـر ژنی هێناوه، ژنەکەی خۆشویـستـووه و شیـعری بەسەردا هەڵداوه. ئەمە ڕێگەی لێ نەگرتووه نازەنین و جـوانانی دیکەشی خـۆش بوێ وەکـو لە شیـعـریدا دەردەکـەوێ. ئەو دلبـەرانەی ئەو حـەزی لێ کردوون تەنیا بە لەش و دیمەن جوان نەبوون، ناویشیـان جوان بوو، لەوانە کچێک بەسەر دەکاتەوه ناوی نیـشـان بووه، کـچی بارام ناوێک لە گـوندی ژیوار لە هەورامـان ژیاوه، کەنیـشـکێکی دیکەی بەدڵ بووه، ناوی شیرین بووه، ئینجا شیعری بۆ دلبەرێکی تریش وتووه بەناوی ڕیۆن. ئەم وشەیە لە ڕێحانەوه بووه بە



ڕیۆن. لە هەورامـان ئەو کـچـەی ناوی ڕەیحـان یا ڕێحـان بێ (ڕیۆن)ی پێ دەڵێن، سـەرەڕای ئەم هەمـوو جوانانەی بوون بەئیلهامی شیعری سەیدی، لە لیریکی شاعیردا وەنەوشە ناوێکیش دەکا بەبووکی شیعری کوردی.

سەیدی لە تەمەنی شەست ساڵی تەریقەتی دەروێشی نەقشبەندی لەسەر دەستی شێخ عوسمانی تەوێڵە وەرگـرتووه و بووه بەخـەلیـفـەی شـێخ. پێم وایە سـەیدی ئەم تەریقـەتەی بەمـانا فـراوانەکـەی سـۆفـیـزم وەرگرتووه، واتە نزیک لە دڵداری و شیـعر و هونەر و، دوور لە تیـۆرییە بێ جووڵە و وەستاوەکـانی ڕێگە لە گـۆڕان و پەرەسـەندن و بۆ پێشـەوەچوون و دڵـتەڕی و جـوانپـەرستی دەگرن. لەبەر ئەوه هەندێ مورید و وشکە سۆفی لە هەورامـان کە سەردانی شێخ عوسـمـان دەکەن لە تەوێڵە، ئەوەی تێ دەگەیەنن کە سـەیدی بۆ تـەریقـەتی سـۆفی دەست نادا، چونکە تـەنیـا خـەریکی ئەوەیە شـیـعـر بەسـەر ژناندا هەڵبـدا. ئەم چوغوڵکردنەی وشکە سۆفیان سەیدی هان دەدا لیریکی «یا شێخ سەنعانم» بنووسێتەوه.

سـەیدی زۆربەی ژیانی لە مەڵبەندی لەدایکبـوونی لە گـوندی خـانەگـای هەورامـان بردۆتە سـەر و هەر لەوێش لە ساڵی ١٨٥٤ کۆچی دوایی کردووه.

***

زانیـاری وا لە ناوەوه هەیە گۆیا ئەو شاعـیـرەی لەم مـاوەیەدا باسی لێـوه دەکـرێ شاعـیـری دووەمـه و شاعـیرێکی پێش ئەو هەبووه بە «سەیدی هەورامی» ناسراوه، ناوی محـەمـەد سادق کوڕی سـەید عـەلی هەورامی لە سـەدەی پازدەم و سەرەتای سەدەی شـازدەم (١٤٤٦-١٥١٢) ژیاوه، ئەگـەر ئەمـه ڕاس بێ، گـومـان لەوەدا نییـە کە بەرهەمی شیـعری هەردووکیـان تێکەڵ بەیەکتری بووه. هەرچۆنێ بێ زانیـاری لە بابەت ئەو «سـەیدی»یەی لێـرەدا باسی لێـوه دەکـرێ زیاترە لە سـەیدییـەکەی دیکە. ئەگـەر بەڕاسـتـیش بەرهەمیـان تێکەڵ بەیەکتری بووبن، ئەمە کێشـەیێکی گرنگ نییـە لە مێژووی ئەدەبدا، چونکە مەبەس بەرهەمی ئەدەبییە، ئەو بەرهەمە بەناوی هەر کەسێکەوه بێ بووه بەسامانی نەتەوه.

### شیعری سەیدی

شیـعـری سـەیدی ئەوەی لەبەردەسـتـدایە بەقـەواره زۆر نییـە. لەڕووی زمـانەوه تێکەڵاوه، لەبنـجـدا بەدیالێکتی گۆرانی هۆنراوەتەوه، بەڵام کاریگەری دیالێکتی کرمانجیی باشووری بەسەرەوه دیاره. جگە لەوه لە شیعریدا دوو شێوازی کێشی عەرووزی و کێشی خۆماڵی بەکارهێناوه.

شیعری سەیدی لە ڕووی ڕووخسارەوه ڕەنگاوڕەنگ و دەوڵەمەنده، لەڕووی ناوەرۆکەوه هەمـوو بابەت و مەبەسە کلاسیکییەکانی شیعری کوردی لە بەرهەمیدا بەرچاو دەکەون.

### ڕوخساری شیعری سەیدی

بەگشتی شیعری ئەم شاعیره لەڕووی کێش و قافیەوه دەکرێ بەدوو بەشەوه:

١- شیعری خۆماڵی

زۆربەی شیعری لەم بابەتەیە، کێشی ئەم شیعرانەی سیلابی خۆماڵییە لە دە بڕگە پێکهاتووە، وەستان لە ناوەڕاستیدایە، لەڕووی قافیەوە جووت قافیەیە (مەسنەوی). لە بابەت ژمارەی دێڕە شیعری لیریکەکانەوە لە چوار دێڕە شیعر تا زیاتر لە پەنجا دێڕە شیعری هەیە، دەتوانرێ ئەم جۆرە لیریکانە بەقەسیدە ناویان ببرێ.

٢- شیعری عەرووزی

لە دیوانی سەیدیدا دەوروبەری بیست پارچە شیعر دەکەونە بەرچاو لەسەر هەندێ لە بەحرەکانی عەرووز هۆنراونەتەوە. ئەو بەحرە عەرووزییانەی شاعیر بەکاری هێناون بریتین لە هەزەج و ڕەمەل و ڕەجەز. زیاتر لە نیوەی شیعری لەم بابەتەی لەسەر بەحری هەزەجە، چوار پێنجێکی ڕەجەزە، سێ چوارێکی ڕەمەلە. بەشێکی ئەو شیعرانەی لەسەر کێشی عەرووز دانراون ئەو شیعرانەن تێکهەڵکێشیان تێدایە (تضمین)، یا ئەوانەی سێ زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی بەکارهێناوە بۆ هۆنینەوەیان، واتە مولەممەع. ئەو شیعرانەی بەکێشی عەرووزی حسێب کراون هەر نیوە دێڕێکیان ١٦ بڕگەیە، ئەگەر ئەو نیوە دێڕە کەرت بکرێ دێڕێکی هەشت بڕگەیی لێ دروست دەبێ، ئەم کێشە ئەگەرچی عەرووزیشە، بەڵام دەچێتەوە سەر کێشی هەشت بڕگەیی شیعری میللی (فۆلکلۆری) کوردی خۆماڵی، هەروەها ئەو شیعرە عەرووزییانە یەکێتیی قافیەیان تێدایە.

لێرەدا خوێنەر لەم جۆرە شیعرانەی سەیدی هەست بەقورسییێکی ڕیتمی و کێش دەکا، چونکە گوێی لەوە ڕانەهاتووە شیعری دیالێکتی گۆرانی بەکێشی عەرووز ببیستێ، جا لێرەدا لە بەرهەمی شیعری سەیدی دوو جۆرە شێواز بەرچاو دەکەوێ؛ شیعری میللی خۆماڵی و شیعری عەرووزی، گوێی خوێنەر هەست بەجیاوازی نێوانیان دەکا. ئەگەر خوێنەری شیعرە عەرووزییەکانی کە بە هەشت بڕگەیی خۆماڵی دەژمێررێن لە ڕووی ئاوازەوە هەشت کەرتی یەکەم و هەشت کەرتی دووەم بەسەریەکەوە بخوێنێتەوە وەستانێک لەنێوانیاندا دروست بکا، شیعرەکە بەڕەوانی دێتە بەرگوێ.

ئەدگارە هەرە گرنگەکانی شیعری سەیدی لەڕووی ناوەرۆکەوە دەتوانرێ لەو تێبینییانەی لای خوارەوە بەدی بکرێن:

١- سەیدی لە شاعیرە دەگمەنەکانی گێتیی گۆراننشینی کوردەوارییە، هەندێ شیعری هەیە کێشی دیکەی دەرەوەی دە بڕگەیی بەکارهێناوە، وەکو لەوەپێش ئاماژەی بۆ کرا، لەوانە شیعرێکی هەیە لەسەر بەحری هەزەج ڕێکخراوە لە هەشت دێڕە شیعر پێکهاتووە، یەکێتیی قافیەی تێدایە. ئەگەر هەر دێڕە شیعرێک کەرت بکرێ دەبێتە دوو بەیت (چوارین)، لە ڕووی کێشەوە هەشت بڕگەیی خۆماڵییە، لە ڕووی قافیەشەوە بەم جۆرەیە (ا ا ا د، ب ب ب د، حـ حـ حـ د)ە، تەنیا دوو بەیتی یەکەم نەبێ (ا ب حـ ب)یە.

ئێمە لێرەدا شیعرەکە بەپێی کێشی خۆماڵی دەنووسینەوە، واتای شیعرەکە بەناوی «هەورامی»یەوە



تۆمار دەکەین، چونکە لە «دیوانی سەیدی هەورامی» عوسمان هەورامییەوە وەرگیراوە:

مسڵموونا ئەز ئاشفتە
جە نوو جەسەم پەشێو هاڵۆ
تلێم خەستە دڵم غەمگین
چەمم هەرسین زوان لالۆ
ئەزیچ بیم یارە لەنجێڤە
ڤلێڤە سوور و سنجێڤە
زەریفە و ساوە زنجێڤە
گوڵ ئەندامە و زەریف خاڵۆ
برەم مەجنوون برەم باروم
شەرم تاکەت لوام ئاروم
جگاش ئاستۆ نەمۆ واڵوم
بێ ئادە زیندەگیم تاڵۆ
ئەگەر دووسەمکەدەم بارە
غەمیم گردی مدە و وارە
کە ڕوو شاباش و نازدارە
ئەگەر مڵکو ئەگەر ماڵۆ
گیۆ نلەم بێ ڕەها بەرشی
دە توو بوورە سەر و فەرشی
سەرەم یاونە کو لەو ئەرشی
کە ڕوو پەرواز چەنی باڵۆ
ئەز داخۆ تۆ وە دیدەم
مرووتە وەسیەتم ئیدەم
بڕینە پەی چو تەرمەم
نەمامۆ دارۆ شمشاڵۆ
مەر ئۆسا توم بلی دڵنێ
بروونەم زێد و مەنزڵنێ
کەرار دەو مەنزڵەم گڵنێ
بەیۆم سەرڤە خڕ و باڵۆ
دەرەک من ئاخری مەرگەم
ئەز توم بەوەش وەلێ دیدەم

فـيـديت بوو مـەكـوشـە (سـەيدى)
هومـــاس كـــالـّۆ هومـــاس كـــالـّۆ

واتاكەی:

موسوڵمانان پەرێشانم
لە نوێ جەستەم پەشێو حاڵە
جەرگم خەستە دڵم غەمگین
چاو پڕ ئەسرین زمان لاڵە
یارێکم بوو باڵابەرز جوان
گوڵێکی ڕەند سوور و سەبان
چەناگە سێو نەرمونیان
گوڵ ئەندام و شیرین خاڵە
بووم بە مەجنوون، بووم بە بارام
بێ شەرم و بێ وزە و ئارام
بەجێی هێشتم نەهاتە لام
بەبێ ئەو زیندەگیم تاڵە
ئەگەر دۆستم سەرێکم با
هەموو غەمم ئەدەم بە با
شاباش ئەکەم بەسەر یارا
ئەگەر موڵکە و ئەگەر ماڵە
بەنارەوا دەرچووە گیان
هەستە سەرێ بدە لێمان
سەرم با بگاتە کەشکەڵان
بنیشمە باڵ لەگەڵ باڵە
من لە سوێی تۆ هەردوو چاوم
ئەمرم سپردەی جێماوم
داری تەرمی دوا هەنگاوم
ببێ لەم داری شمشاڵە
هەر کاتێ تۆم دەرچێ لە دڵ
ببڕم هیوای ژین و مەنزڵ



هەوارم بێ چۆلی ژێر گل
بەن بەسەرما گڵ بە باڵە
خۆ من وا لە سەرەمەرگام
من تۆم خۆش بێ دیدەم بەلاّم
(سەیدی) مەکوژە سەرگەردت بام
هێشتا کاڵە هێشتا کاڵە

«هەورامی»

لە لیـریکێکی دیکەیدا لەسـەر بنجی دوو بەیت ڕێکی خسـتووە، بریتییـە لە دوازدە پارچە لە هەمـوو شیعرەکەدا کێشی هەشت بڕگەیی بەکارهێناوە ، لە ڕووی قافیەشەوە (ا ا ا م) (ب ب ب م) (حـ حـ حـ م)ە، تەنیا دوو بەیتی یەکەم نەبێ قافیەکەی (ا ب حـ ب)یە، واتە نیوە دێڕی دووەم و نیوە دێڕی چوارەم یەک قـافـیـەیان هەیە، ئەم لیـریکە دیسـانەوە بەکـێشی عـەرووزی دەکـێشـرێ و لەسـەر بەحـری ڕەجەز ڕێکخراوە:

دوســـەم لڤـــۆ ئاســـتـــوش جگا
ئاخ چێش کـەڕوو بێ یار و خـــوێم
دانیـش گـــــرد ئـێنـێ دڵمـــــەنە
هەر تـا مـــروو داغـــدار و خـــوێم
کـــەســـڵـــەم نیـــۆ یادیم کـــەرۆ
دا لیـّـڤـــە غـــەمـــخـــواریم وەرۆ
کێ شـــــیـــــوەن و زاریم کــــەرۆ
بێ کـــۆمـــەڵە و بێ یار و خـــوێم
کـــومـــیـــــۆ نەبەر یادم کـــەرە
لای دوســــــەوە دادم کـــــــەرە
بەڵکوم زەڕێو شـــــادم کــــەرە
داد و مــــــەدەد هاوار و خــــــوێم
ئەرمن گنێ چەمـڵـەم جـەمـیش
چی ئێندە کـێـشـینێ غـەمـیش
شـــەربەت وەرێنێ جـــەدەمـــیش
وێم خـاس کـەرێنێ چار و خـوێم
ڕەنگەم جـــە بەرڤـــە ســـوورەنە
بـێ دوســــە زێڵــــــەم نوورەنە

ڕازەم درازە و دوورەنە

تەن دوشتەڵە و بیمار و خوێم

هاوارەمو پەی تە زەڕین

دڵ مەجیە ئەڤدالو بەرین

وێڵ کەش و کۆ و وەرمەڕین

سەرسوومەڵە و سادار و خوێم

کەم تاڵە نۆ ئیکبالڵ خراب

کەرم سلۆم نەبرەم جواب

زێڵۆ ئەزیت کەردە کەباب

مەگنەم وەنە بێزار و خوێم

خەمڵەم فرە و شادیم کەمۆ

سینەم پەڕەن کۆنە غەمۆ

گرد دەرد دوو دووریۆ تەمۆ

زومو تەڤە یەکجار و خوێم

سابووریێ لام ئەندازکەرە

دەنگت وەشۆ ئاڤازکەرە

دا لێڤە غەمزە و نازکەرە

ئەز بوو فیدیت نازار و خوێم

تو مەی ملی یا گێو تەری

پەی چێش ترێز جە من کەری

ئیمونو من گردی بەری

بێ قەدر و سووک و خوار و خوێم

سادەم پەنە تاڵێو ڕیۆن

قیمەت شەنە کێشەم لیۆن

چی مامەڵەی مەگنوم زیۆن

گا ما وەروو ئیکرا و خوێم

(سەید) لە نو بو لەو فەقیر

ئەشقۆ جفۆنی کیرە پیر

چنگو خەمۆ ڤە وارە گیر

غەم کێشەڵە و غەمبار و خوێم



واتاکەی:

دۆستم ڕۆیشت بەجێی هێشتم

ئاخ چی بکەم بۆ یاری خۆم

هەموو داخی لە دڵمایە

تاکو ئەمرم داخداری خۆم

کەسم نەبوو یادم بکا

سا بەڵکو غەمخواریم بکا

کێ شێوەن و زاریم بکا

بێ خوێش و هەم بێکاری خۆم

خزمێ نەبوو یادم بکا

لەلای دۆستم دادم بکا

بەڵکو کەمی شادم بکا

داد و هەی داد هاواری خۆم

خۆ ئەگەر من یارم ئەدی

بۆ هێندە ئەمکێشا غەمی

ئەمنۆشی شەربەتی دەمی

گەلێ چاک ئەمکرد چاری خۆم

لەناو خوێنام ڕەنگم سوورە

بێ یاد دڵم وەک تەننوورە

بەسەرهاتم درێژ و دوورە

لەش تێکشکاو بێماری خۆم

هاوارمە بۆت ئەی ژیکەڵە

دڵ وەک دێوانە چۆڵ گێڵە

لە چیا و ئەشکەوتانا وێڵە

سەر لێشێواو ساداری خۆم

بێ ناو چاوم و بەخت خراب

سڵاوم کردی نەبوو جوواب

دڵی منت کردە کەباب

دەلێمگەڕێ بێزاری خۆم

غەمم زۆر و شادیشم کەم

سنگم پڕە لە کۆنە غەم
دەردی دووری تۆیە دەیدە
لە سوێی زامت ئێجگاری خۆم
دە وەرە لام ئەندازەت بێ
دەنگت خۆشە و ئاوازت بێ
هەمیشە غەمزە و نازت بێ
سەرگەردت بم نازداری خۆم
کە بۆ شوێنی دێیت و ئەچی
دوورە پەرێزی لێم، بۆچی
کشت ئایینم ڕائەپێچی
بێ ڕێز و سووک و خواری خۆم
تۆ پێم بەخشە جلێ ڕێحان
لە نرخیا بکێشە گیان
لەم سەودایە ناکەم زیان
بەجێی دێنم بڕیاری خۆم
ئەمن (سەیدی)م هەژار فەقیر
سەودای گەنجی وا کردمی پیر
لە دەستی غەم خواردوومە گیر
نوقمی ناو غەم غەمباری خۆم

«هەورامی»

٢- یەکێ لە دیاردە هونەرییەکانی سەیدی ئەوەیە تێکهەڵکێشی فارسی لە شیعریدا هەیە، لەو کەمتر تێکهەڵکێشی عەرەبی دەبینرێ، مولەممەعی زۆرە، بەتایبەتی زمانانی فارسی و عەرەبی لەگەڵ کوردیدا بەکارهێناوە. هەندێ جار لە لیریکێکدا تێکهەڵکێش و مولەممەع تێکەڵ بەیەکتری دەکا، لێرەدا بەڕوونی دەردەکەوێ شاعیر توانای ئەوەی هەیە گەمەی شیعری لە بەرهەمەکانیدا بکا، ئەگەرنا ئەم جۆرە شیعرانە قسە لەگەڵ چێژ و خەیاڵ ناکەن، بەڵکو ئەقڵ خەریک دەبێ گەمەکان بدۆزێتەوە.

٣- سەیدی چیرۆکی قەیس و لەیلا کە قەسیدەییێکی پەنجاویەک دێڕی شیعری دەگێڕێتەوە. ئەم جۆرە شیعرە لە لیریک دەژمێررێ، تەنیا ئەوەیە درێژە، هەرچەندە هەندێ لە مەرجەکانی چیرۆکی تێدایە، بەڵام نابێ بەچیرۆکی شیعری.

لە دیوانی سەیدی جگە لەم قەسیدەیە هەندێکی دیکەش بەرچاو دەکەون، ئەمانەش وەکو ئەوەی قەیس و لەیلا لە شیعری لیریکی دەژمێررێن، نەک چیرۆکی شیعری.



## ناوەرۆکی شیعری سەیدی

ئەگەر بەگشتی و بەسەریەکەوە تەماشای شیعری سەیدی بکرێ دەتوانرێ هەموو بابەت و مەبەسەکانی شیعری کلاسیکی کوردی تێدا بدۆزرێتەوە. سەیدی بەتایبەتی شیعری بۆ هەر یەکێک لەم مەبەسانە دانەناوە، ئەگەر لەم لایەنەوە لە بەرهەمەکانی ورد ببینەوە بەشێکی کەم لەم بابەتانە دەکەونە بەرچاومان. بەزۆری بابەتەکانی شیعری سەیدی ئایینی و وەسف بەتایبەتی دڵداری و سروشت. لەم مەبەسانە شیعری ئایینی نەبێ ئەوانی دیکەی بەزۆری ناوەرۆکەکانی سەربەخۆ نین و چوونەتە ناو یەکەوە.

مەبەسی شاعیر لە بابەتی دڵداریدا کە دلبەر و سروشت دەگرێتەوە، بەزۆری هەوڵ دەدا وێنەی مەتریالی قاڵبی دلبەر بگرێ، لە هەموو ئەم شیعرانەدا سروشتی هەورامان سەرچاوەییێکی لەبن نەهاتووە.

سروشت وەک سەرچاوەییێک بۆ داهێنانی ئەدەبی گەلێ لایەنی هەیە، هەورامان وەک وڵاتێکی کوێستانی و شاخاوی و تەڕ، هەریەکێ لە کەژەکانی ساڵ دیمەن و ئەدگاری تایبەتیی خۆی هەیە، لەناو ئەو کەژانەدا کاریگەری بەهاری ڕەنگین لە شیعری سەیدی لە کەژەکانی دیکە زیاترە، ئەمە پێوەندی بەجوانی بەهاری ئەو ناوچە شاخاویانەی هەورامانەوە هەیە.

## نموونەی شیعری سەیدی

ئەو نموونانەی لەم ماوەیەدا تۆمار دەکرێن لە کتێبی «دیوانی سەیدی - کۆکردنەوە و شیکردنەوەی محەمەد ئەمین کاردۆخی، سلێمانی، ١٩٧١» وەرگیراوون، هەروەها سوود لە لێکدانەوەی کاردۆخی وەرگیراوە لە بابەت شیعری سەیدییەوە.

-١-

لە وەسفی بەهاردا شاعیر دەڵێ:

ساقی وەهارەن ساقی وەهارەن
بولبول نە گوڵشەن گوڵ نە گوڵزارەن
فەسلی گوڵ گەشتەن چاخی وەهارەن
سەوزەش فەرش و لق شکۆفەدارەن
سوراحی لەب ڕێز ساغر ئامادەن
وەختی نۆشای مەین خاتران سادەن
ساقی خەستەی زولف عەنبەرینی تۆم
چەمە ڕای بادەی کەوسەرینی تۆم
من عەرسەی مەیدان عومرم کەردەن تەس
ساقی مەی دانت ساکەی مەبۆ کەس؟

دەخــیلم ســاقی جــەو بادەی ســەرجــۆش
جامێ مـەی پێم دەر تانۆش کـە ڕوون نۆش
با خـاتری جـە داخ دەوران شـاد کـەروون
کـۆگـای خـەرمـانان غـەم وە باد دەروون
(سەیدی) جە عەشقت ئەر سەد کە مەستەن
سـاقی پیـاڵەی تۆش ئاوات واسـتـەن

واتاکەی:

ساقی بەهارە، ساقی بەهارە
بولبول لە گوڵشەنە، گوڵ لە گوڵزارە
کەژی گوڵ و سەیرانە سەردەمی بەهارە
دەشت سەوزە دار چرۆی کردووە
سوراحی تا لێوان پڕە، پیاڵە ئامادەیە
کاتی خواردنەوەی مەی، هەنگامی دڵشادییە
ساقی نەخۆشی زوڵفی عەنبەرینی تۆم
چاوەنۆڕی بادەی مەی کەوسەرینی تۆم
من ماوەی مەیدانی تەمەنم بڕیوە
ئەی ساقی کەی کاتی مەی گێڕانت دەست پێ دەکا
دەخیلی تۆم ساقی بادەیێکم بدەیێ لەو مەیە بە جۆشە
بادەیێکم پێ بدە تا نۆشی بکەم (بیخۆمەوە)
با دڵم لە داغی دەوران شاد بکەم
کۆگای خەرمانی غەم بەبادا بکەم
هەرچەندە (سەیدی) لە عەشقی تۆ زۆر مەستە
ئەی ساقی ئاوات دەخوازێ پیاڵەیێک مەی لێت وەربگرێ

سەیدی ئەم لیریکەی بۆ وەسفی بەهار تەرخان کردووە، بەهاری بێ مەی ناوێ. ساقی یا مەیگێڕ دلبەری شاعیرە. لە ئەدەبی کلاسیکیدا مەیگێڕ کەسێکی گەورەیە، بەپێی ئەو شاعیرەی شیعرەکە دەنووسێ ئەو کەسە دەگۆڕێ، دەشێ ڕەمزی سۆفیزم بێ لە شێخێک یا کچێک یا کوڕێک ببینرێ. سەیدی لەم شیعرەدا مەیگێڕ لە خۆشەویستەکەی دەبینێ، بەم جۆرە سێ کوچکەی بەهار و مەی و کچی بەڵگەی دڵداری دروست دەکا.

سەیدی سەرخۆشی بۆ ئەوە گەرەکە فیکری لە داخی گەردوون و ڕۆژگار شاد بکاو غەم و مەینەتی لە دڵی دەربکا و بیداتە بەربا. شاعیر مەستی ڕاستەقینەی دڵداری لە مەیگێڕ (یار) دەبینێ، کە داوای



پیاڵەی مەی دەکا تەنیا لەبەرئەوەیە لە دەستی یار وەری بگرێ، ئەگینا مەستی ڕاستەقینەی لە عەشقی یار وەرگرتووە.

-٢-

لە وەسفی یاری خۆشەویست شاعیر دەڵێ:

بینایی دیدەم شـای سـۆسـەن خـاڵان
ئی دەسـتـە بەسـتـەی مـەستی گـوڵاڵان
بگـیـرە جـە دەس ئی کـەم تاڵەوە
بنیـەش بەو گـۆنای مـوشکین خـاڵەوە
گـوڵ پەی گـوڵ خـاسـەن جەمین جـامـەنی
گـوڵ بۆ گـوڵ قـامـەت گـوڵ ئەندامـەنی
شـاباشی تۆ بان گـوڵاڵانی مـەست
(سـەیدی) خـارخـاسـەن بگێـرۆ وەدەست

واتاکەی:

ڕووناکی چاوم شای سۆسەن خاڵان
ئەم دەسکەی گوڵاڵە مەستەکان
لە دەست ئەم چارەڕەشە وەربگرە
بیکە بەسەر کوڵمە بۆن خۆشە پڕ لە خاڵەکەتدا
گوڵ بۆ گوڵ دەشێ بۆ تۆی ڕوومەت ساف
بۆنت گوڵە، قەد و باڵات داری گوڵە، هەموو لەشت گوڵە
هەموو گوڵاڵانی مەست شاباشی تۆن
(سەیدی) با دڕک بەدەستەوە بگرێ

لەم شیعرەدا سەیدی قسە لەگەڵ خۆشەویستی دەکا، کەژ بەهارە، دلبەر لەناو گوڵ و گوڵاڵە نوقوم بووە. شاعیر دەستەگوڵی بۆ دەبەستێ، پێشکێش بەیاری دەکا، ڕەنگە ئەم دیارییە بەجێ نەبێ، چونکە خۆشەویست لە گوڵەکان جوانترە، لەبەرئەوەیە گوڵ و بەهار شاباشی جوانی دلبەرن، واتە گوڵ لەگەڵ گوڵان دەبێ، دڕکیش بەشی سەیدییە. لە پەندی پێشینانی کوردی پەندێک دەڵێ: «گوڵ بۆ گوڵ و دڕک بۆ دڕک».

-٣-

لەم دێڕە شیعرەدا دیسانەوە شاعیر هەر خەریکی یارە و گفتوگۆی لەگەڵدا دەکا و دەردی دڵی خۆی بۆ دەڕێژێ:

ئەرێ ڕەندەکـــــەم، ئەرێ ڕەندەکـــــەم
ئەرێ هەی نازار شـــۆخی ڕەندەکـــەم
ئەرێ نازەنین دڵ پەســـــەندەکـــــەم
تۆ هەر ئەو خـواجـە و مـن ئەو بەندەکـەم
تۆ خـۆت شـەرتت کـەرد بەینەت دارەکـەم
واتت هـەر تۆ نـی تا ســـەر یارەکـــەم
ئێســـە ســەبەب چێش ئەرێ لەیلەکـەم
مـەیلت کـەردەن سـەرد هەی بێ مـەیلەکـەم
بینایی چەمـــان بەرگـــوزیدەکـــەم
من هەر ئەو غـــولام زەڕ خـــریدەکـــەم
شـــەرتم ئەو شــەرتن هەتا من زیندەم
ددانی تەمــــای تۆ هەر نەکـــەندەم
تۆ بەدەســـتی قـەسـد جـە بەدوازەکـەم
منت بێ ناز کـەرد سـاحـێب نازەکـەم
من (سـەیدی) غـولام قـەدیم زادەکـەم
وەی من دریغـــا ســـیـــا تاڵەکـــەم

واتاکەی:

ئەی خۆشەویستەکەم، ئەی خۆشەویستەکەم
ئەی نازدار ئەی شۆخە خۆشەویستەکەم
ئەی نازەنین ئەی دڵ پەسەندەکەم
تۆ گەورەی و من بەندەی تۆم
تۆ شەرتت کرد ئەی وەفادارەکەم
وتت تا سەر هەر تۆ یارمی
ئێستاش هۆی چییە ئەی لەیلەکەم (لەیلای من)
مەیلت سارد بووە ئەی بێ مەیلەکەم
بینایی چاوان ئەی خۆشەویستەکەم
من هەر ئەو بەندەم بەپارە منت کڕیوە
مەرجم هەر ئەو مەرجەیە تا ماوم
ددانی بەتەمابوونی تۆ نەکێشم (وازنەهێنم)



تۆ بەئانقەست گوێ دەگریە بەدگۆ
منت بێ ناز کرد خاوەن نازەکەم
من (سەیدی) بەندە زادەی قەدیمی تۆم
دریغا! من چارەڕەشم

لەم شیعرەدا سەیدی گلەیی لە نازدار دەکا، لەپێشانا بەجوانیدا هەڵدەڵێ. بەگەورە و مەزن دەیخاتە ڕوو، یار بەسوڵتان و خۆی بەدیل و پێش خزمەت لە قەڵەم دەدا، لێی دەپاڕێتەوە، لەناخی دڵیەوە ئەو ڕاستییەی بۆ دەربڕێ کە وەفای بەرامبەری بێ سنوورە. لەوکاتەی بەڵێنی داوەتێ هەتاهەتایە هەر ئەو بپەرستێ، کەچی یاری نازدار بەئانقەست گوێ لە نەیار و ناحەز و بەدخوان دەگرێ و لەبەر ئەوە بێ نازی کردووە. دەبێ ئەم چارەڕەشییە لە سەرەتاوە چارەنووسی سەیدی بێ!

-٤-

لەم لیریکەدا ڕووبەڕوو لەگەڵ شیرینی یاری قسە دەکا، مەبەسی وەسفی هەندێ لە ئەندامانی دەموچاوی شیرینی جوانە، هەروەها باس لە نەرمونیانی و خووڕەوشت و شیرینی گفتوگۆی دەکا:

شـــیـرین پەیوەندەن، شـــیـــرین پەیوەندەن
دوو ئەبرۆی ســـیـــات بەهەم پەیوەندەن
دوو شـیرازەی قـەوس ئوسای غـەیب ژەندەن
هەریەک سـەد پەیکان وە جـەرگم شـەندەن
جـەو دەسـتـەی زوڵفـان حـەیران مـەندەنان
دامـــەن یا شـــامـــار یاخـــۆ کـــەمـــەندەن
خـــالی جـــەمـــینت زوڵفی چین چینت
چون دانـە و دامـــەن ســـەیادان تـەندەن
هەر تارێش ســـەد تا پێچ دان وە هەمـــدا
هەر تـارێش ســـەد دل پەنـەش پابـەندەن
ئەر من شـــەیداش بیم نەکـــەران مـــەنام
بێ حـــەد زەریفـــەن بێ ســامـــان ڕەندەن
بالآت وێنەی سـەوڵ سـای سـەهەندەی باغ
شـــۆخـــەن وەش تەرحـــەن بەرزەن بوڵەندەن
دوو دیدەی ســـیـــای فـــیـــتنە ئەنگێـــزت
سـەرمـایەی ئەفسـوون هەم جـادوو بەندەن
غـــــەمـــــزە و لارە و لـەنج دیای بـەنازت

بنچینەی یانەی سەبووریم کەندەن
گوفتوگۆی شیرین کەلامت ڕازت
شەهدەن شەکەرەن نەباتەن قەندەن
بەهای دانەی خاڵ سەفحەی جەمینت
موڵکی هیندستان شاری خوجەندەن
عومرم شی وە باد تاقیق نەزانام
بێ مەیلیت تاکەین؟ جەفات تا چەندەن؟
خواجەی ساحیب شەرت چی وۆ وەنجیانی
مەیلت، مۆبەتت، هیچ کام نەماندەن
کەی جە بەندەگیت سەرکێشان (سەیدی)
هەر غولامی تۆن، هەر تا کە زیندەن
حەڵقە غوڵامیت مەکەرۆ نەگۆش
بەندەن پێش واچە (یەکەمتەر بەندەن)

واتاکەی:

شیرین! بەیەکترییەوە بەستراو و،
هەردوو برۆی ڕەشت بەیەکترییەوە بەستراوون
دوو شیرازەی برۆت غەیب بەستوویەتی بەیەکترییەوە
هەریەکەیان سەد تیری لە جەرگم داوە
لەو دەستە بەستەی زوڵفەکانت سەرسام ماووم
ئەمە پاشای مارانە یا کەمەندە!
خاڵی کولّم و زوڵفی چین چینت
وەکو دانە و داو وایە ڕاوچییان دروستیان کردووە
هەر تاڵێکی سەد تای بەیەک داداوە (لوولی کردووە)
هەر تاڵێکی سەد دڵی پێ بەستراوە (تووشی دڵداری کردووە)
ئەگەر من گیرۆدەیان بم لۆمەم مەکەن
چونکە جوانییان بێ سنوورە، ڕەندییان بێ وێنەیە
باڵات وێنەی نەمامی سێبەری ناو باغە
جوان و خۆش ڕەنگە، بەرز و بڵندە
دوو چاوی ڕەشی فیتنە پژێنت



سەرچاوەی ئەفسوونن و پێوەندییان بەجادووەوە هەیە
غەمزە و لارولەنجەت و نوارِینی بەنازت
هەموو ئارامییێکی منیان لەبندا هەڵکەند
گفتوگۆی شیرین، وتەی ڕازونیازت
هەنگوینە، شەکرە، نەباتە، قەندە
نرخی دانەی خاڵی پەرەی کولّمت
هەموو موڵکی هیندستان و شاری خوجەندە
عومرم بەباداچوو بەڕاستی نەمزانی
تاکەی بێ مەیلی؟ جەفات تا چەندە؟
ئەی گەورەی خاوەن پەیمان، بۆ لێمان زیزی
مەیل و خۆشەویستیت هیچ یەکیان نەماوون
کەی لە بەندەییت (سەیدی) سەرکێشی کردووە
هەمیشە غوڵامی تۆیە تا لە ژیاندایە
حەڵقەی بەندەیی تۆ لە گوێی دەکا
بەندەیە، پێش خزمەتە، کەمترین دیلە

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە لە شیعری لیریکی هەموو ناوچەکانی گۆراننشین لە کوردستاندا بەدەگمەن یەکێتیی قافیە بەرچاو دەکەوێ، ئەم شیعرەی سەیدی یەکێکە لەو شیعرانەی یەکێتیی قافیەی تێدا بەکارهێنراوە، قافیەکە لەسەر دەنگەکانی (...ندەن)ە.

لەم شیعرەدا سەیدی خەریکە دوو مەبەس ڕوون دەکاتەوە، یەکێکیان مەتریالییە، خەریکی وەسفی هەندێ لە ئەندامانی لەشی دلبەرە، ئەویتریان گیانییە، لە خووڕەوشت و کردەوە و گفتوگۆ و دەم و پلی خۆشەویست دەدوێ، وەسفی برۆ و زوڵف و بسک و خاڵی کولّم و چاو و باڵا، ئینجا لارولەنجە و ڕەوتی.

شاعیر لە خاڵی دەموچاوی دەدوێ و نرخی ئەو خاڵانە دیاری دەکا، لای وایە بەخەراجی هەموو وڵاتی هیندستان و شاری خوجەندی تورکستانی کۆنی ئاسیای ناوەڕاست ئەوجا ئەو خاڵانە دەکڕڕێن. بۆ دروستکردنی وێنەی شیعری سەیدی هەوڵ دەدا گەورەیی یار و بچووکی خۆی بخاتە ڕوو، دەڵێ دیلیەتی سەیدی بۆی نەبووە بەهۆی سەرکێشی ، هەمیشە غوڵام بەندەی یارە، حەلقەی دیلیەتی لە گوێی کردووە.

-٥-

سەیدی ئەم لیریکەی بۆ «ڕیۆن»ی دلبەری وتوە:

ڕێون! داخۆ باڵا تەڤە
هەزاریۆ دەردەدارانی

من گەڕام لەلای هەموو عەتاران(دەرمان فرۆشان)
هیچ یەکێک لەم دەرمانانە نەکەوتە دەستم
ئیتر ئیختبار لە دەست تۆیە بگەرە فریام
ئەوانەی حاڵی دەردی من نازانن چی دەڵێن
من لە ڕێی تۆدا چەند جەفام کێشا

شاعیر بەخەون یەکتری بینین لەگەڵ یار دروست دەکا. لە خەونیدا هاتۆتە لای. ئەم هاتنە وەک پزیشکێکە بچێتە لای نەخۆشێک. سنگی پڕ لە زووخاو و دڵەسووتاوەکەی فەحس دەکا، حەکیمێکە وەکو ئەفلاتوون نەبزی دەستی دەگرێ و نەخۆشییەکەی دەدۆزێتەوە و دەزانێ ئازاری چییە و دەرمانی کامەیە.

لەدوای ئەمە دێتە سەر ئەوەی بە جوانی دوو لێو و چاو و گۆنا وغەبغەب و گەردن هەڵبلێ. لە پاشانا شاعیر دەڵێ لە هەموو جێیێک گەڕا، شوێن نەما نەیپشکنێنێتەوە بۆ دەرمان، کەچی نەیدۆزییەوە، تەنیا یەک پزیشکی و حەکیم هەیە ئەویش یارە، دەتوانێ دەرمانی دەردی دیاری بکا. وەک تیۆرییێک لە هەموو حاڵەتێکدا دەرمانی دەردی عاشق لای مەعشووقەیە.

## زولف و شەوبۆ

کۆماسی ئەم لیریکەی تەرخانکردووە بۆ وەسفی زولفی خۆشەویست، گوڵی شەوبۆی هەڵبژاردووە بۆ بەراووردکردن، بۆیە دە جار شەوبۆ و شەش جار زولفی لەم شیعرەدا بەکارهێناوە:

چراغم شەوبۆ، چراغم شەوبۆ
شەوێ جە شەوان چراغم شەوبۆ
هەراس بیم جە داخ شەوبۆی زوڵف تۆ
ناعیلاج چنیم دەسەی شەوبۆی کۆ
تاکە بۆی زوڵفت کەمێ بەیۆ لێش
بەڵکەم زامانم کەمتر کەرۆ ئێش
چەند وە دڵ نیام ئەو بۆیی شەوبۆ
بۆ مەدا ئەمما نەک چون زوڵف تۆ
فیدای ئەو دەس بام تۆش ئیجاد کەردەن
زوڵفانت گرەو نەشەوبۆ بەردەن
ئەر شەوبۆی زوڵفت بدەم وە شەوبۆ
دەیری بوون نە جەمع دەیریان کۆ
(ئەحمەد) تا زیندەن هەر سەرگەردانەن
پەی شەوبۆی زوڵفت وێڵ هەردانەن



واتاکەی:

ڕووناکی چاوم شەوبۆیە، ڕووناکی چاوم شەوبۆیە
شەوێک لە شەوان، ڕووناکی چاوم شەوبۆیە
هەراسان بووم لە داخی شەوبۆی زوڵفی تۆ
ناچار چووم دەستەی شەوبۆی شاخم چنی
تاکو کەمێک بۆنی زوڵفی تۆی لێوە بێ
بۆ ئەوەی برینەکانم کەمتر بە ئێش بێ
ماوەییێک بە دڵ بۆنی ئەو شەوبۆیەم کرد
کەچی بۆنی وەک بۆنی زوڵفی تۆ نەبوو
قوربانی ئەو کەسە بم تۆی دروست کردووە
زوڵفت گرەوی لە شەوبۆ بردۆتەوە
ئەگەر شەوبۆی زوڵفت بدەم بەشەوبۆ
شێت و شەیدا بم لەناو شەیدایانی شاخ
(ئەحمەد) تا زیندووە هەر سەرگەردانە
لەپێناوی شەوبۆی زوڵفت وێڵی هەردانە

لەم لیریکەدا مەبەسی شاعیر ئەوەیە تەنیا وەسفی زوڵفی یار بکا، گوڵی شەوبۆی کردووە بەسەرچاوە بۆ وێنە شیعرییە داهێنراوەکانی. سەرکەوتنی شاعیر لەو وێنە دروست کراوانەدا دەکەوێتە بەرچاو کە لە هەردوو شتدا (زوڵف و شەوبۆ) شکڵی لە یەکچوو دەدۆزێتەوە وەک ڕەنگ و بۆن و ئەدگار کە لە هەردووکیاندا لە یەکتری دەکەن.

لەو مەشقە شیعرییەدا وەکو شاعیر دەیخاتە ڕوو بەڕاستی دەبێ زوڵف ببێ بەمەبەس و بنچینە، بنەوشە لەو بکا، نەک پێچەوانە، ئەمە دیاردەییێکە لە شیعری کلاسیکی کوردیدا دەبینرێ ئەوەی لە سروشت وەردەگیرێ و ئەندامی دلبەری پێ بەرواورد دەکرێ، بێ گومان پێویستە ئەندامی وەسفکراو لە سروشت جوانتر بخاتە بەر چاو.

## شیرین و زەینەب

شاعیر ئەم لیریکەی بۆ وەسفی جوانی یار و توانا و قودرەتی داناوە، لە جوانیدا بێ هاوتایە، لە تواناادا دەیگەیەنێتە پلەی عیسای مەسیح. لە سەرەتای شیعرەکەدا دەڵێ:

شیرین زوحاکەن، شیرین زوحاکەن
مارانت چون مار دۆش زوحاکەن
سەوادی و دەیجوور چوست و چالاکەن
(لاتخف) نەخەوف مەحشەر و چالاکەن

جـەمـینش چون جـام جـەمـشـیـد داران
جـەم جـیـهـان پەرێش ئوفـتـادەی سـاران

واتاکەی:

شیرین زوحاکە، شیرین زوحاکە
مارانت وەکو ماری سەر شانی زوحاکن
ڕەشایەتی و دەیجوور چوست و چالاکن
لە ترس مەترسە مەحشەر بێ باکە
نێوچەوانی وەک جامی جەمشید وایە
جەمشید گەڕیدەی گێتی و ئوفتادەی بیابانانە

لەدوای ئەوە دەکەوێتە وەسفی یار، دەمی غونچەیی، قاووغێکی سووری وەک هەنارە، پڕە لە مرواری واتە ددانەکانی، هەناسەی بۆنی هەناسەی عیسایە، کەرامەتی عیسا ئەوە بوو مردووی زیندوو دەکردەوە، ئەم یارەی کـۆمـاسی مـردووی ڕزیوی سـەد سـاڵە زیندوو دەکـاتەوە. لێـوەکـانی دەرمـانی دەردەداران و مەرهەمی برینی برینداراانی عەشقە:

فـــەم غـــونچـــەی نازک رەوزەی ریزوانـی
کــەیلەن جـە لوولـووی مــەعـــدەن رومانـی
نەفـەس بۆی نەسـیم عـیـسـای رۆحـانـی
ئیـحـیـا کـەردەی جیـسم سەد ساڵە فـانی
شـەفـەتەین شـیـفـای دەرد بیـمـاران
مـــەرهـەم نمای زام خـــاتـر زگـــاران

واتاکەی:

دەم غونچەی ناسک و ڕەوزەی ڕیزوانییە
پڕە لە مرواری لەناو قاووغی هەناری
هەناسەی بۆنی شنەبای ڕۆحانیەتی عیسایە
لەشی سەد ساڵەی ڕزیو زیندوو دەکاتەوە
دوو لێوی شیفای دەردی دەردەدارانە
مەرهەمی برینی دڵشکاوانە

بەم جۆرە کۆماسی لەسەر وەسفەکانی دەڕوا و بەم دێڕانە کۆتایی بەلیریکەکەی دێنێ:

باڵ وە باهووبەند سـەدر و جـیـد و مـەم
چون چ چـراغـــان شــەوق دادەن بـەهەم



ناف توحـفـەی دەست حـوکـەمـای نەدیم
مـاددەی مـەعـجـوومـات ئەرەسـتـۆی قـەدیم
وەلحـاسـیڵ نە فـەرق تا کـەعـبی ریجلەین
عــەیب تێـــدا نەدیم بەگـــەردەنم دەین
غـەرەز کـەس نەدیم وەی شـێـوە و تەرتیب
مـەر زەینەب نەسـای رەخش ئەو ڕەنگ زیب
پاشـا بەحـاجـەت شـای بوراق سـوار
شـیـرین مـەحـفـووز کـەی نەدیدەی بەدکـار
(ئەحـمـەد) تا زیندە هەر دوعـا گـۆتەن
مـەدهۆش شـەمـیم عـەتر لیـمـۆتەن

واتاکەی:

شان و باهوو و مل و سنگ و مەمک
وەکو جلچرا شەوق دەدەن بەیەکتری
ناوکی یار توحفەی دەستی حەکیمی هاودەمە
دەسکەوتی بیری ئەرستۆی دێرینە
بەگشتی لەتەوقی سەریەوە تا بنی هەردوو پێی
عەیبم تێدا نەدی ئۆباڵت بەملم
بەڕاستی کەسم نەدیوە بەو شێوەیە دروست بووبێ
مەگەر زەبنەب لە سایەی ڕەخشی ئەو ڕەنگ جوانە
ئەی شا بۆ خاتری شای بوراق سوار
شیرین بپارێزی لە چاوی بەدکار
(ئەحمەد) تا زیندووە هەر دوعات بۆ دەکا
مەدهۆشی بۆنی خۆشی لیمۆکانتە

کۆمـاسی لەم بەشـەی شیـعرەکـەیدا لەسەر وەسف بەردەوام دەبێ، باس لە شان و باڵ و مل و سنگ و مـەمک دەکـا، دێتـە خـوارەوە تا دەگـاتە ناوکی، ئەمـەیان ئەوەندە پڕ لە نهـێنی و ئەفـسـانەیە، کـردەوەی ئەرستۆیە بەتیـۆریکانی ئەو نەبێ تەلیسمی ناشکێ. شاعیر سەری سوڕ دەمێنێ لەوەی کەسی نەدیوە لە بێخەوشیدا بگاتە ئەو دلبەرە خۆشەویستە مەگەر «زەینەب» نەبێ. ناوهێنانی زەینەب کارێکی چاوەنۆڕ نەکراوە، ئێمە بیرمان بۆ هیچ شتێک ناچێ جگە لەوەی ئەم «زەینەب»ەش یەکێکە لە یارەکانی شاعیر و بەهۆی ئەم شیعرەوە دەبێتە یەکێک لە بووکە زۆرەکانی شیعری کوردی. خۆ لە شیعرەکەدا لەگەڵ ئەوەی

کۆماسی ئەم ناوە تازەیەمان بۆ ئاشکرا دەکا قارەمانی بنچینەیی شیعرەکە تەنیا شیرینە.

## تۆبە و پەشیمان بوونەوە

لە سەردەمی پیری و لە دوارۆژانی ژیانی کۆماسی تۆبە دەکا و پەشیمان دەبێتەوە لە هەندێ لایەنی ئەو دڵدارییەی لە ژیانیدا کردوویەتی، لەم لایەنەوە دەڵێ:

فەلەک بەردەنم، فەلەک بەردەنم
راسەن سوجدەی دەیر تەرسا بەردەنم
مەی نەپای میحراب مەسجید وەردەنم
تەحدید مەزهەب عیسا کەردەنم
گرتەنم نەدۆش خەرقەی روهبانان
کێشانم جا رووی فەرش بتخانان
فتوای بەرهەمەن گرتەنم نەگۆش
دینم دان وە مەی جە لای مەی فرۆش
ئانە گشت جە وەخت نادانیم بیەن
فەسڵ و سەرمەستی و جوانیم بیەن
ئیسە ها جە گشت پەشیمانیم یەرد
وادەی پیریمەن جوانیم و یەرد
وادەی پیریمەن یاوانم نۆبە
نۆبەی تۆ بەمەن کەرەمدار تۆبە
ئومێدم ئیدەن وەنەم نەگیری
بویەردی نەجورم وادەی کەم ویری

واتاکەی:

فەلەک کردوومە، فەلەک کردوومە
ڕاستە نوێژم لە دێری تەرسا کردووە
شەرابم لەناو میحرابی مزگەوت خواردۆتەوە
بەڕاستی چوومەتە سەر ئاییینی عیسا
جلوبەرگی روهبانانم لەبەر کردووە
فەرشی بوتخانانم گەسک داوە
فەتوا و دەستووری بەرەهمەنم کردۆتە گوێ



ئاییینم بە شەراب فرۆشت لەلای مەیفرۆش
ئەمانە گشتیان لە سەردەمی نەزانینم بوو
کاتی سەرمەستی و شۆخیم بوو
ئێستا لە گشت ئەمانە پەشیمانم
سەردەمی پیریمە و ڕۆژگاری جوانیم ڕۆیشت
سەردەمی پیریمە، کاتی ئەوە هاتووە
تۆبە لە کەرەمدار داوا بکەم
هیوام وایە لێم نەگرێ
لە هەموو گوناهەکانم خۆش بێ

لەم شیعرەدا کۆماسی بەخەیاڵ لە مێشکیدا هەندێ کردەوە دروست دەکا، هەوڵ دەدا ئەو کردەوانەی لێی رووی داوە بەخەڵکی بگەیەنێ. لێ روو داوە. وێنە شیعرییەکانی پێوەندییان بەسۆفیزمی کوزمۆسییەوە هەیە، زیاتریش ژیانی سۆفیزمی شێخی سەنعان. کۆماسی ئەوە دەخاتە بەرچاو نوێژی لە کەنیسەی گاوران کردووە، خاچی لە مل کردووە و جلوبەرگی روهبانی پۆشیوە و گەسکی لە دێری دیانان داوە لەسەر ئاییینی بەرەهمەنی خودایانی هیندۆسەکان بووە. لەم کردەوانە پەشیمان دەبێتەوە.

هیچ زانیارییێک لەناوەوە نییە کۆماسی ئاگاداری سۆفیزم بووبێ وەک ئیدیۆلۆجییەت ، هەروەها لەو شیعرانەی ئێستا لەبەردەستدان شایەدی ئەوە نادەن بەرهەمی شیعری ئەم شاعیرەمان پێوەندی بەسۆفیزمەوە هەبێ. مەسەلە ئەوەیە بەخەیاڵی شاعیری سۆفیزمی داوەتە پاڵ خۆی و وەکو هەموو شاعیرێکی داهێنەر ئەم پارچە شیعرە جوانەی هۆنیوەتەوە.

## گلکۆی تازە لەیل

لەم ماوەیەدا پەنجاودوو دێڕە شیعری ئەم لیریکە بڵاو دەکرێتەوە، ئەمە تەواوی تێکستی بەرهەمەکەی کۆماسییە کە ئێستا گەیشتۆتە دەستمان و هەموو هەڵسوکەوت و بینای ناوەوەی شیعرەکە ئەوە دەگەیەنی هەر ئەوەندە بێ.

ناوبانگی ئەم شیعرە هەموو کوردستانی باشوور و هەرێمەکانی گۆراننشینی گرتۆتەوە، لەناو دەسنووسی جیاوازدا دەکەوێتە بەر چاو، لە زاری خەڵکێکی زۆرتر بەگوێ دەبیسترێ، تا وای لێ هاتووە شیعرەکە بخرێتە پاڵ شاعیری دیکەی کورد و لەناو دیوانەکانیاندا تۆمار بکرێ. زۆربەی سەرچاوەکانی لایەنی ئەوەن بەرهەمەکە لە شیعری کۆماسییە. بێ گومان فراوانی ناوبانگی لیریکەکە لە کوردستاندا بۆتە هۆی ئەوەی دەنگوباسی شیعرەکە بگاتە ئەوروپا. لە سەرەتای سەدەی بیستەم کوردناسی رووس ڤلادیمیر مینۆرسکی تەواوی تێکستی ئەم شیعرەی دەستکەوت لەپاشانا لەگەڵ لێکۆڵینەوەییێک بڵاوی کردەوە. بیروڕای زانای رووسی لە بابەت شیعرەکەوە ئەوەیە گۆیا شاعیر لە خوێندەواریدا پلەی بەرز نەبووە، کەچی ئەم شیعرە جوانەی بۆ هاتووە، لەلایەن مانا و بۆچوونی شیعرەکەوە مینۆرسکی دەڵێ،

هەستی ساکارە، بەڵام بەهێزە، خەیاڵی ناوەوەی بەڕاستگۆیی دەردەبڕێ بەبێ ئەوەی ناوەڕۆکی لاهووتی یا ئەفسانەیی تێدا بێ. هەروەها لەسەر ئەو باوەڕەیە کە سامانی ئایینی ئیسلامی کۆمەڵی ئیسلام کاری لێ کردووە و بەسەرهاتی لەیلا و مەجنوون وەک ڕەمزێک هاتۆتە ناو شیعرەکەیەوە.

ئەوەی لە بابەت ژیانی دڵداری کۆماسییەوە دەگێڕنەوە ئەوەیە حەزی لە کچێک کردووە ناوی «شیرین» بووە. لە دواییدا خواستوویەتی و ماوەیێک لەگەڵ یەکتریدا ژیاون. خێزانی خۆشەویستی شاعیر پێش وادە جوانەمەرگبووە، ئەمە بۆتە مایەی غەم و پەژارە بۆ کۆماسی.

لە لیریکەکەی شاعیر ئەوە دەردەکەوێ لاواندنەوەییێک بێ لەسەر گۆڕی خۆشەویست کردبێتی. سەرەتا بەم شیعرانە دەست پێ دەکا:

گڵکۆی تازەی لەیل، گڵکۆی تازەی لەیل
ئاوریشم وەسەر گڵکۆی تازەی لەیل
نەپایەی مەزار ئەو لەیل پڕ مەیل
جەدیدەم واران ئەسرینان چون سەیل
شەم وە سەرینەش وە دڵەی پڕ جۆش
سنگە مەزارەش گرتم وە باوەش

واتاکەی:

گۆڕی تازەی لەیل، گۆڕی تازەی لەیل
ئەمڕۆ چوومە سەر گۆڕی تازەی لەیل
لەسەر مەزاری ئەو لەیلەی زۆر خۆشەویست
فرمێسک لە چاوم وەک لافاو هاتە خوارەوە
چوومە سەر سەرینی بەدڵێکی پڕ لە جۆشەوە
هەموو گۆڕەکەم گرتە باوەشمەوە

لەم دێڕانەدا شاعیر دڵتەنگی و گڕژی ناو دەروونی دەردەبڕێ، یادی ڕۆژانی دڵداری دەکاتەوە، گۆڕی لە خاک و خۆڵ دروست بوو دەگرێتە باوەش، چونکە بۆنی لەیلی لێ دێ. بەم ڕەنگە لەسەر شیعرەکەی دەڕوا:

واتم ئەی دڵسۆز قەیسی لونگ وەکۆڵ
موبارەکت بۆ یانەی بیدی چۆڵ
سەر هوردار نەخاک سەوڵی خەرامان
من مەجنوونی تۆم وەی تەور پێم ئامان
کۆچی بێ وادەت کاری پێم کەردەن



بێزارم جە گیان ڕازیم وە مەردەن
گەرەی ناری عەشق دووری باڵای تۆ
کاری پێم کەردەن نەونەمامی تۆ
وەختەن چون قەقنەس تەن بو وە زوخاڵ
شاد بو بەگەردم زەلان یا شەماڵ
یاخو بەوێنەی قەیسی لونگ وە کۆڵ
تەن بووە خۆراک وەحشیانی چۆڵ
سەوگەن بەو خالان فەیرووزەی خۆش ڕەنگ
بەو دەستەی زولفان پەشیویای پای سەنگ
جەوساوە گەردش چەرخی پڕ ستەم
من و تو وە جەور جیا کرد جە هەم
تو بردەن وە خاک سیای تەنگی تار
من مام پەی ئازار جەفای رووزگار
هەر ڕۆ چون مەجنوون خاتر جە غەم کەیل
هەر لەیل لەیلمەن نەهەردەی دوجەیل
غەمان پەژاران رەفیقی ڕامەن
چە نێو جەفا و جەور دایم سەودامەن
سوپای غەم بەی تەور هجووم ئاوەردەن
قافلەی فامەم بەتاراج بوردەن
زامتان سەخت ئەی دڵەی پڕ ئێش
چون جای ماران گاز زووخاو مەیو لێش
شەو کەیلەن زووخاو وەلای جێمەدا
کافر بەزەییش مەیۆ پێمەدا
یانەم وێرانەن دەردم دێویان
چون ئاهووی تەنیا سەر لێم شێویان
شەوان زاری و شین، ڕووان ڕۆ ڕۆمەن
یەکجار وەسواسەی تەنیایی تۆمەن

واتاکەی:

وتم ئەی قەیسی دڵسۆزی کەوڵ لە کۆڵ
ماڵی ئەم بیابانە چۆڵەت لێ پیرۆز بێ
سەرت دەربێنە لە خاک ئەی دارگوڵی نازدار
من مەجنوونی تۆم بزانە چیم بەسەر هاتووە
کۆچی بێ وەعدەت کاری لێم کردووە
لە گیان بێزارم، ڕازیم بەمردن
گڕە ئاگری عەشق لە دووری باڵای تۆ
نەونەمانی تۆ کارێکی گەورەی لێم کردووە
وەختە وەک قەقنەس لەشم ببێ بەزوخاڵ
بای ڕۆژهەڵات و باکوور بە گەردم (تۆزم) شاد دەبێ
وەکو قەیس کەوڵ بەکۆڵمەوەیە
لەشم بوو بەخۆراکی وەحشیانی چۆڵ
سوێند بەو خاڵە پیرۆزەییبیە ڕەنگینانەت دەخۆم
بەو دەستە زوڵفانەی لەسەر بەردی ژێر سەرت بڵاوبوونەتەوە
لەوساوە گەردوون و چەرخی پڕ ستەم
من و تۆی بەزوڵم لە یەکتری جیا کردەوە
تۆی بردە ناو خاکی ڕەش و تەنگ و تاریک
من بۆ ئێش و ئازار و جەفای ڕۆژگار مامەوە
هەموو ڕۆژێ وەکو مەجنوون دڵم پڕ لە غەمە
هەر لەیلە لەیلمە لە هەردەی دوجەیل
غەم و پەژارە ڕەفیقی ڕێگەی منن
لەگەڵ جەفا و جەور هەمیشە لە مامڵەدام
لەشکری غەم بەم جۆرە هێرشی کرد
قافڵەی فامی بەتاڵان برد
برینت سەختە ئەی دڵەی پڕ ئێش
وەک جێی مارانگەست زووخاوی لێ دێتەخوارێ
شەو جێگەم پڕ لە زووخاو دەبێ
کافر بەزەیی پێم دێتەوە
ماڵم وێرانە دەردم دێوییانەیە



وەک مامزی تەنیا سەرم لێ شێواوە
شەوان گریان و شینمە، بەڕۆژ ڕۆڕۆمە
یەکجار وەسواسەی تەنیایی تۆم

شاعیر لە گێتیی ناخۆشیدا دەژی، ڕووناکی لێ بووە بەتاریکی، چونکە لەیلای لەناو تاریکستانی گۆڕ سەری ناوەتەوە، چۆڵ و بیابان بووە بەزێد و مەنزڵی، داوا لە خۆشەویست دەکا سەری لە گۆڕدا دەربێنێ و چاوی بە عاشق بکەوێ بۆ ئەوەی بزانێ چی بەسەر هاتووە. بەڵام وەرام نییە! شاعیر سوێند بە خاڵە پیرۆزەی و زوڵفی دەخوا ئەوانەی لەسەر بەردی ژێر سەری بڵاوبوونەتەوە.

کۆماسی دەڵێ لەو ساوە نازدار لێی ون بووە وەکو مەجنوون وێڵی دەشت و بیابانە. شاعیری ئێمەش وەکو قەیس لە دەشتی دوجەیل دەسووڕێتەوە، ئەو دوجەیلەی بووە بەشانۆی دڵدارانی گێتیی خۆشەویستی . کۆماسی لە هەموو شتێک زیاتر غەم و پەژارەی لەبەر ئەوەیە لەیلای شەو بەتەنیایە.

شاعیر لە لیریکەکەی بەردەوامە و دەکەوێتە پرسیار لە پاڵکەوتووی ناو گۆڕ:

حــاڵـی تۆ چیــشــەن شــای وەفــاداران
کــێـن هـامـــڕازت ســـوبح و ئـێـــواران
نەوسـرای تاریک پڕ خــەوف و خــەتەر
مــــــەدارات چۆنـەن لـەیـلـی نـاز پـەروەر
چ تـەور مــــوورێـای چۆنـن قــــەرارت؟
کــێن هاورەفــــیــقی لەیل و نەهارت
نەو سـاردی هەوای سـەردی سـیـاسـەنگ
چ تەورەن خـاڵان فـەیرووزی وەش ڕەنگ
جـە باتی باهووی قـەیسی غـەمگینت
کـام سـەنگی سـیـاه هان جـە بالینت

واتاکەی:

حاڵی تۆ چۆنە ئەی شای وەفاداران
کێ هاودەمتە بەیانی و ئێواران
لەو جێیە تاریک و پڕ ترس و خەتەرە
حاڵت چۆنە ئەی لەیلی نازدار
چۆن ڕادەبوێری، وەزعت چۆنە
کێن هاودەم و ڕەفیقی شەو و ڕۆژت
لە ساردی هەوای بەردە ڕەشەکەت

خاڵە پیرۆزەییە ڕەنگینەکانت چۆنن؟
لەباتی قۆڵی قەیسی غەمگینت
کامە بەردی ڕەش بووە بەسەرینت

لەم چەند دێڕەدا شاعیر کۆمەڵێک پرسیار لە دلبەر دەکا، وەرامی پرسیارەکان لەناو خۆیاندا دەدۆزێتەوە، وەکو ئەوەی دەڵێ: کێ هاودەمتە لەو جێیە تاریک و تەنگەبەرە، چۆن ڕادەبوێری، لەباتی قۆڵی قەیس کامە بەرد بووە بەسەرینت!

لەدوای ئەم پرسیارانە کۆماسی لەسەر لاواندنەکەی دەڕوا:

داخم ئەو داخـــەن لەیلی خـــاتر تەنگ
ئەو دەستەی زولفان پەشێویای پای سەنگ
وە چنگی چل چنگ تۆ تاتات مـــەکـــەرد
ئێســتــا پەشـێــوان چون ڕەیحـانەی هەرد
ئەو دیدەی مـــەخـــمـــوور ئاهوو بێـــزی تۆ
ئەو قـــەیسی قـــەتران شـــەر ئەنگێـــزی تۆ
ئێـــســتـــا نەگـــەردش چەرخی نیلی ڕەنگ
بێ ڕەونەق بیەن چون نەقشی ڕووی سەنگ
ســـایەی چیش ســـۆمـــای دیدەم تار نەبوو
زنـدەگی جـــــەلام ژاری مـــــــار نـەبوو
تۆ خـــەریکی قـــەبر ســـیـــای ســـەردەنی
تەمـــــام حـــــەســـــرەتـان وە دڵ بەردەنی
من تەنیـا چون قـەیس لیـوەی غـەم خـەلات
زندە مـــەگـــیلوم نەڕووی ســـەربســـات
وەلحـاســـیڵ هەرچەند شین و زاریم کـــەرد
نەپای قـــەبری لەیل بێ قـــەراریم کـــەرد

واتاکەی:

داخم ئەو داخەیە لەیلێ دڵتەنگە
دەستەی زوڵفی شێواوە لەسەر بەردی سەرینی
بەچنگی چل شانە زوڵفت شانە دەکرد
ئێستا شێواوە وەک ڕەیحانەی هەرد
ئەو چاوە مامزییە خەواڵووانەی تۆ



لەگەڵ قەیسی قەتران دەکەونە جەنگەوە
ئێستا بەهۆی چەرخی گەردوونی خماوی
بێ ڕەونەق بووی وەک نەقشی سەر بەرد
لەبەرچی سۆمای چاوم تاریک نەبێ
ژیانم لەلات وەک ژاری مار نەبێ
تۆ خەریکی قەبری ڕەشی ساردی
هەموو حەسرەتەکانت لەگەڵ دڵی خۆتا برد
من تەنیا وەک قەیسی لێو بەبار
بەزیندوویی لەسەر ڕووی زەوی وێڵ و سەرگەردانم
لە ئەنجامدا گەلێک شین و گریانم کرد
لە تەک گۆڕی لەیلا بێ قەراریم نواند

لەو دێڕە شیعرانەدا وەسفی بسکی لوولی شانەکراوی خۆشەویست دەکا، چۆن لەسەر ئەو بەردەی ژێر سەری شێوا و پەرشوبڵاوە، ئەو چاوە مامزییە خەواڵووەی لەگەڵ قەیسی ڕەش پۆش هەمیشە لە جەنگدا بوون، ئێستا بێ ڕەونەق ماونەتەوە. شاعیر پرسیار دەکا، بۆ بەجێی هێشت؟ بۆ هەموو ئامانجەکانی بردە ناو گۆڕەوە؟ بەم شێوەیە کۆماسی لە شیعرە لیریکە لاواندنەوەکەی بەردەوامە و دەڵێ:

نەجـــــوا و دا پێم نەزەڕڕە دەنگ کــــەرد
یەکــجـار بلێـــســەم جـە گــەردوون وەیەرد
دیســـــان هەم جـــەنوو واتم: ئەی دڵســـۆز
حـەکـــیـمی دەرمـــان دەردی مـەجنوون دۆز
یانی چیش مـــەیلم جـە لات کـــەم بیـــەن
مـــەر عـــەهدی وەرین جـــە یادت شـــبـــەن
مـن وەی دڵـەی خـــــار بێ قــــــەرارەوە
وەی جـامـــەی ســیـــای یەخـــە پارەوە
هـام نە ســــــــەرینت زار زار مـــــــەناڵۆ
خـــاکی یانەی نوێت وە چەم مـــەمـــاڵۆ
تو هیچ نیت وە قـــەید بێ قـــەراری من
جـــە ئاڵوودەی ســـەخت شین و زاری من
نمەدەی جـوا و خـاڵ نوخـتـــەی بێ گــەرد
مـەعلوومـەن جـەلات مـەیلم بیـەن سـەرد

واتاکەی:

نەوەرامی دامەوە و نەدەنگی لێوە هات
بەتەواوی بلێسەی عەشقم لە گەردوون تێپەڕی کرد
دیسانەوە لە نوێوە وتم: ئەی دڵسۆز
ئەی حەکیمی دەرماندەری مەجنوون
مانای چییە مەیلت بۆ من لەلات کەم بووە
مەگەر پەیمانی دێرینت لە بیر چۆتەوە
من بەو دڵە دڕکاوییە بێ ئۆقرە و قەرارەوە
بەم کراسە ڕەشە یاخە دڕاوەوە
وا لەسەر سەرینت دەگریم و دەناڵێنم
خاکی ماڵە تازەکەت بەچاو دەماڵم
تۆ بێ باکی لە بێ قەراری من
لە حاڵی سەخت و شین و گریانی من
وەرام نادەیەوە، ئەی خاوەن خاڵی نوختەی بێ گەرد
وا دیارە مەیلت بەرامبەر بەمن سارد بۆتەوە

شاعیر دڵتەنگە لەوەی خۆشەویست وەرامی ناداتەوە، بۆیە ناچار دەبێ زیاتر لێی بپاڕێتەوە، چونکە دەرمانی دەردی تەنیا لای ئەو چنگ دەکەوێ . گلەیی لێ دەکا! بۆ مەیلی جارانی نەماوە و پەیمانەکانی لەبیر خۆی بردۆتەوە. لەم ماوەیەدا کۆماسی وێنەی شیعری جوان دروست دەکا کە دەڵێ: من بە دڵی دڕک ئاژەنکراومەوە، بەبەرگی ڕەشی ماتەم و یاخەی دڕاومەوە، لەسەر سەرینت دەناڵێنم، خاکی ناو ماڵە تازەکەت (گۆڕت) بەچاو دەماڵم، بۆچ وەرامم نادەیەوە!

ئەم جارەیان خۆشەویست لەناو گۆڕەوە دێتە دەنگ و وەرام دەداتەوە:

دیم سەدایی نەرم جە تۆی خاکەوە
جەو یانەی تازەی حەسرەتناکەوە
ئاما وە گوشم چون هەردە جاران
واتش: ئەی مەجنوون وێڵی کۆساران
سەوگەند بەواحید فەردی بێ هەمتا
بێ وادە کەردەن من جە تۆ جیا
ڕای جواو نیەن دڵ بێ قەرارەن
فرە سەنگ و خاک وە جەستەم بارەن



جە تەئسیری خاک، هەوای سەردی سەنگ
ڕێی جواو نیەن چەنیت کەرۆ دەنگ
خانەی خاک وەی تەور مەحبووسم کەردەن
نازارانی ویم جە یادم بەردەن
بەڵێ، هەر چەن شین زاری مەکەری
هەر چەن سەر وەسەنگ سیامەدەری
فایدەش نیەن سوود نەدارۆ پێت
بشۆ! زاری کەر پەرپۆ بەختی وێت
پەی چیش؟ ئەی دونیا خەیلی بێ وەفان
جە نەخوەی وەفاش دایم هەر جەفان
کەس جە قەیدی دام مەکرەش نەرستەن
یەک یەک وە زنجیر عەیارش بەستەن

واتاکەی:

گوێم لە دەنگێکی نەرم بوو لەژێر خاکەوە دەهات
لە خانووە تازەی پڕ لە حەسرەتەوە
دەنگ کەوتە بەرگوێم وەکو جارانی پێشوو
وتی: ئەی مەجنوونی وێڵی ناو شاخەکان
سوێند دەخۆم بەتاکی فەردی بێ هاوتا (خودا)
وەختی خۆی نەبوو منی لە تۆ جیاکردەوە
ڕێی وەرامدانەوە نییە، دڵ بێ قەرارە
بەرد و خۆڵێکی زۆر لەسەر لەشم بارکراوە
لەبەر کاری خاک و هەوای ساردی بەرد
ڕێگەی وەرامدانەوە نییە هەرچەند دەنگیشم لێوە بێ
ماڵی ناو خاک (گۆڕ) بەجۆرێ بەندی کردووم
نازدارەکانی خۆمی لەیاد بردوومەتەوە
ڕاستە، هەرچەندە شین و گریان بکەی
هەرچەندە بەردی ڕەش بماڵی بەسەرتا
کەڵکی نییە، سوودت ناداتێ
برۆ بۆ بەختی خۆت بگری

لەبەرچی ئەو دونیایە زۆر بێ وەفایە
لەباتی وەفا هەمیشە هەر جەفایە
کەس لە بەند و مەکر و داوی ڕزگاری نەبووە
یەکە یەکە هەمووی بەزنجیری فێڵ و عەیاری بەستۆتەوە

لە دوای پاڕانەوەییێکی بەکوڵی شاعیر، دلبەری ڕاکشاوی ناو گۆڕ دێتە قسە و وەرام دەداتەوە، بەشێوەییێک قسە دەکا بەدڵی شاعیر بێ، دەڵێ: «هێشتا زوو بوو بۆ جیابوونەوەمان، ئەوەی هەستی پێ دەکەم ناتوانم بیخەمە سەر زارم و دەری ببڕم، چونکە باری لەشم قورسە، گۆڕی تەنگ و تاریک هەموو شتێکی لەبیر بردوومەتەوە تەنانەت نازدارەکانیش، گەردوون بێ وەفایە هەموو کار و کردەوەییێکی مەکر و فێڵ و عەیارییە».

کۆماسی شیعرە ماتەمی و لاواندنەوە بەرزەکەی بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

جـە ئەووەل دونیـا تا وەڕووی مـەحـشـەر
هیچ کـەس جـە دامـەش بەرنەشی وەبەر
هەر کـەس دڵشـاد بۆ وەی دونیـای بێ بۆ
ئاخـر سـەرەنجـام ڕەنجـەڕۆ مـەبۆ
هـەرچـەنـد پـەرپـۆ مـن تـۆ ئـەلـوەداتـەن
ئاخـر سـەرەنجـام ئەی جـاگـە جـاتەن

واتاکەی:

لە سەرەتای دونیاوە تا ڕۆژی حەشر
هیچ کەسێک لەداوی (گەردوون) ڕزگاری نەبووە
هەر کەسێک دڵی شاد بێ بەم دونیای بێ تام و بۆیە
لە ئەنجامدا ڕەنجەڕۆ دەبێ
هەرچەندە گریان و ئەلوەداعی بۆ بکەی
لە ئەنجامدا ئەم جێگەیە دەبێتە جێی تۆ

کۆماسی ژیرانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ، وەکو دانایێک دەکەوێتە بەرچاو، ئامۆژگارییەکانی دیارە بۆ خۆشەویستی خەو لێ کەوتووی ناو گۆڕەکەیە، کەچی هەر کەسێکی ئەم ئامۆژگارییانە ببیستی وناگزوورییێک لە ژیانی و شۆرشێک لە مێشکیدا هەبێ گوێی بۆ شل دەکا و باوەڕی پێ دێنێ. بەلای شاعیرەوە ئەنجامی هەموو کەسێک ئەو گۆڕەیە کە دەبێتە ماڵی دوایی و هەمیشەیی، ئەگەر ئەو ئەنجامە بۆ خەڵکی دڵگرانی بێ، بۆ شاعیر دڵ خۆشکەرەوەیە، چونکە دەچێتە لای لەیلای خۆشەویستی لەم گێتییەی تا سەر لەگەڵی نەبوو، لەو گێتییە جاویدانییە پێکەوە دەبن.

***



ئەحمەد بەگی کۆماسی لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا بەخاڵۆی کۆماسی ناوبانگی دەرکردووە. ئەم ناوە شەرەفێکی گەورە و جێی شانازییە بۆ شاعیر، چونکە لەلایەن مەولەوییەوە وەک نیشان و میدالێک بەسنگ و یەخە و شانی ئەحمەد بەگی کۆماسییەوە کراوە. کۆمەڵە شیعری شاعیر بەڵگەی سەرکەوتوویی خاوەنەکەیەتی و لەلای هەموو کوردێک پەسەند کراوە. ئینجا ئەو سەرکەوتنە لەلایەن شاعیرێکی وەکو مەولەوییەوە شایەدی بۆ بدرێ، بێ گومان پێویستە حسێبی تایبەتی بۆ بکرێ.

کۆماسی بەشیعری «گڵکۆی تازەی لەیل» ناسراوە، دەنگوباسی گەیشتۆتە ئەوروپا. شارەزایێکی وەکو مینۆرسکی لەسەری نووسیوە، بە بەرهەمێکی بەرزی ژماردووە لەناو شیعری کلاسیکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و، لەگەڵ هەندێ شیعری دڵداری و لاواندنەوە بەراووردی کردووە.

## بەشی بیستەمین

# مەلای جەباری ١٨٠٦-١٨٧٦

### ژیانی شاعیر

لەدوای داگیرکردنی بەشێکی زۆر لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای کوردستان لە ئەنجامی جەنگی چاڵدیران (١٥١٤) پێوەندییێکی تازەی ئابووری کۆمەڵایەتی لە وڵاتی کوردەواریدا پەیدا بوو، بەناوی ئایین و نەوەی پێغەمبەرەوە سوڵتانی عوسمانی سەید عەبدولجەبار ناوێکی خەڵکی شاری حەمای وڵاتی شام خەڵات دەکا، هەندێ پارچە زەوی پێشکێش دەکا لەو ناوچەیەی کە لەدواییدا دەبێ بەئاقاری جەبارییان لە ڕۆژهەڵاتی کەرکووکدا، هەمەوەند دەکەوێتە لای باکووری و شێخان لەلای باشووریەتی، قەرە حەسەنیش دەکەوێتە لای ڕۆژئاوای. ناوچەی جەباری لە ٢٨ ئاوایی پێکهاتووە، دیالێکتی قسەکردنی ئێستایان کرمانجی خوارووە.

سەید عەبدولجەبار لەدوای ئەوەی نەوەی لێ دەکەوێتەوە بەتایبەتی شێخ شەرەفەدینی کوڕی خۆی دەگەڕێتەوە وڵاتی شام، لەپاشانا ئەم کوڕەی دەبێتە باپیرە گەورەی بنەماڵە یا تیرەی جەباری. لەدواییدا ئەم کۆمەڵە خەڵکە لە بنەماڵەوە دەبێتە تیرە یا عەشرەت، واتە سەیدەکان وەک بنەماڵە سەرۆکایەتی دەکەن و خەڵکەکەی دیکەش لەگەڵیاندا عەشرەتی جەباری دروست دەکەن.

شاعیری ئەم ماوەیەمان فەتاح کوڕی سەید مستەفا کوڕی سەید ئیسماعیل کوڕی سەید جانی لە نەوەی شێخ شەرەفەدینی کوڕی سەید عەبدولجەباری گەورەیە. فەتاح لە ساڵی ١٨٠٦ لە گوندی بانگۆل لەدایکبووە، بەمنداڵیی سەرەتای خوێندنی لەلای مەلا ڕۆستەمی مەلای گوندەکەیان بووە. وا دەردەکەوێ لە مەڵبەندی خۆیدا تەنیا قورئانی خەتم کردبێ و، گوندەکەیان حوجرەی مەدرەسەی خوێندنی زانستییەکانی ئیسلام و زمانی عەرەبی تێدا نەبووبێ. لەبەر ئەوە دەوری فەقێیەتی لە مزگەوتی نائیب ئۆغلی لە کەرکووک خوێندوویەتی، لەپاشانا بۆ خوێندن چۆتە سلێمانی و لە دوایییدا گەڕاوەتەوە کەرکووک، ئینجا ڕووی کردۆتە هەولێر و ڕواندز و شنۆ و، بۆ دواجار نیشتەجێی مەڵبەندی خۆی کەرکووک بووە.

لە ساڵی ١٨٣١دا باوکی مەلای جەباری کۆچی دوایی کردووە، ناچار بووە واز لە خوێندن بێنێ، یا هیچ نەبێ پەلە بکا لە تەواوکردنی خوێندنی مەلایەتی، چونکە گومان لەوەدا نییە کە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ئیتر ناچار بووە خەریکی کشتوکاڵ و بەڕێوەبردنی ماڵ و منداڵی بێ.

پێوەندی دەرەبەگایەتی لە کۆمەڵی کوردەواری عوسمانیدا هەندێ تەنگوچەڵەمەی بۆ پەیدا کردووە، لەبەر ئەوە ناچار بووە دووجار سەر لە ئەستەموول بدا. جاری یەکەمیان لە ساڵی ١٨٤٢ دەچێتە ئەستەموول بۆ سەندنەوەی هەندێ لەو موڵکانەی بنەماڵە و تیرەکانی هاوسێیان داگیریان کردبوو. وەک



دەردەکەوێ مەلای جەباری لەو گەشتەیدا سەرکەوتوو بووە. جارێکی دیکەش لە ساڵی ١٨٤٦ دیسانەوە ڕوو دەکاتەوە ئەستەموول، ئەمجارەیان بۆ چارەسەرکردنی ئەو دوژمنایەتییەی کە لەنێوان جەباری و هەمەوەنداندا لە ناوەوە بوو، لەم گەشتەیدا تا پلەیێک سەردەکەوێ، چونکە دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی نێوانی لەگەڵ هەمەوەنداندا خۆش نەبوو، ئەمانە بزێو بوون و زیانیان بەدەسەڵاتی عوسمانی دەگەیاند و هەموو شتێک لە ناوچەی ئەواندا بەدڵی دەسەڵات نەدەکەوتەوە.

لەبەرئەوەی مەلای جەباری لە بنەماڵەیێکی سەید و دەوڵەمەند بوو پێوەندی لەگەڵ کاربەدەست و دەوڵەمەند و شێخە گەورەکانی ئەو سەردەمە هەبوو، وەک (مەحموود پاشای جاف و شێخ عەبدولڕەحمانی خالیسی) و هی دیکە. دەڵێن ئاشنایەتی لەگەڵ مەولەویدا بووە، ئەمەیان ڕەنگە بەناوی خوێندەواری و شاعیرییەتییەوە بووبێ، ئەگەر نا لە ماڵەوە کاروباری بنەماڵە و تیرەی جەباری بەدەست (سەید قادری کاکی)یەوە بووە، هەندێ جار ناکۆکی دەکەوتە نێوانیانەوە و مەلا ناچار دەبوو بۆ ماوەیێک زویر ببێ و لە مەڵبەندی خۆی بار بکا، هۆی ئەم ناخۆشییەی نێوان ئەم دوو برایە هەندێکی دەگەڕێتەوە بۆ پێوەندیی نادۆستانەی نێوان مەلای جەباری و براژنی، واتە خێزانی سەید قادری کاکی گەورەی کە ناوی. هاجەر خان بووە، گەیشتۆتە ڕادەیێک بەشیعر ئەو ژنە هەجوو بکا، جگە لەوە ئەو ناخۆشییەی کە لەنێوان جەباری و هەمەوەندەکان بووە کاکی بەخەتابار حسێب کردووە.

مەلای جەباری لە ساڵی ١٨٧٦ لە ئاوایی تاوێربەرز کۆچی دوایی کردووە، تەرمەکەیان هێناوەتەوە بانگۆل و لەوێ نێژراوە.

### شیعری مەلای جەباری

مەلای جەباری وشەی «مەلا»ی کردووە بەنازناو بۆ شیعرەکانی، لە زۆربەیاندا بەکاری هێناوە. ئەگەر بە وردی بنوارینە شیعری مەلای جەباری لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە لە چوارچێوە و قاڵبی شیعری کوردی شاعیرانی گۆرانزەمین ناچێتە دەرەوە. لە ڕووی ڕوخسارەوە کێشی خۆماڵی دە سیلابییە، زۆربەی شیعرەکان وەستانیان لە ناوەڕاستدایە، دیارە قافیەش هەر ئەو مەسنەوی یا جووت قافیەیە کە ئەم جۆرە شیعرە لەسەری دەڕۆن. زمانی تێکەڵاوە، هەر چەندە لە بنجدا دیالێکتی گۆرانییە بەڵام بە ڕوونی کاری کرمانجیی باشووری بەسەرەوە دەبینرێ، وشە و ڕستەکانی سادە و ئاسانن و لە شیعری میللیی سەرزاری نەنووسراوەوە نزیکن.

لە بابەت ناوەرۆکەوە زۆربەی شیعری ئەم شاعیرەمان لە دڵداری واتە وەسفی خۆشەویست و وەسفی سروشت دەردەکەوێ، هەرچەندە لە هەندێ پارچە شیعریدا دەکرێ مەبەسێکی دیاریکراو بەدی بکرێ، بەڵام بەتایبەتی لە مەبەسی دڵداری و وەسفی سروشتدا زۆر جار ئەم دوو مەبەسە تێکەڵ بەیەکتری دەبن.

شیعری مەلای جەباری ئەوەی لەبەر دەستماندایە زۆر کەمە، لەبەر ئەوە هەموو مەبەسە کلاسیکییەکانی شیعری کوردی تێیدا نادۆزرێنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاکە تاکە شیعری داشۆرین و گاڵتەوگەپ و بۆ پێکەنین بەرچاو دەکەون. بەلای ئێمەوە ئەم جۆرە شیعرانەی لە هەموو ڕوویێکی

هونەرییەوە لە پلەی شیعرە دڵداری و وەسفەکانی سروشت نین، کەچی ڕەنگە بەپێی ئەو قسەیەی «دەبێ شاعیر لە هەموو بابەتێک بڵێ...» ئێمە ئەو جۆرە شیعرانە لە مەلای جەباری و شاعیرانی دیکە قوبووڵ بکەین.

## گەشتی دیوانی شیعری مەلای جەباری

### نەوبەهار

کارێکی ئاساییە کەژی بەهار سەرنجی هەموو شاعیرێک ڕابکێشێ لە ناوچە جیاوازەکانی وڵاتی کەرکووکدا. لەو شیعرەیدا مەلای جەباری دیمەنە ڕەنگاوڕەنگەکانی بەهار دەجوولێنێ کە دەڵێ:

میرزام! یە وەعدەی نەو وەهارانەن
سەرەتای تەلمیت خاتر دارانەن
فەسڵ وەسڵ دۆست سەیر هەردانەن
لەرەی لەرزانەی زەنەخ دارانەن
زەمزەمەی بولبول، دەبدەبەی گوڵەن
نەزارەی هەزار دەروون پڕ چڵەن
نەپرشەی شەونم نەڕووی پەردەوە
نێرگس مەست چەم وە لاو کەردەوە
نەقارەی مینقار تەیران سوب خیز
بیزەنان نەغمەی نەکیسای پەرویز
چریکەی چەکاوس چون حونجەرەی عوود
مەر دەنگ چل چەنگ پەنجەی بارەبوود
هوو هووی بایەقوش شەو وە هەردەوە
زام دەردینان تازە کەردەوە
دەنگی قیرەی قاز سوب نەسەحرای سووس
مەر مۆزیقەی مەشق شەهنشای عورووس
تیپ تیپ قوڵنگان قەتارەی قازان
میرزام تاوەڕووژ ئاوات مەوازان
جەرەس وە ئاهەنگ خۆش قانوونەوە
دەنگ و سەدای ساز ئەرغەنوونەوە



قومری وە قووقووی نەغمەی هویشەوە
مل وە تەوق زەڕ وەفاریشەوە
قووقووشەن وە فەرق شاخ سەروەوە
مەر حاجی وەرای (سەفا و مەروە)وە
قەواقووی قەتار قوڵەنگ تیژ پەڕ
کەردەن هۆش و گۆش کە ڕوبیان کەڕ
فەرش فەرەح بەخش سەوزەی قەدەم خێر
فەرشەنەن وە موڵک سەحرای گەرمەسێر
دەی ساجەی دەمدا هەر کەس دلیش بوو
چون بولبول هەوای سەودای گوڵێش بوو
یاخود چون فەرهاد دڵ ئاهەرین بوو
مەزەی مەزاقش نام شیرین بوو
یاخود جە دەروون مایە مەیلش بوو
چون مەجنوون هەوای خاڵ لەیلش بوو
مەبو ئەزم سەیر سەوزە و ساراکۆ
دامانەش نەهوون دەروون داراکۆ
نەو فەیز فوتووح نەو وەهارەوە
نەو بەیزای ئەنوار کۆی دڵدارەوە
سەیر سەحرا و دەست سەیر دیارانەن
نالەی مورغ زار مێرغوزارانەن
دوست لە بەهانەی دڵستانی بوو
لا قەید نەجەواب (لن ترانی) بوو
شەو سەرگەردانان سەر ئازاد کەرۆ
سەبان وە (وادی ایمن) شار کەرۆ
مەر (مەلا)یش نیشوو شەو نەدەیجوورا
نەتیرەی تاریک سپای بێ نوورا
ئەر ستارەم بێ نەوا و بەرگ بوو
وەدین دڵدار هویت شاد مەرگ بوو

واتاکەی:
گەورەم! ئەمە سەردەمی بەهاری تازەیە
سەرەتای گەیشتن بەنیاز و ئامانجە
کەژی شادبوونی دۆستان و سەیرانی هەردانە
لەرینەوەی ملوانکەی گەردەن زەردانە
دەنگ و ئاوازی بولبولە، وشەی گوڵە
موناجاتی هەزار دڵی پڕ لە شادییە
لە بریسکەی شەونم لە ڕووی پەردەوە
نێرگس مەست بووە لە گوێی ئاودا
لە ئاوازی دەنووکی باڵندەی بەرەبەیانان
ئاوازی بێ وێنەی نەکیسای گۆرانیبێژی خوسرەو
چریکەی کە لە گەرووی عوود دێتە دەرەوە
ئەو ئاوازەی لە ئامێری چل چەنگی باربود دەپژێ
قاژەی کوندەبوو شەو لە هەرداندا
ئێشی برینان تازە دەکاتەوە
دەنگی قیژەی قازی بەیانیان لە سارای سووس
وەک مۆسیقای مەشقی قەیسەری عرووس
تیپ تیپی قوڵەنگان و قەتارەی قازان
گەورەم! تا ڕۆژ ئاوات بڵاو دەکەنەوە
ئاواز و ئاهەنگی خۆشی ئامێری قانوون
دەنگ و سەدا و ئاوازی ئەرغەنوون
قومری بەقوو قووی خۆیەوە
تەوقی چێژ و وەفا لە ملی ئاڵاوە
دەنگ و سەدایان لە لوتکەی شاخەکانەوە
وەک دەنگی حاجییانە لە هاتوچۆی (سەفا و مەروا)
دەنگی تیپی قوڵەنگە تیژ پەڕەکان
عەرەشوقورش کەڕ دەکەن
چیمەنی شادی بەخش و سەوزەی قەدەم خێر
خۆشی دەدەنە دەشت و سارای گەرمیان
لەو سەردەمەدا هەر کەس خاوەن دڵ بێ (دڵدار)



وەک بولبول سەوداو گیرۆدەی گوڵ بووە
یا وەکو فەرهاد دڵی ئاگرین دەبێ
مەزەی سەر لێوی ناوی شیرین دەبێ
یا لەناخی دڵیدا مەیلی بۆی هەیە
وەک مەجنوون هەوای خەیاڵی لەیلای هەیە
سەیرانی سەوزاییی و دەشت و کێوی ڕەنگین لە ناوەوەیە
داوێنی لە خوێن و دەروونی لەسەر شاخ
لەو جیلوە ڕەنگینەی نەوبەهارەوە
لەو ڕووناکییە سپیانەی کێوی دڵدارییەوە
سەیری سارا و دەشتی وڵاتان بکەن
ئاوازی باڵندان لە مێرغوزاران
دۆست لە گۆشەی دڵستان (شاری دڵداری) بوو
بێ گومان لە وەرامی دەنگی (لن ترانی) بوو
بەشەو سەرگەردانان ئازادن
بەشەوان بە(وادی ایمن) شاد دەبن
هەرچی (مەلا)یشە شەو لە تاریکیدا دەژی
لە مەڵبەندی ڕەشی تاریکی بێ ڕووناکی
ئەگەر ئەستێرەم بێ نەواو بەدبەخت بێ
بەمەرگ بەئایینی دڵداری شاد دەبێ

لەم شیعرەدا مەلای جەباری بایەخی بەهەموو لایەنێکی سروشت داوە لە ڕووەک و گیاوگوڵ وەکو هەموو جۆرە شیعری لەم بابەتەی وەسفی بەهار، بەڵام لەم ماوەیەدا بەتەواوی باڵندە دەخاتە ڕوو، نەوەکو تەنیا وەک دیاردەیێکی مەتریالی جوانی سروشت، بەڵکو وەک دەنگ و ئاواز و مۆسیقا، هەوڵێکی زۆر دەدا باس لە ئاوازەکانی ئەم باڵندە جۆراوجۆرانە بکا، هەروەها بەراوردیان بکا لەگەڵ ئاوازە جیاوازەکانی ئامێری مۆسیقا، واتە مۆسیقای سروشت و ئەو مۆسیقایەی باڵندەی سروشت بەدەنگە خۆشەکانیانەوە دروستی دەکەن.

شاعیر لەم هەنگەمەی سەیرانی ئاواز و مۆسیقایە یادی مێژوو دەکاتەوە، ئەو دەنگ خۆشانەی وەکو نەکیسا و باربورد بوون بەرەمزی دەنگخۆشی لە مێژووی دێرینی ئەرکیۆلۆجی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، دیسانەوە شاعیر ئەوەی لەبیر نەچووە ئەو دەنگ و سەدایەی لە غەیبەوە هاتووە بە «لن ترانی» و «وادی ایمن» خۆی دەرکردووە، بەلوتکەی داهێنانی ئاوازی نەمری مۆسیقای هەمیشەیی دابنێ.

## شانامەی بەختە

شێخ عەبدوڵڵا بادەوایی مەلای جەباری بانگ دەکا بۆ ئاهەنگی ژنهێنانی شێخ سەتاری کوڕی، لەو کاتەدا مەلا شتێکی ئەوتۆی بەدەستەوە نابێ شایانی ئەوە بێ بە دیاری بۆ ئەو زەماوەندەی ببا، ئیتر ناچار دەبێ بیر لەو بەرانە سوورە بکاتەوە کە بە تایبەتی لە ماڵەوە دایانبەستبوو بۆ ئەوەی بەدیاری پێشکێشی ماڵی زاوای بکا.

لەم شیعرەدا مەلای جەباری هەستونەستی منداڵەکانی دەردەبڕێ چۆن ئەم بەرانەیان لە دەست چوو:

ئیمساڵ بەختەیەکمان گرد بووە دان
سەری ببڕین بۆ منداڵەکان
وە سمکۆڵ چون ئەسپ زەوی ئەدڕی
دەنگ کا و جۆی لە ماڵم بڕی
دیم پەیا بوو یەک کوڵە بۆری
دیزەی ناپەسەن دەموچاو نەشۆری
واتش شێخ ئەولا وەهاش فەرمایی
تەشریف باوەڕی بێ وە سەر شایی
خۆ منیش وەقوڕ گیراوی ماڵم
دەسم کەوتووی وە دەس زاڵم
هەر چەنی گەڕام بۆ سوورانەی شێخ
ناعیلاج بەختەم کردەوە لە مێخ
کوڕ وە باوکەڕۆ کچ وە ئای ئایی
کەفتەن وە شوێنم تا قەرقەچایی
یەکێکیان وتی بۆ ناپرسی ئەحواڵمان
لەی زاری و شیوەن لەی ناڵەناڵمان
وتم ڕۆڵە گیان ئەحواڵتان چییە؟
ئەم زیڕە زیڕەتان لەبەر چییە؟
وتیان: باوە هەناسەمان سەرد بێ
ڕۆن و گۆشتمان یە بەختە زەرد بێ
ئەو قەرە گریان لە زووان بوون لاڵ
من بەختەم هاوورد ئەوان چوون بۆ ماڵ



من بەختەم هێنا هەتاکو باوە
ئەوە ڕەنجم دا لەگەڵ منالا
هەرچەندە ئێمە ڕەنجمان لەگەڵ برد
ئەومانیش بەگون سەتارا خەرج کرد
ئینە شانامەی بەختەی مرواری
یاران بوواناشی پەی یادگاری

واتاکەی:

ئەمساڵ بەرانێکمان بەخێو کردبوو
بۆ منداڵەکان سەری ببڕین
بە سمکۆڵی وەکو ئەسپ زەوی دەدڕی
کا و جۆی لە ماڵمدا نەهێشت
یەکێکم لێ پەیدا بوو لۆزەندەرێک بوو
وەک دیزەی ناپەسەند و چاونەشۆراو
وتی: شێخ ئەولا فەرموویەتی
تەشریف بفەرمووێ و بێتە سەر شایی
خۆ منیش ماڵم بە قوڕ بگیرێ
گیرۆدەی دەستی زۆردار بووم
زۆر گەڕام بۆ ئاهەنگی شێخ دیارییێک بدۆزمەوە
ناچاربووم بەرانم لە گوریسی کردەوە
کوڕ باوکەڕۆی بوو، کچ واوەیلای بوو
بەدوام کەوتن تا قەرقەچایی
یەکێکیان وتی بۆ لە ئەحواڵمان ناپرسی
لەم زاری و شیوەن و ناڵەناڵەمان
وتم ڕۆڵە گیان ئەحواڵتان چییە؟
ئەم زیڕەزیڕەتان لەبەر چییە؟
وتیان: باوەگیان هەناسەمان ساردە
ڕۆن و گۆشتمان هەر ئەم بەرانە زەردەیە
ئەوەندە گریان لە یەزمان لاڵ بوون
من بەرانم هێنا ئەوان چوونە ماڵ

من بەرانم هێنا هەتاکو باوە
ڕەنجێکی زۆرم لەگەڵ منداڵان دا
هەرچەندە ئێمە ڕەنجمان لەگەڵ دا
بەڵام بۆ گونی شێخ سەتار کردمان بەدیاری
ئەمەیە شانامەی بەرانی مرواری
یاران بەیادگار بیگێڕنەوە

## سمێڵەکەی کاکەی کاکەیی

دەڵێن کابرایێکی کاکەیی لای شێخ عەبدولڕەحمان خالیسی تاڵەبانی دەبێ لە ماڵ یا لە تەکیە، بۆ گاڵتە و ڕابواردن شێخ بە سەرتاشەکەی دەڵێ سمێڵی کابرای کاکەیی ببڕێ، ئیتر بەزۆر سمێڵی کاکەیی دەقاچن. مەلای جەباری ئاگاداری ئەم شانۆگەرییە دەبێ، ئیتر بەزمانی کابرای کاکەییەوە ئەم شیعرە دەڵێ:

ئیلتیجا بردم وە تەکیەداری
لە خالیق نەترس لە حەق بیزاری
هەر وام پەروا کرد چوومە تاسەوە
دیم دەستی ئاما و وەمەقاسەوە
کەلیمەی تەوحید وە زۆر پێم واچان
وە زۆر سمێڵمیان تەمام وەرقاچان
ئەگەر بوینی زەرەی ئێشەکەم
گردەوە بکەم چنگە پووشەکەم
لەی شەرمناکی لە خەجەلاتا
هەرگیز نەنی وەم کەس لەم وڵاتە
شەرت بوو من لە داخ ئەی سمێڵەوە
سەربنێم وە زێر ڕای سەر خێڵەوە

واتاکەی:

ڕۆژێک ڕووم کردە تەکیە
لە خودا ناترسن و لە هەق بێزارن
هەروا بیرم دەکردەوە و چووبوومە ژێریەوە
دیم دەستێکم بۆ هات بەمەقەسەوە



بەزۆر کەلیمەی تەوحیدیان بەسەرم سەپاند
بەزۆر تەواوی سمێڵمیان بڕی
ئەگەر ئەنجامی ئەم کارە ببینی
پێویستە کۆمەڵە مووەکانم کۆبکەمەوە
لە شەرمان و لە خەجاڵەتیدا
هەرگیز کەس نەبینم لەم وڵاتەدا
پەیمان بێ من لە داخی ئەم سمێڵەمەوە
سەربنێمە وڵاتی سەرخێڵەوە

ئەم شیعرە هەرچەندە لایەنی جوانی و کۆمیدی پێوە دیارە، بەڵام لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ئەم کردەوەیە ڕاست نییە، چونکە چوونە مەیدانێکە بەرامبەر بەنەریتێکی ئایینی کە کەس مافی ئەوەی نییە بەربەرەکانی بکا. ئەم ڕووداوە ئەنجامی دژایەتی ئیدیۆلۆجییە لە نێوان تەریقەتێکی دەروێشی (قادری) و ئایینێکی یارسان (ئەهلی هەق)، جگە لەوە دیارە مەسەلەی ئابووری و زەوی و ئاقار و دێرا و مەسەلەیێکی گرنگ بووە لەنێوان دەرەبەگەکانی هەموو عەشرەت و تیرە و بنەماڵەکان نەک تەنیا لەنێوان تاڵەبانی و کاکەییاندا. هەر چۆنێ بێ ئەم کردارانە هەر چەندە ناهەمواریش بن لە دواییدا دەبنە سەرچاوەی داهێنانی ئەدەبی بەرز لە هەموو کۆمەڵێکدا.

***

مەلای جەباری کەسایەتییێکی شیعریی گرنگ بوو لە گۆرانزەمینی کوردستان لە ناوچەکانی گەرمیانی کەرکووک دەورێکی باڵای بووە بەدرێژایی ڕۆژگار لە دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی کوردی، مەلای جەباری شیعری کەم بووە، بەڵام ناوەرۆکی دەوڵەمەند بووە، ئەگەرچی زۆربەی شیعری بابەتی دڵداری و وەسفی سروشتە، بەڵام لە مەبەسەکانی دیکەش شیعری وتووە.

## بەشی بیست و یەکەمین

## مەولەوی ١٨٠٦-١٨٨٢

## ژیان و شیعری مەولەوی

### ژیانی مەولەوی

عەبدولڕەحیمی کوڕی مەلا سەعیدی تاوەگۆزی لە ساڵی ١٨٠٦ لە گوندی سەرشاتەی ناوچەی تاوەگۆز لە باشووری زێی سیروان لەدایکبووە. ئەو کاتە بابانی سلێمانی فەرمانڕەوا بوون و کوردستانی باشوور بەشێک بوو لە دەوڵەتی عوسمانی. مەلا سەعیدی تاوەگۆزی لە نەوەی مەلا یووسفی جانی کوڕی سەید مەلا ئەبووبەکری چوڕی بوو. هێشتا منداڵ بووە ماڵەوەیان گواستوویانەتە گوندی بێژاوەی نزیک هەڵەبجە.

سەرەتای خوێندنی شاعیر لای باوکی بووە. وەک لە مێژووی ژیانی دەردەکەوێ لە منداڵییەوە لە هیچ شوێنێک بۆ ماوەیێکی زۆر ئۆقرەی نەگرتووە. لەدوای خوێندن لای باوکی بۆ ماوەیێکی کەم چووە بۆ پاوە (هەورامانی لهۆن) ئینجا ڕووی کردۆتە چوڕ لە مەریوان، لەوێوە بۆ سنە لە مزگەوتی وەزیر دامەزراوە، ئەوجا ماوەیێک بۆ خوێندن لە بانە بووە، لە پاشانا لە سلێمانی گیرساوەتەوە و لە مزگەوتی گەورە نیشتەجێ بووە و لای شێخ مارفی نۆدێ خوێندوویەتی. لەدوای ئەمە ڕووی کردۆتە هەڵەبجە و لەپاش ماوەیێک لە قەڵای جوانڕۆ ژیاوە. لێرەدا جارێکی دیکە ڕوو دەکاتەوە سنە و لە مزگەوتی دارولئیحسان دەژی لەدوای ماوەیێک ڕوو دەکاتەوە سلێمانی.

لەدوا سەفەری شاعیر بۆ سنە لە دەوروبەری ساڵی ١٨٣٩ لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ڕەزا قوڵی خانی کوڕی خوسرەوخانی والی و، لەپاش گەڕانەوەی بۆ سلێمانی ئیلهام لە خەیاڵیدا دەکەوێتە جووڵە، هەستکردن بەگێتیی گیانی سۆفیزم دەکەوێتە بزووتنەوە و لەو ڕۆژگارەدا کەسایەتی شیعری مەولەوی دروست دەبێ و لە دواڕۆژدا بەرهەمی شیعری دادەهێنێ.

مەولەوی وەکو هەموو مرۆڤێک دەکەوێتە سەر هەوەسی تەریقەتی سۆفییزم. تەریقەتی نەقشبەندی، بەتایبەتی پێوەندی لەگەڵ دیالێکتی گۆران دەبوو ببێ بەو فەلسەفەیەی تێنوویەتی شاعیری دەشکاند لە گێتیی گیاندا، بۆ ئەم مەبەسە ڕوو دەکاتە تەوێڵە و بەشێخ وەسمان شاد دەبێ، لەدواییدا دەبێتە شێخ و مورشیدی گەورەی.

مەولەوی لەدوای تەواوکردنی خوێندن لە گوندی چوڕستانە مەلایەتی دەکا، لە سەردەمی مەلایەتیشیدا بۆ ماوەیێکی زۆر لە جێیێک نامێنێتەوە، جێگۆڕکێی زۆر دەبێ، لە چوڕستانەوە دەچێ بۆ گوندی بێژاوە، لەوێ زۆر نامێنێتەوە و دەچێتە گوندی بیاوێڵە و ئەمە مەنزڵی پێش دوایی ژیانی دەبێ. لێرەوە بۆ دواجار ڕوو دەکاتە گوندی سەر شاتەی مەڵبەندی لەدایکبوونی تا دوایی ژیانی لەوێ دەمێنێتەوە.



نازناوی شیعری عەبدولڕەحیمی تاوەگۆزی «مەولەوی»یە، لەو ماوەیەی مەولەوی لە سنە بووە و لە مزگەوتی دارولئیحسان ژیاوە، والی ئەردەڵان ڕەزا قوڵی خانی کوڕی خوسرەو خانی والی بە ڕەسمی لەقەبی مەولەوی داوەتێ. ئەم نازناوە لە بنجدا نازناوی جەلالەدینی ڕۆمییە، بێ گومان جێی شانازی و سەربڵندی و گەورەیی بووە بۆ عەبدولڕەحیمی تاوەگۆزی لەلایەن والیی ئەردەڵانەوە ئەو لەقەبە گەورەیەی پێ ببەخشرێ، جگە لەوە ئەو حوجرەیەی مزگەوتی دارولئیحسان کە مەولەوی تێیدا ژیاوە و ژمارە (١٩)یە لەناو حوجرەی مەلایان تا ئێستا خەڵکی بە«حوجرەی مەولەوی» ناوی دەبەن.

ئەم شاعیرەمان نازناوی مەولەوی لە شیعریدا بەکار نەهێناوە، نازناوێکی دیکەی هەیە «مەعدووم» یا «مەعدوومی»، ئەمەیانی لە هەندێ شیعریدا بەکارهێناوە، ئەمەش نەک وەکو شاعیرانی ڕینیسانسی شیعری کلاسیکی کوردستانی باشوور کە نازناویان لەدوادێڕی غەزەل یا قەسیدە بەکارهێناوە (نالی و سالم و کوردی) بەڵکو مەولەوی نازناوی لە سەرەتای شیعر یا لەناو شیعرەکە بەکاری هێناوە نەک لەدوادێڕدا.

لە دەوری لاویەتی مەولەوی، لە گوندی چوڕستانە هەندێ بنەماڵەی بەرچەڵەک ئەفغانی دەژیان، ئەمانە سۆفیی تەریقەتی نەقشبەندی بوون. مەولەوی ئاشنایەتی لەگەڵیاندا پەیدا دەکا، ئەو برادەرایەتییە دەبێتە هۆی ئەوەی شاعیر حەز لە کچێکیان بکا و بیکا بەهاوسەری خۆی. ئەو کچە ناوی عەنبەر خاتوون بوو. بەشێکی زۆر لە شیعرە دڵدارییەکانی مەولەوی ڕەنگدانەوەی ئەو دڵدارییە گەرمە بوون.

لە سەردەمی فەقێیەتیدا مەولەوی لە گوندی خانەگای ناوچەی هەورامان حەزی لە ڕابیعەی کچی مامۆستای خۆی سەید عومەری خانەگا کردووە، بەڵام بۆی ڕێک نەکەوتووە بیهێنێ، بێگومان ئەم دڵدارییە کاری لێ کردووە و بووە بەسەرچاوەی ئیلهام بۆ هۆنینەوەی هەندێ لە شیعرەکانی. جگە لە گیانی عەنبەر خاتوون و ڕابیعە لەوانەیە گیانی ژنی دیکەش هەستی ناسکی مەولەوییان جووڵاندبێ و شیعری بۆ وتبن، بەڵام هەرگیز لە عەنبەر خاتوون بەولاوە ئەوانی دیکە نادۆزرێنەوە.

مەولەوی لەگەڵ ئەوەی سۆفی بووە، بەڵام لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا گۆشەگیر نەبووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە پێوەندیی کۆمەڵایەتی زۆر فراوان بووە، برادەرایەتی لەگەڵ زۆربەی خەڵکە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵدا بووە، بەتایبەتی شاعیر و ڕۆشنبیر و ئاغا و شێخی تەریقەتی نەقشبەندی (سەراجەدین و بەهائەدین و زیائەدین)، هەروەها (شێخ محەمەد جەسیمی سنە و محەمەد پاشا و مەحموود پاشای جاف). شیعری پێشکێش بەبرادەرانی کردووە هی وەکو (شێخ موئمینی سازانی و شێخ حەسەنی سازانی و شێخ یووسفی نوسمەیی و شێخ عەزیزی جانەوەری و ئەحمەد بەگی کۆماسی و شێخ عەبدوڵڵای داخی) و هی دیکە.

لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا مەولەوی دڵکراوە بوو، دەم بەخەندە و قسەخۆش بوو، بەڵام لەدوا ساڵانی ژیانی هەستونەستی ناو دەروونی گۆڕا بوو، هەست بەوە دەکرا تووشی ڕەشبینی بووە، ئەم دیاردە سایکۆلۆجییە لە ئەنجامی هەندێ ڕووداوی ناخۆش بوو لە ڕێڕەوی ژیانیدا تووشیان هات بوو.

سروشتی کۆمەڵی کوردەواری بەگشتی و بەشێک لە نەریتە دەرەبەگییە دواکەوتووەکان هۆیێکی گرنگ بوون لە هەندێ ماوەی مێژوودا دووبەرەکی بکەوێتە ناو کۆمەڵ و ئاژاوە دروست ببێ لە ئەنجامی

شەڕوشۆڕی عەشرەتییی کە هەموو توانا و هێزێکی لە نەریتی بێ هۆشی و دواکەوتوویی و بیری نامرۆڤایەتی وەردەگرت. بەم جۆرە کارێکی ئاسایی بوو گوندی سەرشاتەی مەڵبەندی دوا ساڵانی ژیانی شاعیر بکەوێتە بەر تاڵان، لەو کردەوە چەتەگەرییەدا تەنیا نامەخانەی شاعیر تاڵان نەکرا وەکو کەلوپەلی دیکەی ناو ماڵ، بەڵکو بەر گڵپەی ئاگر کەوت و سووتا. ئەمە ڕووداوێکی جەرگبڕ بوو لە ژیانی مەولەویدا.

هەرچی مردنی عەنبەر خاتوونی خێزانی بوو کارەساتێک بوو بۆ شاعیر لە شیعریدا دەردەکەوێ عەنبەر خاتوونی زۆر خۆشویستووە، کۆمەڵێک شیعری ئیلهامی لەو خۆشەویستییە وەرگرتووە. ئەمە و وەکو ئاشکرایە مەولەوی ژنێکی دیکەشی هێناوە، بەڵام لە شیعری دڵداریدا زیاتر ئیلهامی لە عەنبەر خاتوون وەرگرتووە.

لوتکەی ئەو کارەساتەی ژیانی مەولەوی لێڵ کردووە، چەند ساڵێک پێش کۆچی دوایی هەردوو چاوی کوێر بووە. لێرەدا پرسیارێک لەم لایەنەوە قوت دەبێتەوە: یەکێک بەزکماک یا لە منداڵیدا تووشی ئەم نەخۆشییە ببێ لەوانەیە بڵێمەتێکی لێ بکەوێتەوە، بەڵام لە تەمەنی پیری یا لە سەردەمی دوا ساڵانی ژیانیدا کوێر بێ، ئەم چارەنووسە بەچی دەگەیەنێ؟ بەهەموو لێکدانەوەیێک ڕاستییەکە ئەوەیە دوا ساڵانی ژیانی شاعیر قورسترین ماوەیێک بووە لە تەمەنی سێ چارەکە سەدەی چەرخی نۆزدەم، ئەو ژیانە پڕ لە مەینەتییە لە ساڵی ١٨٨٢ کۆتایی پێ دێ، مەولەوی لە گوندی سەرشاتە کۆچی دوایی دەکا و هەر لەوێش دەنێژرێ.

## دیوانی شیعری مەولەوی

مەولەوی یەکێکە لەو شاعیرە بەختەوەرانەی لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا بایەخێکی زۆری پێ دراوە لەلایەن ڕاگەیاندنەوە بۆ ناوبانگ و، لە ڕووی زانستییەوە بۆ هەڵسەنگاندن قسەی زۆری لەسەر کراوە و دیوانی بڵاوکراوەتەوە و لێکۆڵینەوە لەسەر بەرهەمی شیعری کراوە.

پیرەمێرد یەکەمین کەس بووە هەوڵی داوە بەشێک لە دیوانی شاعیر بەناوی «دیوانی مەولەوی و ڕۆحی مەولەوی» لە دوو بەرگدا لە سلێمانی (بەرگی یەکەم لە ساڵی ١٩٣٥، بەرگی دووەم لە ساڵی ١٩٤٠) بەچاپ بگەیەنێ. ئەوەی پیرەمێردی هان داوە گرفتار و هۆگری مەولەوی بێ وەکو خۆی دەڵێ، دەنگی خۆشی عەزیز ناوێک بووە: شیعری مەولەوی بەدەنگی خۆشی عەزیز ئامینە لەناو ئێمەدا برەوی پەیدا کرد، عەزیز گۆیندەیێکی عەزیز بوو، لە مەجلیسدا هیجرانی و لە چیادا قەتار هەر لەو دەهات.

پیرەمێرد لە دیوانی مەولەویدا لە لاپەڕەی جووت شیعری مەولەوی بەدیالێکتی گۆرانی (هەورامی) و لە لاپەڕەی تاک شیعرەکەی بەدیالێکتی کرمانجیی باشوور (سلێمانی) لە وەرگێڕانی خۆی بڵاوکردۆتەوە. بێ گومان ئەمە کارێکی باشە لەلایەن پیرەمێردەوە گەیەنراوەتە ئەنجام، بەڕاستی وەرگێڕانەکەی ئەو گەلێ شت لە شیعرەکاندا ڕوون دەکاتەوە، کەچی لەڕووی هونەری و چێژی شیعرایەتییەوە ئەسڵەکەی مەولەوی تەنیا خۆی نموونەی بەرزی ئەو داهێنانەیە کە مەولەوی مەبەسیەتی و وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد جێی



ئەسڵەکە ناگرێتەوە.

جگە لە پیرەمێرد چەند کەسێکی دیکەش بەشیکردنەوە و لێکۆڵینەوە دیوانی مەولەوییان بڵاوکردۆتەوە.

١- دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و لەسەر نووسینی مەلا عەبدولکەریمی موددەریس، لە بەغدا لە ساڵی ١٩٦١ چاپ کراوە.

٢- دیوانی مەولەوی سەید عەبدولڕەحیمی مەعدوومی، لەلایەن محەمەد ئەمینی ئەردەڵانییەوە لە هەورامییەوە گۆڕاوە بۆ زاراوەی سۆرانی، لە بەغدا لە ساڵی ١٩٩١ چاپ کراوە.

لێرەدا هەرچەندە بڵاوکەرەوەی دیوان وەستایەتی نواندووە لە وەرگێڕانی شیعری مەولەوی لە (هەورامی)یەوە بۆ (سۆرانی)، بەڵام دیسانەوە بەرهەمەکە بە زمانی بنچینەیی خۆی وەک بەرهەمێکی شیعری داهێنراو دەکەوێتە بەرچاو. وەرگێڕانەکە نرخی ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی هەیە.

٣- ڕیسالەی عیشق لە مەولەوی ناسیدا، بریتییە لە لێکۆڵینەوەیێک لە بابەت شاعیرەوە لەگەڵ لێکدانەوەی گوڵچنێک لە شیعرەکانی، لەلایەن سۆران سنەیی ئامادە کراوە و لە ساڵی ١٩٩١ لە شاری ورمێ ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەیووبی بڵاوی کردۆتەوە.

دیوانی شیعری مەولەوی مەبەسی سەرەکی مێژووی ئەدەبی کوردییە، بەڵام وەک زانایێکی ئایینی ئیسلام بەرهەمی زانستیشی هەیە لە بابەت ئیسلامەوە بەشیعری کوردی ئەم کتێبانەی داناوە، ئەم بەرهەمە زانستییانە دەچنە ناو شیعری فێرکردن یا پەروەردەییەوە (دیداکتیکی).

بەرهەمە شیعرییە زانستییەکانی مەولەوی بەسێ زمان نووسراونەتەوە، کوردی و فارسی و عەرەبی، ئەوەی پێوەندی بەئێمەوە هەبێ بەرهەمە کوردییەکەیەتی.

ئەو کارە زانستییەی مەولەوی بەشیعری کوردی دانراوە، بەناوی «عەقیدە» و «العقيدة المرضية» و «زوبدەی عەقیدە» ناوبانگی دەرکردووە، بۆ یەکەمین جار لە قاهیرە لە ساڵی ١٩٣٣دا لەلایەن محیەدین سەبری کانی مشکانی بڵاوکراوەتەوە. بۆ جاری دووەم بەناوی «زوبدەی عەقیدە» لە سلێمانی لە ساڵی ٢٠٠٠دا لەلایەن حەمە ساڵح حاجی مەلا محەمەدی گەلاڵە چاپکراوەتەوە. ئەم چاپە بریتییە لە کتێبی دەسنووسێک بەخەتێکی خۆش شیعرەکان تۆمار کراون، لە لاپەڕە تاکی کتێبەکە بەئۆفسیت تێکستی دەسنووسەکە بڵاوکراوەتەوە، لە لاپەڕە جووتیدا شیعرەکان بەئیملای تازەی کوردی نووسراونەتەوە.

شاعیر عەقیدەکەی بەم شیعرانە دەست پێ دەکا:

زوبدەی عەقیدە و خولاسەی کەلام
هەر لە تۆ و بۆ تۆی حەمد و سەنای تام
هەر خۆتی بۆ خۆت بورهان دیتر بەس
بەشی خۆی تێکەڵ ناوێ بکا کەس

چاک واته خەیاڵ بێ تەقریب نەکەین
مەعلوومە تۆ تۆ و ئێمەیچ خۆ ئێمەین

بەم شیعرانەش کۆتایی پێ دێنێ:

جێی نییە جیلوەی زاتی بەتاقی
مەر دڵی موئمین فانی یو باقی
عاریف هەر خۆیە و مەعرووف خۆیە و بەس
مەعریفەتی حەق بۆ کەس نادا دەس
نیزاع بڕیاوە دەگەڵ خاس و عام
(صح العقیده وتم الکلام)

لە خوێندنەوەی ئەم دێڕانە ئەو ڕاستییە ئاشکرا دەبێ زمانی شیعری مەولەوی زمانێکی تێکەڵاوە لە ئەنجامی کۆبوونەوەی گۆڤەرەکانی (دیالێکتە بچووکەکانی) هەورامی و ئەردەڵانی و سلێمانی و هەردوو دیالێکتی گۆرانی و کرمانجیی باشوور دروست بووە. ئەم دیاردەیە زیاتر لە عەقیدەکەی مەولەوی دەبینرێ نەک لە دیوانی شیعری.

## ڕوخساری شیعری مەولەوی

شیعری مەولەوی لە بابەت ڕوخسارەوە سەر بەقوتابخانەی شیعری کلاسیکی و شیعری میللی سەر زاری دیالێکتی گۆرانییە. ئەو جۆرە شیعرە لەسەر کێشی خۆماڵی برگە (کەرت، هیجا، سیلاب، پەنجە) دەهۆنرێتەوە. لە بابەت ژمارەی بڕگەوە کێشی حەوت و هەشت و دە و زیاتریش بەرچاو دەکەوێ، مەولەوی لە نموونە زۆرەکانی ئەو چەشنە شیعرە تەنیا یەکێکیان بەکاردێنێ کە دە بڕگەییە، هەموو شیعرەکانی لەسەر ئەو کێشە ڕێکخراون، واتە دە کەرتی.

ئەم بابەتە کێشە دوو جۆری هەیە، یەکەمیان لە ناوەڕاستی نیوە دێڕی شیعردا وەستان دەکەوێتە بەرگوێ (ب --ب ب/ - ب -- ب) ئەوی دیکەیان وەستانی تێدا نییە. هەموو شیعری مەولەوی لەم ڕووەوە لە بابەتی یەکەمن، بەدەگمەن نیوە دێڕێکی وا دەبینرێ وەستانی لە ناوەڕاستدا نەبێ.

هەرچی قافیەشە لە شیعری مەولەوی و شیعری دیالێکتی گۆرانی (کلاسیکی نووسراو و ئەوەی میللی نەنووسراو) لەسەر بنچی جووت قافیە (موزدەویج، مەسنەوی) دەهۆنرێتەوە (اا، ب ب، ج ج، د د. هتد)، وەک دیارە شیعری مەولەوی لە ڕووی کێش و قافیەوە زۆر سادەیە، هەموو شیعرەکانی کێشیان دە بڕگەیی و وەستان لە ناوەڕاست و قافیەیان جووت قافیەیە. ئەم تەسکوترووسکییە و نەبوونی هیچ جۆرە ڕەنگاوڕەنگییێک بۆتە هۆی ئەوەی شاعیر بەتەواوی نەتوانێ هونەر بنوێنێ و یاریی ڕەوانبێژی لە مەیدانی کێش و قافیەی شیعریدا بکا.

بەهۆی ئەوەی یەکێتیی قافیە لە شیعری مەولەویدا نییە، هەندێ جار شیعرەکانی بەپێی دەنگی تیپی



یەکەمی پارچە شیعرەکە دیوانی شیعری شاعیر ڕێک دەخرێ، واتە هەموو پارچە شیعرەکان کۆ دەکرێنەوە، بەپێی یەکەمین تیپی یەکەم وشەی شیعرەکە دابەش دەکرێن، بەم جۆرە لە دیوانەکەدا لەپێشانا دەنگی «ئە»، ئینجا «ب» لەپاشانا دەنگەکانی دیکە بەپێ لیستی ئەلفوبێی زمان بڵاودەکرێنەوە. هەرچی بەرهەمەکەشە لە ڕووی زاراوەییەوە ڕاستتر ئەوەیە «پارچە»ی پێ بوترێ، یا ناوێکی تری بۆ دابنرێ. هەندێ جاریش زاراوەکانی شیعری عەرووزی کوردستانی باشوور «غەزەل» و «قەسیدە»یان بۆ بەکاردێنن، ئەگەر پارچە شیعرەکە کورت بێ «غەزەل»ی پێ دەڵێن، ئەگەر درێژیش بێ «قەسیدە»یە. بەهەموو جۆرێک ئەگەر زاراوەی «لیریک» بۆ شیعری مەولەوی و هەموو بەرهەمێکی لەم جۆرە شیعرانەی دیالێکتی گۆرانی بەکاربهێنرێ باشترە.

لە بابەت ژمارەی دێڕی شیعرەوە مەولەوی پابەندی هیچ جۆرە یاسا و دەستوورێک نییە. لەناو شیعریدا لە دێڕە شیعرێکەوە (دوو نیوە دێڕ) تا زیاتر لە سی دێڕە شیعر دەبینرێ. ئەگەر ئەم دیاردەیە لەگەڵ شیعری کوردستانی باشوور بەراوورد بکرێ دوو بابەتیان دەتوانرێ ناویان بۆ دابنرێ، یەکەمیان یەک دێڕییەکە تاک (فەرد)ی پێ بوترێ، وەک:

تا وە زوڵف و ڕووی تۆ تەماشامەن
ئەدای نمای فەرز سوبح و عیشامەن

هەروەها دوو دێڕییەکە دوو بەیتی پێ بوترێ، وەک:

باڵای ئاڵای شەنگ سەد باڵا پێوەن
دوو کانچەی شادی دەردنیان شێوەن
دڵ مەدۆ وە دەم نێش و ئێشەوە
بێ وە قەزای سەخت دیدەی وێشەوە

ئەمەیان لە ڕووی قافیەوە ناکرێ چوارینی (روباعی) پێ بوترێ چونکە لە شیعری کلاسیکی عەرووزی کوردستانی باشوور قافیە (اا ب ا)یە، یا (اااا)یە، کەچی ئەوەی مەولەوی (اا ب ب حـ حـ)ە، لەبەر ئەوە تەنیا لە ڕووی ژمارەی نیوە دێڕی شیعرەوە دەتوانرێ چوارینی پێ بوترێ، بۆیە ڕاستتر ئەوەیە وەک زاراوەییێک بە «دوو بەیت» ناوی ببرێ. هەموو شیعری مەولەوی لە سەرانسەری دیوانیدا لەدوای «تاک» و «دوو بەیت» لە سێ دێڕەوە دەست پێ دەکەن تا دەوروبەری سی دێڕە شیعر.

## ناوەرۆکی شیعری مەولەوی

مەولەوی لە گێتیی هەورامان و گەرمیان و هەموو گۆراننشینی کوردستان یەکێکە لە شاعیرە داهێنەرە گەورە و ناودارەکان. لەپێش خۆی شاعیری بەرزی وەکو (مەلا مستەفای بێسارانی و خانای قوبادی) هەڵکەوتوون، یەکێکی وەکو مەولەوی تەنیا لە هەناسەی شیعرایەتییەوە لە بێسارانی نزیک نەبوو، بەڵکو مەولەوی لە سەدەی نۆزدەمدا بێسارانی دەور دەکاتەوە، بەواتاییێکی تر بێسارانی و مەولەوی

هەردووکیان سەر بلّندن بەوەی لە پلەی شاعیریەتیدا لە ترازووی جوانکاریدا هاوسەنگن.

مەولەوی لە چوارچێوەی ئەدەبی دیالێکتی گۆرانی (هەورامی) سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناوە لە شیعری لیریکی کوردیدا، شێوازی ڕۆمانتیکی لە شیعریدا دەجوولێتەوە. دیارە ڕۆمانتیکی وەکو شێواز نەک قوتابخانە، چونکە شێوازی ڕۆمانتیکی لە سەرەتای ژیانی ئادەمزادەوە دروست بووە، لەپێشانا بووە، ئێستاش هەیە و لە دوارۆژیشدا دەمێنێ هەتا ئادەمزاد لەسەر ڕووی زەوی مابێ. لەپاشانا بۆچوونێکی دیکە هەیە دەڵێ، شیعر بێ ڕۆمانتیزم نابێ، بەپێی ئەم تیۆرییە جەوهەری ڕۆمانتیزم لەلای مەولەوی زۆرە. هەرچی ڕۆمانتیکیشە وەک قوتابخانە، ئەمەیان دیارە لەناو مێژووی ئەدەبی هەموو نەتەوەیێک ڕوو دەدا. لە ئەدەبی کوردیدا پێش ئەوەی زاراوەی ڕۆمانتیزم بەکاربهێنرێ زاراوەی «شیعری نوێ» بۆ شۆرشە شیعرییەکەی دوای جەنگی یەکەمی گێتی لە سلێمانی بەکار دەهێنرا.

ئەوەی زیاتر خەڵکی خستۆتە هەڵەوە لە بابەت مەولەوییەوە ئەوەیە بەرهەمی ئەم شاعیرە و هەموو ئەوانەی بەدیالێکتی گۆرانی نووسیویانە لەگەڵ ئەدەبی کرمانجی باشوور (سلێمانی)ی قوتابخانەی نالی بەراوورد کراوە، بۆیە بە شۆرش یا تازەکردنەوە یا قوتابخانەی نوێ ژمێرراوە. بێ گومان ئەم بۆچوونە ڕاست نییە و بەراوەردەکەش لە جێی خۆیدا نییە. چونکە دیالێکتی گۆرانی و دیالێکتی کرمانجی (باکوور و باشوور) هەریەکەیان هەندێ مەرجی تایبەتی تاقیکردنەوەی ناوچەیی خۆیانیان هەیە، لەبەر ئەوە مێژوونووسی ئەدەب پێویستە ئاگاداری جەوهەرە لەیەکچووەکان و لەیەکنەچووەکان بێ، بۆ ئەوەی نەکەوێتە هەڵەوە.

مەبەس و ناوەرۆکی شیعری مەولەوی لە چوارچێوەی نەخشەی شیعری کلاسیکی کوردی ناچێتە دەرەوە، لێرەدا هەوڵ دەدەین زانیاری پێویست لەم بابەتەوە بەرەو ڕووی خوێنەر و خوێنەواری کورد بکەینەوە.

١- شیعری ئایینی

لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی شیعری کلاسیکی عەرووزیدا زاراوەی موناجات یا ئیلاهییات بۆ ستایشی خودا و، نەعت بۆ ستایشی پێغەمبەر بەکار دەهێنرێن. شیعری ئایینی وەک زاراوەیێک هەموو ئەو مەبەسانە دەگرێتەوە کە ئێستا باسیان لێوە دەکەین لەگەڵ هەموو ناوەرۆکێکی دیکەی پێوەندیی بەئایینەوە هەبێ.

مەولەوی خۆی بەئایینی ئیسلامەوە خەریک کردووە، باسی خودا و پێغەمبەر و گەورە پیاوانی ئایینی کردووە. موناجات و پاڕانەوەی لەگەڵ خودادا هەیە. باسی لە ڕۆژی قیامەت و ئەو گێتییە جاویدانییەی کردووە، لەم گێتییەشدا باس لە شەوی بەرات (١٥ی شەعبان) و شەوانی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانی کردووە.

لەبەرهەمی ئەدەبی مەولەوی دا هەست بەوە دەکرێ سنوورێکی دیاری کراو لەنێوان شیعری ئایینی و شیعری سۆفیزمی دا نەبێ، کەچی لەگەڵ ئەوەش دا ئەم جۆرە شیعرە جێی تایبەتی خۆی هەیە لە لیستی



مەبەسەکانی شیعری مەولەوی دا.

٢- شیعری سۆفیزم (عیرفانی)

شیعری داهێنراوی سۆفیزم (سۆفیزمی کۆزمۆسی یا یەکێتیی بوون) لە دیوانی مەولەویدا کەم بەرچاو دەکەوێ و دەتوانرێ لە خانەی شیعری عیرفانی حسێب نەکرێ، لەگەڵ ئەمەشدا ئەوە هەیە شیعری وەسفی سۆفیزمی دەبینرێ، ئەمەیان جیاوازە لەگەڵ ئەو شیعرەی لە ئەنجامی تێکەڵبوونی ئیدیۆلۆجییەتی قووڵی سۆفیزمی بە ڕۆمانتیزم و سیمبۆلیزم دروست دەبێ. لەو جۆرە شیعرەدا زاراوەکانی سۆفیزم بەکاردێنێ، باس لە مێژووی سۆفیزم و خوو و ڕەوشت و پلەکانی تەریقەت دەکا، واتە شاعیر ئەندامی ڕێکخراوێکە (سۆفیی تەریقەتێکە) نەقشبەندی پێ دەڵێن، لە قەوارە و ناوەرۆکی فەلسەفەی ئەم تەریقەتە ناچێتە دەرەوە، هەروەها پارێزەری خوو و ڕەوشت و ئادابی ئەو تەریقەتەیە، مورشیدەکانی نەقشبەندی بەلای ئەوەوە ڕەمزی ڕاستەقینەی ئەو سۆفیزمەن کە شاعیر باوەڕی پێیەتی. لەبەر ئەوە وەک مێژوونووسێکی تەریقەتی نەقشبەندی دەکەوێتە ڕوو. باس لە زیکر و تەهلیلەی سۆفییان دەکا. دەف و نەی لەلای مەولەوی مۆسیقای ئاسمانییە، مەی و سەرخۆشی ناسینی کردگارە، کۆڕی زیکر نزیکبوونەوەیە لە خودا، ئینجا هیجران و فیراق و عیشقی حەقیقی و مەجازی ئەمانە هەموویان مەولەوی وەک شاعیرێکی سۆفیزم دەخەنە ڕوو، بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە لە ژیاندا ئەندانی تەریقەتی نەقشبەندی بووە، ئادابی ئەم تەریقەتە نەقشبەندی بووە، ئادابی ئەم تەریقەتە لە شیعریدا ڕەنگی داوەتەوە، لە وەسفی گێتی سۆفیزم سەرکەوتوو بووە، بەڵام داهێنانی شیعری عیرفانی کۆزمۆسی زۆر کەمە.

٣- دڵداری و سروشت

بەگشتی لای مەولەوی دڵداری و جوانی ژن یەکتری تەواو دەکەن و سروشت هەوێنی شیعری دڵداری و جوانییە، لەگەڵ ئەوەشدا لیریکی وا لای مەولەوی دەکەوێتە بەرچاو لایەنە دڵدارییەکەی دەشکێتەوە سەر لایەنی سروشت و، پێچەوانەش هەر ڕاستە و کارێکی ئاساییە، ئەگەر پارچە شیعرێکی شاعیر تەنیا لە سروشت بدوێ، لەم جۆرە وەسفانەدا زیاتر هەموو کەژەکانی ساڵ کەوتوونەتە بەر بینین و لێ وردبوونەوەی شاعیر، لەم لایەنەوە وەسفی زەستان لای مەولەوی کەمترە لە وەسفی کەژەکانی دیکە.

٤- پێداهەڵدان و شانازی:

پێداهەڵدان (مەدح) و شانازی (فەخر) لەو مەبەسانەن لە شیعری کلاسیکیدا تێکهەڵکێش دەکرێن، بەدەگمەن شیعرێک دەست دەکەوێ تەنیا پێداهەڵدان یا شانازی کردن بێ، لەگەڵ ئەوەشدا لە دیوانی مەولەوی هەندێ جار ئەم دوو مەبەسە لە یەکتری جیا دەبنەوە. بەهەموو جۆرێک مەولەوی لەم بابەتە شیعرەی گەلێ زۆرە. ئەوانەی بوونەتە قارەمانی ئەم مەبەسەی شیعری مەولەوی خەڵکێکی بەژمارە گەلەکن، لە ڕیزی پێشەوەی ئەمانە شێخ و مورشیدانی تەریقەتی نەقشبەندی تەوێڵە و بیارەی ناوچەکانی هەورامانن، وەکو: بەهائەدین و سەراجەدین و زیائەدین، وێنەی ئەم زاتانە لە شیعری وەسفی سۆفیزمی مەولەوی دەبینرێ. جگە لەمانە شاعیر کەمتەرخەمی نەکردووە لەناوهێنانی و پێدا هەڵگوتنی کەسانی جۆراوجۆری کۆمەڵ لە شاعیران و شێخانی تەریقەت و پیاوانی ئایینی و سەرۆک عەشرەت و

کاربەدەستان، وەکو مەلا مستەفای بێسارانی، ئەحمەد بەگی کۆماسی، ئەحمەد برێسی، شێخ عەزیزی جانەوەری، شێخ یووسفی نوسمەیی، مەلا چراغ، مەلا خەیالی پاوەیی، شێخ موئمینی سازانی، شێخ حەسەنی سازانی، شێخ حوسێنی هەزار کانیانی، مەلا نیزام، بولبولی شاعیر، مەحموود پاشای جاف و گەلێکی دیکە.

٥- ماتەمنامە و لاواندنەوە:

ئەم مەبەسە لاسایییە کلاسیکییە لە شیعری مەولەویدا زۆرە. هەندێ شاعیرانی خاوەن ئەم جۆرە شیعرە سۆزی مرۆڤایەتی لەناو بەرهەمە شیعرییەکانیاندا دەجوولێتەوە. ئەگەر لە شیعری مەولەوی وردببینەوە تووشی خەڵکی جیاواز دەبین، کە شاعیر فرمێسکی بۆیان ڕشتووە و شین و شەپۆڕی بۆیان کردووە. لە سەرووی ئەمانە هەموویانەوە عەنبەر خاتوونی خێزانی بووە، تەنیا شیعرێکی بۆ نەوتووە، بەڵکو کۆمەڵێک شیعری بۆ هۆنیوەتەوە. ئەوانەی گیانیان بەسۆزی ناو فرمێسکی وشەی شیعری مەولەوی شادبووە زۆرن، لێرەدا دەکرێ ناوی هەندێکیان بخرێتە ڕوو: عەبدولڕەحمان حاجی مەحموود پیاوماقووڵی مەحموود پاشای جاف، شێخ عەبدولسەمەدی خانەگا، پەریزاد خانی خێزانی یەکێ لە بەگزادەکانی جاف، ئەحمەد بەگی برای محەمەد پاشای جاف، شێخ عەبدولڕەحمان خالیسی تاڵەبانی، منداڵێک ناوی محەمەد بووە، شێخ عەلیی تەوێڵەیی خەلیفەی شێخ عوسمانی سەراجەدین، قادر بەگی کەیخوسرەو بەگی جاف، ئامینە خانی کچی قادر بەگی کەیخوسرەو بەگی جاف و هی دیکە.

٦- ژیانی کۆمەڵایەتی:

مەولەوی لە هەندێ بەرهەمی شیعریدا ئاوڕی لە ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەواری داوەتەوە، لەو شیعرانەدا زیاتر بۆچوونەکانی لەمەڕ دیاردەی کۆمەڵایەتییەوە لەناو مەبەسەکانی دیکەی شیعریدا تواونەتەوە، شیعرێکی وا لە دیوانی مەولەویدا بەرچاو ناکەوێ تەنیا بۆ دیاردەیێک یا ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی تەرخان کرابێ. لە ژیانی کۆچەری بەتایبەتی لەناو عەشرەتی جاف شارەزا بووە، ئاماژەی بۆ کۆچی کوێستان و هاوینەهەواریانی (زۆزانیانی) کردووە، وتووێژی لەگەڵ کاروانچییان بووە. هەروەها تێبینییەکانی تەنیا لەبارەی ژیانی عەشرەتی و کۆچەری نەبووە، بەڵکو ژیانی گوند و شاریش لە بەرهەمیدا دەکەوێتە بەرچاو.

٧- خەفەت و گلەیی و سکاڵا:

سەردەمی ناخۆشی و شپرزەیی و مەینەتی لە ژیانی مەولەویدا کەم نەبووە، بەتایبەتی لەدوا ساڵانی ژیانیدا. هۆی هەرە گرنگ بۆ ئەو کارەساتانەی بەسەری داهاتبوون مەرگی عەنبەر خاتوون و سووتانی نامەخانە و بەرهەمە ئەدەبییەکانی خۆی بوون، کوێربوونی شاعیر لەسەرووی هەموو ئەم ڕووداوە ناخۆشانەوە بوو. ئەمە و بەساڵاچوون دەوری هەبوو، وەکو دەڵێن پیری و سەد عەیبی، جگە لە تێکچوونی شیرازەی پێوەندی کۆمەڵایەتی لەناو خەڵکیدا و پەرەسەندنی دیاردەی هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواری، ئەمانە هەموویان تاڕادەیێک ڕەنگیان لە کۆمەڵێک شیعری مەولەوی داوەتەوە.



## بەشی بیست و دووەمین

## گەشتێک لە گوڵزاری دیوانی مەولەوی

بەهەشتی شیعری مەولەوی شاگوڵی زۆرە، دۆزینەوەی هەموو ڕەنگ و بۆن و بەرامەی شیعرە جوانەکان کات و ساتێکی زۆری گەرەکە. ئێمە لێرەدا تەنیا ئەوەمان بۆ دەکرێ لە هەر مەبەس و بابەت و هونەرێکی شیعری چەند نموونەیێک هەڵبژێرین وەک بەڵگەیێک بۆ دیارکردنی مەقامی مەولەوی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا.

بۆ لێکدانەوەی شیعری مەولەوی یا ڕاستتر وەرگێڕانی بۆ ئەو دیالێکتەی ئەم کتێبەی پێ نووسراوەتەوە پەنامان بۆ دوو ڕۆشنبیری کورد بردووە، یەکێکیان پیرەمێردە لە ساڵی ١٩٣٥ دیوانی مەولەوی بڵاوکردۆتەوە، ئەویتریان محەمەد ئەمین ئەردەڵانییە لە ساڵی ١٩٩١ دیوانی شاعیری بڵاوکردۆتەوە، ئەم دوو کەسە شیعری مەولەوییان لە دیالێکتی گۆرانییەوە (هەورامی) بە شیعر وەرگێڕاوتە سەر دیالێکتی کرمانجیی باشوور (سلێمانی). ئەو نموونانەی لەم بەشەی ئەم کتێبەدا هاتوون لەپێشانا تێکستی ئەسڵی شیعری مەولەوی تۆمارکراوە، لە پاشانا ماناکەیمان نووسیوە، لێرەدا وەرگێڕانی هەردوو وەرگێڕمان ڕەچاو کردووە، ئینجا لەم دوو وەرگێڕانە کامەیان بەرچاوتر بێ و جوانتر و دڵگیرتر خۆی بنوێنێ ئەومان تۆمار کردووە. لە کۆتایی شیعرەکە ناوی ئەو کەسەمان نووسیوە کە وەرگێڕانەکەی لێ وەرگیراوە، «پیرەمێرد» یا «ئەردەڵانی».

لەم ماوەیەدا پێویستە ئەوە بوترێ مەبەس لەم کارە تەنیا ئەوەیە مانای شیعری مەولەوی بخرێتە ڕوو ئەگینە ئەوەی مەولەوی وتوویەتی ئەویان نموونەی بەرهەمی مەولەوییە و وەرگێڕانی دوو کەسەکەی دیکە بۆ ڕوونکردنەوەیە، لە ڕووی هونەریشەوە تێکستی وەرگێڕانەکە ناگاتە تێکستی ئەسڵی مەولەوی و هەر ئەوەی خۆشی وتوویەتی نموونەی ڕاستەقینەی شیعری مەولەوییە.

### باوەڕ و بینین

-١-

بیروباوەڕی ئایینی لەلای مەولەوی ڕەنگدانەوەی شەریعەتی ئیسلامە، هەوڵی داوە تیۆرییەکانی لەگەڵ هەموو ئەو بیروباوەڕانەی لەگەڵ کردگارێکن یا یەک کردگار دەپەرستن بگونجێنێ، لە بەرهەمی شاعیردا ئاماژەکردن بۆ ئەم لایەنە گیانییەی ئادەمزاد زۆرە و هەندێ جار لەگەڵ سۆفیزم تێکەڵی دەکا.

مەولەوی دەڵێ:

بەزم هام فەردان یار مۆبەت کێش

یەک ئیمشەو دەفێ، دەروێش! های دەروێش!

باوەڕ نەکوورەی وەلوەلەی دەفدا
ڕووی پەند و تەوبیخ وە هەر تەرەف دا
ڕووی پەند ئەو یاران دڵ وە جەهر و جەخت
ڕووی تەوبیخ ئەو لای مەعدوومی بەدبەخت
واچە هەی دڵەی ئەبلەی بێ خەبەر!
هورێز ساتێ تەرک خاو شیرین کەر
(شەوەن، خالوەتەن، ماڵ بێ ئەغیارەن
ئالەم گرد و تەن، دۆس خەبەردارەن)
نەوا میهمان بۆ تۆ نەوینی کەس
خەفەت بۆ پەرێت تا ئاخر نەفەس
دیدەت تۆز غەیر نیشتەنش وەنە
جە جۆی سەوزەی دڵ ئاویش دەر پەنە
وەر تۆ بینابیت پەردەش ها نەسەر
ئەوتۆ مەوینۆ جە تۆ زەریف تەر
ئەمجار یاد کەر عومر عەبەس و یەردەت
باوەڕ وە خاتر ناپاکی کەردەت
سەر ئەفگەندە بەر چون شەرمەساران
چەمەی چەم هۆکەر چون سەیل واران
بەل شۆرۆ بەو ئاو کەرەم فراوان
بابەت وە بابەت سیاهەی تاوان

واتاکەی:

بەزمی یارانە یاری مۆبەت کێش
ئەمشەو یەک دەفێ، دەروێش هەر دەروێش
گەرم کە بەزمێ لە کەللەی دەفدا
ڕووی پەند و تانەت بەهەر تەرەفدا
ڕووی پەند لە کۆڕی دڵان ئاوەدان
ڕووی تەوبیخیش بۆ مەعدومی نادان
بڵێ هەی دڵەی گێلی بێ خەبەر
هەستە خەوی خۆش زوو دەرکە لەسەر



شەوە، خەڵوەتە، ماڵ بێ ئەغیارە
دنیا نوستووە، دۆس خەبەردارە
نەکا میوان بێ تۆ نەبینی کەس
ببێ بەغەمت تا ئاخر نەفەس
دیدەت تۆزی غەیر کەوتە سەری تۆ
بەئاوی جۆگەی سۆزی دڵ بیشۆ
گەر تۆ بیناییت پەردەی وا لەسەر
ئەو لە تۆ باشتر دەتبینێ یەکسەر
یاد کە جا عومری پێشووی بێ حاسڵ
ناپاکیی کردەت بهێنە بە دڵ
سەردانەوێنە وەک شەرمەزاران
چاوەی چاو هەڵکە وەک سەیلی باران
بەڵکو پێی بشوا کەرەم فراوان
بابەت بە بابەت لیستەی پڕ تاوان

«ئەردەڵانی»

لەم شیعرەدا مەولەوی یادی کردگار دەکاتەوە، کەسێکە باوەڕی بەئایین هەیە، کردگاری ئەو وەک موسلمانێک خودای تاک و تەنیایە، بەڵام هەوای شیعرەکە ئادەمزادێک دەخاتە ڕوو خاوەنی بیروباوەڕ و ئایین و عەقیدەییێکە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە باوەڕیان بەکردگارێک هەیە، جا ئەو کردگارە بەهەر شێوەییێک خۆی دەجلوێنێ بەلای شاعیرەوە هەر یەکێکە. واتە ئادەمزاد هەیە، کردگاریش هەیە و بیروباوەڕێک ڕێبەری ئادەمزاد دەکا و لەو کردگارە نزیکی دەکاتەوە.

مەولەوی لەم شیعرەدا باس لە تەنیایی دەکا، لە بێ ئاگایی دەدەوێ، ئەگەر ئەمە بیگوێزێتەوە گێتیی نوستن و یادی عەقیدەی لە بیر بباتەوە، شیعرەکە وا دەکەوێتە بەرچاو وەکو بڵێیی دەیەوێ لەگەڵ خۆیدا قسە بکا، یا ئامۆژگاری کەسی دووەم بکا، بێ گومان ئەویش هەر خۆیەتی، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پارچە لیریکە وەکو موناجاتێک دەکەوێتە ڕوو هەندێ جەوهەری ناوەرۆکی شیعری ئایینی و سۆفیزمی کەوتۆتە ناو.

بۆچوونی مەولەوی لە بابەت کردگارەوە لە چوارچێوەی ئایینی ئیسلام ناچێتە دەرەوە، بەڵام هەندێ جار لەگەڵ هەڵوێستی ئایینی تریش دەگونجێ، وەکو لە بەڵگەی داهاتوودا لەو موناجاتە دەردەکەوێ کە بۆ بابا یادگاری یارسانانی (ئەهلی هەق)ی وتووە.

مەولەوی دێڕە شیعرێکی بێسارانی تێکهەڵکێشی ئەم شیعرەی خۆی کردووە. ئەمە بەڵگەی ژیری و لە شیعر گەیشتنی مەولەوییە، گەورەیی و خەیاڵ فراوانی بێسارانییە.

سەر شار سەهبای بەزم موناجات
مەلجەی ئیلتیجای ئەرباب حاجات
جای ڕجای جەرگەی پادشا و دەروێش
بارەگا و پەنا پەی بێگانە و خوێش
ئاهووی ختوتەنیی فەیز ئیلاهی
نافەی ناف ڕاهی جە مەه تا ماهی
شکۆفەی وەش بۆی ڕەیحانەی ڕەسوول
نەو باوەی نەمام تەبیبەی بەتوول
وە ڕەوزەتانا هەر نوور واران بۆ
تا دەفع زوڵمەت دیدەی یاران بۆ
هەوای سایەتان هەر مەمدوود مانۆ
سەبوون بوردەی جورم نەک زەرەر سانۆ
ناپوختەکاری و شەرمەساریی من
خەجڵەتم غەفڵەت گوناهکاریی من
کەفتەن وە هەمدا پەند زۆر ئاوەردەن
ڕووی ڕجام وە پای بارەگات کەردەن
تۆ چون جە ئەولاد ئەمجاد مەولای
پەی ڕجا وەجا، پەی هیمەت ئەولای
زاری و زگاری زویری کەردم
وە بارگەی پاکت پەنا ئاوەردم
ئامام سەر نیام وەو بارەگاوە
غەریو، موو سفید وە ڕووی سیاوە
تەن مەعسیەت بار، دەروون پڕ جەدەرد
دیدە تەر، لەب خوشک، دڵ گەرم، نەفەس سەرد
های چەند پلەی سەخت خانە ڕێمەدا
جە ڕووی ئیلتیفات بدیە پێمەدا
بەڵکم جە ڕووی ئەو ئیلتیفاتەوە



مەولام حازر بۆ وە نەجاتەوە
دەس شای مەردان مەدەد کارم بۆ
پلە ئەو پلە ئەو دەس وارم بۆ
مەعسیەت نییەن چون هیچ سەدمەتێ
خەیلی مەلوولم، یا پیر هیممەتێ
هیممەتت باعیس ڕستگاری بۆ
یار بۆ، دیار بۆ، یادگاری بۆ

واتاکەی:

سەر ڕێژی بادەی بەزمی موناجات
پەنای ئیلتیجای ئەربابی حاجات
جێی پاڕانەوەی پادشا و دەروێش
بارەگات پەنا بۆ بێگانە و خوێش
ئاسکی وەتەنی فەیزی ئیلاهی
بۆنی میسک ئەدا لە مانگ تا ماسی
تلی بۆن خۆشی ڕەیحانەی ڕەسوول
نۆبەرەی نەمام پاکیزەی بەتوول
نووری مەرقەدتان بدرەوشێتەوە
چاوی یارانی پێ ڕوون بێتەوە
هەوای سایەتان هەر پایەدار بێ
تاسبوون پەردەی گوناه ڕزگار بێ
ناپوختەکاری و گوناهباری من
شەرمەندەی غەفڵەت گرانباری من
سەر یەک کەوتووە بەدکاریم وەک کۆ
ڕووی هیوام کردە بارەگاکەی تۆ
چونکە تۆ نەوەی شەفاعەتکاری
بۆ ڕجای بەجا دەستەڵاتداری
زار و زەبوونم بەگریە و زاری
هاتمە دەربارت بەهیواداری
سەرم ناوەتە سەر خاکی سەرپێت

غەریب، موو سپی، ڕووسیا سەرشێت
بەدەن گوناهبار دەروون پڕ لە دەرد
چاو تەڕ و لێو وشک، دڵ گەرم و ئاه سەرد
ئای زۆر پلەی سەخت ڕێگای لێ بەستم
تۆ فریام کەوە دەست بدە دەستم
بەڵکم بەهێزی دەستگیری ئێوە
باری گرانم بۆ بچێ بەڕێوە
دەستی شای مەردان مەدەد کارم بێ
لەم پلە پلە ئەو دەس بارم بێ
وەک گوناه نییە هیچ موسیبەتێ
پیر و داماووم یا پیر هیممەتێ
هیممەتت مایەی ڕستگاری بێ
یار بێ، دیار بێ (یادگاری) بێ

«پیرەمێرد»

ئەم بڕە شیعرە موناجاتێکە مەولەوی بۆ بابا یادگاری وتووە، بابا یادگار گەورەیێکی گیانیی ئایینی یارسانە (ئەهلی هەقە) لە کردگارەوە نزیکە، یا خۆی کردگارە. کوردی سەر بە ئایینی یارسان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە گیروگرفتیان لەگەڵ کوردی موسوڵمان نەبووە. گیانی نەتەوەیی (کوردایەتی) ڕێگەی نەداوە ناخۆشی لەنێوانیاندا هەبێ. هەردوو لایان بزووتنەوەی ئەدەبییان بووە، شیعری بەرزیان هێناوەتە ناو مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، بەڵام پێوەندی بەهیچ شێوەیێک لەنێوانیاندا نەبووە. ئەگەر هەندێ جار لە ڕووی دەمارگیری ئیسلامییەوە هێرش برابێتە سەر یارسانان ئەمە نەبوو بەنەریت. لێرەدا مەولەوی نەک تەنیا ئەم هەڵوێستەی هەڵوەشاندۆتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەی ئەو جووڵاوەتەوە. بێ گومان مەولەوی لەبەر ڕۆشنایی بیری سۆفیزم تەماشای ئایینی یارسانی کردووە، وەک فەلسەفەیێکی سۆفیزم لە قەڵەمی داوە و بابا یادگاری کردووە بەدیاردەیێکی ئایینی کۆزمۆسی، بەپێی تیۆرییەکانی ئەم فەلسەفەیە دەتوانرێ پاڕانەوەیێک لە پەنای گەورەیێکی ئایینی (هەر ئایینێک بێ) و لە ڕێگەی ئەوەوە بەرەو ڕووی کردگار بکرێتەوە.

لەم شیعرەدا مەولەوی یەکێکی وەک بابا یادگاری گەورەی یارسانانی کردووە بەڕەمزی نزیکبوونەوە لە کردگار، بەناوی بیروبۆچوونی سۆفیزم. هەر چۆنێ بێ مەولەوی وەک مەلاییێکی موسوڵمانی سوننی هەڵوێستی بەرامبەر بەئایینی یارسان هەبووە، دیارە هەموو کەسێکی دەرەوەی ئایینی یارسان لەگەڵ ئەو بیروڕایە نەبوون.



-٣-

نەهات و نەهات دڵ ماتەن ئیمشەو
ئەڵبەت شنۆی شەو بەراتەن ئیمشەو
سیاهەی دەفتەر میرزای ئەزەلەن
زیادی و نوقسان ڕزق و ئەجەلەن
ئەوها وە بەرات بێ ئەندازەوە
ئێد وە تەعلیقەی عومر تازەوە
کەسێ قووتش نوقڵ ڕاز یاوەرەن
یەکێ زیندەگیش وەسڵ دلبەرەن
هانای هام دەردان چێش مەکەردێ پێم
من دیام نەڕووی تەقسیم نامەی وێم
ژار دووریی دۆس ئازیزەن نۆشم
ثمەیۆ ڕازان شیرین نەگۆشم
یانێ جە شوومیی بەخت سیای من
ئیمشەو لەرزان توولّ توولّ تالاّی من
وەڵگ زیندەگیم ها وە هەواوە
دیما دیم شەن وەبای فەناوە
ئەلوەدای تەئریخ کامەرانیمەن
نیشانەی ئاخر زیندەگانیمەن
یاران و یەردن نۆ بەمەن های دەی
ئیسە وەکارەن ساقی نەشئەی مەی
سادەی تای دوگمەی یەخەی دڵ پەسەند
ئازادکەر چون دڵ بێ دەردان جە بەند
پەشێوکەر لانەی دلاّن جە سەردا
گۆشەی عەرەقچین باوەر وەبەردا
مایل بۆ کەمێ ئەو ئەو گۆشەی چەم
گۆشەی چەم ئەو جام، جام ئەو ئەهل غەم
دەورت گەرد جەور دەوران دا وەباد

ناز وا چۆ بنۆش، غـــەمـــزەكـــەت نۆش باد
تا فـــوارەی وشک لوولەی پێـــشـــەی ڕێش
هەر یەک پرشـــەی زووخ هورشـــانۆ پەی وێش
وەشنۆی نەشـــئـــەی مـــەســـتـــیم وا نۆوە
یەک ئەمـــجـــار جـــە دەس هەســـتـــیم ســـانۆوە

واتاکەی:

نەهات بە نەهات دڵ ماتە ئەمشەو
شنەی شەوەکەی بەراتە ئەمشەو
ئوممولکیتابی (ام الکتاب) میرزای ئەزەلە
بۆ کەم و زۆری ڕزق و ئەجەلە
ئەو بەبەراتی بێ ئەندازەوە
ئەم بەفرمانی عومری تازەوە
ئەو نوقڵی ڕازی دلبەر ئەمژێ
ئەم تامی لێوی جانان ئەچێژێ
هانا هەمدەردان های چی ئەڵێن بۆم
من کەوتوومە شوێن قیسمەت نامەی خۆم
ژاری دووری گیان ئازیز ئەنۆشم
ڕازی شیرینی نایەتە گۆشم
یەعنی لە شوومی بەختی سیای من
ئەمشەو لە ڕێوە تووڵ تاڵعای من
ئەلای زیندەگیم وا بەهەواوە
ئەم دیو ئەو دیوە بەبای فەناوە
ئەلوەداع تەئریخ کامەرانیمە
نەشئەی دیوایی زیندەگانیمە
یاران تێپەڕین نۆبەمە های دەی
ئێستا کەڵک ئەگرێ ساقی نەشئەی مەی
سادەی تای دوگمەی سوخمەی دڵ پەسەند
ئازاد کە وەک دڵ بێداران لە بەند
پەشێوکە لانەی دڵان لە سەردا



گۆشەی عەرەقچین بێنە بەبەردا
مایل بێ کەمی ئاوا و گۆشەی چەم
گۆشەی چاو بۆ جام، جام بۆ ئەهلی غەم
دەورەت بەبادا ئاشووبی دەوران
ناز بڵێ: (چێریۆ...) غەمزەت نۆشی گیان
تا فەوارەی وشک لوولەی ئێسکی ڕێش
هەر یەکە پرشەی ڕووح بداتە پێش
بەنەشئەی مەستی بمخوێنێتەوە
لە قەیدی هەستی بمسێنێتەوە

«پیرەمێرد»

شەوی بەرات (بەرات لە بەرەکەتەوەیە)، لە بنجدا دیاردەیێکی ئایینییەو دەکەوێتە شەوی ١٥ی مانگی شەعبانی هیجری، لە ئێوارەی ئەو شەوە قورئان دەخوێندرێ و یادی پێغەمبەران و پیاوچاکانی ئیسلام دەکرێتەوە و نوقڵ و شیرینی دابەش دەکرێ و خەڵکی لەسەر ئەو باوەڕەن هەر هیوا و ئامانجێکی مەبەسیان بێ بە موناجات و پاڕانەوە لەگەڵ خودا و پێغەمبەر بۆیان دەگەیەنرێتە ئەنجام.

لەپاشانا ئەم دیاردە ئایینییە بوو بەدیاردەیێکی کۆمەلایەتی، لە داهێنانی ئەدەبیدا ئەو شەوە بوو بەڕەمزی گەیشتن بەئامانج، نەک تەنیا بەهەشت و حۆر و غیلمان، بەڵکو ئارەزووەکانی سەر زەمینی بەتایبەتی دڵداری. ئیتر لەم ڕووەوە مەولەوی ماوەی بۆ خەیاڵی خۆی خۆش کردووە بۆ قسەکردن لە بابەت هیوا و ئامانجی کەسانێکی زۆر لە کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا.

## دڵداری و سروشت

مەولەوی وەستای وەسفی سروشتە لە هەموو کەژەکانیدا، بەتایبەتی بەهار، هەموو جوانییەکانی خۆی لە شیعریدا دەدۆزێتەوە. سروشتی هەورامان سەرچاوەیێکی گرنگی ئەم بابەتە شیعرەیەتی. هەرچەندە ئەویش وەک شاعیرانی دیکەی قوتابخانەی خۆی شیعری وەسفی تەبیعەت و دڵداری تێکهەڵکێش دەکا و لە یەکتری جیا ناکرێنەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە لیریکەکانی تەنیا وەک وەسفێکی دیمەنی بەهار دەکەونە بەرچاو.

-١-

نـازک تـەدارەک فـــــــــــەسـل وەهـارەن
زەریـف ئـارایـش هەردە و کـــــــۆســـــــارەن
گـــوڵ چون ڕووی ئازیز نەزاکـــەت پۆشـــان
وەفـــراوان چون ســـەیل دیدەی من جـــۆشـــان

مديان گولاڵان نەپاى دەربەندان
ئەو يەكتەر وێنەى ئارەزوو مەندان
چ خاس خاس شنيۆ نەئێواراندا
سەوزە وە ڕووى خاک جەرگەى ياران دا
بوين ڕەعشەى وەجد دڵەى پاكشان
عەيان نەشنياى سەوزەى خاكشان
هۆ ڕێزە سوبحەن دڵ تازە خاوەن
شنۆى پاى كاوەن گۆشەى سەراوەن
جەى گۆشە خاستەر نييەن مەسكەنێ
ساقى گيان ئامان خومار ئەشكەنێ
سەوزەى خاک پاک ياران هام فەرد
فرەمان وە فەرش بەزم وێمان كەرد
كەى سەوزەى ئێمەيچ نەكام هەردێ بۆ
وە فەرش مەجليس كام هام فەردێ بۆ

واتاكەى:

نازک تەدارەک فەسڵى بەهارە
زەريف ئارايش هەردە و كۆسارە
گوڵ وەک ڕووى ئازيز نەزاكەت پۆشە
بەفراو وەک لافاو ديدەم بەجۆشە
سەيركەن گوڵاڵان لە پاى دەربەندان
پێكەوەن وێنەى ئارەزوومەندان
چەند جوان ئەشنى لە ئێواراندا
سەوزە بەڕووى خاک گەلى ياراندا
بڕوانە ڕەعشەى دەروونى پاكيان
ديارە لە جيلوەى سەوزايى خاكيان
هەڵسە بەيانە دڵ تازە خاوە
شنۆى بەر كاوە گۆشەى سراوە
لەم گۆشە خۆشتر نييە مەسكەنێ
دەخيل هەى ساقى خومار شكەنێ



سەوزەى خاكى پاک يارانى هام فەرد
چەند جارمان فەرش بەزمى خۆمان كرد
كەى سەوزەى ئێمەش لە كان هەردێ بێ
فەرشى مەجليسى كام هام فەردێ بێ

«پيرەمێرد»

لەم شيعرەدا مەولەوى بەرامبەر بەدیمەنێک لە دیمەنە بەهارییەكانى هەورامان وەستاوە، شاخ خۆى ڕازاندۆتەوە، پەڕەى گوڵ جوانى و نازكى لە ڕوومەتى دلبەر وەرگرتووە. لەم لا جۆگەلەى بەفراو، لەولا گوڵاڵە لە بنارى شاخ و لە پاى دەربەندان چاوى كردۆتەوە، شنەباى شەماڵى ئێواران ختووكە دێنێتە فەرشى سەوزى زەمينى بەهار و ژيانى جاويدانى دەبەخشێتە سروشت.

-٢-

وەهارەن تەشريف خال خاسان پەى هەرد
كەم كەم جوانيش ئاوەرد پيريش بەرد
جەم جەم سۆسەنان جە تاق تەوق وەردان
سەردان نەهەردان پەرێ هام فەردان
وە ڕووى زاخاندا چنوور لوول وەردەن
پەى پاى گيان تۆڕدام ئامادە كەردەن
بەڕەزا بەو چين توغراى تاتاوە
شەماڵ مشانۆش، يانى: وەى لاوە
نێرگس وە مەس مەس مديۆكێن ئەو كەس
گۆشەى چاک دڵ وەرنەدۆ جە دەس
وەنەوشە سەجدەى خالان فەرز كەردەن
جە بۆنە مەدام كەچ كەردەن گەردەن
مەعدوومى غەفڵەت تا چەند و پەى چى
گۆش دەر وە نالەى سەحەرى نەى چى

واتاكەى:

بەهار خال خاسان وان بەهەردەوە
كەم كەم جوانى هات پيرى بردەوە
تيپى سۆسنان گەلى گەلاڵان
كەوتوونە كێوان لەبەر نەوخاڵان

لە زاخیراندا چنوور لوولی خوارد
بۆ پێی گیانی عیشق تووڕداوی بنارد
بەرەزا بەو چین تووڕەی تاتاوە
شەماڵ ئەیکێشێ بەم لاو بەولاوە
نێرگس بەمست مست ئەڵێ کوا ئەو کەس
گۆشەی چاکی دڵ بەرنەدا لە دەس
وەنەوشە سەجدەی خالی لا فەرزە
بۆیە گەردەنی کەچە بەو تەرزە
مەعدوومی تاکەی وشک و بێ زەوقی
گوێ بگرە لە نەی سەحەری و شەوقی

«پیرەمێرد»

لە شیعری پێشوودا مەولەوی وێنەی دیاردە گشتییەکانی سروشتی هەورامانی کێشاوە، لەوێدا باس لە سەوزایی و چیا و دۆڵ و جۆگەلەی بەفراو و شنەی شەماڵ دەکا، تەنیا ناوی گوڵێکی هێناوە (گوڵاڵە). لەم شیعرەی دا دەرگا بۆ پیشاندانی بەشێ لە گوڵەکانی بەهار دەکاتەوە، سۆسن و چنوور و نێرگس و وەنەوشە. بێ گومان مەبەسی شاعیر لە ناوهێنان و وێنەگرتنی دیمەنی بەهار ئاماژەکردن بووە بە ڕەمزێکی هەرە جوانی دیمەنی بەهار کە گوڵە ڕەنگین و جۆراوجۆرەکانە، لە گوڵیشدا وەکو لە ناوەرۆکی شیعرەکە دەردەکەوێ بەراووردی لەگەڵ هەندێ لە ئەدگارە جوانەکانی دلبەر کردووە وەکو نێرگس بۆ چاوی دلبەر و وەنەوشە بۆ خاڵی سەر گۆنای. بەگشتی لە بەرهەمی شیعری کلاسیکی کوردی جوانی دلبەر لە سروشت جیا نابێتەوە.

-٣-

وەهارەن ســــــــوبـدەم ســــــــەوزەی دیـاران
نم کـــەوت نەدیدەش چون شـــەو بێـــداران
پەی دڵـەی مــــانیـــــای دەروون مـــەلالان
ســــایە بەســــتــــە وە خـــەیمەی گـــوڵاڵان
بۆی یەخـــەی ســـەحـــەر پەی دەمـــاغ دڵ
هانۆ وە نەســــیم جـــێب جـــەمین گــــوڵ
چون دێـوانەی شـــــۆر ئـازیـز نـە ســــــەردا
شــەتا و ســـەر هۆر گـــرت وە دەشت و دەردا
تـوولانی چـون هیـــجـــر خــــاتر پڕ دەردان



ڕەوان وێنـەی وەسڵ گــــەردن بێ گــــەردان
های جــە شنۆی وەش ڕۆح ئەفـــزای کـــاوان
ئای جــە شـــاخـــەی تاف ســـاف ســـەراوان
نـەک چون تـاف چەم پڕ ئەســــــــرین چەرخ
بـاڕەکـــــەڵلاچەرخ هەی ئافـــــەرین چەرخ
چەنی جـــە هەســـــتی وێت تەواســــاییت
چەنی جـــۆش عـــەشق مـــەجنوون ئاســـاییت
بــدیــە چــۆن هــۆردان وە نــام و نــەنــگــدا
بێ پـەروا مـــــدۆ وێش وەڕووی ســــــەنگدا
های ســـاقی هەڵای ســـەرمـــایەی خـــامی
نمـــەدۆم وە دەس ڕای نــــێـــــکــــنــــامـــــی
باوەڕ و وەجـــۆش ســـادەی هەی پەی کـــەی
تاف قـــەڵوەزەی ســـاف شـــیـــشـــەی مـــەی
مــــــەوجش بـنچـــــینەم بدۆ وە هەمــــــدا
هەســـــتــــیم دۆ وە بـەرد هەرد عـــەدەمـــــدا

واتاکەی:

بەهارە و بەیان سەوزەی دیاران
نم کەوتە چاوی وەک شەوبێداران
بۆ دڵەی پڕ شۆر دەروون مەلالان
سێبەری بەستووە خەیمەی گوڵاڵان
بۆی یەخەی بەیان بۆ دەماغی دڵ
ئەڵێی نەسیمە جێبی جەبین گوڵ
وەک دێوانە شۆر دلبەر لەسەردا
شەتاوسەری نا بەدەشت و دەردا
درێژ وەک هیجری دڵ پڕ لە دەردان
ڕەوان وەک وەسڵی گەردن بێ گەردان
های شنۆی خۆشی رووح ئەفزای کاوان
ئای شاخەی تافی سافی سەر ئاوان
نەک تافی چاوی پڕ فرمێسکی چەرخ

بارەکەڵڵا چەرخ هەی ئافرین چەرخ
لەگەڵ هەستی خۆت بۆ خۆت ئاسایی
لەگەڵ شۆری عەشق مەجنوون ئاسایی
سەیرکە تووڕی دا پەردی نام و نەنگ
بێ پەروا سەی خۆی ئەدا لە سەنگ
فیدات بام ساقی سەرمایەی خامی
نادەمە دەس فیکر ڕێی نەنگ و نامی
بیهێنە گەردش سادەی هەی بۆ کەی
تافی ئەلبەزەی سافی شووشەی مەی
قوڵپەی بنچینەم بدا بەهەمدا
بدا بە بەردی هەردی عەدەمدا

«پیرەمێرد»

مەولەوی لە بەهارا سەیرانی سەرچاوەی زەڵمی کردووە، سەرچاوەی زەڵم یەکێکە لەو مەڵبەندە پیرۆزانەی بوونەتە جێی ژوانی دڵداری خاک و ئاو، خاکی کەسک و سۆر، بەهاری تەڕ بەهەموو هێمنییە لێهاتووەکەی لەگەڵ ئاوی زوڵاڵ بەهەموو جوانییە بێ وێنەکەی لە زۆر جێگە بەنهێنی ڕازونیازی دڵدارییان کردووە، یەکێ لەو شوێنانە سەرچاوەی زەڵم بووە.

مەولەوی لەو سەیرانەدا چی دیوە! لە بەهار بەولاوە چاوی بەهیچ شتێکی دیکە نەکەوتووە. بێ گومان بەهار بێدارە و خەو ناچێتە چاویەوە، وەک دەروێش وێڵ و سەرگەردانە، لە کردگار دەگەڕێ، بەهەموو لایێکدا دەسووڕێتەوە، واتە لە هەموو جێیێک هەیە.

شاعیر ڕوو دەکاتە ئاوی زەڵم: هوشیاری دەکاتەوە، چۆن مەجنوون ئاسایی وێڵی دڵدارییە، هەموو بزووتنەوە و خوڕەی لەپێناوی دۆزینەوەی دلبەرە (لەیلا) کە وێنەی لە کردگار وەرگرتووە.

-٤-

چون چهرەی خەیاڵ ڕوخسارەکەی وێش
نەتۆی پەردەی دڵ مەعدوومی دڵ ڕێش
نمانا جەمین شای سۆسەن خاڵان
کەم کەم نەگۆشەی لای سیا ماڵان
زەمین منەتبار پامەنیا و مەویەرد
جار جار وە ڕووی ناز باوەشین مەکەرد
باوەشین مەکەرد ئەو سەفحەی بێ گەرد



نازکیش جە باد ئیحتیات مەکەرد
نەتۆی تاریکی تای شەدەی بێ گەرد
لەتافەت چون ئاو حەیات مەوج مەوەرد
غەریب بیم چەنیم کەرەم نمانا
وە سەوقات پەرێم خەدەنگێ شانا
ئەر سەد چون یاران گیان تەسلیم کەردەم
خاس بی پەی یادگار خەدەنگێ بەردەم

واتاکەی:

وەک ڕووی خەیاڵی ڕوخسارەکەی خۆی
لە دڵەی مەعدوومی دڵ پڕ ئێش و ئۆی
ڕووی خۆی پیشان دا شای سۆسەن خاڵان
کەم کەم لە گۆشەی لای سیا ماڵان
ورد ورد ئەڕۆیی زەویی منەتبار
ئەیکرد باوەشێن لە ڕووی ناز جارجار
ئەیکرد باوەشێن سەفحەی بێ گەردی
پارێزی ئەکرد لە بای بە وردی
لە توێی تاریکی شەدەی بێ خەوشا
وەک ئاوی حەیات جوانیی ئەدرەوشا
لەبەر غەریبیم کەرەمی باری
هاوێشتی تیرێ بۆ من بەدیاری
هەر چەند وەک یاران گیانی خۆم پێدا
باش بوو بەدیاری تیرێکی لێدا

«ئەردەڵانی»

ڕەشماڵی جافانی کۆچەر وەک باڵەخانەی نیشتەجییانی شار وایە، چونکە ماڵی خۆیانە و تێیدا دەژین. ئەمانە لە جێی خۆیانن، ئەوەی ئەوان بەکوڵیانەوەیە، هەر جێیێکی خۆش بێ ڕەشماڵی لێ هەڵدەدەن. ئەو نازەنینە یەکێکە لە سیاچەمانی هەورامان لەناو ڕەشماڵێکدا ژیاوە، لەو کاتەی مەولەوی چاوی پێی کەوتووە لە پەنا دەرگای ڕەشماڵ تەماشای سروشتی ڕەنگاوڕەنگی کردووە. نازەنین مەولەوی دیوە یا نا! ئەمەیان گرنگ نییە، کەچی مەولەوی ئەوی دیوە و بووە بەسەرچاوەی ئیلهام و ئەم شیعرەی دروست کردووە.

دەموچاوی دلبەریان بەمانگ چواندووە، ئەم وێنەیە ڕەسەن نییە لەناو ئەم شیعرەدا. لە ئەدەبی کوردی و ئەدەبی نەتەوەکانی دراوسێدا وێنەی جوانی لەم جۆرە دەبینرێ، داهێنانی مەولەوی لەم شیعرەیدا وێنەی زۆرە. یەکێ لەو وێنانە ئەوەیە شاعیر بووکی خەیاڵی خۆی دەدۆزێتەوە، واتە ڕوخساری ئەو کچەی لە پەنای ڕەشماڵدا دەرکەوتووە هەر ئەو وێنەیەیە لە دڵ و دەروونی شاعیردا دروست بووە و بووکی خەیاڵی پێ دەڵێن.

وێنەیێکی دیکەی ئەو نازەنینە، ڕەوتی نەرمونۆڵی زەوی منەتبار کردووە، بەنازەوە باوەشێنی تاریکی کردووە، بۆ ئەوەی ڕووناکی پەیدا ببێ و نازەنین ببینرێ، ئەم دیمەنەی بەراوورد کردووە لەگەڵ ئاوی ژیان، چونکە ئەو ئاوە لە تاریکستاندایە، واتە دلبەر ڕووناکییە وەک ئاوی ژیان لە تاریکاییدا دەژی.

ئەم شیعرەی مەولەوی لە گێتیی داهێنانی شیعریدا دەچێتە ناو ئەو بەرهەمانەی وێنەی هونەرێکی هەمیشە زیندوویان دروست کردووە لە ڕووی ئیستیتیکی و ڕەوانبێژییەوە.

### خۆشەویستی و مرۆڤایەتی

مەولەوی سۆفی تەریقەتی دەروێشی بوو، بەحسێب دەبوو گۆشەگیر و دوور بێ لە کۆمەڵ و لە جموجۆڵی کۆمەڵایەتی نزیک نەکەوێتەوە، کەچی کەسانێک بووە دۆست و برادەری زۆر بووە، لە هەموو چین و توێژێکی کۆمەڵ هاوڕێی نزیکی بووە. ئەم پێوەندییە کۆمەڵایەتییە لە بەرهەمی ئەدەبیدا ڕەنگی داوەتەوە، زۆربەی نامە بۆ هاوڕێیانی بەشیعر بووە، جگە لەوەی کۆمەڵێک شیعری هەیە سۆزی دەروونی ناوەوەی دەردەبڕێ بەرامبەر بەو کەسانە. لە خۆشەویستی خۆی دەدوێ بەرامبەر ژیان، بەشان و باهوویان هەڵدەڵێ و شانازییان پێوە دەکا.

-١-

لەو سەردەمەی مەحموود پاشای جاف لە ساڵی ١٨٧٤ لە بەغدا دەژی مەولەوی بەم پارچە لیریکە یادی دەکاتەوە:

جە دووریت دەروون مەوج دەریای هوون
مدۆ وەچەمدا، بەڵام چێش کەروون
پایتەخت مەحموود دارولسەلامەن
منیچ کەمی فام ئەیاز جە لامەن
ئەیازت فاماش تەفائول کەردەن
سلامەتیی تۆش وەیاد ئاوەردەن
وە خار و خاشاک موژەی چەسپیدە
سەد بەستەن نەدەور سەرچەمەی دیدە
وەرنە دیجلەی غەم توغیان کەردە بێ
تا ئێستا چەند جار بەغداش بەردە بێ



واتاکەی:

لە دووریت جۆشی سەرچاوەی چاوان
کەوتە سەربەستی جۆگە و سەرچاوان
پایتەختی مەحموود دارولسەلامە
منیش کەمی فام ئەیاز لەلامە
ئەیاز تێگەیی هەڵسا دەستوبرد
سەلامەتی تۆی تیا تێبینی کرد
بەدڕکوداڵی برژانگی نووساو
بەرهەڵستی کرد سەیلی چاوە چاو
ئەگینە دیجلەی چاو ئەرخەوان سوور
بەغدای ئەکردە دەشتی شارەزوور

«پیرەمێرد»

لەم شیعرەدا جگە لە سۆزی دەروونی بەرامبەر بەمەحموود پاشا، مەولەوی یادی ڕووداوێکی مێژوو دەکاتەوە، ئەو ڕووداوە بەراوورد دەکا لەگەڵ پێوەندی نێوان خۆی و مەحموود پاشا و، دەڵێ دارولسەلام (بەغدا) پایتەختی مەحموود پاشای جافە، چونکە نیشتەجێی ئەوێیە، کە ناوی ئەیازی (هەیاسی خاسی) یار و یاوەر و وەزیری سوڵتان مەحموودی غەزنەوی دەبا، ئەو کاتە ئاشکرا دەبێ مەولەوی دەیەوێ مەحموود پاشا بێنێتە پلەوپایەی سوڵتان مەحموود، ئەودەمە بێ گومان خۆی دەبێتە ئەیازی پاشای جاف.

دووری پاشا لە مەولەوی لافاوی خوێناوی لە چاویدا هەڵدەقوڵێنێ، بۆی هەیە بەغدا نوقوم بکا بە دیجلەی فرمێسکی ئەو چاوە. بێ گومان بەغدا بێ دیجلە نابێ.

-٢-

مەولەوی شیعرێکی بۆ کچێک نووسیوە بەدڵی بووە، بەکوڵ چاوەڕێ بووە بێتە لای، بەڵام هەر نەهاتووە تا سۆمای چاوی داهاتووە. ئەو پەریزادە کێ بوو! هەندێ دەڵێن ناویشی پەریزاد خان بووە لە نەوەکانی بەگزادانی جاف، خەڵکی دیکە لەسەر ئەو باوەڕەن ناوی ئامینە خان بووە خێزانی بارام بەگی جاف، هی دیکە دەڵێن ناوی ئامینە خان بووە لە بەگزادانی جاف و خوشکی شیری مەولەوی بووە. ئامینە خان هەواڵی بۆ مەولەوی ناردووە حەز بەدیدەنی دەکا و دەچێتە لای، کەچی لەدواییدا پەشیمان بۆتەوە و بۆی نووسیوە چاوەنۆڕ نەبێ.

ئەو کچە کێ دەبێ ببێ گرنگ ئەوەیە بووە بەسەرچاوەی ئیلهامی ئەم شیعرە ڕەندەی مەولەوی. بەهۆی ئەو برە شیعرەی مەولەوییەوە دەکرێ «ئامینە» ببێ بە بووکێکی تری خەیاڵی شیعری کلاسیکی کوردی:

دەرد وە بان دەرد زامان کاری
گرد جە لام جەم بی یە تەشریف ماری
ئای یە چێشت کەرد تەشریفت ناوەرد
دەردت داوە دەرد مەینەت ماتەم کەرد
ئیسەیچە دیدەم چەم ها وە ڕاوە
هەڵای سەر وەشم بەو تەمنناوە
ئەمرت موتاعەن ( أَطَعْنا) وەندم
دوعای چەمە زەخم جە پیران سەندم
تەعویز بەند ڕیشەی دڵەی سەد پارەم
بەرگش پەرەی جەرگ وە دەرد ئاوارەم
حافز بۆ وە عەشق مەستان یاهوو
بپێچەش نەدەور باهووی بێ ئاهوو
ئینە عادەتێن وە زاهیر ئامان
وەرنە هەی سەرخێڵ نازک ئەندامان
تۆ ئیند نازکیت جە حەد و بەردەن
بینایی خەیاڵ ڕاگەش گوم کەردەن
سەفات خەجاڵەت دان وە جام جەم
دیدەی بەد مەر عەکس وێش بدیۆ وە چەم
دیدەی بەد دەردش نادیاری بۆ
جەکۆ موینۆت تا لێت کاری بۆ

واتاکەی:

دەردی دوای دەردی، دەردی نهێنی
گشتی کۆ بوو لام تۆ تەشریف دێنی
چیت کرد ئەمە تۆ؟ ئای بۆ نەهاتی
دەردت دا بە دەرد غەم بە مەینەتی
ئێستاش دیدەکەم چاو بەڕاتەوە
هێشتا سەرخۆشم بەو ئاواتەوە
ئەمرت لەسەر (أَطَعْنا) خوێندم
نزای چاوەزار لە پیران سەندم



قەیتانی ڕیشەی دڵەی سەد پارەم
بەرگی پەڕەی جەرگ بەدەرد ئاوارەم
مەحرووس بە عشقی مەستانی یاهوو
بیدە لە دەوری قۆڵی بێ ئاهوو
ئەمە خوویێکە باوە لە لامان
ئەینا سەرخێڵی ناسک ئەندامان
تۆ هند ناسکیت لە حەد دەرچووە
بینایی خەیاڵ ڕێی لێ گوم بووە
بەجوانیت سەفای جامی جەم شکا
مەگەر دیدەی بەد خۆی تیا بەدی کا
دیدەی بەد دەردی نادیاری بێ
لە کوێ ئەتبینێ تا لێت کاری بێ

«ئەردەڵانی»

مەولەوی لەم شیعرەدا هەستی ناوەوەی دەروونی دەپژێنێ بەرامبەر ئەو ئامینەیە. چاوەڕوانی دەردێکی گرانە، بەتایبەتی ئەگەر نەگاتە ئەنجام و دلبەر لە دڵدار نزیک نەبێتەوە. ئەم هۆگرییەی شاعیر و ئەم ئارەزووە بەکوڵ و پڕ لە سۆزەی بۆ بینینی ئامینە ئەگەر لەوەوە هاتبێ وەک خوشکێکی شیری تەماشای کردبێ، حەزی مەولەوی دەچێتە ناو گێتیی بێ پایانی سۆفیزم، چونکە ئامینە مەحرەم بووە بۆ شاعیر، ئەگەر ئەم خوشکایەتییەش ڕاست نەبێ بۆی هەیە وەکو هەموو عاشقێک دڵی بچێتە جوانێکی وەک ئەو ئامینە نازدارە.

-٣-

مەولەوی پێوەندی بەشاعیر و خوێندەوارانی سەردەمی خۆی بووە، لەناو ئەمانەدا دۆستایەتی بەهێز بووە لەگەڵ ئەحمەد بەگی کۆماسی، لە دیوانیدا کۆمەڵێک لیریک بەر چاو دەکەون، هەندێکیان بەیادی کۆماسی هۆنراوەتەوە، بڕێکیشیان وەک نامەی شیعری بەرەو ڕووی کراونەتەوە. لە یەکێ لەم نامە شیعرییانەدا مەولەوی بەکۆماسی دەڵێ:

جە گیان سێر وەردەی جە تەن هەراسان
خالۆی خەمیای غەم خاڵ خاڵ خاسان
نامەم چون یاوا مولاحەزەت کەرد
بشۆ وە پا بۆس عەرز کەر جە ڕووی دەرد
واچە هەی سەد جار (مەعدوومی) توفەیل
پەرسا بێت جە ڕووی گەرمی کوورەی مەیل

کۆ جە دووریی من چ تەورەن حاڵش
کێ بەر مەکەڕۆ خەم نەخەیاڵش
هام فەرد ناڵەی دڵ سەیرانگە ستەم
هام دەرد دەروون خەم بەرکەر کۆی خەم
هەر سات وە نەوعێ دەردش خەتەر بۆ
حاڵش چ تەورەن خاکش وەسەر بۆ
تۆ خاسەن نەو تووڵ سەر و سەراوان
خەم مەدەی وە باد شنۆی سەر کاوان
گا چون بۆی نەسیم وە دووی شەتاودا
گا چون گوڵ نەپای چۆڕەی وەفراودا
سەیر لەرزەی بەزم سەوزەی سەر بەرزان
سەفای گولاڵان سەد تەرزان لەرزان
سوب نە سەر ملان سەیادان هام دەم
شریخەی ماردم کلافەی کەڵ ڕەم
نەک چون ئەو پابەند قەڵای شار دەرد
جەی وەهار چون وەڵگ پایزان ڕەنگ زەرد
ئاخ نە جەهد و جەخت داخ زامەت سەخت
بەرگ ماتەم ڕەخت نارەسایی بەخت
کزەی خەم چون موو یەنەش وەردەن
دووریت خۆ یەکجار تەمامش کەردەن
وخت جۆش دەرد کزەی ناڵەی سەرد
گوم بۆ نەگێجاو کەردەلوول دەرد
ئەو خەندەی بێ وەخت مەیۆش وە دام دا
مەگێلۆ ماچۆ نەو گێچ و تەمدا
ئەر هەر ئەو بەختەن هەر ئەو تاڵەمەن
دیدەم دیدەنیت ئەڵڵا و ئاڵەمەن



واتاکەی:

لە گیان تێر خواردوو لە لەش هەراسان
خاڵۆی کۆماوەی خاڵی خاڵ خاسان
ئەم کاغەزەم نارد لەگەڵ خوێندتەوە
بچۆ پێی ماچ کە بەحەسرەتەوە
بڵێ ئای (مەعدووم) کەس لێی نەپرسیو
تۆ لێت پرسی بوو وەک خێر بە هەتیو
چۆنە لە دووریم، چۆن ڕادەبوێری؟
کێ دیاری خەم؟ بۆ ئەو ئەنێری
هام فەرد ناڵەی دڵ سەیرانگە ستەم
هام دەرد دووی دەروون خەم ڕەوێن کۆی خەم
ساتێ بەڕەنگی دەردی خەتەر بێ
هەڵکردی چۆنە خاکی بەسەر بێ
تۆ جا کە وەک تووڵ سەروی سەراوان
خەم ئەدەی بەبای شنۆی سەرکاوان
گاه وەک بۆی نەسیم بەڕووی شەتاودا
گاه وەک گوڵ لەژێر هاژەی بەفراودا
سەیری لەرزەی بەزم سەوزەی سەربەرزان
سەفای گولاڵان سەد تەرزان هەرزان
بەیانیان لەگەڵ ڕاوکەر لەسەر کەل
شریخەی تفەنگ کلافەی کەل گەل
نەک وەک ئەو پێبەند قەڵای شاری دەرد
لە بەهاردا وەک گەڵای پایز زەرد
ئاخ لە دەست داغی کوێرەوەری سەخت
جلوبەرگی ماتەم ناهەمواری بەخت
کزەی خەم وەک موو بەپێچ و بەختم
هێجگاری دووریت خستوومیە ئەلەم
کاتی جۆشی دەرد کزە و ناڵەی سەرد
کەم بوو لە گێژاو گەردەلوولی دەرد
ئەو زەهر خەندەی دێ بەسەر دەمدا

ئەگەرێ و ئەڵێ لە گێژی تەمدا
ئەگەر هەر ئەو بەخت هەر ئەو تالعە
دیدەم دیدەنیت بەخوا راجیعە

«پیرەمێرد»

لەم شیعرە و لە هەموو شیعرەکانی دیکەی مەولەوی کە بۆ مەبەسی موناجات لەگەڵ کۆماسی دایناوون بە «خاڵۆ» ناوی دەبا. ئەم دیاردەیە بووە بەباو لە ناوچەکانی هەورامان و شارەزوور و سلێمانی هەرکەسێک ناوی شاعیر بکەوێتە سەر زاری بە «خاڵۆی کۆماسی» ناوی دێنێ.

لەم شیعرەدا مەولەوی لەو هەموو غەم و پەژارەیە دەدوێ کە هەردووکیان هاوبەشن تیایدا، ئاوڕدانەوەی جوانی هونەری دەکەوێتە بەرچاو کە دەڵێ: سەرەڕای ئەم هەموو مەینەتییەی هەردووکمان هاوبەشین و لە ناویدا دەژین، دووری ئێش و ئازاری زیاتر کردووە.

لە ئاوڕدانەوە جوانەکانی دیکەی ئەوەیە، کەس هەواڵی شاعیری نەپرسیوە، ئەگەر کۆماسی یا هەر کەسانێکی دیکە لێی بپرسن وەک ئەوە وایە چاکەیێکیان لەگەڵ هەتیو کردبێ.

مەولەوی لێرە و لە کارەکانی دیکەیدا ناتوانێ لە سروشت دوور بکەوێتەوە، یەکێ لە لایەنە سەرکەوتووەکانی لە شیعردا ئەوەیە هەندێ جار ئەو مەبەسەی گەرەکیەتی بیکا بەشیعر هیچ پێوەندییێکی بە سروشتەوە نییە، بەڵام ئەو بەڵگەی بەراوورد لەنێوانیاندا دەدۆزێتەوە، ئەمە دەبێتە مایەی داهێنان لە بەرهەمەکەیدا.

**فرمێسک و زام**

مەولەوی بۆ خۆشەویست و هاوڕێ و دۆستانی کە کۆچی دواییيان کردووە فرمێسکی گەرمی ڕشتووە. بایەخێکی زۆری بەم لایەنەی هەستی دەروونی داوە، لەوە پێشیش ئەو نزیکانەی بە وەسف و پێداهەڵگوتن بەسەر کردۆتەوە و لە کاتی ناخۆشیدا لە بیری نەکردوون.

لە دیوانی مەولەویدا ماتەمنامەی شیعری زۆرە بۆ گەلێ کەس، لە هەموو توێژەکانی کۆمەڵ، لە سەرووی ئەمانە هەموویانەوە کۆمەڵێک لیریکی هەیە وەک ماتەمنامەیێکی شیعری بۆ مردنی عەنبەر خاتوونی ژنی نووسیوە.

-١-

عەنبەر خاتوون لەپێشەوەی هەموو ئەو کەسانەوەیە کە مەولەوی فرمێسکی بۆ ڕشتوون، بۆ عەنبەر خاتوون دەڵێ:

شووڕای عاشوورا دیسان بەزمش بەست
موحەڕەم ئاما مەحەڕەم شی نەدەست



ئەو خەریک نەچۆڵ شار عەدەمدا
من نە کەربەلای سارای ماتەمدا
ئەو یەزید مەرگ وە ئەسیر بەردە
من زادەی زیاد خەم یە قیر کەردە
بازارەن وادەی مامەڵەن ساقی
هەی بگرە فاتی وەی بەدەر باقی
ڕۆ حوسەین ئاسا فەردا کەڕۆ بۆ
داخۆ سەرجەکۆ لاشەم جە کۆ بۆ

واتاکەی:

هەرای عاشوورا دیسان بەزمی بەست
موحەڕەم هات و مەحرەم چوو لە دەست
ئەو سەرگەرمی چۆڵ شامی عەدەمدا
من لە کەربەلای دەشتی ماتەمدا
ئەو یەزیدی مەرگ بردی بەئەسیر
زادەی زیادی خەم منی خستە قیر
بازارە وادەی سەودایە ساقی
هەی! بگرە فانی، وەی! بێنە باقی
ئای حوسەین ئاسا سبەی لە نوێ بێ
ئاخۆ! سەر لە کوێ؟ لاشەم لە کوێ بێ؟

«ئەردەڵانی»

لە سەرانسەری دیوانی مەولەوی ئەو ڕاستییە دەردەکەوێ، عەنبەر خاتوونی خێزانی خۆشویستووە، لە ژیان و مردنیدا کۆمەڵێک شیعری بۆ جوانی ئەو و هەستونەستی خۆی بەرامبەر بەو دەربڕیوە. لیریکە دڵدارییەکانی بۆ ئەو ژنە ڕاستگۆ بووە، لە لاواندنەوە و شیعری ماتەمنامە خەیاڵی فراوان و بینینی ورد بووە، لەم شیعرەدا مردنی خێزانی بەمردنی حوسێنی شەهیدی کەربەلا چواندووە، شین و شەپۆڕ تا ئێستاش لە واوەیلای (وا حوسێن و شاحوسێن) کۆتایی نەهاتووە لە دوارۆژیشدا دەمێنێ.

-٢-

کەنیشکێکی جاف ناوی ئامینە یا پەریزاد بووە کاری کردۆتە سەر هەستی ناوەوەی شاعیر، هێشتا ساغ نەبۆتەوە کامەیان ڕاستی مەسەلەکەیە، یا لەوانەیە دوو کەس بن ئامینە و پەریزاد و، پێوەندی لەگەڵ هەردووکیانا بووبێ. هەر چۆنێ بێ ئەو دلبەرە کە لە ژیاندا بووە مەولەوی بایەخی زۆری پێ داوە، شیعری

مەدح و ستایشی بۆ داناوە، نامەی شیعری بۆ نووسیوە، کە مردووە فرمێسکی بۆ ڕشتووە، لە شیعرێکیدا دەڵێ:

پەشێوی وە نەزم لوولووی ئەسریندا
پەروین دائیرەی خورشید تەزییندا
جای ناخوون وە خوون ئەو گۆنای بێ گەرد
ئیشارەت وە مانگ مەینەت دڵ کەرد
شیرینی قامەت قیامەت نەوەرد
سەلای فەرز بەرگ ئازیەتی ئاوەرد
هەنی فتوای شەرع بادە نۆشان بۆ
حەلاڵیی کالای ماتەم پۆشان بۆ
وەشەن ئەو بالا چون بەو کالاوە
بازش ئەو کالا هەر بەو بالاوە
حەیات جە زوڵمات جیا نمە بۆ
کاوە وە بێ بەرگ سیا نمە بۆ

واتاکەی:

ڕشتەی لۆلۆی ئەشک ئاڵۆزانەوە
پەروین گۆی ڕۆژی ڕووی ڕازانەوە
خوێنی جێ نینۆک لە ڕووی وەکو گوڵ
نیشانەی مانگی غەم و دەردی دڵ
حەشر ئەنگێزی جوانیی قامەتی
فەرزی کرد سەلای بەرگی ئازیەتی
سا فتوای شەرعی بادە نۆشانە
حەلاڵیی کالای ماتەم پۆشانە
شەنگە ئەو بالا ئا بەو کالاوە
وازبێنە تۆ لەو کالا و بالاوە
حەیات لە زوڵمەت جیا قەد نابێ
کەعبەش بێ بەرگی سیا قەد نابێ

«ئەردەڵانی»

لەم پارچە شیعرەدا مەولەوی هەندێ وێنەی جوانی شیعری خستۆتە ڕوو. شاعیر لە شین دایە بۆ



نازەنینێک، هەوێنی ئەم کارەی لە هەستی ناسکەوە دەپژێ کە فرمێسکە. فرمێسک مرواریییە بەتایبەتی لەو دەمەی بەڕووی نازدارانەوە دێتە خوارێ کە بۆ دلبەری کۆچ کردوو دەلاوێننەوە، هەموو دیاردەیێک لە سروشتدا ڕەش هەڵگەڕاوە، لە ماتەم دایە، تەنانەت ئاوی ژیانیش کە لە ئەشکەوتێکی تاریکستاندا هەڵدەقوڵێ، بەردە ڕەشی دیواری کەعبەش لەولاوە بوەستێ، بەم بۆنەیەوە بەرگی ڕەشی پۆشیوە.

-٣-

خالۆی کۆماسی، شاعیری ناودار تەنیا لە ژیانا جێی بایەخی مەولەوی نەبووە، لە مردنیشدا فرمێسکی گەرمی بۆ ڕشتووە، لە یەکێ لە شیعرەکانیدا لەم بابەتەوە دەڵێ:

ها! یاران بەرشین جە زێد وەزامن
گرد تەفرە قەبین چون خەیال من
گەرد کۆچشان ئانا دیارەن
دەک لێلاویت بۆ چۆنت قەرارەن
سەنگی بار هۆش پێشبار فامت
دەوار شادی چیخ ئارامت
لوان چەنی کۆچ خاڵۆکەی هام فەرد
ئیسە بار وستەن نەهەوارگەی هەرد
تۆ چێش مەکەردی؟ کەم هۆش و کەم فام
پەرێ عەیب و عار مەندەنی جە لام
سا چەنی ئەرواح یاوە وە یاران
با تەن بۆ وە سەنگ مەندەی هەواران

واتاکەی:

یاران ها! دەرچوون لە زێد بەزامن
بڵاوبوونەوە وەک خەیاڵی من
ئەوەتا گەردی کۆچیان دیارە
کوێراییت دایێ چۆنت بڕیارە؟
باری قورسی هۆش پێشباری فامت
دەواری شادی، چیخی ئارامت
چوون لە تەک کۆچی خاڵۆی هاوفەردا
ئێستا ئارامن لە هۆبەی هەردا

تۆ خەریکی چیت؟ کەم هۆش و کەم فام
بۆ نەنگ و تەشەر مایتەوە لەلام
سا لە تەک گیانا بگەیە یاران
با تەن بەردێ بێ ماوەی هەواران

«ئەردەڵانی»

لەم شیعرە ماتەمییەدا مەولەوی وردەکاری داهێنانی هونەری دەنوێنێ، فرمێسک بۆ کۆماسی و هەموو یارانی دەڕێژێ و، دەڵێ ئەوان هەمـوویان مـاڵاواییـیـان لە گـێـتی کـرد، لە ژێر زەوی (گـۆڕسـتـان) بڵاوبوونەوە، وەکو خەیاڵی بێ سەروشوێن و بڵاوبووی خۆی. هەروەها بەڵگە بەکاروان و کاروانچییان دێنێتەوە، دەڵێ ئەوان باری سووک لە ڕیزەکانی پێشەوەی کاروان بار دەکەن، بەڵام باری قورس لە دواوە دەبێ. ئیتر شاعیر بەخۆی دەڵێ باری قورست کە هۆش و هەستتە، وە باری سووکت کە ئەقڵ و بیرتە، لەگەڵ کاروانی کۆچی خاڵۆی کۆماسی بارکردووە.

## مرۆڤ و کردەوە

لە شـیـعـری مـەولەویدا جگە لە وێنەی ئامـانجی تاک (من) و جـووت (من و تۆ)، ڕەنگدانەوەی کۆمـەڵیش (هەمـوو) دەکەوێتـە بەرچاو، وەکو وێنەگرتنی بەشێک لە دیاردەی کۆمـەڵایەتی و پێـوەندیی ئادەمزاد بەیەکتریەوە، هەندێ کردەوەی لە ئەنجامی هاوکاری و بیری گشتی دەکەوێتە ناوەوە.

-١-

مەولەوی شیعرێکی بۆ وەسفی کۆچی جافان داناوە لە کوێستانی داڵەهۆی ناوچەی پاوەوە بۆ دەشتی زەهاو، تێیدا دەڵێ:

شەماڵ دارانەن، شەماڵ دارانەن
زەردیی ڕەنگ نە ڕووی وەڵگ دارانەن
تەمەن گەردەلوول، بادەن بارانەن
بێزیای بارگەی سەر کۆسارانەن
هەوای سیامال وێنەی جارانەن
پەی سەمەت زەهاو زەردە و یارانەن
هەو هەوو بەو بەو تەڵمیت بارانەن
گەرمیی بەزم نەزم سەر هەوارانەن
نەزارەی ڕای ڕاز شەکەر وارانەن
فەسل سەیر سەید میر شکارانەن



چ خێرەن نامەرد مەر جە خاوەنی
بێ خۆف جە لوای ڕای زەهاوەنی
شۆ وەلای ئەو شۆخ جەمین پەڕەی گوڵ
دەوای دەرد سەخت پەی دەرمان دڵ
مەدیۆ وە فیرقەی زەلیلان خێڵ
دیار نییەن مەعدووم لۆنگ خەم وە پێڵ
مەپرسۆ حاڵم ئیدش دەر جەواو
واچە ئەو فەقیر سفتەی دڵ کەواو
ئانا دەور مەدۆ وە شاهۆ کۆوە
وە سزای دووریی دیدار تۆوە
هەریەک چەنییەک وادەشان کەردەن
وادەشان ڕاستەن تا وە ڕۆی مەردەن
ئەو تا سایەی بەرد ئەو تا بۆ وەگەرد
ئەو تەم و ئەو خەم ئەو سەردی ئەو دەرد
خولاسەی کەلام نوور دیدەی دڵ
شیفای ئێش و نێش زامان پێ حاسڵ
سەوزەی حەیاتم ڕستەی وەفای تۆن
ئەو وەفات نەبۆ زیندەگیم جە کۆن

واتاکەی:

شەماڵ دارانە، شەماڵ دارانە
ڕەنگی زەرد لەسەر پەلکی دارانە
تەمە و گەردەلوول، بایە و بارانە
تۆفی هەوارگەی سەر کۆسارانە
هەوای سیا ماڵ وێنەی جارانە
بۆ شاری زەهاو پەڵەی بارانە
هەو هەو بەو بەوی بارگە سوارانە
گەرمی بەزمی نەزم سەر هەوارانە
تامی شەکەر ڕاز شەکەر بارانە
فەسلی سەیری سەید میر شکارانە
چ خێرتە نامەرد مەگەر تۆ نوستووی

بۆ چ کۆچی ڕێگای زەهاو نەبیستووی!
بچۆرە خزمەت شۆخی جەمین گوڵ
دەوای دەردانە و دەرمانە بۆ دڵ
ئەڵێی بەفیرقەی زەلیلی خێلان
دیار نییە (مەعدووم) لونگی خەم بەشان
کە ئەو وا پرسی تۆ وەرە جواب
بڵێ ئەو لێوەی دڵ بە خەم کەباب
گەرد و خولیەتی بەشاهۆ کۆوە
بەسزای دووری دیداری تۆوە
پەیمانیان لەگەڵ یەکتر بەستووە
لەناو خۆیاندا بەشیان کردووە
ئەو تا ژێر ئەلحەد، ئەتابێ بە گەرد
ئەو تەم و ئەو غەم ئەو سەرما و ئەو دەرد
خولاسەی کەلام نووری دیدە و دڵ
شیفای ئێش و نێش زامان بێ حاسل
سەوزەی حەیاتم بەوەفات ڕوا
کە وەفات نەبێ زیندەگیم کوا؟

«پیرەمێرد»

لەم برە شیعرەدا مەولەوی باس لە هەندێ نەریتی کۆچی عەشرەتی جاف دەکا، لە ناوچەییێکی دیاریکراوی گەرمیان و کوێستانیان دەدوێ. شانۆی ئەم جموجۆڵییە ناوچەی زەهاو و شاخی شاهۆیە، ئەو کۆچەرانە بەسەر گوندی زەردە و یاوان تێدەپەڕن، قۆناغەکانی کۆچی عەشرەت ماوە دەرەخسێن بۆ ڕاوی کارمامز و ژیانی خەڵکی لەناو بەهاری ڕووتدا چێژێکی تایبەتی دەدا بەمرۆڤ.

مەولەوی بەبێ وردەکاری ئیستێتیکی و داهێنانی وێنەی هونەری ناژی، خۆی وا پیشان دەدا هەموو ژیانی غەم و پەژارەیە، شاخی شاهۆش لەبەر بڵندی بێ تەمومژ نابێ، لەبەر ئەوە لە یەکترییەوە نزیکن، پەیمانیان لەگەڵ یەکتریدا بەستووە، هەردووکیان وا دەمێننەوە تا دوایی ژیانیان، مەولەوی بەمردن کۆتایی بەئازاری دێ، شاخی شاهۆ لە ڕۆژی قیامەت دەبێ بەتۆز و گەرد و دوایی بەژیانی دێ.

-٢-

شاعیر لە لیریکێکی دیکەیدا لە بەخت دەدوێ وەک پیشاندەرێکی چارەنووسی ئادەمزاد و دەوری ئەو کەسە پیشان دەدا لە چاکە و خراپە، بەختیاری و بەدبەختی مرۆڤ لە شیعرەکەیدا دەڵێ:



سەد پەرێم دایم خەم بەستەن کەڵەک
ئاخ هەر یەکجار داخ تۆ سەوزەن فەڵەک
مەپێکی ناکا جە نیمە ڕا دا
نیگای ئارەزوو وە تەمەنا دا
کام سەر شام تەمای تاج (کەی)ت کرد
سوبح دەم وە تاج سەر نەییت نەکرد
کێ بی کێ مەجلیس شادی بناوە
پۆس کەللەش وە دەف تۆ دەنگ نەداوە
(مەعدووم) ئەر زەڕەی شێوەی فاماتەن
بەفام قەرینەی لوات ئاماتەن
ئەی ڕاڕای خەتەر ڕاو یارانەن
سفیدیش غوبار کەللەی یارانەن
بورکەش چای دیدە پڕ هووناو دڵ
میل بالای بێ گیان وا مەندەی خجل
ها سەف پێکان پۆس کەللەهام دەمان
کەللە بڕ پەی پۆس کەللەمان تەمان
هۆر دەر چەنی سۆز دەروون پڕ نێش
فەریاد ئەو ساقی و ئەو نە یچی و دەروێش
سەدای دەف و نەی بەیۆ نەگۆشت
نەشئەی مەی بەخشۆ حەیات وە هۆشت
بویەر جە سای تەرز دەف و نەیەوە
وە زات مەستیی نەشئەی مەیەوە
تا کەی کە نۆ دەست چەرخ چەپ ئەندێش
پۆس کەللەت پەی پۆس کەللەی وێش

واتاکەی:

هەر چەند خەم دایم لێی بەستووک کەلەک
ئاخ تەنها داخی تۆ سەوزە فەلەک
ئەدەی بەیەکدا لە نیوە ڕا دا

نیگای ئارەزوو بەتەمەنادا
کام سەر؟ نەتخستە سەودای تاجی کەی
دوایی نەتکردە تاجی نێزەی نەی
کێ بۆ کێ بەزمی شادی نایەوە
پۆست کەللەی بەدەف دەنگی دایەوە
(مەعدووم) ئەگەر تۆ ئەهلی داناییت
نزیکە بەفام کۆچی دواییت
ئەم ڕێیە ڕێی ترس ڕێبوارانە
سپیەتی تۆزی کەللەی یارانە
حەوزی چاڵی چاو پڕ خوێناوی دڵ
میل باڵای بێ گیان نەگەیوە مەنزڵ
ڕێزی بەستووە پێستی کەللەی سەر
سەر بڕ بۆ پێستی کەللەی تر حازر
بەرزکە لەگەڵ سۆز دەروونی پڕ ئێش
هاوار بۆ ساقی و نەیژەن و دەروێش
دەنگی دەف و نەی زیاترکا جۆشت
نەشئەی مەی حەیات بدا بەهۆشت
ڕابوێرە بەهۆی دەف و نەیەوە
بەزۆر و زاتی نەشئەی مەیەوە
تاکەی؟ دەستی چەرخ بەئێش و بەوەی
بگروو پێستی کەللەت بۆ کەللەی

«پیرەمێرد»

شاعیر لەم شیعرەدا لەگەڵ گەردوون دەدوێ، ئەوە دەخاتە ڕوو یەکسانی لە کردەوەکانیدا نییە، هەموو کاروباری تەنگوچەڵەمە و پێچەوانەیە. ئێوارە تانجی کەیخوسرەو دەخاتە سەری پیاو، بەیانی سەری دەبڕێ و پێستەی کەللەی دەکا بەدەف بۆ بەزمورەزمی سەرخۆشان. ئاوڕدانەوەیێکی ئیستێتیکی جوانە کە مەولەوی بەخۆی دەڵێ ئەگەر تێگەیشتنت هەبێ پێویستە ئەوە بزانی ژیان بەڵگەی مردنە.

لە کۆتایی شیعرەکەیدا لەسەر دەستووری شیعری کلاسیکی کە شاعیر خەریکی مەسەلە و لێکدانەوەیێکی قووڵی بیری دەبێ و ناتوانێ بگاتە ئەنجام، پەنا بۆ مەی و مەیخانە و ساز و سەمتوور و مۆسیقا دەبا. خەیاڵی شیعری ئەوە دەردەبڕێ کە بێ هۆشی بەهۆشی دەبەزێنێ بۆ مەبەسی وێنەی شیعری داهێنراو.



**ئێش و ئازار**

ئێش و ئازار و ناخۆشی لە ژیانی مەولەویدا کەم نەبووە، بەتایبەتی کوێر بوون و سووتانی بەرهەمی شیعری خۆی و نامەخانەکەی، تا سەری ناوەتەوە لەناو خەیاڵیدا بزر نەبووە.

-١-

کوێر بوون بۆ هەموو ئادەمزادێک دژوارترین کارەساتی ژیانیەتی، لە سەرووی ئەوەوە کارەساتی دیکە نییە، بەتایبەتی بۆ یەکێکی خوێندەوار و ڕۆشنبیری وەک مەولەوی ماوەی حەسانەوەی خوێندنەوە یا نووسین دەبێ، ئەگەر چاوی نەبێ ئەم حەسانەوەیە لە ژیانیدا نامێنێ. مەولەوی بەهۆی کوێربوونیەوە دەڵێ:

بینای دیدەم تۆ وە سەلامەت
دیدەنیی دیدار کەوت ئەو قیامەت
ئەر بینش نیەن هەی ئاوات وازم
باز هەر تەسکینەن گۆش وە ئاوازم
وە دڵدا تەفسیل زەلیلی و یەرد
چێش جە ئەووەڵدا ئاخرش ئاوەرد
باز بێ تاقەتیم نەڕووی پەردەوە
دەرگای گوزەرگای چەند فەرد کەردەوە
هۆریزا و پێچ وەرد دووی کوورەی دەروون
ئاو ئاوەرد بەڵ هوون نەدیدەی گەردوون
ڕێزا جە سەردا بلێسەم کەم بی
ئەسباب تەحریر ئەی چەند فەرد جەم بی
باز چێش بۆ یاران دەروون پڕ داخەن
ئەغیاران دەماغ دڵ وە پەرداخەن
سەرد بییەن گەرمیی شەوق هام فەردان
گەرمەن سەردیی زەوق جەرگەی هاوەردان
ڕێزان سەوزەی گوڵ مەعاریف وەگل
چۆڵ بییەن چەمەن جە سۆزەی بولبول
نیگای ئیلتیفات گۆشەی چەم کەمەن
ڕووی دەشت سەفای ئەهل دڵ تەمەن

حەڵقەی خەفیەی زیکر ناڵەی هەزار ڕەنگ
چون حەڵقەی دەرگای وێرانان دڵتەنگ
مشیۆ جە گرد لا زاری و شیوەن بۆ
جە کام لا؟ لای دۆ، کام دۆس؟ وێنەی تۆ
کەی؟ ئیسە، پەی کێ؟ پەی دیدەی (مەعدووم)
چێش بییەن؟ بییەن جە دیدە مەحرووم
یانێ های ڕاسەن؟ یا قسەی ناسەن؟
دیارەن کردەی چەپ گەرد هەر پاسەن

واتاکەی:

بینایی دیدەم تۆ بەسەلامەت
بینینی دیدار کەوتە قیامەت
گەربینین نەما هەی ئاواتخوازم
واش هەر تەسکینە، گوێ بەئاوازم
شەرحی کەساسی ڕابورد بەدڵدا
دوایی پێ هێنا هەر لە هەوڵەدا
هەمدیس زویریم لە توێی پەردەوە
بۆ چەند هەڵبەستێ ڕێگای کردەوە
هەڵچوون بەلوولی، دوکەڵی دەروون
ئاو نارشتی خوێن لە چاوی گەردوون
ڕێژای بەسەریا بلێسەم کەم بوو
هۆی نووسینی ئەم چەن بەیتە جەم بوو
دیسان چی ڕوویدا؟ یاران پڕ لە داخ
دەماغی دڵی ئەغیاران پەرداخ
ها ساردە گەرمیی شەوقی هاوفەردان
هەم گەرمە ساردیی زەوقی هاودەردان
سەوزەی مەعاریف گوڵی هەڵوەری
لە سۆزی بولبول چیمەن بێ بەری
گۆشەی چاو نیگای ئاوری کەمە
ڕووی دەشتی سەفای ئەهلی دڵ تەمە



حەڵقەی کۆی زیکری ناڵەی هەزار ڕەنگ
چون حەڵقەی دەرگای وێرانە دڵتەنگ
لە هەر لا بەرزە، زاری و شین و ڕۆ
لە کام لا؟ لای دۆس، کام دۆس؟ وێنەی تۆ
کەی؟ ئێستا، بۆ کێ؟ بۆ دیدەی (مەعدووم)
چی بووە؟ بووە لە دیدەی مەحرووم
واتە واتەیە؟ یا ڕای بەدخوایە
گەردوون کردەوەی دیارە هەر وایە

«ئەردەڵانی»

مەولەوی لەدوای کوێربوونی لەم پارچە شیعرەدا بۆ شپرزەیی و پەژمردەیی خۆی دەلاوێنێتەوە. لەوانەیە ئەم لیریکە نامەیێکی شیعری بێ بۆ دۆستێکی خۆی نووسیبێ. لە شیعرەکەدا قسە لەگەڵ ئەو کەسەدا دەکا و پێی دەڵێ: لەم گێتییەدا لە مەولا چاوم پێت ناکەوێ، دەبێ چاوەنۆڕی ئەوە بم لە گێتییەکەی دیکەدا چاوم پێت بکەوێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هیوای ماوە و ڕەشبینی بەتەواوی ئامانجی کوێر نەکردۆتەوە، دەڵێ: گوێم بووە بەچاو، چونکە ئەگەر بەچاو نەتبینم، بەگوێ هەستت پێ دەکەم کە قسەکانت دەبیستم.

کارەسات کە بەرۆکی کەسێک دەگرێ دەبێتە مایەی ناخۆشی بۆ یاران و مایەی خۆشی بۆ دوژمنان. کارەسات تەرازوویێکە چاکە و خراپە لەناو کۆمەڵدا دەکێشێ و قورساییيان دیاری دەکا. کێ دەڵێ، دلبەر خۆی پیشانی دڵدار نادا! لە کاتێکدا مەولەوی چاوی نەبێ و شت نەبینێ، دەبێ بیر لەو تیۆرییە بکرێتەوە، ئەگەر شت نەبینم بوونی نییە! بێ گومان ئەمە ڕاست نییە. مەولەوی داوا دەکا لە هەموولایێک کۆڕی شین و شەپۆڕ و واوەیلا لەناوەوە بێ بۆ چاوی لەدەستچووی کە یەکێکە لە کردەوە ناهەموارەکانی گەردوون.

-٢-

لە لیریکێکیدا مەولەوی هەستی ناوەوەی دەردەبڕێ لە بابەت ئەوماڵسووتانەی کە مێشکی شاعیری وێران کرد نەک لەبەرئەوەی کەلوپەلی ماڵی سووتاوە و لەناوچووە، بەڵکو مەسەلە سووتانی دیوانی شیعر و کتێبی دیکەیەتی:

خامەی سەراوێز نەچای سیایی
مەڕێزۆ ئەسرین شەکوای جیایی
نامەی سەد شکەنج وە هەم پێچ وەردەن
چون من سەرتاپاش شکستەی دەردەن

دەوات دووی سـیــاش جـە دەم مـەخـێـزۆ
نـامــە سـیــاخــاک وەسـەر مـەڕێزۆ
دەوات دووی دەروون گـێـچـدان وە هەمـدا
لیـقـەوێش کـێـشـان وە لیـتـەی خـەمـدا
خــامــە شــەق وەردەن دەم مـەکـەردەوە
زار زار مــــــــــەنـاڵـۆ وە دەم دەردەوە
مـەوات هەی ئاوات واسـتـەکەی جەسـتـەم
هەی مـۆمــیــایی پیـشـەی شکسـتـەم
کــام زام بی جــەتۆ من نەویم نەســیب
جــەفــا هەر وە من وەفــایەی ڕەقــیب
زامــــان تاونـان هوو ناوان جــۆجـــۆ
دەرد وە بـان دەرد یـەجــــــە دووریـی تـۆ
بڕیان تـای ڕوباب قــافــیــە خــوانیم
نەمــەندەن تاقــەت عـیــبـارەت زانیم
دەمــەی هـەناسـەی گــەرم تـارەکــەم
نەکــوورەی دەروون پڕ جــەخــارەکــەم
ئـایـردان حــــوجـــــرەی دڵـەی پڕ دەردم
سـۆچنان کـتـاو مـەجـمـووعـەی فـەردم

واتاکەی:

قەڵەم سەرەوژێر کەوتە چاڵی ڕەش
فرمێسکی دادێ دووری بوو بەبەش
کاغەز وەک فەنەر تێک پێچرایەوە
وەک من سەرتاپای تێکشکایەوە
دەویت دوکەڵی ڕەش هەڵدەڕێژێ
نامە ریگ بەسەر خۆیا ئەبێژێ
دەویت دوکەڵی ڕەشی لە دڵدا
لیقە خۆی کێشا بەکووپەی لیلدا
قەڵەم شەقی برد دەمی کردەوە



جیرە جیری دێ بەدەم دەردەوە
ئەیگوت هەی ئاوات خواستووی هەناوم
هەی موومیایی ئێسکی شکاوم
کام برین بوو تۆ پێت نەگەیاندم
بەئاگری دووری هەڵت قرچاندم
برین هاتنە ژان خوێنیان ناوەستێ
ئەم ئێشە ڕێگای ژیان ئەبەستێ
تەلی روبابی قافیەم پچڕا
عیبارەت زانیم لە هۆش وەرگەڕا
کوورەی هەناسەی گەرمی ئاگرەکەم
تاوی شەرارەی دنیا داگرەکەم
ئاگری بەردایە حوجرەی دەروونم
مەجمووعەی شیعرم سووتا زەبوونم

«پیرەمێرد»

ئەم لیریکە لە نامەییێکی شیعری دەکا، مەولەوی بۆ دۆستێکی نووسیوە و هەواڵی ئاگر تێبەربوونی ماڵی پێ گەیاندووە. سووتانی ماڵی مەولەوی سەرچاوەییێکی گرنگ بوو بۆ کردنەوەی دەرگای داهێنانی هونەری.

شاعیر دەڵێ، شووشەی مەرەکەب دوکەڵی لێ هەڵدەستێ، کاغەز خۆڵی ڕەشی بەسەر خۆیدا کردووە، واتە مەرەکەب دەسووتێ، بۆیە دوکەڵی لێ هەڵدەستێ، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی وشک بێتەوە، هەروەها کە کاغەز خۆڵی ڕەشی بەسەردا کرابێ مانای ئەوەیە جێی سپی تێدا نەماوە و لە سەری نانووسرێ، ئەمە بەڵگەی کۆتایی نووسینە یا شیعرە، هەرچی قەڵەمیشە شەقی بردووە و لە نووسین کەوتووە. جگە لەمە ژێی تارەکەشی پساوە و ئاوازی لێ هەڵناستێ، لەلای مەولەوی نە شیعر ماوە و نە ئاواز و مۆسیقا. سووتانی شیعرەکانی بۆتە هۆی ئەوەی هەستیشی بسووتێ و لەناو بچێ، ئەو شیعرانەی لەناو هەست و دەروونیدا دەژین و هێشتا لەدایک نەبوون، ئەوانیش سووتاون، شیعر لای شاعیر نەماوە.

***

مەولەوی ئاگاداری تاقیکردنەوەی هەزار ساڵەی شیعری کوردی بوو لە ناوچەی هەورامان و هەموو ناوچەکانی گۆراننشین لە کوردستاندا. لە سەرەتای شیعری ئایینی یارسان (ئەهلی هەق) و شیعری ئاسایی ئایینی ئیسلام (سوننی و شیعی)، ئەوجا شیعری کلاسیکیی هونەری لەگەڵ هەمووشیانا ئەدەبێکی بەرزی نەنووسراوی سەرزار، دەتوانرێ بوترێ مەولەوی ئەم هەموو سامانەی دەورکردۆتەوە و لە داهێنانی شیعریدا گەیشتۆتە لوتکە. لە سەردەمی ژیانی ئەو بزووتنەوە یا ڕینیسانسی ئەدەبی لە

باشووری کوردستاندا لەسەر دەستی نالی لە ناوچەی سلێمانی دەستی پێ کرد، ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئەدەبی ناوچەکانی گۆرانئشین بەرەو خوار بێتەوە، ئەگەرچی تا ئێستاش هەر ماوە، بەڵام ئەدەبی باشووری کوردستان جێی ئەوی گرتۆتەوە. بەم جۆرە مەولەوی لوتکەی شیعر و دوا شاعیری گەورە بوو و لەدوای ئەو تا ئێستاش شاعیرێکی دیکە لە پلەی مەولەوی بەدیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردی هەڵنەکەوت.



## بەشی بیست و سێیەمین

## کوردستانی باکوور

### لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا

نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم خاکی کوردستان لە ڕووی سیاسییەوە ملکەچی ئەو دابەشکردنە بوو کە لە ئەنجامی جەنگی چاڵدیران (١٥١٤) لەنێوان سوڵتانی عوسمانی و شای عەجەم جێبەجێ کرا، ئەوەی لێرەدا سەرنج ڕاکێشێ ئەوەیە زۆربەی هەرە زۆری خاکی کوردستانی باکوور لەژێر فەرمانڕەوایی دەسەڵاتی عوسمانی بوو، ڕژێمی دەرەبەگی لەناو دەوڵەتی عوسمانی و سیاسەتی دەرەوەی لەگەڵ هاوسێکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی ڕووس و عەجەم سەرێشەیێکی زۆریان بۆ کورد دروست کردبوو، چونکە زۆربەی دانیشتوانی ئەم ئاقارانەی دەوڵەتی عوسمانی، کورد بوون. لە جەنگەکانی عوسمانی لەگەڵ هاوسێکانی، کورد زیانی گەورەی لێ دەکەوت، گەلێ جاریش مەسەلەی ئایین و ئایینزا دەوریان لە دیاریکردنی هەڵوێستی کورد هەبوو لەناو ئەو جەنگانەدا، وەکو مەسەلەی سوننە و شیعە لەگەڵ ئێران، ئیسلام و مەسیحی لەگەڵ ڕووسیا.

بەڕێوەبردن لەلایەن دەسەڵاتی دەوڵەتەوە لە ناوچە کوردییەکاندا شێوەیێکی وای وەرگرتبوو دەتوانین بڵێین فەرمانی دەوڵەت شتێک بوو، تیۆری یا بڕیار یا قانوون لە پراکتیکدا شتێکی دیکە بوو. بۆ بەڵگە لە ساڵی ١٨٠٠دا والی بەغدا قوباد بەگی کرد بە بەڕێوەبەری ئامێدی، ئەمە بەدڵی مراد خان نەبوو، ئەمەیان بەزۆر خۆی کرد بە بەڕەێوەبەری ئاکرێ، لەم کاتەدا عادل خان مانی گرت و بەزۆر خۆی کرد بەبەڕێوەبەری ئامێدی. ئەمە وێنەیێک بوو لە ئاژاوەی دەسەڵاتی عوسمانی، لەبەر ئەوە بۆی نەدەکرا هێزێکی نێوەندی هەبێ بتوانێ فەرمانڕەوایی ناوچە کوردییەکانیان پێ بسپێرێ، هەموو ئومێدێکی بە دەرەبەگی کورد خۆی هەبوو، ئەمانەش کامەیان بەهێز بوایە ئەویان سەر دەکەوت، بەڵام تەنگوچەڵەمەی لەگەڵ دەسەڵاتی دەوڵەت وەکو خۆی دەمایەوە، هەموو تەباییێک کاتیی بوو، زۆرجاریش دەوڵەت سوودی لە پێوەندیی دەرەبەگایەتی ناو ماڵی کورد وەردەگرت بەوەی شەروشۆڕی نێوانیان میللەتیان بێ هێز دەکرد و گەلێ جار خەڵکی ناچار دەبوون و داوایان لە دەسەڵاتی عوسمانی دەکرد هێمنی و ناکۆکی ناو کۆمەڵیان بۆ جێبەجێ بکا.

دەوڵەت بەپێی بەرژەوەندی خۆی هەڵوێستی لەگەڵ لایەنی بەهێز دەبوو لە جەنگی بنەماڵە و عەشرەتەکاندا، بەمەرجێ ئەگەر هەموویان بەئایین موسڵمان بوونایە، ئەگەر نا دەسەڵاتی عوسمانی خۆی عەشرەتە موسوڵمانە کوردەکانی هان دەدا لە دژی ئێزدی و یارسانان (ئەهلی هەق، کاکەیی، شەبەک، زازا (عەلەوی) وهی دیکەی کورد). بەم ناوەوە لە ساڵی ١٨٣٤ جەنگی نێوان مزووری و داسنییان زیانێکی زۆری بە هەردوولا داوە، هەر لەو سەردەمەدا هێرشی محەمەد پاشای کۆرەی ڕواندوز بۆ سەر بادینان و

ئازاردانی ئێزدییان لە مێژووی کوردی ئەم ناوچەیە لاپەڕەیێکی ڕوون و ئاشکرایە.

بەم جۆرە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم کە بە ماوەی ژیانی میرنشینەکانی کورد دەژمێررێ، هەر ئەو ماوەیە ڕژانی ئەستێرەی بەختی گەلێ لەو میرنشینانە بوو، نەک تەنیا لە کوردستانی باکووردا، بەڵکو لە کوردستانی باشووریشدا. ئەوە ئاشکرایە چۆن میرنشینی بابان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمدا لەلایەن تورکە عوسمانییەکانەوە داگیر کرا، هەروەها لە ساڵی ١٨٤٨دا میرنشینی ئامێدی کۆتایی هات و بوو بەقەزا و لەگەڵ هەکاری و ئاکرێ درانە ویلایەتی مووسڵ لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە.

ڕووداوی گەورەی سیاسی لەم ماوەیەدا لە کوردستانی باکوور ئەوە بوو بەدرخان پاشا ملی بۆ دەسەڵاتی عوسمانی شۆڕ نەکرد، دەسەڵاتی دەوڵەت سوپاییێکی گەورەی بەفەرماندەیی محەمەد حافز پاشا هەناردە سەر بەدرخان پاشا، لەدوای شەڕوشۆڕێکی گەورە و کوشتار و ماڵوێرانییێکی زۆر و، لە ئەنجامی ئەوەی عیزەدین شێر بۆتانی لایەنی دەسەڵاتی گرت لە دژی بزووتنەوەی بەدرخان پاشا ناچار خۆی بەدەستەوەدا و لەو جەنگەدا کورد ژێر کەوت و بەدرخان پاشا بەدەستبەسەری نێررایە ئەستەمووڵ و لەوێوە بۆ شاری مەدینە لە حیجاز و، هەر لەو شارەشدا کۆچی دوایی کرد. بەم جۆرە ئەم میرنشینەش لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم ١٨٤٨دا کۆتایی هات.

ئێزدی وەک توێژێکی گرنگی کۆمەڵی کوردەواری لەو ماوەیەی ئێمە باسی لێوە دەکەین لە کوردستانی باکووردا لە هەموو توێژەکانی دیکەی نەتەوەی کورد زیاتر کارەساتی بەسەردا هاتووە، لە ئەنجامی دژایەتیکردنی دەسەڵاتی عوسمانی بەرامبەر هەموو ئایینێکی دەرەوەی موسوڵمان، لەناو ئەمانەشدا هەڵوێستی بەرامبەر بەئێزدی و یارسان (کاکەیی) لە هەموویان تیژتر بوو. ڕاستە بەربەرەکانی ئایینی جوولەکە و مەسیحی دەکرد، تا دەگەیشتە ئەو پلەیەی حسێب بۆ شیعەش بکا، بەڵام بەربەرەکانی ئێزدی و کاکەیی لە سەرووی هەموویانەوە بوو تا گەیشتبووە پلەیێک محەمەد پاشای ئینجە بەیرەقداری والی مووسڵ لە ژەنگار (سنجار) هەرچی ئێزدی بوایە دەبوو سەری ببڕێ.

لەگەڵ ئەم هەموو گیروگرفتە سیاسی و نەتەوەییانە و پێوەندی خراپی کورد لەگەڵ دەسەڵاتی عوسمانی، کۆمەڵی کوردەواری لە ژیانی ئاسایی دوور نەبوو لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و خوێندەواری و هەموو لایەنەکانی دیکەی ژیانەوە.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا حوجرەی مزگەوت یەکەمین دەسگای خوێندن بوو، ڕاستە بۆ زانستییە ئایینییەکانی ئیسلام و زمانی عەرەبی دامەزرابوو، بەڵام بەگشتی خوێندەواری پێ دەگەیاند. ئەو خوێندەوارە هەندێ جار زانینی تەنیا بۆ لایەنی ئایینییەکە بەکار نەدەهێنا، بەڵکو ئاوڕی لە زمانی خۆی دەدایەوە و هەوڵی دەدا ئەوەی لە مێشک و دڵ و دەروونیدایە بەزمانی کوردی دەرببڕێ، لەبەر ئەوە لە هەموو کوردستاندا حوجرەی مزگەوت وەک دەسگاییێکی خوێندنی قەومی دەکەوتە بەرچاو، چونکە شاعیرەکانمان لەم دەسگایانە زانستی و زانیارییان وەرگرتووە.

ئەمە و ئەو سامانە بەنرخەی شاعیرانی ڕینیسانسی ئەدەبی کوردستانی باکووری سەدەی شازدەم هێنابوویانە ناوەوە سەرچاوەییێکی گرنگ بوون بۆ خوێندەوارانی سەدەی نۆزدەم و دواتریش.



لە کوردستانی باکوور وەکو کوردستانی باشوور هەر لەو سەدەیەدا بوو تەریقەتەکانی دەروێشی پەیدابوون، ئەمانە ڕەنگدانەوەی بزووتنەوەکانی دەروێشی ناوچەی سلێمانی بوون، لەمانە تەریقەتی نەقشبەندی لە بامەڕنی و تەریقەتی قادری لە بریفکان، بەشێوەییێکی گشتیی ئەم تەریقەتانە پشتگیری دەرەبەگایەتی فەرمانڕەوایی ئۆتۆکراتی عوسمانییان دەکرد، بەڵام لە هەندێ کاتدا بەرژەوەندی ئەم تەریقەتانەی کوردەواری لەگەڵ دەسەڵاتی عوسمانی ڕێک نەدەکەوت، لەو کاتەدا ئەدگارێکی قەومی وەردەگرت و دەبوو بەدژایەتی لەنێوان دەسەڵاتی ئۆتۆکراتی و مافی نەتەوایەتی، ئەمانە لە گەلێ لە هەڵسانەکانی نەتەوەی کورد دەردەکەون وەک شۆڕشی شەمدینان و زازا و هی دیکە.

ماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم کۆمەڵێک ناوی پرشنگدارمان بۆ دەور دەکاتەوە لە شاعیرانی کوردستانی باکوور، بەڵام شیعری ئەمانە بەقەوارە و هەندێ جاریش بەناوەرۆک نەگەیشتۆتە ئەو پلەیەی بەشی تایبەتییان بۆ تەرخان بکرێ، لەمانە ناوی وەکو بەکر بەگی ئەرزی و مەلا مەنسووڕی گیرگاشی و شێخ نوورەدینی بریفکانی و میهرەبان خاتوون و گەلێکی دیکە دەکەونە بەرچاو.

## بەشی بیست و چوارەمین

## وەداعی ١٧٩٠-١٨٥٠(؟)

### ژیانی وەداعی

ئەگەر هەندێک لەو بڕە شیعرەی وەداعی شایانی ئەوە نەبوایە بچێتە ناو لاپەڕەکانی ئەم کتێبەوە؛ بێ گومان ئەم بەشەمان بۆی تەرخان نەدەکرد، چونکە ناوی شاعیر و بابوباپیرانی و جێی لەدایکبوون و مەڵبەندی ژیانی لە هیچ سەرچاوەیێکی تۆمارکراو یا گێڕانەوەی سەر زار دەست نەکەوتووە، ئەوەندە هەیە لە ناوەرۆکی شیعریدا هەندێ لایەنی ژیانی بۆمان ئاشکرا دەبێ.

سەرچاوەی گرنگی ئەم بەشەی مێژووی ئەدەبی کوردی «دیوانی وەداعی» بوو. تا ماوەیێکی کەم لەمەوبەر لە ناوی شاعیر بەولاوە زانیاریی دیکە لەناوەوەدا نەبوو، تا لەم چەندانەدا «دیوانی وەداعی» لە کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی سەعید دێرەشی لە بەرلین لە ساڵی ٢٠٠٢دا بڵاوکرایەوە. ئەم دۆزینەوەیە کارێکی بەکەڵک بوو بۆ پیشاندانی ڕووی ڕاست و جوانی ئەدەبی کوردی.

وەداعی نازناوی ئەم شاعیرەمانە، لە هەندێ لە بەرهەمەکانیدا بەکاری هێناوە. لە ساڵی ١٧٩٠ لە مکس (موکس)ی ناوچەی هەکاری ژیاوە. خوێندنی لەسەر دەستووری ئەو سەردەمە لە حوجرەی مزگەوت بووە، دەبێ هەموو قۆناغەکانی خوێندنی زانستییە ئیسلامییەکان و زمانی عەرەبی تەواو کردبێ. هیچ بەڵگەیێک بەدەستەوە نییە مەلایەتی کردبێ، بەڵام لە میرێکی کورد نزیک بووە، ناوی شێخی بەگ بووە و شیعری بۆ وتووە، لەدوای کوژرانی ئەو لە جێگری نزیک بۆتەوە، ناوی مەحموود خان بووە، دوور نییە لە دیوەخانی ئەو ناودارە کوردانە میرزا بووبێ و کاروباری خوێندەواری و نامە نووسینی بۆیان بردبێتە سەر.

لە ساڵی ١٨٢١ وەداعی کوڕێکی بووە ناوی ناوە مەحموود، لە پاشانا «بەیت»ە شیعرییەکەی لە بابەت شێخی بەگ هۆنیوەتەوە و لە ساڵی ١٨٣٩ شیعری بۆ مەحموود خان وتووە. لەدوا ساڵانی ژیانی تۆبەی کردووە بووە بەسۆفیی تەریقەتی نەقشبەندی. لە شیعریدا ستایش و پێداهەڵدانی زۆری هەیە بۆ تەهای مورشیدی تەریقەتەکە. بێ گومان ئەم زاتە سەید (تەهای نەهری شەمدینی)یە باوکی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری (١٨٣١-١٩٠٠) فەرماندەی هەڵسانی کوردی شەمدینان و هەکاری لە ساڵی ١٨٨٠دا.

دوا هەواڵی ژیانی وەداعی ئەوەیە شیعرێکی لە ساڵی ١٨٤٠م نووسیوە بەقسەی خۆی تەمەنی پەنجا ساڵ بووە، هیچ شتێک لە بارەی ژیانییەوە نازانرێ، لەوانەیە تا دەوروبەری ساڵی ١٨٥٠ (؟) ژیابێ.





### شیعری وەداعی لە ڕووی ڕوخسارەوە

وەداعی لە ژیانی خوێندەواریدا هەوڵی داوە شاعیریەتی خۆی لەپێشانا بەشیعری فارسی بخاتە ڕوو ئینجا شیعری کوردی، لەبەر ئەوە شیعرە فارسییەکانی بەقەوارە دوو ئەوەندەی شیعرە کوردییەکانیەتی. بێ گومان ئەو شیعرە فارسییانە لە ڕووی نرخی جوانکارییەوە لە پلەی شیعرە کوردییەکانی نزمترن و هیچ جۆرە پێوەندییێکیان بەمەبەسی ئێمەوە نییە، تەنیا ئەوە نەبێ لایەنێکی کەمی ژیانی شاعیر و بۆچوونی لە هەندێ مەسەلەی کۆمەڵایەتی ڕوون دەکەنەوە.

شیعری وەداعی لە ڕووی بابەت و کێشی شیعرییەوە بەدوو شێوە خۆیان دەنوێنن. یەکەمیان شیعری عەرووزی، دووەمیان بەیتی خۆماڵی، لەو کاتەی شیعرە خۆماڵییەکان لەسەرکێشی سیلاب ڕێکخراون بەکێشی عەرووزیش دەکێشرێن، واتە هەموو شیعرەکانی لە ڕووی کێشەوە عەرووزین.

١- شیعری عەرووزی

شیعری وەداعی لەسەر ئەو کێشە عەرووزییانە ڕێکخراون کە لە شیعری کلاسیکی کوردیدا بەکاردەهێنرێن. بەشی هەرە زۆری بەرهەمی شیعری ئەم شاعیرە لەسەر کێشی هەزەج و ڕەمەل ڕێکخراون. پێنج شەش پارچە لە بەحری ڕەجەزی هەیە، لە بەحری موتەقاریب و موزاریع لە هەریەکەیان تاکە شیعرێکی هەیە. ئەم بابەتە شیعرەی وەداعی دەکرێ بەدوو بەشەوە:

(أ) غەزەل، دەتوانرێ «لیریک»ی پێ بوترێ. پارچە شیعرێکی کورتە لەسەر کێشی بەحرەکانی عەرووز دەهۆنرێتەوە یەکێتیی قافیەی تێدایە.

(ب) پێنجین، یا حەوتین، جۆرە شیعرێکە لەسەر بنچینەی بەند (کووپلە) دادەنرێ، هەر بەندی پێنج نیوە دێڕ شیعرە، کێشی عەرووزییە، قافیەی بەم جۆرەیە (اااا ب). لەناو دیوانی شاعیردا پێنجینێک هەیە لە حەوت نیوە دێڕ شیعر پێکهاتووە، لەسەرکێشی عەرووز و لە ڕووی قافیەوە بەم جۆرەیە (اااا ا)، بەڵام لەدوای پێنج دێڕەکە دوو نیوە دێڕی دیکەی لەگەڵە لەسەرکێشی عەرووز و قافیەی (ب ب)یە، لەبەر ئەوە حەوتینیشی پێ دەوترێ، ئەم دوو دێڕە لە هەموو بەندەکاندا دووبارە دەبێتەوە.

بەندی سەرەتای پێنجینەکە یا حەوتینەکە ئەمەیە:

گوهـ بدێرن هوون ل من خەڵقی جوات و سوحبەتێ
قەنج ژ ڤی چەرخی بترسن ژێ بکەن پڕ فیکرەتێ
ڕاست نابت ڕۆژەکێ بۆ کەس ب مەیل و موحبەتێ
حیلەکارە ئەو ددت خەلقی ژ ژەهرێ شەربەتێ
ئەحمەق و جاهیل ئەوە ئێ پێ بغاری دل دەتێ
بێ ڕەواجە ڤی زەمانی مەعریفەت
بێ گومان بێ قەدرە ئێدی عیلم و خەت

بەندی دوایی ئەمەیە:

ئەو چ دەورانە چ تەبدیلە گـــەلۆ دیســـا مـــەدی
قەت نەما شۆلەک ل ئسلوویا بەرێ ڤی سەرحەدی
ڕاست نابت چەرخ کـەچ ڕووخـاین و خـوار و بەدی
کەس وەفاو و ئیعـتیبـار ئەسلا ژ ڤی دەوری نەدی
سـەرهەلینان ناکـەسـان ئێ جنس پاک من بەرزەدی
بێ ڕەواجـــە ڤی زەمـــانی مـــەعـــریفـــەت
بێگومـــان بێ قـــەدرە ئێـــدی عـــیلم و خـــەت

٢- بەیت (پۆیێم):

بەشێکی زۆر لە بەرهەمی شیعری وەداعی لەم بابەتەیە، ئەمانە لەبەرئەوەی ناوەرۆکی چیرۆکی و بەسەرهات و بزووتنەوەیان تێدایە درێژترن لە شیعرە عەرووزییەکانی.

ئەم جۆرە بەیتانەی شاعیر لەو بابەتەن لە شیعری کوردیدا بەهەردوو کێشی میلییی خۆماڵی (سیلاب) و عەرووزی دەکێشرێن. بەیتەکان لەسەر بنچینەی بەند دادەمەزرێن، هەر بەندی چوار نیوە دێڕ شیعری کورتە. زۆربەی بەیتەکان لە ڕووی قافیەوە هەر بەندی (ا ا ا ب)یە، قافیەی (ا ا ب ا)یش هەیە، هەروەها لە بەیتێکدا قافیەی (ا ب ا ح) بەرچاو دەکەوێ.

## شیعری وەداعی لە ڕووی ناوەرۆکەوە

وەداعی شاعیرێکی ئاساییە (تەقلیدییە) لە قوتابخانەی شیعری کلاسیکی لە کوردستانی باکوور لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا. وەک قوتابییێکی زیرەک و هەڵکەوتووی قوتابخانەی عەلیی هەریری و مەلای جزیری و فەقێ تەیران خۆی دەنوێنێ. شیعرەکانی بەردەوامی ئەو قوتابخانەیەن. لەگەڵ ئەوەی داهێنانێکی ئەوتۆی نەخستۆتە ناوەوە بگاتە پلەی شاعیرییەتی ئەوان، بەڵام لاپەڕەیێکی پرشنگداری خستۆتە ناو دیوانی شیعری کوردییەوە.

وشە لای شاعیر لە جێی خۆی بەکارهاتووە، مانا ئاشکرایە و لەناو تیپەکاندا دەبینرێ، کێشی ڕەوانە هیچ جۆرە لەنگییێکی تێدا نییە، قافیەی سفت و بێ کەموکوڕییە، وێنەی شیعری ئاساییە بەمانا لای شاعیرانی دیکەش دەبینرێ، بەڵام بەتەعبیر نوێیە و داهێنانی تێدایە.

شیعری وەداعی بەهەردوو بابەتیەوە، لیریکی خۆماڵی و غەزەلی عەرووزی لە چوارچێوەی مەبەس و هونەرە کلاسیکییەکانی ئەدەبی کوردی نەچۆتە دەرەوە. ئەم بابەتە شیعرانەی وەکو لای خوارەوە دەکەونە بەرچاو.

١- موناجات (ئیلاهییات):

وەداعی چەند پارچە شیعرێکی لەم بابەتە هەیە، بەناوەرۆک بریتییە لە پاڕانەوە لە خودا بۆ ئەوەی لە گوناهی خۆش بێ، لە یەکێکی دیکەیدا بەسەر کردگاردا هەڵدەڵێ بەهۆی ئەوەی ساڵی ١٨٢٣ لە



مەڵبەندی ئەوان وشکە ساڵ بووە، لە دواییدا بارانێکی زۆر باریوە. لەم بابەتە شیعرانەدا وەکو لە شیعری شاعیرانی دیکەش باوە زاراوەی ئایینی و ناوی کەسانی پیرۆزی ئایین دەهێنرێ. وەداعی ناوی ئادەم و یوسف و ئەیووبی هێناوە، هەروەها ناوی ئیـبلیس و بەهەشت و دۆزەخ دەبا. لە خـودا دەپاڕێتەوە لە پەشێواوی و شپرزەیی ڕزگاری بکا.

٢- نەعت (مەدحی پێغەمبەر)

لە ڕووی ناوەرۆکەوە ئەم جۆرە مەبەسە جیاوازییێکی ئەوتۆی لەگەڵ موناجاتدا نییە، تەنیا ئەوە نەبێ لەم جۆرە شیعرەدا ئەو کردەوە و ڕەوشتانە دەخرێنە ڕوو کە پێوەندییان بەپێغەمبەرەوە هەیە. لە نەعتەکانی شاعیردا ئەوە دەردەکەوێ ئاگاداری زانستییە بنچینەییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی بووە.

٣- دڵداری

لای ئەم شاعیرە وەکو هەموو شاعیرانی دیکەمان شیعری دڵداری زۆرە و لەبەرچاوە، شاعیر لە جوانی دەگەڕێ و لە کچێکدا دەیدۆزێتەوە، هەندێ جار ئەو کچە ناوی سەلوایە، باس لە خووڕەوشتی دەکا؛ یا ناوی پەریزادە، ئەگەر ئەوی هەبێ پێویستی بە لوقمان نییە، کچەکە یاری نازدارە و پزیشکی پزیشکانە و هەموو دەردێکی تیمار دەکا.

٤- وەسف

شاعیر بایەخێکی زۆری بەم بابەتە شیعرە داوە، ناوەرۆکی هەمەجۆر و ڕەنگاوڕەنگە، وێنەی هونەری جوان لەناو شیعریدا بەدی دەکرێ، بەهاری سەیران و خۆشی، کۆڕی یاران و هەنگامی گوشادی، بلبل و بەهار و مێرگ و مێرغوزار. بەیانییێک شاعیر لە پەنجەرەوە چاوی بەیار دەکەوێ، باس لە لەنجەولاری دەکا، ئاهی بۆ هەڵدەکێشێ، بەڵێن دەدا کە هەر ئەوی دەوێ. بەزۆری جوانی دلبەر لە ئەندامی لەش و لاری دا دەبینێ، پەنا دەباتە بەر سروشت بۆ ئەوەی وێنەیێک بدۆزێتەوە بەئەندامانی یاری بچوێنێ یا بەپێچەوانە ئەو ئەندامانە لەگەڵ وێنەکەدا بەراوورد بکا.

٥- پێداهەڵدان (مەدح)

شیعری لەم بابەتەی شاعیر بۆ ئەو میرە کوردانە هۆنراونەتەوە کە لێیانەوە نزیک بووە، هەروەها شیعری بۆ شێخ تەهای نەهری مورشیدی تەریقەتی نەقشبەندی داناوە. ناوەرۆکی ئەم جۆرە شیعرە لە هەندێ لە مەبەسەکانی دیکەی شاعیریش دەبینرێ.

٦- داد و فیغانی دەروونی

ئەم بابەتە شیعرەی وەداعی لە نالەباری و ناگزووری ژیانی تایبەتیی خۆی دەدوێ، هەندێکیان وەک کێشەیێکی کۆمەڵایەتی، بەڵام شیعرییانە دەیانخاتە ڕوو، باس لە ستەمی ڕۆژگار دەکا، لە زوڵمی زۆردار و نەبوونی یەکسانی دەدوێ. بەزۆری وێنەی ئاوارەیی و بێ کەسی و بەدبەختی لەلای دەبینرێ. بێ وەفایی یار و چاوی بەدی ڕەقیب دڵ و جەرگیان هەلا هەلا کردووە، مەگەر سەرخۆشی و مەی و مەیخانە ئەم مەینەتییانەی لەبیر بباتەوە. وەداعی هێرش دەباتە سەر گەردوون و فەلەک، بەبێ شەرم و حەیا

ناویان دەبا، پیری و بێ توانایی دەورێکی دیاری هەیە لەم جۆرە شیعرانەدا. زۆربەی ئەم بەرهەمە شیعرییانە لە سەردەمی بەساڵاچوونی دایناون، بەتایبەتی لەدوای تۆبەکردن و چوونە ناو ڕێکخراوی تەریقەتی نەقشبەندییەوە.

## هەڵبژاردەی شیعری وەداعی

### نەعتی پێغەمبەر

لەو شیعرانەی دەچنە ناو مەبەسی موناجاتی خودا و نەعتی پێغەمبەر لە بەرهەمی وەداعیدا وشەی زۆری عەرەبی تیایاندا بەکارهێنراوە، ئاماژە بۆ هەندێ لە ئایەتەکانی قورئان و حەدیسی پێغەمبەر کراوە، شاعیر بەزمانێک قسە دەکا زیاتر ئەو کەسانە تێی دەگەن کە خوێندەوارییان وەکو ئەوەی شاعیرە، لە دیوانی شاعیردا بۆ ئەم مەبەسە هەردوو بابەتە شیعری کێشی خۆماڵی و عەرووزی دەبینرێ.

لە بەندی یەکەمی پێنجینێکیدا دەڵێ:

یا حەبیبەڵڵا ڕەسوولێ خالقێ فەرد و ئەحەد
تو شەفیعێ عاسیانی پێش قەییوومێ سەمەد
موزنیب و عاسی ئەزم جورمێد من زێدە ژ حەد
شەرمەسار و ڕوو سیاهم پێش تە حەتتا ئەبەد
تو ژ فەزلا خوە مەکە مەحرووم گونەهکارانێ بەد

لە بەندی دواییدا دەڵێ:

یا ئیلاهی پڕ گونەهکارم مبانێ موئمینان
دێ چ بت ئەنجامێ کارێ من فەقیرێ ناتەوان
وەی ژ هەولا ئاگری وەڵڵاه دلەرزم بێ گومان
تۆبەکە جارەک (وەداعی) پێش ڕەببێ موستەعان
فەخر عالەم دا د حەشرێدا ژ بو من بت مەدەد

ناوەرۆکی ئەم جۆرە شیعرە ئەوە دەخوازێ شاعیر بەچاوێکی بەرز تەماشای پێغەمبەر بکا، چونکە نزیکترین کەسە لە خودا، بۆی هەیە هەموو تکاییێکی لەلایەن خوداوە جێبەجێ بکرێ. خۆی بەختەتابار و گوناهکار دادەنێ و داوا دەکا تۆبەی قوبووڵ بکرێ.

### چاوی خەواڵووی دلبەر

لە غەزەلێکیدا وەداعی باس لە ڕەفتار و کردەوەی یار دەکا و پەیمانی دەداتێ کە دڵدارێکی ڕاستی ئەو خۆشەویستەیە:



نازکا من مەستە ئیرۆ قەسدی خەمماری دکەت
یووسفێ حوسنا غەریبە گەرم بازاڕی دکەت
تۆتییا تبعەت شەکر ئیرۆ ل خەرگاهێ مەدی
دێ فیداکەم جان و دل چاغێ ڕەفتاری دکەت
ئاورن یارەب نزانم یانە تیر و خەنجەرن
هەر پەیاپەی تێنە من مەقتوول مووکاری دکەت
موحبەتا ڤێ نازەنینێ سۆتمە سەر تا قەدەم
هێژ وەکی باران خەدەنگان وێ ل دل جاری دکەت
عاشقێ سادق ئەزم ئیرۆ د بەندا موحبەتێ
لێ ژ بو من هەر دەما دەم قەهر و ئازاری دکەت
ڤێ ب ئەبروویان دوو تیر ئیرۆ ل مێلاکا م دان
عیشق یا ڕەب ئاگرە پڕ سۆزە دشواری دکەت
دارویێ دەردێ (وەداعی) تو ژ وان لەعلان ببەخش
ماد کونجێ فرقەتێدا وی ژ مێژ زاری دکەت

ئەم غەزەلە وێنەییێکی دیکەی شیعری ئاساییە، چەند مەبەسێک کۆدەکاتەوە، وەکو دڵداری و وەسفی مەتریالیی هەست پێکراوی چاوی مەست و تیری ئابرۆ. هەروەها وەسفی ڕەوشت وەک ڕەوت و لەنجەی پڕ لە نازی. لێرەدا شاعیر وێنە داهێنراوەکانی شاعیرانی پێش خۆی ورد دەکاتەوە لە ڕووی ماناوە، بەڵام لەبارەی ڕوخسارەوە دووبارە بەشێوازێکی دیکە دایدەڕێژێتەوە، بۆیە جوان و سووک و ڕەوان دەکەوێتە بەرگوێ.

### عیشق

لە غەزەلێکیدا وەداعی هەوڵ دەدا لە دڵداریی بکۆڵێتەوە، لەبەر ئەوە وشەی «عیشق» دەکا بەپاش قافیە بۆ شیعرەکەی:

بیحەمدیللا دەرێ مەیخامەئێ عیشق
ڤەبوو دیسا ل من دێوانەئێ عیشق
وەرە ئەی عیشق هیممەت کە دگەل من
ژ بۆ من قیسسەکە ئەفسانەئێ عیشق
د ملکێ دل ل سەر تەختێ خوە ڕوونە
ب شەئن و شەوکەتێ شاهانەئێ عیشق

دەما پەیدا ببی وەعدە ل من بت
دوو سەجدان ئەز ببەم شوکرانەئێ عیشق
ب دیدارا تە دێ ڕەوشەن بت ئەو مولک
عیمارەت کە دلێ وێرانەئێ عیشق
دڤێ ڕێدا گەلەک چوون و نەهاتن
نەشێ کەس تەی بکەت مەیدانەئێ عیشق
مەگەر هیممەت بکەت پیرێ تەریقەت
ببن ئەم ئاشنا فەرزانەئێ عیشق
تو موورغی چینەئێ ئەمما (وەداعی)
وەلێ نە موورغی لائیق دانەئێ عیشق

شاعیر داوا لە عیشق دەکا بەسەرهات و ئەفسانەی خۆی بگێڕێتەوە. دل دەکا بەمەملەکەتی دڵداری و شایەدی ڕووداو، بەوە زۆر گوشاد دەبێ ئەگەر جارێک ئاوڕی لێ بداتەوە و ڕووی تێ بکا، واتە بچێتە ناو دڵی شاعیرەوە، ئەو دڵە وێرانەیە عیشقی تێدا نییە، ڕێی گەیشتن بەو عیشقە گەلێک سەختە، زۆر کەس هەوڵیان داوە بیبڕن، بەڵام نەیانتوانیوە. شاعیر پەنا بۆ پیری تەریقەت و سۆفیزم دەبا بەڵکو بەو عیشقە شادی بکا. لەدواییدا بەخۆی دەڵێ باڵندەییێکە چینە دەکا، وەک باڵندان شایانی ئەوە نییە دانی عیشقی لەبەردەم دابنرێ. وەکو لەم غەزەلەدا دەردەکەوێ شاعیر هەوڵ دەدا ئەو دڵدارییەی لە گێتیی مەجازی بهێنێتە دەرێ و بیخاتە قاڵبی سۆفیزمەوە. ئەوەی لایەنێکی جوانکاری لەم شیعرەدا دەخاتە ڕوو ئەوەیە شاعیر خۆی بە باڵندە دەچوێنێ، بەڵام بۆی هەڵنەکەوتووە دەنووک لە دانەی عیشق بدا.

**بسک و خاڵ:**

وەداعی لیریکێکی هۆنیوەتەوە بۆ وەسفی هەندێ ئەدگاری یار، ئەو یارە ئۆقرەی نییە، دەمێک لێیەوە نزیکە، دەمێکیش لێیەوە دوورە، لە هەردوو باردا شاعیرانە هەستی دەردەبڕێ و وێنەی دیمەنەکان دەکێشێ:

ئیرۆ ژ نوو گرتی سەما
بسکان ل دۆرا جەبهەتێ
نیشان و خال لێک بوون جەما
ڤێکرا دکەن خۆش سوحبەتێ
***
زولفەین ل سەر خالێ ڕەشین
تاتا ب دێمیدا مەشین



خۆش بوونە شوبهێ باوەشین
کەفتینە ڕەقس و داوەتێ
***
ڕەقسین ل سەر دێما گولین
بسکێ سیاه سلسلین
وەک من گەلەک مەجرووح دلین
دائیم د کونجێ فیرقەتێ
***
ئەو فیرقەت و هەجوا حەبیب
دیسا ژ بۆ من بوو نەسیب
ئەز ژار و بێ یار و غەریب
دائیم دکێشم حەسرەتێ
***
سەد حەسرەت و سەد ئاه و زار
یار چوویە زۆزانێد سار
ئەز مام دگەرمێ بەندەوار
گاڤەک تەبیتا من نەتێ
***
سەبر و تەبیتا من نەمان
ژبەر فیرقەتا سەلوا چەمان
کوشتم ب سەد دەرد و غەمان
هشتم ل گۆشا میحنەتێ
***
هەرچی دکەت هیجران دکەت
پڕ عاشقان بێ جان دکەت
دەردان گەلەک دەرمان دکەت
خالا ل دۆرا جەبهەتێ
***

خالا ژ ڕەنگێ عەنبەرێ
بەژنا ب میسلێ عەرعەرێ
جارەک دنێڤا پەنجەرێ
فکریمە بەژن و قامەتێ

***

ئەو قامەتا بەژنا لەتیف
لبسێ دبەر کیمخە و قەدیف
گەردەن وەکی شووشا خەفیف
سوبحان ژ شاهێ قودرەتێ

***

سوبحان ژ شاهێ قادری
حوسنا بەدیع ڤی خەلق کری
لەو دل دەمەک ناسەبری
دائیم دسۆژت ب ئولفەتێ

***

ئەو نەینکا حوسنا جەلا
زولفەک خوە ڤی تێرا نوما
لەو دل ژ من ئیرۆ ڕەوا
کەتمە د بارێ غوربەتێ

***

ڤێ غوربەتێ ئەز کرمە ژار
لێ فیرقەتێ ئەز کرمە نار
عومەرک (وەداعی) ڕابوار
ئەندووە و غەم بەحس ژێ نەتێ

کە لە خوێندنەوەی ئەم شیعرە دەبینەوە بیر و خەیاڵمان بۆ ئەو بابەتە شیعرە دەڕوا کە لەسەر بنچینەی دوو بەیت دامەزراوە. قافیەی نیوە دێڕی چوارەمی هەموو بەندەکانی «ـەتێ»یە، ئەم بابەتە لە شیعری کلاسیکی و خۆماڵی سەرزاری (فۆلکلۆری) لە کوردستانی باکووردا گەلێکە، لەناو شاعیرانی ئەوانیشدا بەزۆری لای فەقێ تەیران بەرچاو دەکەوێ.



لە بنجدا وەداعی بەرنامەی ئەم شیعرەی بۆ ئەوە داناوە باس لە بسک و زوڵفی سەلوا بکا چۆن لە دەوروبەری خەت و خاڵی ڕوومەت و گەردنی سەما دەکەن. سەلوا یەکێکە لەو بووکە شیعرییانەی کە لە ئەدەبی کلاسیکیدا دەوری گرنگیان هەیە، وەک یار و دلبەر و خۆشەویست و مەعشووقە دەبنە قارەمانی دڵداری. شاعیر هەوڵی نەداوە یەکێتیی ڕووداو دروست بکا. دەمێک لەناو پەنجەرە چاوی بە یار دەکەوێ و دڵی شاد دەبێ و دەکەوێتە هەنگامێکی خۆشی و شادی، کەچی بەپێچەوانەی ئەمەوە دەمێکی دیکە یار لێی دوور دەکەوێتەوە، لێرەدا وێنەیێکی جوان دروست دەکا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دوورییە؛ کە دەڵێ یار لە زۆزانانە واتە لە هاوینەهەوار و جێی فێنک دەژی، کەچی شاعیر لە شاردا گەرما بردوویەتی. ئەم جۆرە بازدانە لە مەبەسێکەوە بۆ مەبەسێکی دیکەی پێچەوانە کارێکی ئاساییە لە دروستکردنی شیعردا ئەگەر شاعیر بتوانێ بە سەریدا زاڵ بێ.

**مەدحی میر:**

وەداعی ئەم غەزەلەی لە مەدحی یەکێ لەو میرانە وتووە، کە لە سایەیان ژیاوە و سکرتێری و میرزایی بۆیان کردووە:

من ژ حەق داخوازە دائیم دێ ژ حەق دەستوور بی
هەر بکام و شادمان و خوررەم و مەسروور بی
قەت د دنیایێ نەبینی غەم ژ دەورانا فەلەک
کەوکەبێ بەختێ هومایوونی تە هەرپڕ نوور بی
غونچەیا بەختێ تە خەندان بی ب عەیش و نۆش و ناز
ڕووز و شەب ئەز ئافەتێ چەشمێ حەسوودان دووربی
هەر د نێڤا سەرفرازان بەختیار و کامیاب
خەتتێ ئیقبال و کەرەم بەر ڕوویێ تو مەستوور بی
ئەی جەوان بەخت و فەلەک یار و کەرەمکارێ جیهان
من ژ حەق هیڤی هەیە مولکێ تە دێ مەغموور بی
هەر کەسێ ڤێ دەولەتێ هەردێ نەخوازت تا قیام
ڕووسیاه و شەرمەسار و خەستەوو ڕەنجوور بی
نەزم و ئەشعارێ (وەداعی) گەر ببت مەقبوول میر
دێ د ئیقلیمێ جیهان شیعرێ مە دێ مەشهوور بی

ئەم شیعرە نموونەیێکی ڕوونی مەدحی ئاساییە، وەداعی لەو شێوازە گشتییەی لەم جۆرە شیعرەدا بەکار دەهێنرێ لە شیعری کلاسیکیدا نەچۆتە دەرەوە، پێویستە بۆ ئەو میرەی خۆی لە خودا داوا بکا هەمیشە شاد و گوشاد بێ، لە ئەندێشە بەدووربێ، هەموو ژیانی بەختیاری بێ، ئارەزوو دەکا

فەرمانڕەوایی هەتا هەتایە بمێنێ. شاعیر داوا لە خەڵکی دیکەش دەکا وەکو خۆی بنوارنە میری گەورە، ئەگەر وا نەکەن ڕووڕەش و شەرمەزار دەبن. باوەڕی بەمیر دەگاتە پلەیێک؛ دەڵێ ئەگەر شیعری وەداعی شیرین و جوان بێ لای میر لە هەموو گێتیدا بەناوبانگ دەبێ، واتە میر هەستێکی ئەوەندە بەرزی شیعرایەتی هەیە، ئەو شیعرەی لای ئەو جوان بێ لەلای خەڵکی دیکەش جوان دەبێ.

**گازاندەی شاعیر:**

لەم شیعرەدا وەداعی یادی ڕۆژانی لاویەتی خۆی دەکاتەوە، گازاندە لە گەردوون دەکا، چونکە ئەم پیرییەی بۆ هێناوە لەگەڵ ئێش و ئازارێکی زۆر:

ئەی درێغا نەوجەوانی چوو تەلەف
(جائَني الشَّيْبُ وقعتُ في الضَّعَف)
سۆتمە نارێ فیراقێ دێ چ بت
گەر ژ وان لەعلان تو دەرمان کەی بە خەف
من ژ دلبەر قەت نەدی ڕۆژەک وەفا
هەر خەدەنگ و ئاوران کرمە هەدەف
ما تەنێ ئەز مەست و شەیدامە جنوون
سەد وەکی من ڤێ دنالن هەر تەرەف
من د هیجر و دووریێ بۆراندی عومر
لێ ڕەقیبان شادمان گرتینە سەف
ڤێ ژ مێژ ڤە عاشقان بۆ یەک نیگاه
د ئنتیزارن نەقدێ جانێ وان د کەف
عاشقان زانینە عیلمێ مەعنەوی
کان چییە ئاواز و ساز و چەنگ و دەف
جامێ عیشقێ دەرخورێ هەر کەس نهن
ئەی (وەداعی)دا نەدی ژێ لاق و کەف

لەم بڕە شیعرەدا وەداعی هەوڵ دەدا سەردەمی پیری بەخۆی و هەموو باری قورس و گرانییەوە بکا بەبەڵگە بۆ سەرانسەری ژیانی، واتە هەمووی نالەباری و پڕ لە مەینەتی بووە. لە ژیانیدا وەفای لە دلبەر نەدیوە، هەموو تەمەنی بەئاوارەیی بردۆتە سەر، هەرگیز خۆشی بەخۆیەوە نەدیوە، هەمیشە غەمگین بووە کەچی ڕەقیب دڵخۆش بووە. بەڵام ئەوە هەیە وەکو عاشقێک جەوهەری نهێنیی مەعنەوییاتی زانیوە، ئاگاداری هەناسەی ناوەوەی سۆفیزم بووە لەبەر ئەوە لە زمانی ساز و ئاواز (مۆسیقا) گەیشتووە، بەلای



شاعیرەوە هەموو کەسێک نازانێ جامی مەی بنۆشێ.

شاعیر لەم غەزەلەدا نیوە دێڕێکی بەعەرەبی وتووە، هەرچۆنێ بێ بەیەک نیوە دێڕ شیعر لیریکەکە نابێتە مولەممەع. دەتوانرێ ئەم نیوە دێڕە بەتێکهەڵکێش بژمێررێ، شاعیر نیوە دێڕێکی لە ڕستەییێکدا بەعەرەبی داناوە و خستوویەتییە ناو شیعرە کوردییەکەوە.

**بەیتی شێخی بەگ:**

ئەم بەیتەی وەداعی دەتوانرێ بەپۆیێمێک (قەسیدەیێکی درێژ) بژمێررێ لە ٣٨ دوو بەیت پێکهاتووە، واتە ١٥٢ نیوە دێڕ شیعر. وەکو لە دوو بەیتی دواییدا بەحسێبی ئەبجەد هاتووە بەیتەکەی لەساڵی ١٨٢١دا داناوە.

وا دەردەکەوێ وەداعێ بەشێک لە ڕۆژگارانی ژیانی لە سایەی میرێکی کورد بردبێتە سەر، ناوی شێخی بەگ بووە، ئەم ناودارە یەکێک بووە لە میرەکانی «مکس»ی ناوچەی هەکاری. شیعرەکە بەسەرهاتی هەڵسانێکی چەکداری و قارەمانیەتی ئەو میرە دەگێڕێتەوە. نیوە دێڕی چوارەمی هەموو دوو بەیتێک ئەمەیە «کانێ جیهانگێرێ جیهان».

سەرچاوەی ئەم بەرهەمەی شاعیر گێڕانەوەی ئەدەبی میللیی سەر زارە (فۆلکلۆر)، ڕووداوەکە ئەگەر بووبێ لە ئەدەبی کلاسیکیی نووسراو و ئەدەبی میللیی سەرزار ڕەنگی داوەتەوە و بەرهەمی ئەدەبی هەردوولایان کاریان لە یەکتری کردووە. بەهەموو جۆرێک خەیاڵی شاعیر کاریگەر بووە بۆ دانانی ئەم شیعرە، چونکە بەسەرهاتی شێخی بەگ لە سەردەمی ژیانی شاعیر لەناو خەڵکی کورد و لە ناوچەکەدا لەسەر زاری خەڵکی بووە، ئەلێکساندر ژابا تێکستێکی ئەم بەسەرهاتەی بەپەخشان تۆمار کردووە و لە کتێبە بەناوبانگەکەی «جامیعی یێ ڕیسالەیان» بەزمانی کوردی و فەرەنسی لە ساڵی ١٨٦٠ لە سانت پیترسبورگ بڵاوی کردۆتەوە. بەراووردێک لەنێوان تێکستی پەخشانی میللی بەسەرهاتەکە و بەیتەکەی وەداعی ئەو ڕاستییەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە ئەم دوو بەرهەمە بەگشتی لە یەکتری دەکەن، سەرچاوەی هەردوولایان یەکێکە، بەڵام ئەوەی باوەڕ ناکرێ ئەم هەڵسانە ئەوەندە گەورە بووبێ کەچی نەچووبێتە ناو مێژووی میللەتەوە. مێژووی نەتەوەی کورد ئەو هەڵسانەمان بۆ دەور ناکاتەوە. هەرچۆنێ بێ ئێمە وەک بەرهەمێکی ئەدەبی داهێنراو مامەڵە لەگەڵ ئەم شیعرە دەکەین، نەوەکو وەک ڕووداوێکی مێژوویی.

سەرەتا شاعیر بەم جۆرە دەست بەشیعرەکەی دەکا:

ئیرۆ ژ دەستێ فەلەکێ
کانێ جیهانگیرێ جیهان
بگرین ژ بۆ شێخی بەگێ
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

میرێ ب ئیحسان و کەرەم
کان ساحیبێ جوود و نیعەم
وەسفێ دڤی هەردێ بدەم
کانێ جیانگیرێ جیهان

لێرەدا شاعیر پێداهەڵدان و ستایشی شێخی بەگ دەکا وەک کەسێکی چاوتێر و دەست بڵاو و مرۆڤێکی دڵسۆز بەرامبەر بەدەوروبەری:

چاغێ دناڤ کۆمێ دکەت
هەیبەت ب سەر رۆمێ دکەت
ما ئەڤ فەلەک دۆمێ دکەت
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

رۆمێ دەما عەسکەر دکر
بێ حەدد و بێ دەفتەر دکر
میر لەشکرێ وان کەر دکر
کانی جیهانگیرێ جیهان

***

میرێ ب ئیحسان و خەلات
ژ رۆمێ ڤەگرتن پڕ وەلات
عەسکەر ژ بۆهتان بۆ دەهات
کانی جیهانگیرێ جیهان

***

کانێ گەلۆ میرێ ب ناڤ
عەسکەر ل رۆمی کر بەلاڤ
دوژمن بەزاندن ڤی تەڤاڤ
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

ئەڤ حاکمێ پڕ ناڤ و دەنگ
ژ رۆمێ ڤەگرت تۆپ و تفەنگ



دوژمن لبەر مابوونە تەنگ
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

میر پڕ هەبوو قەدر و ڕەواج
پێچان ئەڤی ڕۆم و حەلاج
ژ بەحران دهات ژێرا خەراج
کانێ جیهانگیرێ جیهان

له خوێندنەوەی ئەم بڕە شیعرە ئەوە دەردەکەوێ شاعیر لە هەموو دێڕە شیعرێکدا ناوی «ڕۆم» دەبا، مەبەسی دەسەڵاتی تورکی عوسمانییە، ئەو دەوڵەتەی دوژمنایەتی میللەتی کوردی دەکرد و خەڵکی کوردی دەچەوساندەوە. شاعیر ئەوە دەردەبڕی کورد و عوسمانی لە جەنگدان، سەرکردەی کورد شێخی بەگە، لە هەموو هێرشێکدا کورد سەردەکەوێ، ئازایەتی شێخی بەگ دەوری گرنگی هەیە لەو سەرکەوتنەدا. میر جێگەی ڕێزلێنان بوو، زەبر بەدەست بوو، لەودیو زەریایانەوە خەراجی بۆ دەهات.

وەداعی لەم دێڕانەیدا هەندێ پێوەندی کۆمەڵایەتی ڕوون دەکاتەوە:

خەسمێ شکاک و وانییان
کان دوژمنێ ئەرتووشییان
کۆچەر ل بەر میر لەرزییان
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

حازر د ئیمدادا د میر
هیزان و شێروان و جزیر
حەتتا خۆشم ناکەم ژبیر
کانێ جیانگیرێ جیهان

***

رۆمی دقەلسن بێ زراڤ
دلەرزین وەکی تووڕا دناڤ
سەرحەد هەمی هاتن سلاڤ
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

سەرحەد سەلامكارێ تەبوون
دوژمن بریندارێ تە بوون
ژار و فەقیر بارێ تە بوون
كانێ جیهانگیرێ جیهان

***

وەک میر نەبوون عالی هیمەم
دكرمانجیێ حەتتا عەجەم
كان لەشكر و جەیش و حەشەم
كانێ جیهانگیرێ جیهان

***

بەردا وەزیر و بەگلەران
شەبخوون ددانە عەسكەران
نايێنە شەرح و دەفتەران
كانێ جیهانگیرێ جیهان

لەم پارچە شیعرەدا وەداعی گیروگرفتی ناوەوەی كۆمەڵی كوردەواری دەخاتە ڕوو كە ڕەنگدانەوەیێكی نالەباری ڕەوشت و نەریتی عەشرەتی و بنەماڵەیی بووە و لەو سەردەمانەوە و تا ئێستا بوونەتە تەگەرە لە ڕێی وەدەستهێنانی هیوا و ئامانجی كورد لە یەكگرتن و دروستكردنی دەسەڵاتی تایبەتی خۆی ئەوەی تا ئێستاش نەگەیشتۆتە ئەنجام.

شاعیر ئەوە دەردەبڕێ عەشرەتی شكاك و خەڵكی وان و ئەرتووشی و عەشرەتە كۆچەرەكان دوژمنی شێخی بەگ بوون و وایان پیشان دەدا نرخی لەلایان نییە، كەچی لە ڕاستیدا هەموویان لێی دەترسان و سەریان بۆ شۆڕ كردبوو. پێچەوانەی ئەمەش لە ناوەوە بوو، هەندێ لایەنی دیكەی كوردەواری دۆستی میر بوون و یارمەتییان دەدا، وەكو عەشرەتەكانی هیزان و شێروان و ناوچەی جزیری بۆتان، لێرەدا شاعیر خۆشی دەخاتە پاڵ ئەوانەوە وەكو دۆستێكی میر.

جارێكی دیكەش وەداعی دەست دەكاتەوە بەپێداهەڵدانی شێخی بەگ و دەڵێ لەو كاتەی دەوروبەر سڵاوی لێ دەكەن و ڕێزی لێ دەنێن توركی عوسمانی لێی دەترسن.

شاعیر لەسەر ستایشەكانی دەڕوا و دەڵێ:

كان حاكمێ عالی جەناب
وەسفێ دڤی نابن حیساب
لێ فەلەكێ زوو كر شتاب
كانێ جیهانگیرێ جیهان

***



ما میر تنێ ئیحسان دكر
فەرماندەهی ل بەحران دكر
ڤی سەرەوەری ل وەستان دكر
كانێ جیهانگیرێ جیهان

***

ما میر تنێ وەستان ڤەگرت
ل بەر كۆچەران زۆزان ڤەگرت
حەتتا جهێ بۆهتان ڤەگرت
كانێ جیهانگیرێ جیهان

***

دوژمن ل بەر میر بوون زەبوون
وەستان و شاخ وەرگرت بوون
فریاد ژ چەرخا واژ گوون
كانێ جیهانگیرێ جیهان

***

هەرچی دمامیر با سوار
دوژمن دبوونە تار و مار
وەرگرت بوو حەتتا خومار
كانێ جیهانگیرێ جیهان

***

ما كەس هەبوو ڤێرا مەجال
دائیم هزار میر بوون ل بال
تەقدیر حەقە نابت بەتال
كانێ جیهانگیرێ جیهان

لەو شیعرانەدا وەداعی باس لە میر و فەرمانڕەوا گەورە و مەقام بڵندەكان دەكا ئەوانەی لەژێر سایەی شێخی بەگ دەژیان، موڵكی میر دەكشا تا دەگەیشتە زەریایان (ڕەنگە مەبەسی گولی وان بێ) و زۆزانی كۆچەران و ناوچەی بۆتان، ئەمانە هەموویان سەر بەشێخی بەگ بوون، دوژمن لەپێش میر سەرشۆڕ بوو، هەموولاییێكی داگیر كردبوو، هەمیشە هەزاران میر لەدوایەوە بوون.

ئەم سەرکەوتن و خۆشی و بەختیارییەی دەسەڵات تا سەر نەبوو، پیلان و بەرنامەدانان دەستی پێ کرد بۆ لە ناوبردنی میر:

چبکە ژ ڤێ چەرخا فەلەک
موهلەت نەدا چاڤێد بەلەک
ڤێ نازەنین کوشتن گەلەک
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

جارەک ل تەقدیرێ بنێ
چەرخی گەراندە کوشتنێ
ناڤ و کەرەم هشتە دنێ
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

عەسکەر هەگرت و چوویە شاخ
پێکڤە هنارن چوویە تاخ
ئەڤ چەرخ پڕ ئازارە ئاخ
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

ژۆریان شەهاند و میر برن
سەد سوند و عەهد ژێرا کرن
مەکرێ ژنان هەر حازرن
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

میر خوەندن و برنە حەرەم
ژێرا کرن سوند و قەسەم
ڤێکرا کرن لوتف و کەرەم
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

چبکەم ژ تەقدیرا جەببار
دەستوور نەدان میر بێتە خوار



وان هشتە ژۆر ئەڤ شەهسوار
کانێ جیهانگیرێ جیهان

وەداعی گازاندە لە گەردوون دەکا ماوەی نەدا ئەم سۆز و بەختیارییە تا سەر بێ. مەسەلە گەیشتە ئەوەی پیلان دابنێن بۆ کوشتنی میر، لێرە بەڵگەی مەکری ژن و مێبازییان بەکارهێنا بۆ ئەوەی لەناوی ببەن. میریان هەڵخەڵەتاند بەوەی بردیانە «حەرەم» ئەو دیوەی ژنی لێ دەژی لە هەموو ماڵێکدا. لەپێشانا هەڵسوکەوتیان لەگەڵیدا باش بوو، سوێندیان خوارد خراپەی لەگەڵدا نەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەک بەندکراوێک لە حەرەمدا مایەوە و ڕێگەیان نەدەدا لێی بچێتە دەرەوە.

لە دوای ئەمە شاعیر دەکەوێتە گێڕانەوەی چۆنیەتی کوشتنی میر:

میرێ کو پڕ قەدر و ویقار
ئەڤ حوققەبازا حیلەکار
شێخ شاند و خەنجەر ژێ ڤە شار
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

حەتتا کو میر ڕازا بخەف
نەسرانییان گرت چار تەرەف
سەد حەیف کو میر کرنە تەلەف
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

زیندی چ کر چەرخا جیهان
ئەڤ حاکمێ پڕ هەست و دان
کوشتن ب دەست نەسرانییان
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

بابێ فەقیر و ڕێویبیان
دەربێ مراد و هێویبیان
سەد حەیف میرێ مکسییان
کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

مەدحێ د میر من کر تەمام

دائیم ژ حەق لێ بن سەلام

هەر شابت ئەڤ جەننەت مەقام

کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

هەرچی دبێژم هەر وە بوو

مەدحێ د میر هێژ زێدە بوو

قەت کەس ل ڤان وەسفان نەبوو

کانێ جیهانگیرێ جیهان

لەو دێڕە شیعرانەدا وەداعی لەوە دەدوێ ئەو فێڵبازانە خەنجەریان لە میر شاردەوە. لەدوای ئەوەی میر خەوی لێ کەوت گاووران (نەسڕانییان) دەوریان دا و میریان لەناوبرد، شاعیر داد و بێدادیەتی لەوەی میر بەدەستی گاووران کوژراوە، ئەو کەسەی باوکی هەژاران بوو، میری مکسییان بوو، وەداعی دەڵێ: بەسەرهاتی میرم تەواوکرد، خودا ئاگاداری بێ، بەهەشت جێگەی بێ، ئەوەی وتوومە هەروا بووە.

وەداعی ئەم بەیتە جوانەی بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

یا ڕەب بە حەقێ قودرەتێ

میر چوویە مالا زولمەتێ

شاکەی ب لوتف و ڕەحمەتێ

کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

یا ڕەب ژ تە دەستوور بتن

قەبرا ڤی هەر پڕ نوور بتن

مەحرەم سەرابێ خووربتن

کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

قەت مسلێ خان مەحموود یەکێ

نینن د دەورا فەلەکێ

خۆش بت ل جە شێخی بەگێ

کانێ جیهانگیرێ جیهان

***



هەرچی بڤێ ڤی هەر وەبی

چەندی دنێ بێ هەر هەبی

تالع ل وی فەرخوندە بی

کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

من دل ژ بۆ میر سۆهتییە

دێ بەحس بکەن ژێ عامییە

بێژن (وەداعی) گۆتییە

کانێ جیهانگیرێ جیهان

***

یا قنج ئەوە ئەم ڤێ بکەین

ناڤی ل تاریخێ بدەین

بۆ غەین و ڕێ و لام و زەین

کانێ جیهانگیرێ جیهان

ئەم دێڕە شیعرانەی دوایی بەیتەکە موناجات و پاڕانەوەییێکن، لە کاتێکدا لە دەمی وەداعی دێنە دەرەوە کە کرنووش بۆ خودا دەبا و دەستە و دوعا داوای لێ دەکا لە گوناهی میر خۆش ببێ و بەهەشتی بەرینی پێ ڕەوا ببینێ. لەو دەمەی ئەم شیعرە وەک ماتەمنامەییێک دەکەونە ڕوو بۆ کوشتنی شێخی بەگ، پیرۆزباییێکیشن بۆ مەحموود بەگ گۆیا لەدوای کوشتنی شێخی بەگ ئەم لەجێی ئەو دانیشتووە و بووە بەمیری ناوچەی مکس.

وەداعی بە تۆمارکردنی ساڵی کوشتنی شێخی بەگ کۆتایی بەشیعرەکەی هێناوە. ناوی تیپەکانی «غ، ر، ل، ز»ی نووسیوە، نرخی ئەمانە بەحسێبی ئەبجەد دەکاتە (١٢٣٧ه) واتە (١٨٢١م).

***

وەداعی شاعیرێکی بەتوانا و ڕەسەنی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمە لە باکووری کوردستان، ئەدگاری قوتابخانەی هەریری و جزیری و فەقێ تەیرانی پاراستووە و ڕەنگدانەوەی ڕۆژگاری ژیانی خوێندەواری و ڕۆشنبیری نەتەوەی کورد بووە لەو سەردەمانەدا، زمانی شیعری ڕەوانە، بەسەر کێش و قافیەدا زاڵە، هەستونەستی ناوەوەی بەرامبەر بەدڵداری ئەگەرچی زۆر گەرم نییە، بەڵام لە وەسفی سروشت و دلبەر سەرکەوتووە. وێنە و مانای شیعرەکانی لەناو تیپەکانیدا لە سەرەوەیە و دیارە، وردبوونەوە و بیرکردنەوەی قووڵی گەرەک نییە، هەندێ لە شیعرەکانی وەک شیعری پەروەردەیی (تەعلیمی، دیداکتیکی) دەکەونە بەر چاو.

# ليستى ناوى كەسان

## لیستی ناوی جوگرافی

## بیبلیۆگرافیا

لەم بیبلیۆگرافیایەدا بەپێی توانا هەوڵدراوە ئەو سەرچاوانەی لە بەرگەکانی پێشوودا ئاماژەیان بۆ کراوە لێرەدا ناویان دووبارە نەکرێتەوە.

### بەزمانی کوردی


– ابن الحاج، مەهدی نامە، لێکۆڵینەوە و پێشکەشکردنی محەمەد عەلی قەرەداغی، بەغدا، ١٩٧٥.
– أحمد سالاو، سالم لە تای تەرازووی وێژەدا، سلێمانی، ١٩٦٨.
– ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، چاپی یەکەم، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٠؛ چاپی دووەم سلێمانی، ٢٠٠١.
– پیرەمێرد، دوازدە سوارەی مەریوان، سلێمانی، ١٩٣٥.
– دیوانی مەلای جەباری، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسینی عەبدولجەبار محەمەد جەباری، کەرکووک، ١٩٦٨.
– دیوانی سالم، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٣٣.
– دیوانی صەیدی، کۆکردنەوە و شیکردنەوەی محەمەد ئەمین کاردۆخی، سلێمانی، ١٩٧١.
– دیوانی «صەیدی»ی هەورامی، کۆکردنەوە و گۆڕینی عثمان هەورامی، سلێمانی، ١٩٧٠.
– دیوانی کوردی، بەغدا، ١٩٣١.
– دیوانی مەولەوی و ڕوحی مەولەوی، بڵاوکراوەی پیرەمێرد، بەرگی یەکەم سلێمانی، ١٩٣٥، بەرگی دووەم، سلێمانی، ١٩٤٠.
– دیوانی مەولەوی وەرگێڕانەکەی پیرەمێرد، بڵاوکراوەی نامەخانەی پیرەمێردی کاکەی فەللاح، بەغدا، ١٩٦٨.
– دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و لەسەر نووسینی مەلا عەبدولکەریمی مدرس، بەغدا، ١٩٦١.
– دیوانی مەولەوی، ساغکردنەوەی سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)، چاپخانەی حیدری، تاران، ١٩٩٠.
– دیوانی مەولەوی، لەلایەن محەمەد ئەمینی ئەردەڵانییەوە لە هەورامییەوە گۆڕاوە بۆ زاراوەی سۆرانی، بەغدا، ١٩٩١.
– دیوانا وەداعی، بەرهەڤکرن و ڤەژاندنا سەعید دێرەشی، بەرلین، ٢٠٠٢.
– ڕەفیق حیلمی، شعر و ئەدەبیاتی کوردی، بەرگ ١، بەغدا، ١٩٤١، بەرگ ٢، بەغدا، ١٩٥٦.
– رسالەی عشق لە مەولەوی ناسیدا، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و نووسینی سۆران سنەیی، ورمێ، ١٩٩١.
– زوبدەی عەقیدەی مەولەوی، ئامادەکردن و هێنانەوە سەر ڕێنووسی نوێ، حەمە ساڵح حاجی مەلا محەمەد گەلاڵە، سلێمانی، ٢٠٠٠.

- علاءالدین سجادی، دوو چامەکەی نالی و سالم، بەغدا، ۱۹۷۳.
- غەفوور ڕەشید، هەندێ لە وتارەکانی لە کۆواری «شەفەق»، ۱۹٦۲؛ لە کۆواری «ڕۆژی نوێ»، سلێمانی، ۱۹٦۱.
- کەریم شارەزا، کۆیە و شاعیرانی، بەغدا، ۱۹٦۱.
- محمد أمین زکی، تاریخ سلێمانی و ولاتی لە دەوری زۆر قەدیمەوە تا أولی احتلال ۱۹۱۸م، بغداد، ۱۹۳۹، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی، مەلا جەمیلی مەلا ئەحمەدی ڕۆژبەیانی، بەغدا، ۱۹۵۱.
- محمدی مەلا کەریم، مەولەوی ژیان و بەرهەمی، هەولێر، ۲۰۰۱.
- میهرەجانی مەولەوی، کتێبی ژمارە (۱)ی کۆواری «ڕۆشنبیری نوێ»، بەغدا، ۱۹۸۹.
- هەڵبژاردەیێک لە عەقیدەی مەرضیەی مەولەوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی بابە علی شێخ عمر قەرەداغی، بەغدا، ۱۹۸۵.
- أ.ب. هەوری، شای شاعیرانی لاهووت و زانایی و خۆشەویستی کورد لە چەرخی نۆزدەمدا، سلێمانی ۱۹۷۳.

**بەزمانی عەرەبی:**

- جمال نبز، الامیر الکردي میر محمد الرواندوزي، أربیل ١٩٩٤.
- محمد القزلجي، التعریف بمساجد السلیمانیة ومدارسها الدینیة، مطبعة النجاح، بغداد، ١٩٣٨.

**بەزمانی فارسی**

- شاعر قلەهای مە آلود، تصحیح، ترجمە و شرح أشعار غلام رضا ارکوازی شاعر شهیر ایلامی، بە انضمام: در آمدی برکرد وسیر تاریخی وفرهنگی أو و تاریخ استان ایلام ازنگاهی دیگر، تحقیق و تصحیح، ترجمە و شرح: ظاهر سارایی، تهران، ۱۳۷۹ (۲۰۰۰م).
- هجری دده، تحفەء سلیمانی، مطبعەء سریان، بغداد، ۱۹۳۵.
- محمد مکری، گورانی یا ترانەهای کردی، طهران، ۱۹۵۱.

زۆربەی سەرچاوە ئەوروپاییەکان لە بەرگەکانی پێشوودا ناویان هاتووە، وا بەباش زانرا لەدواییدا هەموویان بەسەر یەکەوە تۆمار بکرێن.

# ناوەڕۆک

# تاريخ الادب الكردي

## النصف الأول من القرن التاسع عشر

## (١٨٠١-١٨٥٠)

يتناول هذا الجزء من الكتاب النهضة الأدبية الكبرى التي ظهرت في النصف الأول من القرن التاسع عشر في أصقاع السليمانية في ظل الأمارة البابانية الكردية. وكان رائدها الاول الشاعر المؤسس نالي. ولقد أسهم هو ورفيقاه سالم وكردي في بناء تلك الحركة الأدبية الكردية المتينة التي أنتشرت في جميع أصقاع كردستان الجنوبية فيما بعد، وتطور الأدب الكردي كذلك من حيث ظهور الألوان الأدبية الجديدة والمضامين الاجتماعية الحديثة. وكذلك يتطرق هذا الجزء الى جانب من الأدب الكردي في المناطق التي تسود فيها اللهجة الگورانية ويتناول حياة طائفة من الشعراء الممتازين وعلى رأسهم مولوي، ويستمر كذلك في البحث عن الأدب الكردي في المناطق الشمالية من كردستان.

## الجزء الثالث


## الدكتور معروف خزنەدار



أربيل ٢٠٠٣




# The History of Kurdish Literature

## The first half of 19th. Century
## 1801 - 1850

## Vol. III


By
Prof. Dr. Marouf Khaznadar



Arbil 2003